زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ٤٤

# چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا

## ٢

### لەبارەی ئیمان و بانگەوازی و جیهاددا

نووسینی
دکتۆر صلاح عبدالفتاح الخالدي

وەرگێڕانی
کاوە هاوڕاز



## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین.
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و ڕەوتگەرایی.
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستوورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت؛

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# چیـرۆکی
# پێشـینان لە قورئـاندا

## چەند وانەیەک لە ئیمـان و
## بانگـەوازو جیهـاد دا

## بەشی دووەم

نووسـینی

**د.صلاح عبدالفتـاح الخـالدي**

وەرگـێڕانی

**کـاوە هاوراز**




بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

ناوی کتێب بە عەرەبی: مع قصص السابقين في القرآن (٢)

ناوی نوسەر: د.صلاح عبدالفتاح الخالدي

ناوی کتێب بەکوردی: چیرۆکی پێشینان لە قورئاندا بەشی دووەم

ناوی وەرگێڕ: کاوە مصطفی (هاوراز)

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر

نەخشەسازی ناوەوە: عزالدين محمد عمر

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: ئەمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر هەولێر ژمارەی سپاردن (٣٠٩) ساڵی ٢٠٠٤ ی پێدراوە



تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com


www.al-tafseer.com

# بەشـــی دووەم

## چیرۆکەکانی ســوورەتی ( کهف )

﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ .. ﴿١٣﴾ ﴾ الكهف

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور انفسنا، وسيئات أعمالنا، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، واشهد ان لا الـه الا الله، وحده لاشريك له، وأشهد ان محمدا عبده ورسوله، صلوات الله وسلامه عليه، وعلى آله وصحبه.. اما بعد:

ئەمەش بەشی دووەمە لە تێڕوانینو لێکۆڵینەوەمان لە چیرۆکی پێشینەکانی نێو قورئانی پیرۆز... ئەوەبوو پێشتر بەشی یەکەمان دەرکرد کەتەرخانمان کردبوو بۆ گرنگترین چیرۆکەکانی (بەنو ئیسرائیل)و کە دەربارەی چەند چیرۆکێك بوو، وەك (چیرۆکی دایکی مووسا- سلاوی لێ بێت) و(چیرۆکی پیاوە باوەڕدارەکەی هۆزی – فیرعەون)و (چیرۆکی قاروون)و چیرۆکی وێڵ بوونی (بەنو ئیسرائیل) لە (سینا)داو (چیرۆکی سەربڕینی مانگاکە)و (چیرۆکی هاوەڵانی شەممە (اصحاب السبت)و (چیرۆکی طالووت).

بەڵێنیشماندا کەلەم کتێبەدا لەسەر کارەکەمان بڕۆینو لەم بوارەدا بەردەوام بینو چەند نموونەیەکی دیکەی چیرۆکی پێشینەکانی نێو قورئان لێك بدەینەوە.

بێگومان ئەم بەشەمان تەنها بۆ ئەو چیرۆکانەی نێو سوورەتی (کهف) تەرخان کردووە.. دیارە سوورەتی (کهف)یش سوورەتێکی چیرۆك ئامێزەو، چیرۆکەکان بەشێکی زۆریی سوورەتەکەیان پێك هێناوەو زۆربەی ئایەتەکانیان لەخۆ گرتووە، چونکە لەکۆی هەموو ئایەتەکانی سوورەتەکە کە (١١٠) ئایەتە حەفتاویەك (٧١) ئایەتیان لەسەر چیرۆکەکان هاتوون.

١- چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوت **(قصة اصحاب الكهف)**.

٢- چیرۆکی کابرای خاوەن دووباخەکە لەگەڵ هاوەڵە باوەڕدارەکەیدا.

٣- چیرۆکی (مووسا)ـ سڵاوی خوای لێ بێت ـ لەگەڵ بەندە چاکەکەدا.

٤- چیرۆکی (ذو القرنين).

بۆ هەر چیرۆکێك لەم چیرۆکانەش بەندێکی تایبەتیمان داناوەو لەبەرایی گشت چیرۆکەکاندا دەسپێکێکمان بۆ ڕاخۆشکاریی گرتۆتەبەر کە باسی ئەو باردۆخەی هاتنە خوارەوەی سوورەتەکە دەکات‌و ئاماژە بۆ ئەو تاقیکردنەوەیەی موشریکەکانیش دەکات کە بەرێنمایی یەکی جوولەکەکان پێغەمبەری خودایان ﷺ تاقی کردەوە.

هەر لەو دەسپێکەدا تێڕوانینی مامۆستا (ابو الحسنی ندوی) بۆ سوورەتی (کهف)مان خستۆتە روو کە سەرنجی وردی خۆی لە بابەتە بنچینەییەکەی ئەم سوورەتە داوەو وای بینیوە کە ئەم سوورەتە چەق دەخاتە سەر ململانێی نێوان باوەڕو ماددەپەرستی.

هەروەها لەم بەرایی یەدا زۆربەی ئەو پێناسەیەی مامۆستای پێشەوا (سید قطب)مان هێناوە کە لە تەفسیری (في ظلال)ەکەیدا نووسیویەتی‌و، سەرنجی لە بابەتە گشتییەکەی سوورەتەکەو لەوتەوەرەیەشی داوە کە سەرجەم بابەتە لاوەکی (جزئي)و ئایەت‌و بڕگەکانی پێکەوە دەبەستێتەوە.

بابەتە گشتی یەکەی ئەم سوورەتە وەك (سید قطب)یش سەرنجی لێداوە، ئەوەیە مەبەست‌و ئامانج تێیدا ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕو، ڕاستکردنەوەی بەرنامەی فیکرو تێڕوانین‌و، ڕاستکردنەوەی بەها جوانەکانە بەتەرازووی عەقیدە.. بێگومان بۆ سەرنج‌و تێڕوانین لەچیرۆکەکانی پێشینان بەرنامەیەك لەئارادا هەیە. ئەم بەرنامەیەش لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ‌و تێگەیشتنی هاوەڵانی (صحابە)و زانایانی لێکۆڵیارو ساغکەرەوەکانەوە، سەرچاوەی گرتووە..

ئەوەبوو لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژیی لەم بەرنامەیە دواین، کە تایبەت بوو بە چیرۆکەکانی (بەنو ئیسرائیل).. لەم بەرگەشدا هەر چەق دەخەینەوە سەر ئەو بەنامەیە، کە پێشەکیی بەرگی یەکەم بووو بەپێشەکی یەکی ئەم بەرگەو بەسەرەتایەکی رێ خۆشکارییشی دادەنێینەوە.

بە ڕاستی دیدو تێڕوانین لە ئایەتەکانی سوورەتی (کهف) هەمە لایەنەو هەمەگیرەو، دەرس‌و پەندو وانە لێ دەرهێنراوەکانیشی هەمەجۆرو هەمەڕەنگن، وەك ئەوەی، کە چەندەها دەرس‌و پەندی (باوەڕداریتی‌و، بانگخوازی‌و، جیهادکاری‌و، پەروەردەیی‌و، مەنهەجی‌و، زانستی‌و، ڕەوشتمەندی‌و، ئابووری‌و، کۆمەلایەتی‌و، پیشەسازی‌و، جوگرافی‌و، هەروەها مێژوویی‌و.. چەندین جۆرە بواری تریشن..) بەلام سەرەڕایی ئەمەش نەمانتوانیوە هەموو ئەو وانەو ئاماژەو پەندو عیبرەتانەی لێ دەربێنینەو، هیچ کەسێکیش ناتوانێت ئەو پرۆپاگاندەیە بۆخۆی بکات، بۆیە بێگومان هێشتا گەلێك پەندو وانەی وای تێدا ماون، کە ئێمە گوزەرمان بەلایاندا نەکردووە.

لێرەش دا لە چەند خالێکدا ئامانجی تێڕوانینی خۆمان لەم چیرۆکانەو لەوەی دەمانەوێت بەدییان بهێنین، دیاریی دەکەین:-

١- هێشتنەوەی باسی ئەو چیرۆکانە لە کەش‌و هەوای دەقە قورئانیەکەداو، دەرنەچوون لەو دەقانە تەنها بۆ سەر فەرموودە ڕاست (صحیح)ەکانی پێغەمبەر ﷺ نەبێت، کە لایەنێکی نادیارو نەزانراو ڕوون دەکەنەوەو، تەمومژو ئاستەنگێك دەرەوێتەوە، واتە تەنها پشت بەو دوو سەرچاوەیە (قورئان‌و سوننەت) بەستراوە.

٢- پەسند نەکردنی هیچ هەواڵو ڕوونکردنەوەو شیکارێك لە دەقە هەلبەستراوە ئیسرائیلییەکان‌و لە هەر سەرچاوەیەکی هاوشێوەیان لە ڕیوایات‌و قسەو باسە پووچەلو ئەفسانەییەکان.. هەروەها ڕەتکردنەوەی هەر وتەو باس‌و خواسێك لە

هەر مرۆڤێکەوە تەنانەت هەرکەسێك‌و لـە هـەر پلەیەکـدا بێـت ئەگـەر وتـەو باسـەکەی پـشتیان بـە دەقـی ڕۆشـنی قورئـان، یـان فـەرموودەی (صـحیح) نەبەستبێت، ئەمەش بەپێی بڕوابوونمان بەپێویستیی قایل بوون تـەنها بـە ڕوون کراوەی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها پێویستی‌و پێویستبوونی بێ دەنگی لە ئاست ئەو ڕووداوو شیکارانەی کە ئەم دوو سەرچاوەیە (قورئـان و سوننەت) لێیی بێ دەنگ بوون.

٣- ئاوڕدانـەوە لـە ڕەهەنـدە واقیعییـەکانی ئـەو چـیرۆکانەو ئامـاژە کردنـی بـۆ پیادەکردنی هەندێك دیمەن‌و وێنەو نموونەیان بەسەر واقیعی ئـەمڕۆدا، هـەروەها پیادەکردنی ئەو ڕەهەند (بعد)ە واقیعییە کردەیی‌و زیندووەش بەسەر ئەو وانـەو بەڵگەو نیشانانەی لەو چیرۆکانەوە وەردەگیرێن.

٤- چـەق خـستنەسەر وانـە بـاوەڕداری‌و بـانگخوازی‌و جیهـادی‌و ڕێـسابەندییە دەرهێنراوەکانی ئەو چیرۆکانە، بەو پێودانگەی گرنگترین ئاتـاج‌و ویـستەمەنیی بانگەوازکارو چاکسازی خوازانی ئەم سەردەمەیان تێدایە.

چەند چیرۆکێکی تریش لە قورئاندا هـەن کەلێکۆڵینەوەیـەکی سـەربەخۆیان بـۆ دیاری دەکەین‌و، کە بەرگی سێ‌هەمی ئەم کتێبەیەو (ان شاءالله) لەدوای ئەم بەرگە دەردەچێت، دیارە ئەو چیرۆکانەی تریش هەردەربارەی پێـشینەکانە، وەك (چـیرۆکی هارووت‌و مارووت)و (چیرۆکی ئەو ڕێبوارەی بەلای ئاواییەکەدا تێپەڕی)و (چیرۆکی هەردوو کوڕەکەی ئادەم)و (چیرۆکی ئەو پیاوەی خۆی لە زانستی ئایەتەکانی خـودا داماڵی)و (چیرۆکی مێروولەو پەپووسلێمانکە)و (چیرۆکی لوقمان)و (چیرۆکی سەبەء )و (چیرۆکی هاوەڵانی گوندەکە).

خوێنـــەری هێژاو بەڕێز..

ئەوا پەندو وانە دەرهێنراوەکانی ئەو چیرۆکانەی نێـو سـوورەتی (کهـف) لەبـەر دەمتانــدان بـۆ ئـەوەی تـۆش بـەگوڕو تـینو شـەوقێکی گـەورەترەوە خوازیـاری خوێندنەوەیان بیتو، بۆ ئەوەی هاندەریشت بێت بۆ بەردەوامیی خوێندنـەوەی ئـەم سوورەتەی قورئان. بێگومان ئەم سوورەتی (کهف)ەش تایبەتمەندێتی یەکی جـوداو بابەتێکی دیاری تێدایەو ڕێزو پێزو فەزڵێکی تایبەتیشی هەیە.

سوننەتیش وایە گشت موسڵمانێك ڕۆژی هەینی سوورەتی (کهـف) بخوێنێـت، وەك پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی کردووینو چەندین فـەرموودەی لەمبارەیـەوە هەیـە، وەك:-

١- (مسلم) لە (صحیح)ی خۆی لە (ابو الـدرداء)ەوەو، ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، کە فەرمویـەتی: ((**مـن حفـظ عـشر ایـات مـن اول سـورة الکهف، عصم من الدجال**))[1]..واتـە "هەرکەسـێك دە ئایـەت لـە سـەرەتای سوورەتی (کهف) لەبەر بکات ئەوا لە دەجال پارێزراوە".

٢- (ابو داود)یش لە (سنن)ی خۆی لە (ابو الدراء)ەوە ــ خـوا لێـی ڕازی بێـت)و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوێتیەوە کە فەرموویەتی: ((**مـن حفـظ عـشر ایات من اول سورة الکهف، عصم من فتنة الدجال**))، لە گێڕانەوە (روایە)یەکی دی دا هاتووە: کە ((**من حفظ عـشر ایـات مـن خـواتیم سـورة الکهـف**)). لـە ڕیوایەتێکی سێیەمدا واهاتووە: ((**من اخر الکهـف**))[2] هەردوو ڕیوایەتەکـەش مانای ئەوە دەگەیەنن کە هەرکەسێك لە کۆتایی سوورەتی (کهف)دا، دە ئایەت لەبەر بکات ئەوا لە شەڕو فیتنەی دەجال پارێزراوە.

---

(١) مسلم(٦): کتاب صلاة المسافرین (٤٤) باب فضل سورة الکهف، حدیث رقم (٨٠٩).

(٢) ابو داود : (٣٦) کتاب الملاحم (١٤): باب خروج الدال، حدیث رقم (٤٣٢).

٣- (ترمزی)یش لە (سونەن)ی دا —خوا لێی ڕازی بێت- و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوێتیەوە، کە فەرموویەتی : **((مـن قـرأ ثـلاث ایـات مـن اول الكهـف عصم من فتنة الدجال))**[1].. واتـە: "هەرکەسـێ: سـێ ئایـەت لـە سـەرەتای سوورەتی (کهف)ەوە بخوێنێت ئەوا لە شەڕو فیتنەی دەجال پارێزراوە".

٤- (بخاری)و (مسلم)و (ترمزی) لە (براو- کوڕی — عازب)ەوە- خـودا لێـی ڕازی بێت- گێڕاویانەتەوە کەوا: جارێکیان پیاوێـك سـوورەتی (کهـف)ی دەخوێنـدو ئەسپێکی خۆیشی بەدوو گوریسی درێژ بەستبووەوەو لەوکاتەدا پەڵـە هـەورێك داپۆشیو، وای لێ هات دەسوڕایەوەو نزیك دەبـووەوە، تەنانـەت ئەسـپەکەش لێی نزیك دەبووەوە، کاتێك کابرا هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ ئەوەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: **((تلك السكنيه تنزلت للقران))**[2]..واتە: ئەوە هێمنیو ئاسوودەیی یەك بووە، کە بۆ قورئان هاتۆتە خوارەوە".

٥- (الحاكم) لە (مستدرك)ی خۆی، لە (ابو سعيد-ی خدری)یەوە -خـوا لێـی ڕازی بێت- گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((مـن قـرأ سـورة الكهـف كما انزلت ثم خرج الى الدجال لم يسلط عليـه ولم يكـن لـه عليـه سـبيل))**[3].. واتە: " هەرکەسێك سوورەتی (کهف) وەك چۆن هاتۆتە خوارەوە هەمـوو پێکەوە بە وردبوونەوە لە ماناو مەبەستەکان، بخوێنێتو، پاشان بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی دەجاڵ دەرچێت، ئەوا (دەجاڵ) ناتوانێت بەسەریدا زاڵبێتو هـیچ ڕێگـە چـارەو دەربازێکی لە بەرامبەریدا نیە".

---

(١) ترمذي: (٤٢) : كتاب ثواب القرأن (٦) باب ماجاء في سورة الكهف، حديث رقم (٣٠٤٧).

(٢) البخاري: (٦٦) كتـاب فـضائل القـرآن (١١): بـاب فـضل سـورة الكهـف، حـديث رقـم (٥٠١١) ومـسلم: (٦) كتـاب صـلاة المـسافرين(٣٦) بـاب نـزول الـسكينة لقـراءة القـران. حـديث (٧٩٥). والترمذي: (٤٢) كتاب ثواب القرآن (٦) باب ماجاء في سورة الكهف، حيث رقم (٢٠٤٦).

(٣) المستدرك للحاكم كتاب الفتن والملاحم، بـاب مـن قـرأ سـورة الكهـف لم يـسلط عليـه الـدجال (٤: ٥١١) وقال عنه الذهبي في التلخيص: صحيح (٤: ٥١١) حاشية.

٦- (ابن مردویة)و (ضیائی مقدسی)یش لە (المختار)دا لە (علی)یەوە ﷺ و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویێتییەوە کە فەرموویەتی: ((**من قرأ الكهف يوم الجمعة معصوم الى ثمانية ايام من كل فتنة تكون، وان خرج الدجال عصم منه**))[1]. واتە: (هەرکەسێك لە ڕۆژی هەینی دا سورەتی (کهف) بخوێنێ، هەتا هەشت ڕۆژ پارێزراو دەبێت لە هەر بەڵایەك ڕووبدات، خۆ ئەگەر ڕۆژی دەرچوونی دەجاڵیش بێت، هەر لێی پارێزراوە".

ئەم فەرموودە ڕاستو صەحیحانەش هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە سوورەتی (کهف) ڕێزو پێزو فەزڵێکی تایبەتی هەیەو هەرکەسێك لەبەری بکاتو هەموو ڕۆژی هەینیەك لەسەر خوێندنەوەی بەردەوام بێت، ئەوا خودا لەشەڕو فیتنەی ماددەپەرستی دەیپارێزێتو بەساغ وسەلامەتو هێزو تینەوە لێیان دەردەچێتو، جێگیرو خۆڕاگریش دەبێت لەسەر ئایینو ئیمانەکەی.

ئەم سەردەمەی ئێمەش سەردەمی فیتنەو ئاشووبی ماددەپەرستییە، کە هەموو خێرێك ڕادەماڵێت، کە سیستەمی ماددەپەرستیی جاهیلیی تێدا بڵاوبۆتەوەو جوان کراوەو، هەموو جادووو ساختەو فیتنەو فریودانو ئارەزووو بێشەرمیو لادانێکی لە نێو موسڵماناندا بڵاوکراوەتەوە، لەهەموو ڕوویەکیشەوە رووبەندی ژیانی موسڵمانانی داگیرکردووە، موسڵمانانیش یەخسیری ئەو داگیرکردنە بوونو، وەك نێچیرکەوتوونە بەر کەڵبەکانیو، خۆیان داوە بەدەم هەواو هەوەسو ئارەزووەکانیەوەو، بڕوایان بە جادووو ساختەو ڕێ لێ ونکردنی کردووە.

بەڵام خودا موسڵمانە ڕاستو دڵسۆزەکانی لەبەردەم ئەو شاڵاوو ململانێیەدا پاراستووە، بە قورئان پاراستوونی لەکاتێکدا ئەوان ڕوویان کردۆتە قورئانو لەبەریان کردووەو، بەتەواوەتی مافی خوێندنەوەیان پێداوەو، بەتەواوەتیش لێی تێگەیشتوونو، هەر بەقورئانیش جیهاد لە دژی سیستەمی ماددەپەرستیی جاهیلی

(١) الدر المثور للسيوطي (٥:٣٥٥).

دەکەن‌و لەرێی ڕاستییەکانی قورئان‌و چەمك‌و واتاو ڕێساکانیەوە بەربەرەکانیی ئەو سیستەمە دەکەن.

هەروەها سوورەتی (کهف) - سوورەتی ململانیی نێوان ئیمان‌و ماددەپەرستی- ئەرکێکی هێجگار گەورەی لە ڕووبەڕووبوونەوەو جیهادکاریی‌و خۆڕاگریـدا هەیـە.. مامۆستا (ابو الحسنی ندوی) دەربارەی ڕازی (خۆپاراستن لـە فیتنـەی دەجـال بـەم سـوورەتە)و لەفیتنـەی هاوشـێوەکانی لەجادووگـەران‌و درۆزنـان، گووتوویـەتی: "بێگومان ئەم سوورەتە لە سوورەتە بێ هاوتاکانی قورئانە کە گەورەترین‌و زۆرترین بابەتی تێدایە، بەتایبەتیش ئەو بابەتەی پەیوەستە بەفیتنەو پـشێوییەکانی دوایـین سەدە، کە جادووگەر دەجال حوکمی تێدا دەکـات‌و فیتنـەو جـادوو گـەورەدەکات‌و بەیداخەکەی هەڵـدەگرێت. هـەروەها ئـەم سـوورەتە زۆرتـرین بـڕو میقـداری ئـەو دەرمانەی تێدایە کـە ژەهـری دەجـال لـەناو دەبـات‌و زامەکـەی سـاڕێژ دەکـات، هەرکەسێکیش هێدی هێدی لەکانیاوی واتاکانی ئەم سوورەتە بخواتەوەو خـۆی لـێ تێرکات، (واتە لەئەنجامی لەبەرکردنی‌و زۆر خوێندنی لە گشت حاڵەتێکدا) ئەوا لە فیتنەو ئاشووبی ئەم سەردەمە دەپارێزرێت، کە سەرتاپای جیهـانی ئـاڵۆزکردووەو، لە داوو تۆڕەکانیشی دەرباز دەبێت.

دیسان هەرئەم سووڕەتە هێندەی ڕێنمایی‌و ئامۆژگاری‌و پەندو چـیرۆك تێدایـە، کە دەجال لە هەموو زەمان‌و جێگەیەکدا دیـاری‌و دەسنیـشان دەکـات‌و، بنـەمای فیتنەو بانگەشەکانیان دەردەخات‌و، عەقڵ‌و دەروونـی خـەڵکی بـۆ بەربـەرەکانێ‌و بەرەنگاربوونەوەی ئەو فیتنەیەو بۆ بەرپەرچدانەوەی سازو ئامادە دەکات، بێگومان عەقڵ‌و دەروونی مرۆڤیش گیـانێکی وایـان تێدایـە کەبەرهەڵـستیی‌و بـەرەنگاری جادووگەری‌و پێشەوایانی‌و، بەرنامەی بیرکردنەوەیان‌و پلانـی ژیانیـان، بەرۆشـنی‌و بەهێز دەکات)[1].

---

(١) ابو الحسن الندوی (تأملات فی سوره الکهف) ٩-١٠.

لەڕاستیشدا هەر بەقورئان دەتوانین خۆمان لەگوناهان بپارێزین، هەر بە قورئانیش ڕزگاردەبین، خۆڕاگریی‌و دان بەخۆداگرتنیشمان تەنها بەقورئانەو، سەبەرزی‌و سەروەری‌و بەختەوەریشمان بەقورئانەوەیەو، سەرکەوتن‌و سەرفرازی‌و گرەو بردنەوەشمان هەر بەهۆی قورئانەوەیەو، بەهەشتیشمان بەیارمەتی خودا تەنها بە پابەندییمان بەم قورئانەوە دەست دەکەوێت.

(خودایە قورئانی پیرۆز بکە بە بەهاری دلأنمانو، ڕۆشنایی سینەمانو، نەمانی خەم‌و ڕەواندنەوەی پەژارەمانو، بواری خوێندنەوەی قورئانیشمان لەساتەکانی شەوو ڕۆژدا بۆ بڕەخسێنەو، ئەوەی لێی بێ ئاگابووین ونەمانزانیوە فێرمان بکەیتو، ئەوەی لەبیرمان چووەتەوە بەبیرمان بێنیتەوەو، بیکەیتە بەلگەو شەفاعەتکارمان لە ڕۆژی قیامەتدا). لەگەڵ ئەم نزایەدا ئەم نزایەی پێغەمبەریش دەڵێینەوە کە (احمد) گێڕاویێتییەوە :

((اللهم اني عبدك وابن عبدك واين امتك، ناصيتي بيدك ما من في حكمك، عدل في قضائك. اسألك بكل اسم هو لك، سميت به نفسك او انزلته في كتابك اوعلمته احدا من خلقك او استأثرت به من علم الغيب عندك، ان تجعل القرآن الكريم ربيع قلبى ونور صدري وجلاء حزني وذهاب همي وغمي)).

(احمد) لە پێغەمبەرەوەﷺ گێڕاویێتییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەر عەبدێکی خودا تووشی خەم‌و پەژارەیەك بوویێت، بەم نزایە لەخودا بپاڕێتەوە ئەوا خوداش خەم‌و پەژارەکەی بۆ لابردووەو، بە خۆشی‌و شادی بۆی گۆڕیوە).

درووودو سلاو لەسەر گیانی پێشەوامان پێغەمبەرو کەس‌و خانەوادەو هاوەلانی بێت.

صلاح عبدالفتاح الخالدی
صویلح- یەك شەمە
١٤٠٨/٦/١١ کۆچی
١٩٨٨/١/٣١ زایینی

## بەرایـــی:

# ناساندنی ســوورەتی "کـهف"

### "ئەو بارودۆخەی کە سوورەتەکەی تێداهاتۆتە خوارەوە":-

بەڕای تێکڕایی سەرجەم زانایانی تەفسیر، کـە لـە هۆیـەکانی هاتنـە خـوارەوە (اسباب النزول)ی قورئانیان کۆڵیوەتەوە، سوورەتی (کهف) مەکیە، واتـە لەشـاری (مەککە) هاتۆتە خوارەوە لەکاتێکیشدا هاتۆتە خـوارەوە کـە جـەنگو ململانێـی فیکریی لەنێوان پێغەمبەروﷺ موشریکانی قوڕەیش بەتوندی پەرەی سەندووە، لـە گەرمەی تەشەنەسەندنی ململانێی نێـوان بـاوەڕو ماددەپەرسـتیدا ئـەم سـوورەتە هاتۆتە خوارەوە.. ئەمە سەبارەت بە ڕەوشو بارودۆخی گشتیی هاتنـە خـوارەوەی سوورەتەکە.

بەڵام دیارە بۆنەو موناسەبەیەکی تایبەتیش بۆ بـارودۆخی هاتنـە خوارەوەکـەی هەیە، کە زانایانی تەفـسیر لـە (المأثور)و ژیاننامـە (سـیرە)ی پێغەمبـەرەوە ﷺ دیاریان کردووە. بۆ نموونەش: هەر یەکە لە (ابن اسحاق)و (ابن جریر)و (ابن المنذر)و (ابو نعیم) و(بیهقی) لە (ابن عباس)ەوە (خودا لێیان ڕازی بێت) بەسەر هاتێکیـان هێناوەو (اخراج)[1]کردووە، کە ناوبراو واتە (ابن عبـاس) گێڕاوێتیـەوەو گوتوویـە: (قوڕەیشیەکان (نضری کـوڕی حـارث)و (عقبـەی کـوڕی ابـو معـیط)یـان بـۆ لای زانایانی جولەکەکانی نێو(مەدینە) ناردو پێیـان گـوت: (دەربـارەی"موحەممـەد" پرسیاریان لێ بکەنو، شێوەو سیفەتی باس بکەن بۆیانو هەواڵی ووتـەکانی پێیـان

(١) (اخراج) لە زاستی فەرموودەو گێرانەوەی دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەردا مەبەست لەوەیە کەوا ئەو ریوایەتو فەرموودانەیان بە بەڵگەو (سەنەد)ە ڕاستەکانیانەوە هێناوە. (وەرگێر)

بدەن، چونکە ئەوان خۆیان یەکەم کۆمەڵی شوێنکەوتووی کتێبی خوادانو، زانستێکی وەهاشیان لەمەڕ پێغەمبەران هەیە کە ئێمە نیمانە. ئەو دوو کەسەش (واتە: نضر و عقبە) ڕۆشتن تاکو گەیشتنە مەدینەو لەوێ پرسیاریان لە زانایانی جوولەکەکان کرد دەربارەی پێغەمبەری خواو وەسفی کاروبارو مەسەلەکەیان بۆکردنو هەندێك لە فەرموودەکانیان پێ ڕاگەیاندن. پێشیان گوتن: (ئێوە شوێنکەوتووی تەوراتن، بۆیە ئێمە هاتووین بۆ لاتان تاکو هەواڵی ئەو هاوڕێیەی خۆمانمان پێ بلێن). جوولەکەکان لە وەڵامیاندا گوتیان " پرسیاری سێ شت لەو پیاوە واتە لە (محمد) بکەن، جا ئەگەر هەواڵی تەواوی لەسەریان پێدان، ئەوە دیارە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، خۆ ئەگەر وەڵامی تەواویشی پێنەبوو ئەوە دیارە لەخۆیەوە قسە دەهۆنێتەوە، ئێوەش بیروڕای خۆتان بخەنە کارو تاقی بکەنەوە.. ئەو سێ شتەش ئەوەیە:

یەکەم: پرسیاری دەربارەی زەمانی یەکەم لێ بکەن، کە ئاخۆ حاڵی خەڵکی چۆن بوو بێت، چونکە قسەوباسێکی سەرسوڕهێن لە بارەیانەوە هەیە.

دووەم: دەربارەی پیاوێکی گەڕۆکیش لێی بپرسن، کە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای زەوی گەڕاوەو، داخۆ هەواڵی چی بێت..

سێیەم: لەبارەی گیانەوە (ڕۆح) لێی بپرسن کە داخۆ چی بێت؟!"

ئینجا (نضر)و (عقبە) دەستیان بەگەڕانەوە کردو هاتنەوە بۆ لای قورەیشو پێیان گوتن: ﴿ئەی گەلی قورەیش بەڵگەی جیاکەرەوەو بڕێنەرەوەی مەسەلەی نێوان ئێوەو (محمد)مان بۆ هێنانەتەوە کە زانایانی جوولەکەکان داوایان لێکردین چەند پرسیارێك لەسەر چەند مەسەلەیەك لە (محمد) بکەین﴾.. ئینجا پرسیارەکانیان سەبارەت بەو سێ مەسەلەیە بۆ قورەیش گێڕایەوەو ئەوانیش ئەوپرسیارانەیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد. پێغەمبەریش ﷺ لەوەڵامدا پێی فەرموون: (سبەینێ هەواڵی ئەو ڕووداوو مەسەلانەتان پێ دەگەیەنم (بێئەوەی ئەگەرێکی جیاکاریی لەسەر

دابنێت..)، واتە نەیفەرموو سبەینێ ئەگەر خودا خواستی لێبێت (ان شاءالله) جا کاتێك ئەم وەڵامەی بەبێ وتنی (ان شاءالله) پێ گەیاندن، ئەوانی ڕۆشتن بەو هیوایەی سبەینێ بێنەوە بۆ لای.

پێغەمبەری خودا ﷺ تا پازدە ڕۆژ مایەوەو خودا سرووش (وحی)ی بۆ نەدەنارد، (جبریل)یش نەدەهاتە لای، تاوای لێ هات تەنانەت خەڵکی مەککەش دەستیان کرد بە دروستکردنی وتەو هەواڵی ناڕاستو پشێوی نانەوە.. ئەم حاڵەتی ڕاوەستانی سرووشەش پێغەمبەری ﷺ دڵتەنگ کردبوو, کاری ئاخاوتنی بۆ خەڵکی مەککەی لەلا گران کردبوو.

پاشان (جبریل) بە سوورەتی (کهف) لەلای خوداوە هات بۆ لای کە تێیدا لەسەر دڵتەنگ بوونی بۆ ئەوان گلەیی لێکراوە، هەروەها لەسەر هەواڵی پێگەیاندنی ئەو مەسەلانەی کە دەربارەی لاوەکان وپیاوە گەڕیدەکەو حەقیقەتی ڕۆح پرسیاریان لێ کردبوو، وەك فەرمایشتی خوداش ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ... ﴿٨٥﴾ الإسراء﴾ ئاماژەی بۆ دەکات[1].

بێگومان هاوەڵ بۆ خوادانەران (موشریکەکان) لەگەڵ جوولەکەکاندا ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەی، کەوا پێغەمبەر ﷺ تاقی بکەنەوە، لەو تاقیکردنەوەیەشدا سێ پرسیاریان خستبووە بەردەم کەوەڵامیان بداتەوە. سوورەتی (کهف)یش وەڵامی دوو پرسیاریان داوەتەوە، واتە وەڵامی ئەو دوو پرسیارەی کە دەربارەی (هاوەڵانی نێو ئەشکەوت)و (ذو القرنين) بوون، بەڵام دەربارەی پرسیاری سێهەم بۆ مەسەلەی ڕۆح ئەوە دیارە کە سوورەتی (اسراء) بەوە وەڵامی لەسەرداوەتەوە کە ئەمەش (واتە ڕۆح) لەکاروباری خودایەو، جگە لەخوداش هیچ کەسێك لە حەقیقەتو بنجو بناوانی نازانێت.

(١) الدر المنثور للسيوطي، ٣٥ : ٥٧

هەربۆیەش هیچ وەلامێــــــــك لەسەر ئەو پرسیارە لە قورئانـدا نەدراوەتـەوە ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيـلًا ﴿٨٥﴾ الإسـراء﴾، کەوا بوو سوورەتی (کهف) سـوورەتی ئـەو تاقیکردنەوەیەیـە کـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ ئـەنجامی داوە، کـە خـودا تیایـدا پێغەمبـەری خـۆی سەرخستووەو جبریلی بۆ ناردۆتە خوارەوە تـاکو بـەو وەلامانـەوە فریـای کـەوێت‌و ئەویش وەلامەکانیان بۆ بخاتەڕوو بۆیان بخوێنێتەوە.. بەم شێوەیەش پێغەمبـەر ﷺ بەسەرپەرشتی خوداو سەرخستن‌و پشتگیریی خوداوە بۆیەوە سەرکەوتووە. ئەوەی کە لە کەش‌وهەوای تاقیکردنەوەکەشەوە دەردەکەوێت ئەوەیە ئایەتەکان بـە ڕاشـکاوی گوزارشت لەوە دەکەن، کـە وەلامەکـە لەخوداوەیـەو هەرخوداشـە وەلامـەکان بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەنێرێـت تـاکو ئـەویش لـەلای خۆیـەوە بـۆ ئـەو خەلکـەی بخوێنێتەوە. خوداش دەربارەی هـاوەلانی ئەشـکەوت فەرمووویـەتی: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّۚ ..﴿١٣﴾ الکهف﴾، واتـە: (ئێمـە هـەوال‌و دەنـگ وباسـی ئـەو کۆمەلە لاوەت بەڕاستی‌و یەقینەوە بۆدەگێڕینەوە کە هیچ گومانێکی تێدانیە).

دەربـارەی (ذو القـرنین)یـش فەرموویـەتـی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلْقَرْنَيْنِۖ قُلْ سَأَتْلُواْ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ الکهـف﴾، واتـــە: (دەربـــارەی (ذو القـــرنین) پرسیارت لێ دەکەن، تۆش پێ یان بلێ هەوال‌و دەنگ‌و باسێکتان لـە بارەیـەوە بـۆ دەگێڕمەوە).

دەربارەی گیان (روح)یـش خـودا فەرموویـەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْـرِ رَبِّي قَلِيـلًا ..﴿٨٥﴾ الإسـراء﴾، واتـە: (دەربـارەی گیـان پرسـیارت لـێ‌دەکەن تۆش لەوەلامدا پێیان بلێ مەسەلەی گیـان هەرلـە فـەرمان‌و کاروبـاری خودا خۆی دایە).

## ســوورەتی ململانێی نێوان باوەڕداریێتیو ماددە پەرستی

مامۆستا (ابو الحسن ندوی) بەوردی لەم سوورەتەی ڕوانیوەو هەڵوێستەی لەسەر ئەو دەزووە وردە کردووە، کە هەموو ئایەتەکانی پێکەوە دەبە ستێتەوەو، چەقیشی خستۆتە سەر ئەو مەسەلەگشتییەی، کە چیرۆکەکانو برگـەکانیان کـۆ دەکاتـەوە.. بابزانین مامۆستای ناوبراو چۆن ئەم دەزووە وردەمان پیشان دەداتو لـەم بارەیـەوە چی دەڵێت ؟!

(من هەموو سوورەتەکەم وابینیوە کە ملکەچییەك بابەتەو دەتوانم نـاوی بنـێم: (لــە نێــوان بــاوەڕداریێتیو ماددەپەرســتیدا) یــان (لــە نێــوان ئــەوهێزەی، کــە هەڵسووڕێنەری ئەم گەردوونـە- واتـە خـودا-و، لـەنێوان سروشـت یـان هۆیـەکان دایە).. هەروەها بینیم، کە گشت ئاماژە، یان گـشت بەسـەرهاتەکان، یـان گـشت پەندو وانەکان بەچوار دەوری ئەم مانایـەدا دەسـوڕێنەوەو، لەڕێگەیـەکی ڕۆشـنەوە ئاماژەی بۆ دەکەن، یان لەکەنارێکی نادیارەوە بۆی دەڕوانن)[1].

هەروەها دەڵێت: (بێگومان سوورەتی (الکهف) چیرۆکی ململانـێی نێـوان دوو تێڕوانینو، دوو عەقیدەو، دووکەسێتییە.. ململانێی نێـوان بڕواکـردن بـە مـاددەو پاشکۆکانو، باوەڕهێنان بەنادیار(غیـب) وباوەڕهێنـان بەخودایـە، هـەروەها ئـەم سوورەتە شیکاری پاشینەی گشت تێڕوانینێکە لەبیروباوەڕو، لـەکارو خووڕەوشـتو سەرەنجامو شوێنەوارەکان)[2].

مامۆستا (ندوی) لەکتێبەکەیدا (تأملات في سورة الکهـف) بایـەخی زۆری بـەم حەقیقەتە داوەو بەم ڕوانگەیەش هەر چوار چیرۆکەکەی (هاوەڵانی نێو ئەشکەوت)و

(١) تأملات في سورة الكهف- الصراع بين الايمان والمادية- للندوي: ص(١٠).
(٢) هەمان سەرچاوە: ص —٢٣.

(کابرای خاوەن دوو باخەکە)و (موساو عەبدە ساڵحەکە)و (ذو القرنین)ی خستۆتە ڕوو، پاشان ئەو دەزووە وردەشی پیشان داوین، کە پێکیانەوە دەبەستێتو، ئەو بابەتە گشتی یەشی بۆدیاریی کردووین، کە هەرچوار چیرۆکەکەی یەك خستووە، ئینجا ڕەنگدانەوەی ململانێی (نێوان باوەڕداریتیو ماددەپەرستی)ی بۆ ڕوون کردووینەوە، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ململانێی نێوان (تێڕوانینی ماددەپەرستیانەی بڕواکار بە هۆیە ماددییە سرووشتییەکان)و، (تێڕوانینی ئیمان دارانەی باوەڕهێن بە حەقیقەتە خودایی یە نادیارەکان)و، سەرکەوتنی ئەم تێڕوانینە ئیماندارانەیە لە هەموو وێستگەو دیمەنەکانی سوورەتەکەدا.

## کرۆك و کلیلی سوورەتەکە

مامۆستا (ندوی) دوای هەڵوێستەکردنی لەسەر ئەو دەزووە وردەی سوورەتەکەو، لەسەر دیاریکردنی مەسەلەو بابەتە گشتییەکەی، لەئایەتەکانیشی کۆڵیوەتەوە، تاکو ئایەتێکی کۆکەرەوەی هەموویان بدۆزێتەوە، کە وەك گیانێکی سەرتاسەریی بەنێو هەر ئایەتێکدا گوزەر دەکات، ئینجا ئایەتەکەشی دۆزیوەتەوە، کە لە نێوبەسەرهاتی (کابرایی خاوەن دووباخەکە) داو لەو بڕگەیەدایە، کە گفتوگۆیەکە لەنێوان ئەم کابرایەو هاوڕێ ئیماندارەکەی دا، ئایەتەکەش لەسەر زاری ئەوهاوڕێ ئیماندارەیەوە هاتووە، کە پێی گوتووە: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ... ﴿٣٩﴾ الكهف ﴾، واتە (ئەرێ بۆچی تۆ کاتێك دەچیە نێو باخو بێستانەکەتەوەو پێی دڵشادو سەرسام دەبیت، ناڵێیت: ماشاءالله، لاقوة الا بالله (ئای خودا چی بۆ فەراهەم هێناوم، بە ڕاستی هیچ هێزوتوانایەکی خۆمی تێدا نیە تەنها لەخوداوە نەبێت).

بێگومان هه‌ر ته‌نها ئه‌م کلیله‌ش (واته‌ (ماشاءالله)و خواستو فه‌رهه‌م هێنانی خودایی) به‌جێ هێنراوه‌و له‌ کایه‌دایه‌و هه‌ر شتێك خودا خۆی خواستی لێ بێت هه‌رده‌بێت ببێت، هه‌رشتێکیش خودا خۆی خواستی لێ نه‌بێت هه‌رگیز ناشێت ببێت، که‌وابوو ئه‌وه‌ی خودا خواستی لێ بێت (ماشاءالله) بووه‌، ئه‌وه‌ی خواستیشی لێ نه‌بێت, نه‌بووه‌.

هه‌روه‌ها هیچ هێزێکیش جگه‌ له‌هێزی خودا له‌ئارادا نیه‌و، هه‌ر هێزێکی دنیاش له‌ خودا دوور که‌وێته‌وه‌و به‌ربه‌ره‌کانێی بکات یان له‌ڕێبازی دادی خودا لابدات، ئه‌وه‌ هێزێکی فه‌وتاوو له‌نێو چووه‌، هه‌مدیسان هه‌رهێزێکیش کۆمه‌ك له‌ خودا داوا نه‌کات ئه‌وه‌ لاوازو تێکچووه‌، بۆیه‌ ته‌نیا هێزێك، که‌ به‌سوودو خێردار بێت، ئه‌و هێزه‌یه‌که‌ کۆمه‌ك ویارمه‌تی له‌هێزی خوداوه‌ داوا ده‌کات‌و، به‌هێزی خوداوه‌ په‌یوه‌سته‌و هه‌ر رووی له‌قاپی خودایه‌. ده‌سته‌واژه‌ی هه‌ر خواستی خودایه‌و هیچ هێزێك نیه‌ ته‌نها له‌خوداوه‌ نه‌بێت ﴿مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ ده‌بینین گیان وگوڕو تینی ئه‌م ده‌سته‌واژه‌یه‌ له‌ گشت ئایه‌ته‌کانی سووره‌ته‌که‌و له‌ گشت بڕگه‌کانیشیدا ده‌گه‌ڕێت، ده‌بینین ماناکه‌ی له‌ گشت ئایه‌تێکدایه‌، له‌ئایه‌ته‌کانی چیرۆکی (هاوه‌ڵانی ئه‌شکه‌وت)و چیرۆکی (خاوه‌نی هه‌ردوو باخه‌که‌)و چیرۆکی (مووسا له‌گه‌ڵ عه‌بده‌ پیاو چاکه‌که‌)و چیرۆکی (ذو القرنين)دا به‌دی ده‌کرێت)[1].

## پێناسه‌ی مامۆستا سید قطب بۆ سووره‌ته‌که‌

مامۆستای پێشه‌وا (سید قطب) هه‌ڵوێسته‌یه‌کی نایابی له‌سه‌ره‌تای ته‌فسیرکردنی سووره‌تی (کهف)ه‌وه‌ پیشان داوه‌، که‌ تێیدا سووره‌ته‌که‌ی ناساندووه‌و ئه‌وبابه‌ته‌ بنچینه‌ییه‌شی دیاری کردووه‌، که‌ بابه‌ته‌ فه‌رعییه‌کانی پێکه‌وه‌ ده‌به‌ستێته‌وه‌و، که‌ له‌ گشت ئایه‌ت‌و بڕگه‌کانیاندا ره‌نگ ده‌ده‌نه‌وه‌.

---

(١) الصراع الايمان والمادية من ٠٧٤.

لێرەدا پوختەی ئەو پێناسەیەی مامۆستا (سید قطب) دەخەینەڕوو بەو پێودانگەی ببێتە سەرەتایەکی ڕا خۆشکاری بۆ لێدوانمان لەسەر چیرۆکەکانی ئەم سوورەتە. مامۆستای بەڕێزمان گوتوویەتی:

(چیرۆکەکان ئەو ڕەگەزەن، کە باڵی بەسەر کەشی سوورەتەکەدا کێشاوە بۆ نموونە لەسەرەتاکەیەوە چیرۆکی(هاوەڵانی ئەشکەوت) دێت دوای ئەمە چیرۆکی (کابرای خاوەن دووباخەکە)و پاشان ئاماژەیەك بۆ چیرۆکی (ئادەمو ئیبلیس)و، لەناوەڕاستی سوورەتەکەشدا چیرۆکی (مووسا لەگەڵ عەبدە پیاو چاکەکەدا) دێت، لەکۆتاییشدا چیرۆکی (ذوالقرنین) دێت. ئیدی ئەم چیرۆکانە زۆربەی ئایەتەکانی سوورەتەکە دەگرنەوە. چونکە لەکۆی (١١٠) ئایەت لەحەفتاو یەك ئایەتیاندا هاتووە، زۆربەی ئایەتەکانی تریش تیشك دەخەنە سەر ئەو چیرۆکانە، یاخود لەئاکامو سەرەنجامیان دەکۆڵنەوە.

لەپاڵ چیرۆکەکانیشدا، هەندێك دیمەنی قیامەت باسکراوە، لەگەڵ باسکردنی هەندێك دیمەنی ئەو ژیانەی، کە بیرۆکەیەك، یان مانایەك (لەسەر شێوازی قورئان لە گوزارشت بەوێنە گرتن) وێنا دەکات، بەڵام ئەو تەوەرە بابەتیانەیەی سوورەتەکە، کە بابەتەکانی پێکەوە دەبەستێتەوەو سەرو بەندیشی لەخولگەیدا دەسوڕێتەوە، ئەمانەیە:

١- ڕاستکردنەوەی عەقیدە.

٢- ڕاستکردنەوەی بەرنامەی فیکرو تێڕوانین.

٣- ڕاستکردنەوەی بەهاکان بەم عەقیدەیە"[1]

(١) في ظلال القرآن / سيد قطب (٤: ٢٢٥٦- ٢٢٥٧).

## ١- ڕاســتکردنەوەی عەقیدە:

سەبارەت بە ڕاستکردنەوەی عەقیدە، سەرەتای ســــوورەتەکەو کۆتاییەکەشی بڕیاری لەسەر دەدەن. لە سەرەتای سوورەتەکەوە خـودای گەورە فەرموویەتی[1]: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ الكهف﴾. لەکۆتایی سوورەتەکەشدا خودا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ الكهف﴾.

هەر لە سەروبەندی سوورەتەکەشدا، چەندان جارو لە چەندین شێوەدا ئەم مەسەلەو بابەتی عەقیدەیە دەسنیشانکراوە، بۆ نموونە: لە چیرۆکی (هـاوەڵانی ئەشـکەوت)دا ئەو لاوانەی باوەڕیـان بـەخودای پـەروەردگاریان هێنـاوە دەڵـێن: ﴿وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَـٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ الكهف﴾. فەرمایـشتی خـوداش لـە بەدواداچـوونی ئـەم وتەیەی لاوەکانو کاروباریاندا هاتووە، کە فەرموویـە: ﴿...مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ الكهف﴾. لـە چـیرۆکی کـابرای خـاوەن دوو

(١) لەم (بەرایی)یەدا تەفسیری ئایەتەکانم نەهێناوەو واتا کوردییەکەم نەنووسیوە، چونکە بەیارمـەتی خودا لە یەکەمین چیرۆکی ئەم بەرگەوە چەند جارێك واتاو تەفسیری ئایەتەکانی دیاری کراون. وەرگێڕ

باخەکەدا، پیاوە باوەڕدارەکەش لەدواندنی کابرادا دەڵێت: ﴿...أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ الكهف﴾. لە بەدواچوونو تیشك خستنەسەر ئەو گفتوگۆیەشدا فەرمایشتی خودا هاتووە، کە فەرموویەتی: ﴿ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ الكهف﴾. لە دیمەنێك لە دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەتیشدا خودا فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ الكهف﴾ لە تیشك خستنە سەر دیمەنێکی تریشدا، خودا فەرموویەتی: ﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ الكهف﴾.

## ٢- ڕاستکرنەوەی بەرنامەی فیکرو تێڕوانین:

ڕاستکردنەوەی مەنهەجی فیکرو تێڕوانین بە ڕوونی، لە بە ناشیرین دانانی بانگەشەی موشریکاندا ڕەنگدەداتەوە، کاتێك لەسەر مەسەلەیەك دەدوێن زانیارییان لەبارەیەوە نیەو، هیچ بەڵگەیەکیش لەسەر وتەکانیان دیاری ناکەن. هەروەها ڕاستکردنەوەی ئەم مەنهەجە لەوەشدا دەردەکەوێت، کە مرۆڤ ئاڕاستە دەکات بۆ ئەوەی حوکم بەپێی زانیاری خۆی بداتو لەوە تێپەڕ نەبێت، هەر مەسەلەیەکیش زانستو زانیاریی لەبارەیەوە نەبوو، با بۆ فەرمانی خودای بگەڕێنێتەوە. بۆیەش لە سەرەتای سوورەتەکەدا خودا فەرموویەتی: ﴿ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِءَابَآئِهِمْ ﴿٥﴾ الكهف﴾

لاوەکانیش (واته هاوەڵانی نێو ئەشکەوت) دەڵـێن: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ ﴿١٥﴾ الكهف ﴾.

کاتێك دەربارەی ماوەی مانەوەیان له ئەشکەوتەکەدا له یـەکتر دەپرسـن، ئـەو زانیاری یه تەنها بۆ خودا دەگێڕنـەوە، وەك دەڵـێن: ﴿ ...قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ ... ﴿١٩﴾ الكهف ﴾ لەدوو تـوێی چیرۆکەکەشـەوە بەرپەرچی ئەوانه دەدرێتەوە، که بەبێ بەڵگه دەربارەی ژمارەی لاوەکـان دەدوێـنو دەڵێن، که گوایه ئەوەنده کەسه بوون:-

﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٢٢﴾ الكهف ﴾.

له چیرۆکی مووساش لەگەڵ عەبده پیاو چاکەکەدا، کاتێك دەربارەی رازو نهێنی چەند هەڵسو کەوتێکی پرسیاری لـێدەکات، که پێی ناخۆش بوون، فەرموویـــە: ﴿ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ﴿٨٢﴾ الكهف ﴾ لەمەشدا مەسەلەکه بـۆ لای خودا دەگێڕێتەوە.

ڕاستکردنەوەی بەهاکان بـەپێوەری عەقیـده لەچـەندین شـوێنی هەمـە جـۆری سوورەتەکەدا هاتووەو، بەها ڕاستەقینەکان بۆ ئیمان وکاری چاك گێڕاوەتـەوە، بـەم پێیه بەها زەمینیه دنیایی‌یەکانیش، که چاوان سەرسام دەکات، بچووك دەکاتەوە- چـــونکه هەرشـــتێکی جـــوانو سەرســـوڕهێن بـــۆ هەڵـــسەنگاندنی مـــرۆڤ و تاقیکردنەوەیەتی.. بەڵام کۆتایی هەموو شته جوانو سەرنج ڕاکێـشەکان لـەدنیادا هەر نەمانو فەوتانـە:﴿ إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا ﴿٨﴾ الكهف ﴾.

پەناگەی پارێزگاریی خوداش فراوانترەو، ئەگەر مرۆڤ لەناچاریدا پەنا بباتە نێو ئەشکەوتێکی رەقو تەقو تەنگە بەر ئەوا زۆرباشترە بۆی.. لاوەکانی هاوەڵانی ئەشکەوتیش کە باوەڕیان هێناوە دوای خۆ دابڕانیان لە گەلەکەیان گوتوویانە:

﴿وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ الكهف﴾.

هەروەها ڕووی گوتار (خطاب)یش ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ کراوە، تاکو بێباکیش بێت لەئاست دیاردە فریودەرو جوانکراوەکانی دنیاو هاونشینی گەورە پیاوانو دەسەڵاتداران، کە لەخودا بێئاگان ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴿٢٩﴾ الكهف﴾.

لەچیرۆکی هەردووباخەکەشدا ئەوە پیشان دەدات، کە چۆن مرۆڤی باوەڕدار لە بەرامبەر ماڵو سامانو پلەوپایەو دنیای ئاڵو واڵادا شانازی بەباوەڕەکەیەوە دەکاتو، بە (حەق)یش ڕووبەڕووی کەسێکی خاوەن سامانی پێ دەبێتەوە، کە تەواو لەخۆی گۆڕاوەو فووی کردۆتە خۆیو، ئەمیش (واتە باوەڕدارەکە) بەتوندی گلەیی لێ دەکات لەسەر ئەوەی، کەوا خودای لەبیرچۆتەوەو بەسامانو شتومەکی دنیاوە دەنازێت، وەك خودا فەرموویە: ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا

حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ الكهف ﴾.

لەدوای ئەم چیرۆکەشەوە نموونەیەك لەسەر (ژیانی دنیاو خێرایی لەنێو چوونی دوای گەشەکردنی) دەهێنێتەوەو، دەفەرمووێت ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ الكهف ﴾، ئینجا وایشی لێك دەداتەوەکە بەهاو بیروباوەڕە پووچەڵو لەناوچووەکان لەبەهاوبیرو باوەڕە جوانو پیرۆزو بەردەوامەکان جیادەکاتەوە: ﴿ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ الكهف ﴾.

(ذو القرنين)یش له بەسەر هاتەکەیدا بەو ڕەنگە باس ناکرێت، کە پادشایەك بووە، بەڵکو له بەرکارە چاکەکانی باس دەکرێت. بۆنموونە، کاتێك ئەو گەلەی کەوا دانیشتوانی ناوچەی نێوان دووچیاکە بوون، داوای لێ دەکەن بەنداوێکی وایان بۆ دروست کات، کەبیان پارێزێت له (یەئجووجو مەئجووج) و، ئەمانیش لەهەمبەر کارەکەیدا سامانێکی پێ بدەن، بەڵام ئەو یەکسەر ئەو سامانەیان ڕەتدەکاتەوە، چونکە ئەوهێزو توانایەی، کە خودا لەدروستکردنی ئەو بەربەستو هۆیە پارێزگارییانەدا پێی داوە، له ماڵو سامانی ئەوان باشترە بۆی، وەك خوداش فەرموویەتی: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ ﴿٩٥﴾ الكهف ﴾، کاتێك بەنداوەکەش تەواو دەکات، هۆکارو فەزڵی ئەم کارە هەر بۆخودا دەگێڕێتەوە، نەك بۆهێزە مرۆییەکەی خۆی: ﴿ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴿٩٨﴾ الكهف ﴾.

لەکۆتایی سوورەتەکەشەدا خودا بڕیار لەسەر ئەو ڕێسایە دەدات، کە ئەوانەی لە کارو کردەوەکانیاندا دۆڕاوترینو زەرەرمەندترین کەسن ئەوانەن، کە باوەڕیان بە (بەڵگەو نیشانە ڕۆشنەکانی خودا)و بە (گەڕاندنەوە بۆ لای خودا) نەهێناوە، ئەم جۆرە کەسانە هیچ سەنگو بەهاو قورساییەکیان نیە سەرەڕایی ئەوەش وابزانن کارو کرداری باشیان نواندووە: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا (١٠٤) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا (١٠٥) الكهف﴾.

بەم ڕەنگەش دەبینین تەوەرەی سوورەتەکە: (ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕ)و (ڕاستکردنەوەی بەرنامەی فیکرو تێڕوانین )و (ڕاستکردنەوەی بەهاکان بەتەرازووی عەقیدە)[1]یە جا ئیدی ئەمە سووڕەتی (کهف)ەو، ئەمە بابەتەکەیەتیو، ئەمەش تایبەتمەندێتی یەکەیو، ئەوەش دەزووە وردەکەیو، ئەوەش کلیلو، ئەوەش گیانو کرۆکیەتی.. پاشەکەوتبوونی ئەمانەش لەهەر چوار چیرۆکەکەیدا (هاوەڵانی ئەشکەوت، خاوەنی هەردوو باخەکە، مووسا لەگەڵ (خضر و ذو القرنین) بەدی دەکەین.. دەفەرموون ئەوە چیرۆکەکان با هەڵوێستە لە ئاستیاندا بکەینو چەند ساتێك لەسایەیدا بژینو، هەندێك لە پەندو وانەکانی وەربگرین.

(١) سید قطب ـ في ظلال القران (٤: ٢٢٥٧-٢٢٥٩).

# چیرۆکی یەکەم

## چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە

چیرۆکەکە لە قورئاندا بەم جۆرە هاتووە، کە خودا لەبارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ
أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا
﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ
أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ
ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا
رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ
قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟
إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ وَتَرَى
ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ
ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن
يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ۚ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ
ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ

مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ
قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا
لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَىٰ طَعَامًا
فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن
يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾
وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَا إِذْ
يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَانًا رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ
غَلَبُوا عَلَىٰ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ
وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ
كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا وَلَا
تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾
إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ
هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ
أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن
دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ الكهف﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ.. ئایا واتێ دەگەیت کە هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەو، ئەو تابلۆ بەردینەی[1]، کە بەسەرهاتی ئەوانی لەسەر نووسراوەتەوەو خراوەتە

(١) تابلۆ بەردینە کە (الرقیم) کە لێرەدا بۆمانای وشەکە (الرقیم)هێناومە، لە هەمان کاتدا زانایانی تەفسیر لەسەر وشەی (الرقیم) گوتوویانە ( ئەو دۆڵەیەکە ئەشکەوتەکەی تیایدا بووە) گوتراویشە ئەو

بەردەرگای ئەشکەوتەکە، بەڵگەیەکی جێی سەرسوڕمان بێتو کە لە شتە گرنگو سەرسوڕهێنەکانی تری نێو ئاسمانەکانو زەویدا هەیە،کە خودا ئەو هەموو مەخلووقات وشتە جۆربەجۆرانەی نێوان ئاسمانەکانو زەویشی تیادا دروست کردووە، بەتواناشە لەوەدا، کە چەند کەسێك لەخەڵکی بۆماوەی پتر لەسێ سەد ساڵ لەشوێنێك دابپارێزێت. ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بۆ ئەوکەسانە باس بکە، کە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی چەند لاوێك کاتێك چوونەتە نێو ئەشکەوتێکەوەو پەنایان بۆ بردووەو لەدەست پادشایەکی ستەمکارو بێ باوەڕ هەڵاتوون وگوتوویانە: (خودایە، ئەی پەروەردگاری ئێمە لەلایەن خۆتەوە سۆزو رەحمەتێکمان پێ ببەخشە، کە ویستەمەنیەکانی لێخۆشبوونو ئاسودەیی‌و رزق‌و رۆزیی تێدا بێت، هەرلە لایەن خۆشتەوە رێنمایی یەکی وەهامان بۆ دابین و ئاسان بکەیت کە ڕەزامەندیی تۆی تێدا بەدی بکەینو لەدەست بێ باوەڕبوون دەربازبین) دوای ئەم نزایەیان ئێمەش پەردەیەکی وەهامان بەسەر گوێیانداداو خەومان لێ خستن وماوەی خەولێخستنیان لەو ئەشکەوتەدا چەندین ساڵی دیاری کراوو بڕێردراوبووە. دوای ئەو ساڵانەش لەخەو هەڵمان ساندوون و بەخەبەرمان هێناونەتەوە تاکو زانیاریی لەپێشترمان پەیوەست بێت بەڕاستی وتەی یەکێك لەو دووتاقمەی، کە وتەکەی لەوی دی راستترە لەسەر ژماردنی ماوەی مانەوەی لاوەکان لە ئەشکەوتەکەدا.. ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە هەواڵو بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بەو ڕاستی‌و یەقینەوە بۆ دەگێڕینەوە، کە هیچ گومانێکی تێدا نیە.. بەڕاستی ئەوان چەند گەنجێك بوون، کە باوەڕیان بەخودای پەروەردگاریان هێنابووو ئێمەش رێنمایی‌و بەرچاو روونیەکی

---

تابلۆیەیە کە هەندێك کەس لە میللەتی ئەو سەردەمە ناوی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەو بەسەرهاتو چیرۆکیانی لەسەر نووسیوەتەوە گوتراویشە (رقیم) لەسەر کێشی (فعیل) لە وشەی ژمارە(رقم)ەوە هاتووە، کە ریشەی (مرقوم)ە، وەك (جریحو مجروح)، هەروەها گوتراویشە (رقیم) شوێنی نزیك (تیلە)یە لە خوارووی (فەلەستین).

زێدەترمان پێ بەخشیبوون تا بەهۆیەوە بتوانن ئارام لەسەر بەجێهێشتنی خاکی گەلەکەیان بگرنو بە ئاینەکەیانەوە هەلبێن. هەروەها سروشتی خۆڕاگریو دانبەخۆداگرتنمان پێ گەیاندبوون ودلیانمان بەجورئەتو بوێری لەسەر دیاریکردنی حەق قایمکردبوو، کە توانیان بەهۆیەوە مانەوەو ژیانی نێو ئەشکەوت هەلبژێرن، ئەوانیش لەو حالەتە دڵ قایمی وباوەڕداریتییە بەهێزەیاندا گوتیان (پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی یەو جگە لەخودا هیچ پەرستراوێکی دی داوا ناکەینو نایکەینە خودای خۆمان، گەر وانەبین ئەوە بێگومان وتەیەکی هێجگار ناڕاستو پڕ لە درۆو دەلەسەمان درکاندووەو تەنەنەت لەسنووری ئەوپەڕی درۆشدایە) جاکاتێك ئەم لاوانە لەشار دەردەچن، دەلێن : (ئا ئەوە گەلە بێ باوەڕەکەمانە کەلەجیاتی خودا چەند بتێك دەپەرستنو کردوویانن بە پەرستراوانی خۆیان، ئەی بۆچی بەلگەیان لەسەر شیاوی پەرستنیان نیەو بۆچی بەلگەی راستو دروستیان وبیانوو پاکانەی رۆشنو بێ پێچو پەنایان لەسەر رەفتارەکەیان نیە ئیدی کێ ستەمکارترە لەوکەسەی، کە درۆودەلەسەی خستۆتە پاڵ خودا بەهۆی ئەوەی هاوەلی بۆ دادەنێت ) (جا مادام ئێوە خۆتان لەم گەلە بێ باوەڕەو لەپەرستراوەکانیان دادەبڕنو مل بەهەڕەشەی پادشای ستەمکار نادەنو تەنها خودا دەپەرستن، ئەوا پەنا بەرنە بەر ئەشکەوتی چیایەك، کە ناوی (ئەنجلۆس) بووە، تاکو خودا سۆزو بەزەیی بەرفراوانی خۆی بۆ سازو دابین بکات).

جاکاتێك ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ، یاخود هەرکەسێکی دی بیدیایە ئەو لاوانە چۆن خەوتوون دەیزانی، کە چۆن لەئامێزێکی تۆکمەی پارێزگاریی خودادانو، ئەگەر خۆر لەخۆرهەلاتەوە دەرکەوتایە ئەوا بەلای راستی ئەشکەوتەکەدا لاردەبۆوە تاکو خۆر لێیان نەدات، لەکاتی خۆرئاواش خۆرەکە بەلای چەپی ئەشکەوتەکەدا لای دەداو تێدەپەڕی تاکو بەریان نەکەوێت چونکە دەرگای ئەشکەوتەکە لەڕووی باکوورەوە بووەو، بەم رەنگەش تیشکی خۆرەکە دەکەوتە سەر هەردوو لای

ئەشکەوتەکەو بەریان نەدەکەوتو، ئازاری بەجەستەیان نەدەگەیاند، ئەوانیش لەهۆڵێکی فراوانی ناوەوەی بوون.. ئەم پارێزگارییەش بۆ ئەوان، لە بەڵگە دیارەکانی تواناو قوودرەتی خودایە، هەرکەسێکیش خودا رێنمایی ئیمانی پێ بدات (وەك هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە، کە بەهۆی خواستی خۆیان لەئیمانداریێتیو رەتکردنەوەی زوڵم وکفر) خودا رێنمایی پێ گەیاندن، هەرکەسێك ئاوابێت، ئەوا خوداش رێی راستی پیشاندەداتو جێگیرو دامەزراوی دەکات. خۆ هەرکەسێکیش بەهۆی سەرکێشیو بەدکارییی خۆیەوە خودا گومرای بکات، ئەوا سەرخەرو رێ پیشاندەرێکی نابێت.

تۆ کاتێك لاوە خەوتووەکانت دەبینی، واتدەزانی بێدارو بەخەبەرن، ئەمەش بەهۆی ئەوەی چاوەکانیان کرابوونەوەو بەزۆریش هەڵدەگێرانەوە، ئەوە بوو ئێمە لەکاتی ئەو خەوتنەیاندا بەملاولایاندا هەڵماندەگێڕانەوەو دەمانخستنە سەر لای راستو سەر لای چەپیان. (ابن عباس) گوتوویە: (ئەگەر ئەوان بەملاولادا نەخرانایەو راستو چەپیان پێ نەکرایە، ئەوا زەوی لاشەیانی دەخوارد)[1]. سەگەکەشیان هەردوو قوڵی لەسەر زەویی حەوشەی ئەشکەوتەکە درێژکردبوو، وەك ئەوان خۆی هەڵدەگێڕایەوەو باری لاشەی خۆی دەگۆڕییو وهەردووچاویشی کراوە بوون. خۆ ئەگەر تۆ بۆیانت بڕوانیایە، ئەوا لەترسان راتدەکردو لەودیمەنەیان زۆر دەترسایتو ترسو بیمێکی زۆر دڵیدادەگرتیت، چونکە خودا سامو هەیبەتێکی وەهای پێ بەخشیبوون، تاکو هیچ کەسێك نەتوانێت بەلایان دابچێت. خوداش وەها پاراستنی، کە هیچ کەسێك غیرەتی لێ نزیك بوونەوەیانی نەبوو. پاشان دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر خەواندنمان، لەو خەوە هەڵمان ساندنەوەو ئەوانیش تەماشای یەکتریان دەکردو دەربارەی حاڵی خۆیانو ماوەی مانەوەی نێو ئەشکەوتەکەیان پرسیاریان لەیەکتر دەکرد، ئەوە بوو یەکێك لەخۆیان گوتی: (ئەرێ ئێوە چەندێك

---

(١) بڕوانە (مختصر تفسیر الطبري) لابي يحيى بن صمادح التجيبي. (وەرگێڕ)

لەم ئەشکەوتەدا خەوتوون)؟! هەندێکیان گوتیان : (ڕۆژێك یان هەندێك لەرۆژێك تێیداماوینەتەوە) هەندێکی تریشیان گوتیان (خودای پەروەردگارتان خۆی دەزانێت چەندە ماونەتەوە. ئێستاش برسیمان بووەو یەکێکتان بنێرن با بەم دەرهەمانەی، کە پێمانە بچێت بۆبازارو پاکترین خۆراکمان بۆ بکڕێتو کە چوو بۆ ناو خەڵکەکەش با بەهێمنیو نەرمونیانی سەودا لەگەڵیاندا بکاتو بەهێمنی بەڕێگادا بڕوات تاکو هیچ کەسێك هەستی پێ نەکات، کە کێیەو لەکوێوە هاتووە!!

چونکە ئەگەر کافران شوێنەکەتان پێ بزاننو بیدۆزنەوە زەفەرتان پێ دەبەنو بەردبارانتان دەکەنو دەتانکوژن، یان ناچارتان دەکەنەوە بۆ ئەوەی پەیڕەویی دینە نابەجێکەی خۆیان بکەنو گەر واش بکەن ئەوا هەرگیز بەسەرفرازیو ڕەزامەندیی خودا ناگەنو هەرگیز بەهەشتی خوداو ژیانی هەمیشەیی نێو بەهەشتتان دەسگیر نابێت). ئێمە بەم ڕەنگە (وەك چۆن بەخەبەرمان هێنان) کۆمەڵەکەی ترمان لە خەڵکی لەوە ئاگادارکردەوە کەوا ئەوانەی گومانیان لەسەر زیندووکردنەوەی مردووان هەیە بابزانن، کە بەڵێنی خودا ڕاستو وەهەقەو هەر بەدی دێت وەهەر زیندوو دەکرێنەوەو قیامەتیش کاتی خۆی دێت وگومانی تێدا نیە، جا ئەو کەسانەی لەشارەکەدا بوون ناکۆکیو مشتومڕی بیروڕایان لەنێواندا پەیدا ببوو، هەندێکیان گومانی تێدا هەبووو بەدووری دەگرت، هەندێکی تریشیان وای بۆ دەچوون گوایە تەنها ڕۆحەکان زیندوو دەکرێنەوەو لاشەکان لەخاکدا دەڕزێن.. هەندێکیان دەربارەی لاوەکان، کە لەدواییدا لە ئەشکەوتەکەدا مردن) گوتیان: (ساختمانێك لەسەرگۆڕەکانیان دروست بکەن، خودا خۆی زانایە لەکاروباریاندا، هەندێکی تریشیان، کە حاکمان بوونو دەسەڵاتیان لەکاروباری لاوەکانو ناوچەکەدا هەبوو گوتیان: (بڕیار دەدەین، کە مزگەوتێك لەسەر گۆڕەکانیان دروست بکەین تاکو بەندایەتی بۆ خودا تێدا بکرێت.

جائەی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی تۆشدا کەسانێك هەنو دەربارەی ژمارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە پرسیاری هەمە جۆر دەکەنو لەخۆیانەوە ژمارەیان بۆ دادەنێن هەندێکیان دەڵێن (لاوەکان پێنج کەس بوون شەشەمیان سەگەکەیان بووە) ئەم وتانەشیان هەر لەگومان بردنەوەیە ولەخۆیانەوە باس لە نادیار دەکەن. هەندێکی تریشیان دەڵێن:حەوت کەس بوونو هەشتەمیان سەگەکەیان بووە. جاتۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ مشتومڕ لەگەڵیاندا لەسەر مەسەلەو کاروباری لاوەکان مەکە تەنها بەوەندە نەبێت، کە بۆمان گێڕایتەوە، هەروەها پرسیار لەم بارەیەوە لە هیچ کەسێ: لەوانە مەکە، کە دەربارەی ژمارەیان مشتومڕ دەکەن. ئەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانیشت پێ دەکەین، کە دەربارەی هیچ کارێك، کە سبەینێ دەیکەیت مەڵێ (سبەینێ ئەو کارە دەکەم) بەڵکو ئەو ڕستەیەت بلکێنە بە (ان شاء الله)وەو بڵێ (ئەگەرخوا خواستو ئیرادەی لەسەربوو سبەینێ ئەو کارەتان بۆ دەکەم) هەرکاتێکیش لەبیرت چوو، کە بڵێیت (ان شاء الله)و پاشان لەدواییدا بیرت کەوتەوە ئەوا بیلێرەوەو بڵێ ﴿وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ الكهف﴾، واتە (بڵێ تکاکارم خودا ڕێنماییم بکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو پێویستییەو بۆ پێکانی ئەو ڕاستییەی، کە بەڵێنم پێدابوون لەسەر گەیاندنیی بە ئێوەو پێم ڕاگەیاندن کە (انشاءالله — بەخواستی خودا ) ئەو کارە دەکەم.

لاوەکان ماوەی سێ سەدو نۆ ساڵ بەزیندوویی‌و بەخەوتوویی لە ئەشکەوتەکەیاندا مانەوە (هەندێك لە زانایان گوتوویانە، کە سێ سەد ساڵی هەتاوی (شمس) بەرامبەر بە سێ سەدو نۆ ساڵی مانگی (قمری) ماونەتەوە. تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ (خودا خۆی دەزانێت ماوەی چەندە ماونەتەوەو زاناترە لەوکەسانەی، کە ڕێی جۆراو جۆریان لەسەر ماوەی مانەوەیان دەربڕیوەو، خوداش پێشتر ئەو ماوەیەی دیاری کردووە، چونکە پەیوەستە بەخۆیەوەو دەزانێت لە بارودۆخی خەڵکی ئاسمانەکانو زەویدا چی دیارەو چی نادیارە ئای بەڕاستی خودا

چەند بیناو بیسەرە، هیچ شتێك لە چوارچێوەی بینایی‌و بیستنی خوادا دەرناچێت. خەڵکیی سەر زەویش‌و مەخلووقاتی ئاسمانەکانیش هیچ خاوەن‌و سەرپەرشتیارێکیان جگە لە خودا نیەو هیچ کەسێکیش بەشداریی حوکم‌و بڕیارەکانی خودا نیە).

تا ئێرە تەفسیرێکی ئایەتەکانی (٩-٢٦) بوو، کە ئەم چیرۆکە دەگێڕنەوە.

## کورتـەی چیـرۆکەکـە لە ڕێی گێڕانەوەی قورئانـەوە

ئێمـە لـەڕێی گێڕانـەوە قورئانیەکـەوە لـە چـیرۆکی هـاوەڵانی ئەشـکەوت دەکۆڵینەوەو، بەهیچ شێوەیەك ڕوو ناکەینە دەقە ئیسرائیلییەکان چ لـە ڕیوایـەت‌و وتـەو بەسەرهاتەکانیـشیان بێـت، کـە چـەند مێـژوونووس‌و راڤـەکارێکیش هێناویانەتەوە.. چونکە ئەمە ئەو مەنهەجە دروستەیە لە مامەڵە لەگـەڵ چـیرۆکی پێشینەکاندا، وەك چۆن قورئان خستویەتیە بەرچاومان‌و کە خۆشمان ئاوا پێی قایـل بووین.

هاوەڵانی ئەشکەوتەکە کۆمەڵە لاوێکی باوەڕهێن بـەخودا بـوون ئـەم کۆمەڵـە لاوەش ژمارەیان (وەك لەقورئاندا ئاماژەی پێ کراوە) حەوت کـەس بـووە.. دیـارە هیچ زانیارییەکیشمان لەسەر ناوەکانیان‌و کارەکانیان‌و ئەوشارەی تێیدا بوون‌و، ئەو پادشایەی لەسەردەمیدا ژیاون‌و، ئەو ئاینەی پەیڕەوییان کردووەو، ئەوئەشـکەوتەی پەنایان بۆ بردووە، نیە. ئـەم لاوە باوەڕدارانـە هەڵوێـستەیەکیان بـۆ لێکۆڵینـەوەو تێڕوانین تەرخان کردووەو، ئەنجامێکی بنەبڕ (قاطع)یان لێوە دەرهاویشتووە، ئەوەیە کە بێگومان خودا هەر تەنها خۆی پەروەردگاری جیهانییانەو، ئەوانیش تەنها باوەڕ بەخودا دەهێنن‌و جگە لەخودا هیچ شتێکی تر ناپەرستن.

بێگومـان زانیویـشیانە کـە گەلەکـەیان بێبـاوەڕن، چـونکە غـەیری خودایـان پەرستووە ئـەم کفـرو بێبـاوەڕی یەشـیان سـتەم‌و درۆو هۆنینـەوەی بوختـانی بـۆ بەدیهێناون، جا کێ سـتەمکارترە لـەو کەسـەی، کـە درۆودەلەسـە لەسـەر خـودا

دەهۆنێتەوە؟ هەڵوێستی ئەم لاوە باوەڕدارانەش بیرکردنەوە بوو لەڕێگە چارەیەك بۆ ئەو قۆناغە، ڕێگە چارەکەشیان لە خۆدابڕاندا بینیەوە بۆیە بڕیاریانـدا، خۆیـان لـە گەلەکەیان دابڕن، چونکە خۆیان باوەڕدارنو گەلەکەشیان کافرن، لەبەر ئـەوە هـیچ بوارێك بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵیانـدا نـەماوە ئـەوە بـوو لەشـارەوە بـەرەو چیاکان دەرچوونو بڕیارياندا پەنا بەرنەبەر ئەشکەوتێك لە چیایەك دا...

داواشـیان لـە خـودا کـرد، کـە ڕەحمـی بـەرفراوانی خـۆی لـە ئەشـکەوتەکەدا پێبگەیەنێت. خوداش بەدەم داواکەیانەوە هاتو نزای گیرا کردنو ڕەحمەتی خۆی لە ئەشکەوتەکەدا بۆ ناردن، ئەوەبوو خودا کارەکەی بۆ ئاسان کردن وهـەموو بەڵگـەو نیشانەیەکیشی بـۆ بەیدەسـت کـردنو فـەرمانی بـە خـۆرکرد، کـە بەرجەسـتەیان نەکـەوێت، تـاکو ئازاریـان نـەدات. ئـەوەبوو لـەکاتی بەیانیانـدا خـۆر لەسـەر جەستەیانەوە بەلاڕیی ڕەت دەبوو بەڵام نەدەکەوتە سەریان لەکاتی ئێوارانیش دا بەم ڕەنگە بەلاریی بەسەریاندا ڕەت دەبووو لێی نـەدەدان. ئـەوانیش لەبۆشـایی یـەکی ناوەڕاستی ئەشکەوتەدا بوون یەکێك لە بەڵگـە ڕۆشـنەکانی خـودا لەسـەریان لـەو ئەشکەوتەدا ئەوەبوو چاوەکانیان کرابوونەوە، بۆیە هەرکەسێ: سەیری بکردنایە وای دەزانی بێدارو بەخەبەرنو سەیری دەکەن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەوتووو پاڵکەوتوو بوون. جا بۆ ئەوەی زەویش لەشو لاریان نەخوات، خودا جارێك لەسەر لای ڕاسـت دایدەنانو، جارێکی تریش بەلای چەپیان دا هەڵیدەگێڕانەوە.

ئەوان سەگێکی خۆیشیان لەگـەڵ دابـوو کـە لەبـەردەم دەرگـای ئەشـکەوتەکە دانیشتبووو هەر دووقۆڵی بڵاوکردبۆوەو، وەك شێوە نووستنی ئەوان نوسـتبوو، جـا بۆ ئەوەی لەکاتی پاڵکەوتنو نووستنیاندا هیچ کەسێك دەستدرێژییان نەکاتە سەر، خودا ترسو بیمی خستبووە دڵی هەرکەسێکەوە، کە بۆیـان دەڕوانـیو ترسـەکەش بەشێوەیەك بوو، کە ئەو کەسەی بۆی بڕوانینایە خێرا ڕووی وەردەگێڕاو هەڵدەهاتو ترسێکی زۆری لێ دەنیشت.

ئەو لاوانە لە نووستنێکی درێژخایەندا بوونو سێ‌سەدو نۆ ساڵ لەو حاڵەدا مانەوە.

دوای ئەوماوەیەش خودا لە خەوەکەیان بێداری کردنەوەو، ئەوانیش پرسیاریان لەنێوخۆیاندا لە یەکتر دەکرد لەسەر ماوەی نووستنەکەیانو لە مەزەندەکردنیدا بیرورای جیاوازیان هەبوو، هەندێکیان دەیانگوت کە: (ماوەی ڕۆژێك، یان هەندێکی ماوە ڕۆژ خەوتوون )، بەڵام زۆر لەوەیان نەکۆڵییەوە، چونکە زانیارییان لەبارەیەوە نەبوو، بۆیە زانیارییەکەیان بۆ خودا گەڕاندەوەو گوتیان (خودای پەروەردگارتان زانایە لەوەی چەند ماونەتەوە)، بەڵکو بایەخیان بەکاری گرنگتر داو، یەکێ: لەخۆیان بەوە ڕاسپارد، بچێت بۆ شارەکەو ئەو پارەیەی پێیان بوو پێیانداو داوایان لێکرد خۆراکێکیان بۆ بکڕێ تابیخۆن، داواشیان لێکرد خواردەمەنیەکی خۆشو حەڵاڵو ڕێ پێدراویان بۆ بکڕێت. هەروەها ئامۆژگارییان کرد، زۆر وریاو چاپووكو ئاگادار بێت نەبادا کەسێك لەکاری بەئاگا بێتو، با کەسیش هەستی پێ نەکات، چونکە ئەوان لەگەلەکەیان دەترسانو، ئەگەر بە مەسەلەیەکەیان بزانیایەو شوێنەکەیان بۆ دەرکەوتایە ئەوا دەیانکوشتن، یان تووشی بەڵایان دەکردنو وایان لێدەکردن لە ئاینەکەیان هەڵگەڕێنەوەو بیانگێڕنەوە بۆ سەرشیرکو هاوەڵ بۆ خوا دانان.

ئەو کەسە ڕاسپێردراوەش چووە نێو شارەو تاکو خواردەمەنییان بۆ بکڕێتو، سووریش بوو لەسەر ئاگاداربوونو وریاییو خۆ حەشاردان، بەڵام خودا خواستی لەسەرکارێکی تر هەبووە، خواستی خودا وابوو ئەمان بکات بە بەڵگەو نیشانەیەك بۆ تواناو قودرەتی خۆی لەسەر زیندووکردنەوە. ئەوەبوو ڕاستی مەسەلەی ئەم لاوانەی دەرخستو بەگەلەکەیان ئاشنای کردنەوەو، بەڵام گەلی ئەو سەردەمە (واتە دوای تێپەڕبوونی ئەو سێ‌سەد ساڵە) گەلێکی باوەڕداربوونو باوەڕیان بەخودا هێنا بوو، چونکە ئەو نەوە کافرو بێ‌ئیمانەی ئەوسا نەمابوون، کە لاوەکان لەدەستیان

هــەڵاتبوونو چــووبوونە نێــو ئەشــکەوتەکە، بــەڵکو دوای بەخەبەرهاتنــەوەیان (نەوەیەکی ئیماندارو باوەڕهێن بەخودا) هاتبوونە کایــەوە جـا کاتێـك دانیـشتوانە ئیماندارەکانی ئەو شارە پیاوە ئیماندارەکە دەبینن دوای دەکەون تا ئەشـکەوتەکەو کاتێك دەگەنە ئەشکەوتەکە هەرحەوت لاوە ئیماندارەکە دەبینن، کەوا (مـردوون). ئەم جارەیان بەشێوەیەکی ئاساییو راستەقینە مردوون.

ئینجا دەربارەی ڕێوشـوێنی بـەخاك سـپاردنیان بـیروڕای جیـاوازو ناکۆکیـان لەنێواندا دروست دەبێت، پێویستە چییان لـێ بکەن؟!

لەوبارەیەوە هەندێکیان دەڵێن: (ساختمانێکیان لەسـەر دروسـت بکـەن، خـودا خــۆی زانایــە لــە کاروباریــان، بــەڵام حــاکمو کاربەدەســتەکانیان بڕیاریانــدا، مزگەوتێکیان لەسەر دروست بکەن. ئەم بڕیارەش ئەنجامدراو مزگەوتەکە لەسەریان لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکە دروستکرا. بەم ڕەنگەش لاپەڕەیەك لـە لاپـەڕەکانی بــاوەڕداریتیو دڵــسۆزیو نەویــستن لــە دنیــاداو پەنابردنــە بــەرخودا پێــچرایەوەو، بەسەرهاتی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە بـۆ هەمیـشە مایـەوەو هـەموو خـەڵکیو شوێنکەوتوانی ئایینە ئاسمانیەکان بەردەوام بەیـەکتری دەگەیـەننو، بـاوەڕدارانیش لێی ڕادەمێننو هەڵوێستەی لەبەردەمدا دەکـەن، تـاکو چـەند وانەیـەکی لـەبارەی باوەڕو دڵسۆزیو جێگیربوون لەسەر ڕێی ڕاستەوە لـێ وەرگرن.

## هـۆی هاتنــە خوارەوەی ئایەتەكـــان

(ابن هشام) لە ژیاننامە (سیره)دا ئەوەی گێڕاوەتەوە كاتێـك جـەنگی فیكریـی نێوان پێغەمبەری خودا ﷺو (قورەیش) لە (مەككـە)دا تونـدو دژوارتـر بـووەوە، قورەیشییەكان داوای كۆمەكیان لە جوولەكەكانی نێو(مەدینە)كرد، ئەوەبوو (نضری كوڕی حارث)و (عقبەی كوڕیو معیط) یان بۆ لای زانایانی جوولەكـە نـارد تـاكو پرسیاریان دەربارەی پێغەمبەر ﷺ لیٚ بكەن. ئـەوانیش هاتنــە لای جوولەكـەكانو پێیان گوتن: (ئێوە خاوەنی تەورات)نو هـاتووین هـەواڵمان دەربـارەی هاوڕێكـەی خۆمان (واتە محمد ﷺ) پیٚ بدەن).. زانایـانی جوولەكـەش پێیـان گـوتن: (لەسـیٚ رووەوە پرسیارلەو هاوڕێیەتان بكەن، ئێمەش سیٚ فەرمانتان پیٚ دەدەین، جا ئەگەر دەربارەی ئەوسیٚ فەرمانە، وەڵامو هەواڵی پێدان ئەوە دیارە پێغەمبـەرێكی رەوانـە كراوە، خۆ ئەگەر هەواڵی پیٚ نەبوو، ئـەوە پیـاوێكی قـسە هەڵبەسـتەو لەخۆیـەوە دەدوێت. جا ئێوەش بزانن بیروڕای خۆتان چۆنە:

١- دەربارەی چەند لاوێك پرسیاری لیٚ بكەن، كە لەیەكـەم سـەردەمدا رۆشـتوونو داخـۆ مەسـەلەكەیان بەچـی گەیـشتووە، چـونكە بەڕاسـتی دەنگوباسـێكی سەرسوڕهێن لەمەڕ ئەو چەند لاوەوە هەیە!!

٢- دەربارەی پیاوێكی گەڕیدە پرسیاری لیٚ بكـەن كـە لەگـەڕانو هاتوچـۆی نێـو دنیادا سەرانـسەری خۆرهـەڵاتی زەویو سەرانـسەری خۆرئـاوای بڕیـوەو داخـۆ هەواڵی چیە!!

**"دەربارەی گیـان (رۆح)یش پرسیاری لیٚ بكەن"**

ئەوانیش (واتە ئەو دوو نێـردراوە) هاتنــەوە بـۆ لای قـوڕەیش وگوتیـان (ئـەی كۆمەڵی قورەیش ئێمە هەواڵی یەكلاكەرەوەی كێشەی نێوان ئێوەو (محمد)مـان بـۆ هێناونەتەوە، كە زانایانی جوولەكە تیٚی گەیاندووینو فەرمانیان پێكردین پرسـیار

له‌ محمد ﷺ له‌سه‌ر چه‌ند شتێك بكه‌ین ئه‌وانیش هاتنه‌ لای پێغه‌مبه‌ری خوداو ﷺ گوتیان: (ئه‌ی محمد ﷺ هه‌واڵمان پێ بده‌ له‌سه‌ر چه‌ند لاوێـك، كـه‌ له‌سـه‌رده‌می یه‌كه‌مدا ژیاون‌و رووداوێكی سـه‌یرو سه‌رسـوڕهێنیان هه‌یـه‌، هه‌واڵیـشمان له‌سـه‌ر پیاوێكی گه‌ڕیده‌ پێ بده‌،كه‌ سه‌رانسه‌ری خۆرهـه‌ڵات وخۆرئـاوای زه‌ویـی گـه‌ڕاوه‌، ئینجا هه‌واڵمان له‌سه‌ر رۆح پێ بده‌ ئاخۆ چی بێت!!)

پێغه‌مبـه‌ری خـوداش ﷺ لـه‌وه‌ڵامیان فـه‌رمووی: (سـبه‌ینێ هـه‌واڵی ئـه‌و مه‌سه‌لانه‌تان پێ ده‌ده‌م كه‌ پرسیاریان له‌باره‌وه‌ ده‌كه‌ن : بـه‌ڵام پێغه‌مبـه‌ر ﷺ لـه‌و وه‌ڵامه‌یدا ئه‌گـه‌رێكی وای جیانـه‌كرده‌وه‌، كـه‌ بڵێـت (ان شـاءالله‌) (ئه‌گـه‌ر خـودا بیكات)، واته‌ (ان شاءالله‌)ی له‌گه‌ڵ وه‌ڵامه‌كه‌یدا نه‌گوت. كاتـێ: سـبه‌ینێ داهـات (جبریل) وه‌ڵامی بۆ نه‌هێناو، ئیـدی پـازده‌ شـه‌و بـه‌بێ سـرووش (وحـی) مایـه‌وه‌ خه‌ڵكی (مه‌ككه‌)ش ده‌نگوباسی خراپیان بڵاوكرده‌وه‌و گوتیان: (محمـد ﷺ بـه‌ڵێنی سبه‌ینێی پێداین‌و، كه‌چی وا ئه‌مڕۆ پـازده‌ شـه‌و تێپـه‌ڕی‌و هـه‌واڵی له‌سـه‌ر ئـه‌و مه‌سه‌لانه‌ پێ نه‌گه‌یاندین پێغه‌مبه‌ریش ﷺ به‌ دواكه‌وتنی سرووش دڵته‌نگ بوو،و گرانبوو له‌سه‌ری له‌و رووه‌وه‌ بۆ خه‌ڵكی (مه‌ككه‌) بدوێت.

دوای ئه‌و پازده‌ رۆژه‌ش (جبریل ) به‌ سووره‌تی (كهف)ه‌وه‌ هات بـۆ لای‌و تێیـدا گله‌یی یه‌كی سووكی له‌سه‌ر دڵتـه‌نگ بـوونی بۆیـان تـێ دایـه‌و، هـه‌روه‌ها وه‌ڵام‌و هه‌واڵی ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ی لاوه‌كان‌و پیاوه‌گه‌ڕۆكه‌كه‌و، گیان (رۆح) تێدایه‌[1].

زانایـانی ته‌فـسیریش وه‌ك (طـبري‌و سـیوطي‌و شـوكاني‌و ابـن كـثیر) ئـه‌م ڕیوایه‌تانه‌یان به‌شێوه‌ی (مأثور) [2] له‌ (ابن اسحاق)ه‌وه‌ هێنـاوه‌و، له‌ویـشه‌وه‌ (ابـن هشام) ڕیوایه‌ته‌كانی ژیاننامه‌ (سیرة)ی وه‌رگرتووه‌.

---

(١) الروض الانف- شرح السيرة النبوية (٣: ١٢٨-١٢٩).

(٢) -مـأثور- ئـه‌و فـه‌رمووده‌ گێڕراوه‌یه‌یـه‌ كـه‌ دواییـه‌كان (خلـف) له‌پێـشینه‌كان (سـلف)ه‌وه‌ وه‌ریانگرتووه‌. — وه‌رگێر-.

## چەند هێماو ئاماژەیەك لەم ڕووداوەوە

کاتێك لەم ڕیوایەتە ورد دەبینەوە، چەند هێماو نیگاو ئاماژەیەك دەردێنین، وەك:-

١- ئارەزووی قورەیش لەدروست کردنی گومان لەدژی پێغەمبەری خوداﷺ هەروەها لە بەکارهێنانی هەر ئامرازێك بۆ وەستان بەڕوویداو نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی بانگەوازەکەی.

٢- پشت بەستنی قورەیش بەهۆزو تیرەکانی دی لە بەرەنگاریی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئەمەش هێماو دەلالەتە لەسەر توندو تیژیو دڕندەییو سەختی ئەو جەنگەی کە دەیانگێڕا.

٣- بێگومان جوولەکەکانیش مەترسیدارترین خەڵك بوون لەسەر بانگەوازی حەق، هەروەها سەرسەخت ترین دوژمنی ئەم بانگەوازەنو زۆرترین ئارەزوویان لە ریشەکێشکردنیدا هەیە، هەر بۆیەش قورەیش پەنایان بۆ بردن لەدژایەتی کردنی پێغەمبەری خواداﷺ ئەم دوژمنایەتی یە توندەی جوولەکەش لەبەرامبەر ئیسلام و موسڵماناندا تائەمڕۆش هەیەو بەردەوامەو هەمیشەش لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ تا کاتی ئێستامانو، تا هەتاهەتایە هەردەمێنێت.

٤- بەڕاستی جوولەکەکان مامۆستایانی بەدکاریو، زانایانی ناهەقو پێشەوایانی تاوانو شێواندنو، شەیتانە مرۆییەکانن، واتە ئەوانەن کەخەڵکانی نالەباری تر پەنایان بۆ دەبەن تاکو دەرسیان لەلا بخوێننو لێیانەوە فێربنو سوود لە زانستو زانیاری یەکانیان وەربگرنو، کار بە بیروڕاکانیان بکەنو پەیڕەویی زانیاریو ئامۆژگارییەکانیان بکەن. ئەوە بوو پێشەوایانی قورەیش لەزایانانی جوولەکەوە فێری زانیاری دەبوونو لەبەرەنگار بوونەوەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرسیان لەوانەوە وەردەگرت.

هەروەها بەردەوام جوولەکەکان چاوگێك بوون بۆ کافرانو کەسانی دژی هەق‌و، تاوانبارانو تێکدەرو بەدڕەفتاران.. لەم رووەشەوە هەر خودی جوولەکەکان هەر چەندێکیان لە زانستو زانیاری هەبووبێت بۆ ئەوەی خەڵکیی پێ فێری خراپەو ناهەق‌و تاوانو بەدکاریی بکەن، تەرخانیان کردووەو درێغییان نەکردووە. بەڕاستی ئەمەش پەیامێکی پیسیی جوولەکانەیەو، پێشڕەوایەتییەکی جوولەکانەشە لەخراپەو ناهەقی‌و تاوانکارییدا.

٥- بێگومان جوولەکەکان مەبەستیان تاقیکردنەوەی پێغەمبەر بووە ﷺ لە کاتێکدا ئەوسێ پرسیارەیان بەقوڕەیشدا ئاڕاستەکردووە، پێغەمبەی خوداش ﷺ تاقیکردنەوەیەکی سەختو دژواری ئەنجام داوە، چونکە پازدە رۆژ چاوەڕوانی کردووە تا وەڵامی لەلایەن خوداوە بۆهاتووە.

٦- بێگومان پێغەمبەر ﷺ وتنی (ان شاءالله)ی لەبیرچووە لەکاتێکدا بەڵێنی بە گەلەکەی ئەداو، لەسەر ئەوەی، رۆژی دواتر (سبەینێ) وەڵامی پرسیارەکانیان پێ بگەیەنێت، دیارە خوداش وانەیەکی کاریگەری بە پێغەمبەرەکەی داوە (وەك چۆن هەمان وانەی بەئێمەش گەیاندووە) وانەکەش ئەوەیە پازدە رۆژ سرووش (وحی)ی لێ دواکەوت، سەرەڕایی ئەوەی زۆر زۆر پێویستیی پێ بوو، سەرەڕایی ئەوەش لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەختوگران بوو، پاشان سەرەڕایی ئەوەی دەبوایە وەڵامی چەند پرسیارێکی قورسی جوولەکەکان بداتەوە.

٧- بێگومان دواکەوتنی سرووش لە پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی پازدە رۆژو لەو ماوەیەشدا هەموو رۆژێك قورەیشییەکان بچنە لای‌و داوای هەواڵو وەڵامی مەسەلەکانی لێبکەنو، هەموو جارێکیش پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامیاندا بفەرموێت:- (هێشتا وەڵامەکەم بۆ نەهاتووە)، بەڵگەیەکی روونو ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە: "قورئان لەلایەن خوداوە نێردراوە، نەك لەلایەن (محمد) خۆیەوە ﷺ چونکە ئەگەر قورئان لەلایەن محمد ﷺ خۆیەوە بووایە، ئاتاجی بەو

چاوەڕوانیە نەدەبوو و، دەسبەجێ وەڵامیی دەدانەوەو دەیشیدایە پاڵ خودا (والعیاذ باللە).. بۆیە دەستەوسان بوونی لە وەڵامدانەوەدا سەرەڕایی پێویستییەکی فرەی پێیشیو، چاوەڕوانی کردنی هاتنی سرووش لە ئاسمانەوەو، خەمباربوونی بۆ دواکەوتنی سرووشو، تەنگەتاوبوونی بە قسەو دەنگو باسی موشریکان، هەموو ئەمانە هێماو دەلالەتن لەسەر ئەوەی کە (قورئان فەرمایشتی خودایە).

## چەند وشەیەکی گرانی نێو ئایەتەکان[1].

١- ٱلۡكَهۡفِ : ئەشکەوتێکە لەچیادا

٢- وَٱلرَّقِيمِ : بەردێکی تەختو رێکە کە بەژمارە ناوەکانی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەی لەسەر نووسراوەتەوەو، خراوەتە سەردەرگای ئەشکەوتەکە.

٣- فَضَرَبۡنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمۡ : وامان لێکردن بخەون.

٤- شَطَطًا : ناهەقو پووچەڵ.

٥- يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم : پەروەردگارتان سۆزو بەزەییتان بۆ دابین دەکات.

٦- مِّرۡفَقًا : ئەوەی بەکاری دێنن وەك ئامراز بۆسوود لێوەرگرتن لەگوزەرانتاندا.

٧- تَّزَٰوَرُ : لە ئەشکەوتەکە لادەداتو لێوەی لاردەبێتەوە.

٨- تَّقۡرِضُهُمۡ : لێیان لادەداتو لێیان دوور دەکەوێتەوە.

٩- وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ : لە پانتاییەکی نێوەڕاستی ئەشکەوتەکەدان.

---

(١) هەرچەند واتێدەگەم لەم دەقەی تەرجەمە کوردییەکەدا ئەم برگەیەی ماناکردنی چەندو وشەیەکی گران هێندە پێویست نەبێت، بەڵام وەك ئەمانەتێکی کارەکەو لەبەر ئەوەی نووسەر دیاری کردووە منیش تەرجەمەی ماناو راڤەکانی ئەوم کردووە. (وەرگێر).

١٠- بِٱلۡوَصِيدِۚ : پێش دەرگاکە.

١١- بِوَرِقِكُمۡ : بەو دراوە زیوەتان.

١٢- أَزۡكَىٰ طَعَامٗا : حەلاڵترین‌و خۆشترین خواردن.

١٣- يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ : پەردە لەسەر کاروبارتان هەڵدەدەنەوە.

١٤- أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ : دەرمان خستن بۆخەڵکی.

١٥- رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ : قسەیەك بەگومانەوە، بەبێ یەقین‌و زانیارییەك.

١٦- فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ : مشت ومڕ لەسەر مەسەلەکەیان مەکە.

## چەند لایەنێکی نادیار لە چیرۆکەکەدا.

لایەنە نادیارەکانی قورئان گەر قورئان خۆی روونـی نەکردبنـەوە، ئـەوا لـەرێی سەرچاوە ناڕاستەکان‌و بـێ متمانـەکان و نایەقینیەکانـەوە روون ناکرێنـەوە. هـەر بۆیەش بە چەندلایەنێکی نادیارو نـەزانراوی وا دانـراون، کـە بـەر هەسـتی مـرۆڤ ناکەون. هەروەها بۆ زانینیان تەماشای فەرموودەکانی پێغەمەر ﷺ دەکرێت، خـۆ ئەگەر فەرموودەیەکی (صحیح) لە سەریان هەبوو ئەوا پێویستە کاری پێ بکرێـت. دەنا ئەگەر لە فەرموودەشدا نەبوو ئەوا پێویستە لەسەرمان لێـی بـێ دەنـگ بـین‌و لەسەر بـارە نادیاریەکـەی بیهێڵینـەوە، چـونکە بۆمـان شـیاو نیـە لـە سەرچـاوە ئیسرائیلییەکان‌و سەرچاوەکانی ترەوە هەوڵی روونکردنەوەیان بدەین.

لە چیرۆکی هاوەڵانی نێـو ئەشکەوتیـشدا چـەند لایـەنێکی نادیـار هەیـەو لـە قورئان‌و لە فەرموودەشدا رووننەکراونەتەوە، لەو لایەنە نادیارانەش، وەك:-

١- ئەو ماوە زەمەنیەی کە خەڵکی سەردەمی ئەشکەوتەکە تیایدا ژیاون، ئایا لە پێش جوولەکەکاندا بوون، یان لە دوایان هاتوون؟ ئەی ئایا پێش سەردەمی (عیسا سلاوی لێ بێت)یان لە دوای ئەو بوون؟!

٢- ئەو ئاینەی پەیڕەوییان کردووە، ئایا ئایینی جوولەکە؟، یان ئایینی نەسرانی، یان ئاینێکی تری ئاسمانیی خوا بە یەکگرتن بووە؟

٣- ناوی ئەو پادشایەی لەماوەی حوکمڕانیدا ژیاون ئایا پادشاکەش (ڕۆمانی)یان (یۆنانی)یان (فارس)یان (جوولەکە) یاخود(عەرەب) بووە؟

٤- ناوی ئەو شارەی کەتیایدا بوون، ئایا(ئەفسووس)ی تورکی، یان (طرطوس)ی سووریا، یان (عەممان)ی ئەردەن، یان کام شار بووە؟

٥- شوێنی ئەو ئەشکەوتەی کەتیایدا حەساونەتەوە، لەئەردەن، یان سووریا، یان لە تورکیا، یان لەوڵاتێکی تر بووە.

٦- کاری ئەو لاوانە پێش ئەوەی بچنە نێو ئەشکەوتەکەوە، ئایا کوڕانی میرو پادشایان بوون، یان لە گەورە فەرمانبەرانی لای پادشا بوون، یان چەند شوانێك بوون.

٧- چۆنیەتی هیدایەتدانو ڕێنمایی کرانیان بۆ ڕێبازی خوداو باوەڕهێنانیان بەخوداو زانیارییان لەسەربیێ باوەڕیی و گومڕایی گەلەکەیان.

٨- چۆنیەتیی پێکگەیشتنی هەندێکیان بەیەکتریو دەرچوونیان لەشارەکەو، ڕۆیشتنیان بەرەو ئەشکەتەکە، ئەی ئایا گەلەکەیان پێ یان زانیبوون یان نا؟ ئەی ئایا پادشاکە گرتبوونیەوە یان پێیان نەگەیشتبوو.

٩- سەگەکەیان، ئایا لەکوێ دوایانکەوتووەو چۆن ناسیونیو، فەرمانی لەگەڵیاندا چی بووە؟!

١٠- ناوەکانی ئەو لاوانەو، ناوی سەگەکەیانو ڕەنگو بارستایی یەکەشی؟!

١١- کاتی چوونە نێو ئەشکەوتەکەو کاتی بەخەبەر هاتنەوەیان تێیدا.

١٢- ناوی ئەوکەسەی لەخۆیان بووو چوو بۆ نێو شارەکە تاکو خۆراکیان بۆ بهێنێتەوە، ئەی داخۆ ئەوبڕە پارەیەی پێی بووە چەند بووەو، ئایا لەنێو شارەکەشدا چ رووداوو مەسەلەیەکی کتوپڕی تووشبووە؟

١٣ - شیکارو درێژەی پێزانینی خەڵك بەو لاوانەو ناسینەوەیانو، چۆنیەتی گەیشتنیان پێیانو ناکۆکییان لەبیرورِادا لەسەر کاروباریانو بنیاتنانی مزگەوت لەسەریانو، ئایا رۆڵی پادشاکەش لەوەدا چی یە؟

١٤- دوای دۆزینەوەو پێزانینیان لایەن خەڵکەکەوە چییان بەسەرهاتووەو ئایا خەڵکانی دواتر پێیان گەیشتوون یان نا؟ ئەی ئایا خەڵکانی تر لە هاوڕێو یاوەر بینیویانن؟ ئەی ئایادەشێت کەسێکی دی بیانبینێت، یان نا؟

١٥- ئایا هاوەڵانی ئەشکەوت لەپاشە رۆژدا چییان بەسەر دێت؟ ئایا لەکاتی هاتنە خوارەوەی (عیسا)دا، سلاوی لێ بێت- ئەوانیش دەژینو، ئایا لەگەڵیدا دەبن یان نا؟

بۆ هەموو ئەم پرسیارانەو چەندانی تریش وەڵامێکی زانراوی راستو دروست ویەقین بەخش نیە، بەداخەوە چەندین تەفسیرکارو مێژوونووسی پێشین تێیدا رۆچوونو لەئەنجامدا برێکی زۆری کەڵەکە بوویان لەئەفسانەو دەقە ئیسرائیلییەکان هێناوەو خەڵکییان پێ سەرقاڵی ناتەبایيو خیلافات کردووەو، بەرچاویان لەئاست دەقە قورئانیەکەو، لێوردبوونەوەیو دەرهێنانی فەرمایشتە ناسکەکانیو دەرسو پەندەکانی، گرتوون.

بەراستی گەران بەدوای ئەو لایەنە نادیارانەداو هەوڵی وەڵامدانەوەی، ئەو پرسیارانەی پێشووی نێو ئەو پازدە خاڵە، هیچ زانستو سوودوکەڵکێك بەخەڵکی ناگەیەنێت، جگە لەوەی کە لەگەڵ (بەرنامەی راستی مامەڵە لەگەڵ نادیارەکانی قورئاندا) ناگونجێت.

## هەندێك لە بەڵگەو نیشانەکانی خودا لەم چیرۆکەدا

چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوت دیاردەیەکە لەدیاردەکانی قودرەتی بەکاری خوداو، خواستی بەجێ گەیەنراوی‌و، هێزی باڵا دەست‌و سەروەری‌و، دانایی‌و رەحمەت‌و رێکخستنی کاروباری دنیا.

قورئان لەکاتی باسکردنی چیرۆکەکەدا کۆمەڵێك بەڵگەو نیشانەی سەرسورهێن‌و، چەندین موعجیزەی دیارو، چەندین سەربازی نادیاری لەوانەی (خودا هەر خۆی دەیانناسێت‌و تەرخانی کردوون بۆ پاراستنی هاوەڵە ئیماندارەکانی نێو ئەشکەوت‌و، خۆشگوزەرانییان) دیاری کردووە. لەو سەربازانەی خودا دیاریی کردوون‌و لەو ئامرازانەی دەستەبەری کردوون کە بە چەند بەڵگەو نیشانەیەکی خودا دادەنرێن، ئەمانەن:

١- (ئەشکەوتەکە) لەوشوێنە گونجاوو شیاوەیدا کە ژیانی هاوەڵەکانی تێیدا هەمووی خۆش‌و ئاسان‌و ئاسوودە بووەو، بەیانیان‌و ئێوارانیش لە تیشکی خۆر پاراستوونی.

٢- ئەو سەگەی یاوەرو هاوڕێیان بووەو کاتێك چوونەتە نێو ئەشکەوتەکەوە، ئەم سەگە لە پێش دەرگاکە راوەستاوەو پاسەوانیان بووەو هەردوودەستی بەسەر زەوی حەوشەی پێش دەرگای ئەشکەوتەکەدا بڵاوکردۆتەوەو وەك شێوە نووستنی ئەوان نووستووە.

٣- ئەو خۆرەی کە سوور بووە لەسەر ئەوەی بە گەرمییەکەی خۆی ئازاریان نەدات، بۆیە خۆرەکەش وەك زیندوویەکی ژیرو هوشیارو دانا رەفتاری کردووە، بۆ نموونە کاتێك هەڵهاتووە تیشکەکەی لەوان دوورخستۆتەوەو بەلای راستدا لار بۆتەوە، لەکاتی ئاوابوونیشدا بەلای چەپدا لێیان دوورکەوتۆتەوە، ئەوانیش لە کەلێنێکی فراوان‌و پانتاییەکی نێو تیشکەکەی‌و لە نێوەڕاستی ئەشکەوتەکەدا بوون.

٤- بۆ ئەوەی لاشەکانیان بەنووستنە درێژخایەنەکەیان ماندوو شەکەت نەبێتو، پاشان بۆ ئەوەی زەوی لەلاشەیان نەخوات، خودا بەلای راستو بەلای چەپیاندا هەڵیدەگێڕانەوە، جا کاتێك بەلای راستدا هەڵدەگێڕانەوە، لای چەپیان بەرهەوا دەکەوت، لەکاتێکیشدا بەلای چەپدا هەڵدەگێڕانەوە لای راستیان دەکەوتە بەرهەواو دەحەسایەوە بەم رەنگەش لایەکانی لەشیانو سەرجەم بەشەکانی جەستەیان بەساغو سەلیمی دەمانەوە.

٥- بۆ ئەوەی کەسێکیش دەستدرێژییان نەکاتە سەر، خودا لەبەرچاوی کەسانی تر دیمەنێکی ترسناكو بەسامی پێدابوون کە بینەرانیان وا لێدەکرد رابکەنو ترسێکی زۆریان لێ بنیشێت دیارە هۆکاری لێترسانیشیان ئەوەبووە کە چاوانیان کراوەتەوەو، هەرکەسێك بۆیانی ڕوانیوە، وایزانیوە ئەمان بێدارو بەخەبەرن وبۆی دەڕوانن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا راکشاوو نووستوو بوون.

٦- بەخەبەرهێنانەوەیان لەو خەوە درێژخایەنەیان، کە سێ سەدونۆ ساڵی خایاندووە.

## " ژمارەیـــان و ماوەی مانەوەیـــان"

گەلو نەتەوە دێرینەکان هاوڕێو یەکدەنگ نەبوون لەسەر ژمارەی لاوەکان. زانایانی موسڵمانیش لەسەر ئەگەری زانینی ژمارەیان یەکدەنگ نین.. قورئانیش سێ جۆرە بیروڕای گەلانی پێشینی لەمەڕ ژمارەکەیان خستۆتەڕوو.

١- ژمارەیان سێ‌کەس بووە: ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَـٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾

٢- ژمارەیان پێنج کەس بووە: ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ﴾.

٣- ژمارەیان حەوت کەس بووە: ﴿سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾

﴿قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٢٢﴾ الكهف﴾.

هەر بۆیەش کۆمەڵێك لەزانایانی تەفسیر وای بۆچوون کە ناکرێت ژمارەیان بزانرێت، چونکە قورئان بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ نەکردووە، بەڵکو زانینی ژمارەی ئەو لاوانەیان بەکاروباری خودا داناوەو، تەنیا خوداش زاناو ئاگادارە لە ژمارەکەیان (قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم ).

بەڵام کۆمەڵێکی دی لەزانایانی لێکۆڵیارو ساغکەرەوە لە تەفسیردا وای بۆچوون، کە ژمارەی لاوەکان حەوت کەس بن لەم بۆچوونەشیاندا گووتوویانە:" ئەمە وتەی لابەلاو گومان فڕێدانە، چونکە دەستەواژەی (رجما بالغیب/ گومان فڕی دان) لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیە: بەبێ زانستو بێ بەڵگە بدوێیت" ئەوان بۆ ئەم وتەیەیان، ئەم بەڵگانەیان هەیە:

١- قورئان هەردوو وتەکەی پێشوو، کە گوتراوە (سێ بوون) یان (پێنج کەس بوون): " سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ "و "وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ" ڕەتکردۆتەوە ئەمەش بەو وەسفە کەوا (رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ )ن، واتە بەبێ زانیاریو، بەڵگەیەك گوتراون بۆیە ئەم وەسفەش ڕەتکەرەوەی هەردوو وتەکەیە.

٢- بێ دەنگیی قورئان لەئاست وتەی سێیەم، کە گوتراوە (حەوت کەس بوون): " وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ " کە بە هیچ وەسفێك تیشکی نەخستۆتە سەری، ئەگەر ناڕاست بوایە ئەوا بە لاوازو بێ نیوەڕۆکی دادەنا. ئەم بێدەنگی یەی قورئان بەڵگەیە لەسەر داننان بەم وتەیەی دواییو پشت پێبەستنیدا.

هێنانی ئامرازی گەیاندنی پیتی (و) بۆ وتەی سێیەم، بەڵگەیەکە لەسەر ڕاستیو دروستی بۆچوونەکە. ئەم (واو)ەش لە زمانی عەرەبیدا بە (واو

الثمانية) ناو بردووە لە بڕگەیەکی تری ئەم باسەدا (ان شاءالله) هەڵوێستەیەکی لە ئاستدا دەکەین.

٤- قورئان بەشێوەیەکی نەگۆڕو دەسنیشانکراو (زانینی ژمارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە)ی بەکاری چەند کەسێکی کەم داناوە.. وەك فەرمووییە (قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ) جائەگەر هیچ کەسێك تواناو مافی ئەوەی نەبوایە کەژمارەکەیان بزانێت، ئەوا قورئان بەراشکاویی ئەو فەرمایشتەی ئاوا ڕادەگەیاند (ما یعلمهم الا الله).

٥- وتەی ڕاشکاوانەی هەندێك لە هاوەڵان (ضمانة) لەسەر ئەوەی کە ئەوان لەو کەسە کەمانەن کەوا ژمارەی لاوەکان دەزانن، بۆ نموونە: (عبدالله ی کوڕی مسعود) (خوالێی رازی بێت) گوتوویەتی: (من لەو چەند کەسە کەمانەم کە ژمارەیان دەزانن، ئەوان حەوت لاو بوون). (ابن عباس)یش- خودا لێیان رازی بێت- گوتوویەتی: (من لەو کەسە کەمانەم کە خودا لە زانینی ژمارەکەیاندا جیای کردووینەتەوە، ئەوان حەوت لاو بوون)، هەمان وتەش لە (قتادة) و (عطاء). خودا لێیان ڕازبێت- گێڕراوەتەوە.

بەڵام ماوەی مانەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا بیروڕای هەمە جۆری لەسەر هەیە. بۆ نموونە هەندێك لە زانایانی تەفسیر گوتوویانە (سێسەدو نۆ ساڵە) ئەمەش لەدەقی ئایەتەکەوە وەریان گرتووە، هەندێکیشیان گوتوویانە: (بەڵگەیەك لەسەر ئەو ماوەیە نیە، چونکە خودا هەر لەوێدا دەفەرمویێت: (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْ) هۆی لێك نەچوونی بیروڕای زاناکان لەسەر مەزندەکردنی ماوەکە جودایی بۆچوونیانە لەمەبەستی ئایەتەکە، کە خودا تیایدا فەرموویەتی: ﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾ الکهف ﴾، واتە (سێ سەد ساڵ لە

ئەشکەوتەکەیاندا مانــەوەو نــۆ ســاڵی تریــشیان زیــاد کــردووە) کەواتــە جــودایی بیروبۆچوونی زاناکان لەم فەرمایشتەدایە.

١- (ابن کـثیر) گوتوویەتی: (ئەمە هەواڵێکە لە خـوداوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەربــارەی مــاوەی ســاڵانی مانــەوەی هــاوەڵانی نێــو ئەشــکەوتەکە لــە ئەشکەوتەکەیاندا، لەو کاتەوەی خودا خەوی لێ خستوون تاکو کـاتی بەخەبـەر هێنانــەوەیانو دەرخــستنەوەیان بـۆ خــەڵکی ئەوســەردەمەی تیــادا بەخەبــەر هاتوونــەوە. ئــەم ماوەیــەش ســێ سەدســاڵ بــووەو، بــەڵام لــە ســاڵی مــانگی (هیلالی)دا نۆ ساڵی تریشی دەچێتەسەر)[1].

٢- لە کاتێکدا زانایانی تری تەفسیر وای بەڕاست تر دادەنێن گوایە ئەمە لە وتەی (ئەهلی کیتاب) بێت، واتە (جوولەکەو دیانەکان)، بەڵام ئەم وتەیە راست نیــە، وەك چۆن وتەشیان دەربارەی ژمارەی لاوەکان ڕاست نەبووە (ابن عبــاس) (خــوا لێی ڕازی بێــت) گوتوویــەتی: (مرۆڤــ کاتێــك ئایەتەکــە لێــك دەداتــەوە وای دەبینێت کە بەپێی ژمارەو ساڵەکان ئاوایە، بەڵام لەماوەی نێوان ئاسمــانو زەوی دوورترە، کە دەخوازێت لە نادیار بزانێت، پاشان (ابن عباس) ئایــەتی ( وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ )ی خوێندوتەوەو گوتوویەتی: (ئەو کەسانە چەند ماونەتەوە؟ گوتوویانە: (سێ سەدو نۆ ساڵ) گــەر وابوایــە خــودا نەیدەفــەرموو (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْ ) واتە: (بڵێ خودا خــۆی دەزانێــت چــەند ماوەنەتــەوە) ئینجا وتەی ئەو گەلەی هێناوەتــەوەو گوتوویــەتی: ( سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ..) تــا دەســتەواژەی (رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ ) کــە لەســەر زاری ئــەوان هــاتووە هەواڵی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان ژمارەکەیان نــەزانیووە. هــەروەها گوتوویــە:

---

(١) تفسیر ابن کثیر (٣: ٧٩).

دەڵێن (وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا) ئەم وتەیەشی لە (قتادەو مطرق‌و ابن اسحاق‌و کەسانی ترەوە هێناوەو (ابن کثیر)یش یەکخستنێکی لەنێوان هەردوو فەرمایشتەکەی خودا (وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ...)و (قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُواْ)دا دروست کردووەو گوتوویەتی: (لە فەرمایشتی خوادا- قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُواْ - واتە: ئەگەر دەربارەی مانەوەی لاوەکان پرسیارت لێکراو، تۆش هیچ زانیارییەکت لەو بارەیەوە پێ نیەو لەلای خوداشەو ئاوا دانرا بێت، ئەوا هیچ ڕایەك مەخەرە پێش چاویان، بەڵکو لەو جۆرە حاڵەتەدا بڵێ **(الله اعلم بما لبثوا له غیب السموات والارض)** واتە: خودا دەزانێت‌و هیچ کەسێك نازانێت، ئیدی کێ هەیە لە خەڵکی دروستکراوی خۆی، کە ئەو زانیاریەیەی پێبگەیەنێت)[1]. بەمانای ئەو ژمارەیە هەرچەندە لای خوداوە ئاوا دانراوە، بەڵام هەر خودا خۆی زانایە. ئێمەش ڕامان لەسەر یەکلاییکردنەوەی وتەکەی (ابن کثیر)ە لەسەر ماوەی مانەوەیان، کە سێ سەدو نۆ ساڵە بەتایبەتیش، کە ئەمە وتەی کۆمەڵێ زانایانی تەفسیرەو، هەر خوداش زانایە.

## "چیرۆکەکەیان کورت کراوەیەو پاشان درێژکراوەیە"

قورئانی پیرۆز چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتی بە شێوازێکی جوان‌و کاریگەر خستۆتەڕوو، کە سەرنجی دڵ‌و دەروونی مرۆڤی بەلایدا ڕادەکێشێت‌و بەپێی بەرزترین شێوازی دارشتنی هونەری هێناویەتی..

---

(١) تفسیر ابن کثیر (٣ : ٧٩).

لە سەرەتاشدا بەکورتی‌و پوختی باسی بەسەرهاتەکەیان دەکات، پاشان بەدرێژی شیکارو ڕوونی دەکاتەوە بۆ نموونە لە چوار ئایەتی سەرەتای چیرۆکەکەدا ئەو کورتی‌و پوختکردنەوەیە بەدی کراوە، کە خودا تیایاندا فەرموویەتی:

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ الكهف ﴾.

بەڵام شیکارو درێژەی چیرۆکەکە لەو ئایەتانەی دواتریانەوەیە، کە بە ئایەتی ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ... ﴿١٣﴾ الكهف ﴾ دەستپێدەکات.

ڕەگەزەکانی کورت‌و پوختکردنەوە، سەرجەم بەشەکانی چیرۆکەکەشی بەیەکەوە بەستۆتەوە. جا بە وردی سەرنج بدە لەم پوختکردنەوەیەی قورئان لەسەر چیرۆکەکە:

ئەوان هاوەڵانی نێو ئەشکەوت‌و، دۆڵەکەن، ئەوان لە بەڵگەونیشانەکانی خودان.. ئەوان چەند لاوێکن.. پەنایان بۆ ئەشکەوتەکە بردووەو داوای کۆمەك‌و بەهاناوە هاتنی خودایان کردووەو، خوازیاری ڕەحمەت‌و ڕێنمایی‌و ئاڕاستەکردنی خودا بوون خوداش خەوێکی قورسی وای لێ خستوون کە گوێیان لە هیچ دەنگێك نەبێت، ئەوانیش خەوتوون.. خەوەکەشیان تاچەندین ساڵ بەردەوام بووە، پاشان خودا لەوخەوە هەڵی ساندوونەتەوە خەڵکیش لەمەسەلەی ژمارەی ئەو لاوانەو لەسەر ماوەی مانەوەی نێو ئەشکەوتیاندا بوون بەدووکۆمەڵی لێك جودا لە بیروڕادا. قورئانیش لە بیروڕاو وتەی هەردوولایان وتەی ڕاستی کۆمەڵێکیانی دیاری کردووەو، وتەی ئەوی تریانی پووچەڵ کردۆتەوە.

دیــارە لــە ئایــەتی یەکــەمی بەســەرهاتەکەدا کــە ئایــەتی ژمــارە (٩)ی ســـوورەتەکەیەو کــە تێیــدا فەرموویــەتی: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا ﴾ لەم ئایەتەدا وەڵامێکی ئەو کەسانە دەداتەوە کــە لــە چــیرۆکەکەیان سەرســام دەبــن، هــەروەها وەڵامێکیــشە بــۆ ئــەو جوولەکــەو موشریکانەی کە پرسیاریان دەربارەی لاوەکان لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە.

## "رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً"

بێگومــان لاوە باوەڕدارەکــان کاتێــك پــەنایان بردەبــەر ئەشــکەوتەکە، داوای کۆمەك‌و هانایان لە خودا کردو لێی پاڕانەوەو گوتیــان.. ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ ئەوان بــەم نزایــە بوونەتــە پێــشەنگی ئیمانــداران لــە پەنابردنە بەرخواداو لەداوای هانا لێ کردنی‌و داوای ڕەحمەت‌و پشت پێ بەستنی لە ڕێنمایی بۆ ڕێی چاکەو دانانی لەکاروباری ژیاندا. دیارە ئــەوان زانیویانــە کەســۆزو ڕەحمــەتی راســتەقینە تــەنها لــەخودا خۆیەوەیــەتی، هەربۆیــەش لــە سەرچــاوە بەخشندەکەیەو داوایان کردووە ﴿ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ مانای (لــدنك) بــە عــەرەبی (عندك) واتە: (لەلایەن خۆتەوە لە کانگاوی سەرچاوەی بەخشندەیی خۆتەوە).

وەك تێبینیش کراوە وشەی (لدن) بەزۆریی لەسوورەتی (کهف)دا بــەکارهێنراوە کە چوار جار تێیدا هاتووە:-

١- خــودا فەرموویــەتی: ﴿قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ الكهف﴾.

٢- هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿... رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ الكهف﴾.

٣- هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ الكهف﴾.

٤- هەروەها فەرموویە: ﴿... قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّى عُذْرًا ﴿٧٦﴾ الكهف﴾.

وەك تێبینیش دەكرێت وشەی (رحمـة) بەزۆریی لە سوورەتەكەدا هەیە كە شـەش جار هاتووە، وەك :-

١- وتەی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە: ﴿... رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ الكهف﴾.

٢- وتـەی هەنـدێك لـەو هاوەڵانــە بــە هەنـدێكی تریـان لـەكاتی چـوونە نێـو ئەشـــكەوتەكەدا: ﴿...فَأْوُۥٓا إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ... ﴿١٦﴾ الكهف﴾.

٣- فەرمایـــــشتەكەی خـــــودا: ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ۚ... ﴿٥٨﴾ الكهف﴾.

٤- خودا دەربارەی (خضر) گوتوویـە: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ الكهف﴾.

٥-(خضر) لەمەڕ هەردوو كوڕە مێردمنداڵە هـەتیوەكانی نێـو شـارەكە گوتوویـە: ﴿... فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ... ﴿٨٢﴾ الكهف﴾.

٦- (ذو القرنين)یش كاتێك بەربەستەكەی بنیات نا، گـوتی:﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ... ﴿٩٨﴾ الكهف﴾.

رەحمەتی خوداش لە سوورەتی (كهف)و لە چیرۆكەكانیدا بەدیار دەكـەوێت، بـۆ نموونە رەحمەتی خودا بۆ هـاوەڵانی نێـو ئەشـكەوتەكە ئەوەیـە، كـە رێنمـایی بـۆ ئەشكەوتەكە كردوون، ئەوانیش تێیدا نیشتەجێ بوونو خۆیان لە گەلە (هاوبەش بۆ دانەرو موشریكەكەیان) دابڕیوە.

هه‌روه‌ها خودا له‌وه‌شدا ره‌حمی پێكردوون، كاتێك مانه‌وه‌ی نێو ئه‌شكه‌وته‌كه‌ی به‌درێژایی ئه‌و چه‌ندین ساڵه‌ بۆ ئاسان كردوون.

هه‌روه‌ها له‌وه‌شدا خودا ره‌حمی پێكردوون، كاتێك وای لێكردوون سه‌دان ساڵ بخه‌ون، تا ئه‌و نه‌وه‌ بێباوه‌ڕه‌ی، كه‌ هه‌ڵاتبوون له‌ده‌ستیان، نه‌مابوون‌و نه‌وه‌یه‌كی باوه‌ڕدار جێنشینیان ببوون، پاشان ره‌حمه‌تی خودا بۆ ئه‌وان له‌وه‌ش دایه‌، كه‌ خودا چه‌ندین نیشانه‌و موعجیزه‌و كه‌راماتی له‌نێو ئه‌شكه‌وته‌كه‌دا بۆ به‌یده‌ست (تسخیر) كردبوون.

ئه‌وان زانیبویان، كه‌ ره‌حمه‌ت‌وبه‌زه‌یی ته‌نها له‌خوداوه‌ ده‌سگیر ده‌بێت، بۆیه‌ لێیان خواستبوو، هه‌روه‌ها زانیبوویان، كه‌ رێنمایی ئه‌وه‌یه‌: خودا به‌ شوێنكه‌وتوانی خۆی ده‌دا، بۆیه‌ لێیان خواستبوو: ﴿...فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ الكهف﴾.

كاتێك ئه‌و ره‌حمه‌ت‌و رێنمایی یه‌شیان به‌دڵسۆزی‌و گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ لای خوداو به‌ ڕاستگۆیی‌و تكاكاری یه‌وه‌ داوا كردبوو، خوداش به‌ده‌م نزاكه‌یانه‌وه‌ هات‌و، ده‌رگای ره‌حمه‌تی خۆی لێ كردنه‌وه‌و، وای لێكردن له‌و ئه‌شكه‌وتی ره‌حمه‌ته‌دا بژین‌و، له‌نێو سێبه‌رو فێنكاییه‌كانیدا ئه‌ملاولای جه‌سته‌یان بگۆڕن.

به‌ڕاستی ره‌حمه‌تی خودایان له‌نێو ئه‌شكه‌وته‌كه‌دا بۆ چوو بووو به‌و ره‌حمه‌ته‌ش شوێنه‌كه‌یان ببووه‌ هۆی به‌خته‌وه‌ری‌و نازونیعمه‌ت.. هه‌ر له‌م ڕووه‌وه‌ خودا فه‌رمویه‌: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ... ﴿٢﴾ فاطر﴾.

# " نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ"[٤]

ئەم فەرمایشتەی خودا ( نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ ). چەندین ئاماژەی سرووش بەخشی تێدایە، وەك:-

١- بێگومان کاتێك خودا خۆی هەواڵی هاوەڵانی ئەشکەوتەکەمان پێ دەگەیەنێت، ئەوە دیاردەیەکە لە دیاردەکان رەحمەتی خودا بۆ ئێمەو، دیاردەیەکی فێرکارییشە کە فێرمان دەکاتو ئەوەی سوودی بۆمان هەیە لە چیرۆکەکانی پێشینان بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەمەش چاکەو فەزڵو رێز لێنانێکە لەخوداوە بۆ ئێمە.

٢- ئەو بارودۆخەشمان بیرناچێت کە ئایەتەکانی تێدا هاتوونەخوارەوە، ئەو دۆخەی کە موشریكو جوولەکەکان تیایدا پێغەمبەریان ﷺ (دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە) تاقی کردۆتەوە، بۆیە هەربەوەی کە خودا خۆی هەواڵەکانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەر ئەو تاقیکردنەوەیە گەیاندووە، هەر بەمە سەرکەوتنو پشتگیریی لە خوداوە تێدایە بۆی.

٣- هەمدیسان ئەم رەحمەتەی خودا دەشێت بە بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی (پێغەمبەرێتی)و (شایەتی دانێکی خودا) بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ دابنرێت خۆ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ نەبووایە ئەوا خوداش بۆی بەراست دانەدەناو شاهێدیی بۆ نەدەداو بۆی نەدەگێڕایەوە.

٤- وەسفکردنی گێڕانەوەی چیرۆکەکە لەلایەن خوداوە بە (حەق): " نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ " بانگەوازێکە بۆ ئێمە بۆ باوەڕکردن بە هەموو ئەو مەسەلەو رووداوانەی نێو چیرۆکەکەو برواهێنانیش بە راستیو دروستیو بوونی لە واقیعدا سەرەڕایی ئەوەی کە چەند مەسەلەیەکی هەندەکی (جزئی)یشی تێدا

بێتو ملکەچی پێوەرە ماددیو دنیاییەکان نەبێت، چونکە عەقڵی باوەڕدار ئەو ڕاستییە بۆ خودا دەسەلمێنێت کەوا (قودرەتی بەکار)و (ئیرادەی بەجێگەیەنراو)و (خواستی ڕەها)ی هەیە کە هەموو جۆرە یاساو ڕێساو سوننەتێکی گەردوونی پێ دەگۆڕێت.

٥- هەروەها وەسفکردنی گێڕانەوەکە بە (حەق): ( نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ ...) بانگەوازێکیشە بۆ ئێمە کە سیفەتی (حەق) بەدی بێنین، ئەو حەقەی، کە مانای: ڕاستگۆییو ڕاست پێکانو وجودی ڕاستەقینە دەگەیەنێت لە توێژینەوەماندا لەمەڕ چیرۆکەکانی پێشینان لە قورئانداو، لەو مەیدانەی، کە تێیدا هەڵدەسووڕێتو، لەو سەرچاوانەی لێوەیان سوود وەردەگرینو، لەو بەرەنجامەش، کە دەریدەهێنین. بۆیە هەردەبێت هەموو ئەمانە بە سیفەتی ڕاستیو حەق وەسف بکرێت، ئەمەش تەنها بۆ سەرچاوە ڕاستو دڵنیاکارو جێی متمانەکان دەگونجێت کە قورئانی پیرۆزو فەرموودە ڕاستەکان (الحديث الصحيح)ن.

بێگومان وەسفکردنی گێڕانەوەی چیرۆك لە بەسەرهاتەکەی هاوەڵانی ئەشکەوتدا بە(حەق)، بانگەوازێکە بۆ توێژەرو لێکۆڵیاران، کە تەنها پشت بەگێڕانەوە ڕاستگۆیانە حەق بێژەکەی خودا ببەستنو ڕوو نەکەنە ئەو سەرچاوانەی تر، کە چەندین دەقی ئیسرائیلیو ئەفسانەو شتی پڕوپووچیان لەخۆگرتووەو، تەنانەت پێویستە ئەو جۆرە سەرچاوە ڕاستانە تێبپەڕێنن، پشتگوێیان بخەنو، هەموو جۆرە ڕیوایەتێکی لێ وەرگیراوەیان بەلاوەنێن.

٦- وشەی (نبأ) لە ئایەتەکەدا: ( نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ) مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە چیرۆکی هاوەڵانی نێوئەشکەوتەکە گرنگە، چونکە وشەی (نبأ) بەو هەواڵو بەسەرهاتە گرنگانە دەگوترێت، کە لە هەمان کاتدا ڕاستیشن.

# " إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ "

خودای مەزن هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەی بەچەند لاوێك (فِتْيَةٌ ) وەسف کردووە: ﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَـٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ الكهف ﴾.

وشەی (فِتْيَةٌ ) کۆی (فتی)یە.. لە عەرەبیدا (فتی)بەو لاوە دەگوترێت کە لە سەرەتای تەمەنی گەنجێتی دایەو لە مێردمنداڵ، یان لە نەوجەوان (غلام) گەورەترەو لە گەنج (شاب)یش بچووکترە.

قۆناغی گەنجی (مرحلة الفتوة) قۆناغی جۆش سەندنو جموجۆڵو چالاك بوونەو هەروەها قۆناغی بەخشینو بەرزیو پابەندییە."گەنجێتی" سیفەتێکی ستایشکراوە لە قورئانداو خاوەنەکەشی ستایشکراوە لەکاتێکدا ئەگەر باشترین کردەوەو گەورەترینو بەرێزترین ئاکار بنوێنێت.

بۆ نمونەش (ئیبراهیم) (سڵاوی خودای لێ بێت) کاتێك بتەکانی گەلەکەی تێکشکاند، بەگەنجێکی تازە پێگەیشتوو (فتی) وەسفیان کرد: ﴿ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ الأنبیاء ﴾، واتە: (بیستمان گەنجێك کە ناوی (ئیبراهیمە) باسی بتەکانی دەکرد کە نابێت بپەرسترێن) ئەوان بەم وەسفە مەبەستیان بەکەم دانانو سەرزەنشتکردنو تاوانبارکردنی بووە، وەك ئەوەی لەبارەیەوە بڵێن: (ئەو گەنجێکی بزێوو سەرکەشەو لە ئاکامی کردەوەکانی نازانێتو هەست بە ئەنجامی رەفتارەکانی ناکات. خۆ ئەگەر گەورەو پێگەیشتوو بوایە خۆی لەقەرەی ئەو کارە نەدەدا).. بەڵام ئێمە لە وەسفکردنیدا بە گەنجێتی (فتوة)و لە

ستایشکردنی تێدەگەین، کە لەڕاستیدا ستایشی رەفتارەکەی کراوە، چونکە گەنجێتییەکە پاڵنەری بووە بۆ بەربەرەکانێکردنی کاری خراپەو تێکشکاندنی بتەکانو هەر گەنجێتییەکەشە رێی نەداوە، کە حەوسەڵەی بینینی خراپەو ناڕەواییی هەبێتو، هەر بۆیەش هەنگاوی بۆ تێکشکاندنەکە ناوە. گەنجێتی لاوی موسڵمانو پابەندی بە دینەکەشیەوە، سەرچاوەی تۆمەتبارکردنیو سەرزەنشتکردنیو بەکەم گرتنیەتی لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە. ئەوەتا بەچەند گەنجێکی سەرەڕۆو چەند لاوێکی بێباكو بزێویان دادەنێنو دەڵێن: (گەر ئەوان چەند پیاوێکی گەورەبوونایە ئەوا هوشیارو داناو زیرەكو پێگەیشتوو ئەبوون). لەکاتێکدا گەنجێتیی ئەو لاوە پابەندانە کانگای هیممەتو ووزەو هەوڵو کۆششو چالاکییانەو هەمیشەش بەروبوومی پێگەییوی گەنجێتی راستگۆیانەو پابەند بونیانە. هەروەها لاوان هۆکاری گۆرانکاریو چاکسازیشنو بانگەوازەکانیش هەر بەهێزو توانای لاوان بەڕێوەچوون گۆڕانکاریش تەنها بەکۆششی ئەوان بەدی دێت، زۆربەی هەرە زۆری لایەنگرو شوێنکەوتوانی پێغەمبەران وبانگەوازکارو چاکسازانیش هەر لاوان بوون.

جا لەبەرئەوەی لاوان کاریگەریەکی دیاریان هەیەو لەبەرئەوەش دوژمنانی موسڵمانان لەم سەردەمەدا سورن لەسەر ئەوەی کە نابێت موسڵمانان سوود لە وزەو ورەی لاوەکانیان وەربگرنو، بۆیە رِژدن لەسەر ئەوەی کە ناخی فیکرو عەقیدەو بڕوایان داگیر بکەنو بیانخەنە نێو گێژاوی ون بوونو بێهودەیی یەوەو جوامێری وورەو چالاکییان لەناوبەرنو، رێنمایان بکەن یان بۆ شتە کەم بایەخو بێنرخەکانو چەند کاروبارێکی لابەلای ژیان.

بێگومان لە مەوبەر هێندەی ئەم زەمانە لاوانی موسڵمان دژایەتی نەکراونو وەك ئەمڕۆش غەزوی فیکریی یان لەسەر نەبووە. موسڵمانان لە مەوبەر وەك ئەمڕۆ توشی کارەساتی جەرگبڕ لە نێوان ڕیزەکانی لاوانیاندا نەبوون..تەنانەت هەرگیز موسڵمانان لە رابردوودا وەك ئەمڕۆ لاوەکانیان گومڕاو سەرگەردانو سەرنگوم

نـەكراون. داخـۆ نەتـەوەش چـەندە زیـانی لیٚ بكـەوێت كاتێـك لـە سـەنگەری لاوانیەوەتوشـی كارەسـات دەبێـت وكاتێـك لـەنێو نەوجـەوانان وگەنجـە تازەپێگەیشتوەكانیەوەمەینەتی بەسـەردا دەبارێـت. لـە كاتێكـدا لاوان كۆڵەكـەی نەتەوەو جیٚ ئومێدی گەورەی نەتەوەن. بەلاٌم نەتەوەی موسڵمان هـەموولاوانی لـە دەسـت نـەداوەو، چـونكە هێـشتا چـەندەها لاوی سـالح وبـاش وچـەندین گـەنجی هەڵـسوڕاوی تێـدا مـاوەو فەرمایـشتو وەسـفی خـوداش كـە بـۆ لاوانـی نێـو ئەشكەوتەكەیەو, ئەوانیش دەگرێتـەوە: ﴿...إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ الكهف﴾، چـونكە ئـەم لاوانـەی ئـەمڕۆمان ڕوویـان كردۆتـە ئـاینی ئیسلامەكەیانو بـە تـەواوی ناسـیویانەو ڕاسـتگۆیانەش پابەنـدبوون پێـوەیو بـە هیممەتو گورج وگۆڵیو دڵسۆزیـشەوە بانگـەوازی بـۆ دەكـەن.. لاوانـی ئێمـەش ئەوانەن كە (إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ ): كاتێك باوەڕیان بە خودای پەروەردگاریان هێناوەو ڕیبازەكەیان هەڵبژاردووەو ئیدی خوداش ڕاستگۆییو دڵسۆزی لیٚ بینیونو بەم هۆیەشەوە كۆمەكو هانایان لەلایەن خـوداوە پێگەیـشتوەو ئەوەیـە كـە زیـاتر ڕێنمایی كردوون بۆ سەر ڕێبازە ڕاستەكەیان.

ئەم ئایەتە دەیەوێت جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتـە قورئانیـە ڕاسـتگۆیانەیە لـە بابەتی باوەڕداریو ڕێی ڕاست گرتنەبەردا بكات، كـە ئەوەیـە: بێگومـان مرۆڤـی باوەڕدار خۆی ڕێی خۆی هەڵدەبژێرێتو كاتێك ڕێی باوەڕداریەتی هەڵدەبژێرێتو بـە دڵسۆزیو پابەندیو ڕاستگۆییو پەرۆشییەوە ڕوویتێدەكاتو باوەڕی بەهێز دەكات. خۆ ئەگەر ئەوكەسە خۆی هەنگاوی یەكەم نەنێتو ڕێی ڕاست بە كردەوەو دڵـسۆزی هەڵنەبژێرێتو، ئـەوا خـوداش هیدایـەتو ڕێنمـایی پـیٚ نـاداتو وێـڕای ئـەوەی نەخوازەڵا بۆی زیاد بكات. بۆیە ئەركی تۆ تەنها هەڵبژاردنی ڕێگاكەیـەو خـوداش (ئەوەی هەڵیدەبژێرێت) بۆت زیادو زۆرتـر دەكـاتو كۆمـەكت پـیٚدەدات، سـائیتر

باوەڕداربیت، یان بێ باوەڕو، لەسەررێیی ڕاست بیت یا گومڕایی. ئەمەیە ئەو سوونەتەی خودا کە لە چەند ئایەتێکی قورئاندا بڕیاری لەسەر داوە، وەك ئەم ئایەتانە: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ الإسراء﴾. واتە: (هەرکەسێك خۆشیو شادیی هەر لەدنیادا دەوێت (ئەوا ئێمەش بەخواستی خۆمان) ئەو شادیو ئاواتە بەپەلەیەی دنیای بۆبەدەست دێنین، پاشان بەبێزراویو دەرکراولە ڕەحمەتی خودا دەچێتە نێو دۆزەخەوەو بەگڕوتینی ئاگری دۆزەخ دەبرژێنرێت جاهەر کەسێکیش خوازیاری خۆشیو شادیی ڕۆژی دواییەو بەئیمانداریتیو خواپەرستییەوە هەوڵی تەواوی بۆ دەدات، ئەوا ئەم جۆرە کەسانە هەوڵو کۆششیان بەفیڕۆ ناچێتو پاداشتیان لەبەرچاوە. ئێمە کۆمەکی هەریەکە لەوان (چ دنیاپەرستانو، چ کۆششکارانی ئاخیرەت) دەکەینو هەموو لایەکیان لەنێو بەخششو کۆمەکی خوادانو، بەخششی پەروەردگاریشت لە کەس قەدەغە نەکراوە، جا بڕوانە چۆن هەندێکیانمان لە هەندێکی تریان جیاکردۆتەوەو فەزڵی باوەڕو ڕێی ڕاستمان بەهۆی هەوڵو دڵسۆزیی خۆیانەوە پێداوە.

دیارە لە ڕۆژی دواییشدا پلەو پایەو فەزڵو سەرخستنی زیاتر بەو تاقمەی دووەم (باوەڕداران) دەدرێت).

# " وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ "

لاوە باوەڕدارە ڕێنماییکراوەکانی (هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە) لەنێو کەسانێکی کافرو بێباوەڕدابوون پێچەوانەی ڕێبازی کافرانیان گرتبووەبەرو لایەنی حەقو ڕێگای باوەڕیان هەڵبژاردبوو ئەوەبوو دڵیان بۆ باوەڕ والا کردو کاتێ باوەڕیش چووە نێو دڵەکانیانەوە خودا زیاتری کرد بۆیان، باوەڕو هیدایەتی زیاتریشی پێ بەخشین بە شێوەیەك کە هەموو دڵەکانی ئەوانی لێ پڕکرد.

دوای ئەوەش دڵەکانیان پڕ بوو لە ئیمانو هیدایەتو، خودا ئەو دڵانەی جێگیرو بەئارامو دامەزراو کرد کە ئارامیو ئازایەتیی تێداچاند، هەموو ئەمانەش مانای ئەم دەستەواژەیەی نێو ئایەتەکەیە ( وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ).

مانای ( وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ) واتە: (ثبتناهم على الايمان= لەسەر باوەڕ جێگیرو دامەزراومان کرد)، ئیدی جێگیربوون لەسەری بەوپەڕی توندو تۆڵیو ورەو ئارامیو سوور بوونەوە. من خۆم (نووسەری ئەم کتێبە) زۆرسەرسامم بەو دیمەنە قەشەنگەی کە ئەم ڕستەیە پیشانی دەدات، بەجۆرێك سەرسامیشم کە وێنەی دڵەکانیان لەبەرچاومە چۆن پڕبوون لە باوەڕو هیدایەت، ئەمەش زیاتر هاوشێوەو وێکچووی گۆزەیەکی پڕ لەئاوە کە خاوەنی گۆزەکە توند سەرەکەی دەبەستێت تاکو ئاوی لێ نەڕژێتو ئاوەکەی تێدا لەنێودا بمێنێت.

جائەو دڵانەی کەباوەڕو هیدایەتیان هەڵبژاردووەو ترسی ئەوەیان لێ دەکرێت کە لە نێوەندی فیتنەو بەڵای قەومی کافراندا (باوەڕو هیدایەتەکەیان لێ بکەوێتو بڕژێت) ئەوا خودا خۆی ئەو دڵانەی جێگیر کردووەو دەمە کانیانی بەستووە تاکو ئیمانو هیدایەتەکەی نێویان بهێڵێتەوە.

جا ئەو دڵانەی کە باوەڕ هەڵدەبژێرن ئاتاجیـان بـە جێگیربـوونو دامەزراوەیـە، تاکو ئیمانیان لێ کەم نەبێتەوە، یان لـێ ون نـەبێت، وەك خـودا بـە بـاوەڕدارانی جـەنگی (بـەدر)ی فـەرمووە: ﴿...وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ الأنفال﴾. واتە: (ئەوەبوو خودا بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆ بارانـدن تـاکو خاوێنتـان بکاتەوە پێیو وەسوەسەو دڵە خورپەی شەیتانیشتان لێ دوورخاتەوەو، پاشان دڵتان بەهێزو دامەزراو کاتو جێگیربن لە مەیدان).

# " إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ "

خــــودا دەفـــــەرموێت: ﴿ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ الكهف ﴾

بێگومان لاوە باوەڕدارەکان (هاوەڵانی نێو ئەشکەوت) بە چەند قۆناغێکی یەك لەدوای یەكو پلە بەپلەی ڕێگەی ئیماندا تێپەڕیون، کە بەم ڕەنگەیە:-

١- ئەوان، یەکەمجار باوەڕیان بـەخودای پـەروەردگاریان هێنـاوەو داوای رەحمـەتو شارەزاییو ڕێنماییان لێ کردووە. خوداش بەدەم داواکەیانەوە هـاتووەو بـاوەڕو شارەزاییو هیدایەتی زیاتری پێ داون.

٢- هەروەها ئەوان کەرامەتو ڕێزو نیعمەتیان لەخودا وە چنگ کـەوتووەو، خـودا خۆی دڵیانی دامەزراو کردووەو پڕی کردووە لەباوەڕ بۆیـان، تـاکو ئیمانەکـەیان بەزیندوویی تێدا بهێڵنەوە.

٣- ئــەوان دوای ئەمـــەش بــە ورەو هیمەتــەوە جووڵانەتــەوەو بــە چـالاکیو کۆششکردنیـــشەوە گـــەڕاونو بەڕاشـــکاویی ڕایانگەیانــدووە، کـــە خـــودای پەروەردگاریان بەتەنها پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییشە، ئیـدی ئـەوان جگـە لەم خودایە، هیچ خواوەندو پەرستراوێك بۆخۆیان دانانێن، بۆیە ئەو گەلەیان، کە پەرســتراوێکی دی، جگــە لــەخودا دەپەرســتن بەهەڵەداچــوون. ئـەم قۆناغــەی سێیەمیش قورئان گوزارشــتی بــەم فەرمایــشتەی خــودا لـــێکردووە: ﴿...إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴾

﴿إِذْ قَامُواْ﴾ لەم ئایەتەدا کە بەمانای (کاتێك هەستان.. یان کاتێك جـووڵانو کەوتنەخۆ)، یـان بـە هـەر مانایـەکی زمانـەوانیی هاوشـێوەی تـر دێـت، چـەند بیروڕایەکی لە زانایانی تەفسیرەوە لەسەر دەربڕاوەو ماناکانی هەستانو کەوتنە خـۆ (القیام)یان لەم چەند خاڵەدا ڕوون کردۆتەوە:

١- هەندێك لەزانایان گوتوویانە: ئەوە هەستانێك بووە لەو لاوانەوە بە ڕووی پادشا بێ باوەڕەکەدا.. ئەمەش سـیفەتێکی هەسـتانیانە لەبەردەمیـداو، پادشـاکەش پێی زانیون، کەوا سەرپێچی لە ئایینی ئەو دەکەن، بۆیە مەسەلەکەیان خراوەتە بەرچاوی‌و، پاشان خۆیشیان براونەتە لای پاشاو پێی گوتراوە: ئەمانە خۆیان لـە ئایینی تۆ دابڕیوەو باوەڕ بە تۆ ناهێنن، پادشاکەش فـەرمانی پێکـردوون، کـە وانەکەن، بـەڵام ئـەوان لەسـەر حـەق جێگیربـوونو پێیـان گوتـووە: (ربّنـا رب السموات...) ئەم بەسەرهاتە گەر بەڕاستی لە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕرابێتـەوە ئەوا پەسندە، بەڵام گەر بە فەرموودەی (صحیح) لێیەوە ڕیوایـەتی نەکرابێـت ئەوا ئێمەش نایڵێینەوە.

٢- هەندێك لە زانایانی تری تەفسیر گوتوویانە: ئەو لاوانە لە کوڕانی گەورەپیاوانی شارەکە بوونو لەوشارە دەرچوونو لـە قـەراغی شـار (بـەبێ بـوونی وادەیـەکی نێوانیان) کۆبوونەتەوەو یەکێکیان گوتوویەتی: (من لەدڵی خۆمـدا وای دەبیـنم کە خودای پەروەردگارم، خـودای ئاسمانـەکانو زەوییـە)، ئـەوانیش گوتوویانـە: (ئێمەش لە دڵی خۆماندا هەمان شت دەبیـنین). ئنجـا هـەموویان هەسـتاونو گوتوویانە (ربّنا ربّ الـسموات والارض) ئـەم شـیکارەش لـە ڕیوایەتـە ڕاسـت (صحیح)ەکانی فەرموودەدا (دەربارەی ئەم جـۆرە هەسـتانە) دەقێکـی لەسـەر نەهاتووە.

٣- هەندێکی تر لە زانایانی تەفسیر گوتوویانـە: قورئـان لێـرەدا هەسـتان (قیـام) گوزارشتی لە جیابوونەوەو دەرچوون لەگەلەکەیانو، سووربوونیان لەسەر هەڵاتن

بۆ لای خودا، کردووه‌، وه‌ك چۆن بلێیت: فلان که‌س هه‌ستاو که‌وته‌خۆ بۆ فلان کار، ئه‌گه‌ر ئه‌وکه‌سه‌ به‌وپه‌ری جیددی‌و په‌رۆشییه‌وه‌ به‌ته‌مای ئه‌وکاره‌ بێت[1].

به‌لام ئێمه‌ مه‌سه‌له‌یه‌کی تر له‌ وشه‌ی هه‌ستان (قیام) له‌م جێگه‌یه‌دا تێده‌گه‌ین. له‌وانه‌شه‌ هه‌ستانێکی راسته‌قینه‌ی هه‌ست پێ‌کراو بێت به‌مانای وه‌ستان (وقوف) به‌و ره‌نگه‌ی که‌ رێگه‌ی خودایان هه‌لبژاردبێت‌و خوداش دلیانی جێگیرو دامه‌زراوکردبێت‌و ئینجا ئه‌وان هه‌ستابن‌و راوه‌ستابن‌و به‌ئاشکراو به‌راشکاوی رایانگه‌یاندبێت که‌خودای په‌روه‌ردگاری ئه‌وان، خودای ئاسمانه‌کان‌و زه‌وی یه‌، هه‌روه‌ها ده‌شێت مه‌به‌ست له‌هه‌ستان (قیام): (اذا قاموا) کۆشش‌و لێکۆلینه‌وه‌و بایه‌خ دان‌و په‌رۆشی‌و ماندوو بوون بێت، چونکه‌ ئه‌وان جیددی‌و راستگۆبوون له‌ هه‌لبژاردنی رێگای خواداو، پاشان به‌جوامێری‌و وره‌و ئیراده‌وه‌ په‌یره‌ویی رێگاکه‌یان کردووه‌.

هه‌روه‌ها شێوازێکی دی له‌ هه‌ستانه‌که‌یان تێده‌گه‌ین، ئه‌ویش بزاوتن‌و کۆشش‌و هه‌ولدانه‌، به‌مانای ئه‌وان باوه‌روئیمانیان ته‌نها له‌بازنه‌ی زانیاری یه‌کی تیۆری (نظري)و فیکری‌و عه‌قلیدا دانه‌ناوه‌و، هه‌ر ته‌نهاش به‌رۆشنبیری یه‌ك‌و مه‌عریفه‌یه‌ك‌و شاره‌زایی یه‌ك دانه‌ناوه‌، به‌لکو هه‌نگاوێکی تریان ناوه‌ که‌به‌ به‌روبوومێکی سروشتی وئه‌نجامێکی لۆژیکی (منطقي)ی مه‌عریفه‌ی هزرو رۆشنبیری وعه‌قلی داده‌نرێت، ئه‌وه‌ش له‌کاتێکدا بووه‌ که‌هه‌ستاون‌و جوولاون‌و کۆششیان کردووه‌.

بێگومان هه‌ستان‌و کۆششکردنیشیان هۆکارێك بووه‌ له‌ به‌هێزکردنی باوه‌ریانداو، پاشان بزاوت‌و جموجول‌و هه‌نگاوه‌ کرده‌یی (عملی)یه‌که‌شیان زۆر پێویست‌و ته‌واو که‌ری باوه‌ره‌که‌یان بووه‌. که‌وابوو هه‌ر ده‌بێت باوه‌ر ئیمانمان زیندوو کاراو به‌هێز بێت، وه‌ك ئیمانی ئه‌و لاوانه‌ هه‌رده‌شبێت که‌ ئه‌و ئیمانه‌ پێشه‌واو

---

(١) القرطبي/ ١٠: ٣٦٥-٣٦٦.

ڕێنیشاندەرمان بێت بۆ هەنگاوە کردەیی یەکان وجم وجۆڵە دەرەکییەکان بەو ڕەنگەی ژیانمان هەمووی بەگوێرەی ئەو باوەڕەدا بڕێژینەوەو، پاشان هەربەو باوەڕەوە ڕووبکەینە لای کەسانی ترو بانگەوازیان بکەین بۆ لای ڕێبازی خودا.

بێگومان هەستانیش بە ئیمانو ئیسلامەوەو بە جێگیربوون لەسەری و بە بانگەواوکردنی بۆ لای ئاتاجی بە چەند دڵێکە کە هەڵبژێری ئەو باوەڕەنو پاشان لێی پڕ دەنو، ئینجا داوا لەخوداش دەکەن کەبەهێز ودامەزراویان کات، چونکە کاتێك خودا دڵانی لاوەکان (هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە)ی لەسەر باوەڕ دامەزراوو جێگیرکردووە، هیواو ورەو هیممەتیشی پێ بەخشیونو، ئەوانیش بەباوەڕەکەیانەوە هەستاون.. هەمووڵێکی باوەڕدارو جیهادکاریش هەمیشە ئاوان، بێگومان قورئان داوای ئەو هەستانو هەڵوێستەمان لێ دەکات کەهەموو کارێکی بایەخدانو هیممەتو ورە لەگەڕانو لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لەخۆ دەگرێت، ئەگەر ئەم کارانەش بەجێ بگەیەنرێت ئەوا مرۆڤ باوەڕو پابەندیی هەڵدەبژێرێت.. خودا فەرموویەتی: - ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ٤٦﴾ سبأ. واتە پێیان بڵێ من یەك پەندو دەرس بەئێوە دەگەیەنم ئەوەیە کە دوو دوویان یەك یەك لەپێناوی خوادا هەستنو ئیمانو ئیسلام وەرگرن، پاشان بیربکەنەوە لەوەی کە هاوەڵەکەتان (واتە پێغەمبەری خودا ﷺ شێت نیەو هیچ جۆرە شێتییەکی بەپڕوپاگەندەی ئێوە تێدا نیە، بەڵکو ئەو ترسێنەرێکە بۆتان لەبەردەم سزایەکی سەخت دا".

شتێکی سەیرو سەمەرەش لە ڕێبازی سۆفیگەرییدا هەیە، ئەوەیە گوایە ئەوان پەیوەستن بە هەستانەکەی هاوەڵانی ئەشکەوتو ئەو وتەیەیانەوە کە گوتیانە: (ربنا رب السموات والارض) ئەمەشیان کردۆتە بەڵگەیەك بۆخۆیان لەسەر شیاوبوونی ڕاوەستانیانو حەرەکاتیانو سەماو خۆبادانیان لە هەڵقەکانی زیکرو دەروێشیو سروودبێژیدا..

ئیمامی (قرطبـي)یش وەڵامی ئەو پەیوەستبوونەی سۆفیەکانی وەهاداوەتەوە کە بەڵگە هێنانەوەکەیانی پووچەڵ کرۆدتەوەو گوتوویەتی: "ئەمە پەیوەست بوونێ ناڕاستە، چونکە لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە هەستاون و یادو زیکری خودایان لەو بارەیەوە کردووە کە ڕێنمایی کردوون بۆ ڕێی ڕاست، هەروەها سوپاسی خودایان لەسەر بەخشش ونیعمەتەکانی کردووە..ئیدی ئەمەلە کوێ وئەو ڕەفتارەی سۆفیو درەوێشەکان لەکوێ کە پێ بەزەویدا دەدەن و سەمادەکەن و شان هەڵدەتەکێنن، بەتایبەتیش لەم زەمانەدا کە لەکاتی بیستنی دەنگە ناسکەکانی منداڵو ژناندا حاڵیان لێ دێتو ئەو سەمایانە دەکەن.. بەڕاستی نێوانیان واتە: (نێوانی ئەمانو لاوانی نێو ئەشکەوتەکە ئەرزو ئاسمانە) پاشان ئەو نەریتەش لەلای کۆمەڵی زانایان حەرامە. ئیمام (ابوبکری طرسوسي)یش دەربارەی (ڕێچکەی سۆفییگەریی) پرسیاری لێ کراوەو لە وەڵامدا گوتوویە: (سەماکردنو حاڵ لێ هاتن یەکەم جار هاوڕێ یانی (سامیری) دایانهێنا، ئەوەبوو دوای ئەوەی جەستەی گوێرەکەیەکی لە ئاڵتوون بۆ کردن، کە هیچ گیانێکی تێدانەبووو دەنگێکی وەك بۆڕەی مانگای لێدەهات، کەوتنە سەماکردن بەدەوری داو حاڵیان لەخۆیەوە دەهێنا)[1].

---

١) (القرطبي/ ١٠٣٦٦)

## "لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ"

هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە هەستانو گوتیان:﴿ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ الكهف ﴾، هەروەها هەستانو گوتیان ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾ الكهف ﴾.. بێگومان ئەو ڕێبازەی تریان دەپەرست و، چەندین خواوەندیان لەجیاتی خودای پەروەردگار بۆ خۆیان دانابوو. بۆیە داوایان لەگەلەکەیان کرد، کە بەڵگەو پاساوو پاکانەو نیشانەیەکی ڕوونو ئاشکرایان لەسەر شیاو بوونی ئەو باطیلەی لەسەری بوون، پێ بدەن، پاشان بڕیاری ئەنجامی ئاساییان لەسەر ئەوەدا، ئەنجامەکەش ئەوەبوو کە: (بێگومان هیچ کەسێك ستەمکارترو زۆردارتر نیە لەوکەسەی درۆ بۆ خودای پاكو میهرەبان هەڵدەبەستێتو، هاوبەشی بۆ دادەنێتو شتی تری لەگەڵدا دەپەرستێت.

جا بۆیە وتەی لاوەکان: "لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ" واتە (بۆچی بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا لەسەر شیركو بێباوەڕییتیەکەیان ناخەنە بەرچاو)؟!

ئەم وتەیە حەقیقەتێکی بنەبڕ (قاطع)ی قورئان دەخاتە ڕووو بڕیار لەسەر ڕێسایەکی زۆر پێویستی قورئانیش لەبابەتی عەقیدەو فیکرو بیرو ڕاکاندا دەدات.

(لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ ) ئەریَ بۆچی بیانووو بەڵگەو پاساوێك لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی خۆیان ناهێننەوە؟!.. لێرەدا پیتی (لولا) پیتی مەرج (حرف شرط) نیە، بەڵکو پیتی هاندانو پاڵنانە، چونکە ئەگەر لەدوای (لولا)وە فرمان (فعل) هاتبێت، ئەوابە پیتی ئامرازی هاندانو پاڵنان دادەنرێتو، بەمانای (هلا) دێت، واتە (بۆچی)؟!

خۆ ئەگەر لەدوای (لولا) ناو (اسم) هەبێت ئەوا بە پیتی مەرج (حرف شرط) دادەنرێت كە پیتی (امتناع لوجود)ە.

بێگومان قورئانی پیرۆز دەیەوێت خەڵكی هەموویان بە ئاكارێكی زانستیو مەنهەجیو بابەتیانەوە لە مەسەلەی عەقیدەو فیكرو بیروڕاو تێڕوانینیاندا بجوولێنەوەو، فیكرو ڕایەكی وەها وەرنەگرن، گەر لەگەڵ ڕاستیدا نەگونجێتو، گەر لایەنە زانستیو مەنهەجیو بابەتیانەكەشی تیادانە بێت.

جابۆ ئەوەی ئەم سیفەتە هەرە پێویستەی ڕێبازە پەیرەوكراوەكەیان بەدی بهێنن، دەبێت نیشانەو بەڵگەو پاساو لەسەر بیروباوەڕیان بخەنە ڕووو ئەو بەڵگەو پاساوەش دەبێت روونو ئاشكرا بێتو هەموو عەقڵێكی ساغ پەسندی كاتو لەگەڵ هەموو دانایی یەكی راستیشدا بگونجێت.

خۆ ئەگەر هەرمرۆڤێك بەڵگەو پاساوو نیشانەیەك لەسەر ئەوەی باوەڕی پێی هەیە، یان لەسەر ئەوەی كە بە وتن دەری دەبڕێت، داوابكاتو تەنانەت هەر بیروڕاو فیكرو ڕێسایەكیش لەسەر بنچینەی بەڵگەیەكی ئاشكرابێت بخاتە لاوە، ئەوا خەڵكی واز لە زۆربەی وتەكانو بیروباوەڕەكەیان دێننو بەمەسەلە بەڵگەنەویستە دانپێدانراوەكانیان دادەنێن بەڕاستی ئەمڕۆ زۆربەی ئەو بیروباوەڕو ئەفكارو ڕێساو تێورو دروشمانەی لە جیهاندا بڵاوبوونەتەوە لە بێئاگاییو بۆشایییەكی توێژینەوەی زانستیو مەنهەجیو بابەتیانەدانو پێویستیان بە بەڵگەو نیشانەو پاساوی ڕەوایە.

قورئانی پیرۆزیش داوای بەڵگەو نیشانە لە خەڵكی دەكاتو ئەم داوایەشی بەتایبەتی خستۆتە بەرچاوی كافرانو لەسەرفیكرو بیروڕاو ڕێساكانیان گفتوگۆیان لەگەڵدا دەكات.

خودای مەزن لەبارەی دیاریكردنی شتە حەرامكراوەكانەوە فەرموویەتی ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ

مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ الأعـراف ﴾. واتــە "بڵــێ بێگومان خودای پەروەردگار هەموو درۆو گوناه و سەرپێــچی یــەکی ناشــیرینی چ بەکردار، یان بەگفتار بێتو، چ بە ئاشکراو دیار بێــت، حــەرام کــردووە، وەك ئــەو کردارانەی، کە بە دەستی ئەنقەست دەکرێت، وەك کوشتنو زیناو دزیکردن، یان بــە پەنهانیو شاراوە بێت، وەك کردارە ناوەکییــەکانی دڵ لــە مەســەلەی حەســوودیو نیازی خراپ، هەروەها بڵێ: خــودا هــەموو جــۆرە سەرپێــچییەك، کــە (گونــاه)ی لــێدەکەوێتەوەو هەموو جۆرە ستەمو دەستدرێژیەکیشی بۆ سەر خــەڵکی، کــە بــە ناهەق ستەمیان لــێدەکرێت حەرامکردووە، هەروەها شەریكو هاوبــەش بــۆ خــودا دانانیشنی حەرام کردووە، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خــوارەوەو، پاشــان ئەوەشی لێ حەرام کردوون، کە لەخۆتانەوەو بەبێ بەڵگەو وتەو قسەی وەها لەســەر خودا دەربڕن، کە زانستتان لەسەری نیە.

هەروەها قورئان وتەی ئەو موشریکانەشی هێناوە، کە کوڕیان بۆ خودا داناوەو، بەوەش وەڵامی داونەتەوە، کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر ئەو وتەیەیــان نیە:

﴿ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ۖ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ یونس ﴾.

هەروەها قورئان جەختی لەسەر ئەوەش کردووە، کــە ئــەو موشــریکانەی هــیچ بەڵگەیەکیان لەسەر شیركو هاوبەش بۆ خوادانانیان نیــەو وێــڕای ئــەوەش ســوورن لەسەر نەریتی هاوبەش بۆ خوادانانەکەیانو مشتومڕ لە ئایەتەکانی خــوادا دەکــەن ئەوە بێگومان بەهۆی خۆ بەزل زانینیانەوەیە لــەناخی خۆیانــدا، وەك دەفــەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۙ إِن فِى صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ ۚ وَمَا .. ﴿٥٦﴾ غافر ﴾

واته" ئەوانەی مشتومڕ له ئایەتو نیشانەکانی خوادا دەکەن بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان لەخوداوه بۆ هاتبێت ئەوانه لەدڵیاندا نەریتی خۆ بەزل دانانو ئێرەیی پێبردنیان هەیه. بەڵام بێئەوەی بگەن ئەو مەبەستانەی خۆ بەزل دانانو ئێرەیی پێ بردنه".

له شوێنێکی تری قورئاندا، خودا فەرمانی بەپێغەمبەری خۆی (محمد) ﷺ کردووه، که با بەرپەرچی موشریکان له پەرستنی بتو پەیکەرەکان بداتەوەو پووچەڵیان بکاتەوە، چونکه هیچ بەڵگەیەکیان لەسەری نیه وەك دەفەرموێت "

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ النجم ﴾.

واته: (ئەی ئەوانەی هاوەڵ بۆ خوادادەنێن، ئایا دەتوانن هێزو توانای ئەو بتانەم پێ ڕاگەیەنن که (لات —ی پەرستگەی — قورەیش)و (عوززا–ی پەرستگەی — طائیف)و (مەنات–ی پەرستگەی — بنو کعب)نو، ئایا ئەی موشریکان، ئێوه وای دادەنێن، که ئەم بتانه کچانی خودان، ئایا کوڕەکان بۆ خۆتان دادەنێنو، کچانیش له مێینه بۆ خودا دادەنێن، بەڕاستی ئەمه دابەشکردنێکی ناتەواوو ناڕێکه، بێگومان ناوی ئەو بتانەش (لاتو عوززاو مەنات) چەند ناوێکی دانراوی خۆتانو، چەند شتێکی ناولێنراوی خۆتانو بابو باپیرانتانن‌و، خوداش هیچ بەڵگەو بیانوویەکی لەسەر ئەو مەسەله دەسهەڵبەستانەی خۆتان نەناردۆدته خوارەوە، بەڵکو ئەوان بەو وته ناڕاستو خولقێنراوانەیان، دوای گومانو هەواو ئارەزووی نەفسیان کەوتوون، لەکاتێکدا (محمد) ﷺ لەلایەن پەروەردگاریانەوه پەیامی ڕێی ڕاستی بۆ هێنان، کەچی سوودیان لێ وەرنەگرت".

بێگومان بێباوەڕان هیچ بەڵگەو بیانووو پاساوێکیان لەسەر ئەو بێباوەڕیو ڕێبازە پووچەڵە نیە، کە پەیڕەوی دەکەن، تەنانەت گەر هەموو تەمەنیشیان تێدا بەسەربەنو، ژیانی بۆتەرخانکەنو عەقڵو ژیرییان تیا بڕەتێننو، خۆیان بەگەڕانو خواستنو لێکۆڵینەوەوە ماندوو بکەن. چونکە بەڵگەو پاساوێ بۆ هیچ ڕێچکەیەك نیە، تەنها بۆ یەك حەقیقەت نەبێت، ئەویش حەقیقەتی پەرستراوێتیو پەروەردگارێتی خودای پەروەردگاری جیهانییانەو، پابەندییشە بە هەر فەرمانو حوکمو ڕێساو بنەمایەکەوە کە لەخوداوە ئاراستەی بەندەکانی کرابێت.

ئێمەش لەم سەردەمەماندا ئەو وتەیەی (هاوەڵانی ئەشکەوت)، کە بەگەلەکەیان ڕاگەیاندبوو) بەو کەسانەی هاوچەرخی خۆمان دەڵێینەوە، کە لە بەرنامەی خودا دەرچوونو ڕێگەیەکی دی پیادە دەکەن، پێیان دەڵێین:

﴿ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ الكهف ﴾؟!

## " وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ "

دوای ئـەوەی لاوەکـان (هـاوەڵانی ئەشـکەوتەکە) گەیـشتنە ئـەو قۆناغـە لـە لێکۆڵینەوەو وەبەرنانی ڕێی ڕاست، هەروەها دوای ئەوەی هێزی خۆیانو توانایان لە بەرامبەر هێزو توانای گەلەکەیاندا زانیو، دوای ئەوەش بۆیان دەرکەوت کە ئـەوان لەئاست ڕووبەڕووبوونەوەو گۆڕانکارییدا دەستەوسـانن، بڕیـاری خـۆ دابڕانیـان لـە گەلەکەیان داو، وایان بە چاکتر زانی کە بۆ ئەشـکەوتەکە بـڕۆنو، هەنـدێکیان بـە هەندێکی تریان گوت: ﴿وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ الكهف﴾ بـەمانای: بەهۆی ئەوەی بڕیاری خۆ دابڕانتان لەگەڵە کافرەکەتان داو، بڕیاری خۆبە دوورگـرتن لەو بەندایەتییە بێ ناوەڕۆکەی ئەوانتاندا کە چەند پەرسـتراوێکی تریـان لـەجیاتی خودا پەرستووە، لەبەرئەوە بەرەو ئەشکەوتەکە بڕۆنو پەنای بۆبەرن، چونکە ئـەوێ باشترین شوێنە بۆ دابڕانو، هەر لەوێش خودا باڵی ڕەحمـەتو بـەزەییتان بەسـەردا دەکێشێتو بەسـەرتاندا بڵاویدەکاتـەوەو شـوێنی شـیاوی نیـشتەجێ بوونتـان بـۆ دەڕەخسێنێـت.

## " کــەی لە گـەلەکـەیان دابــڕاون؟"

ئەو پرسیارەی خۆی دەردەخاتو قوت دەبێتەوە، ئەوەیە: کەی لاوە باوەڕدارەکان بڕیاری خۆ دابڕان لەگەلەکەیاندا ؟

وەڵامەکەش ئەوەیە، ئــەوان دوای دیراســەکردنی ئــەو واقیعــەی تێیــدا دەژیــان بڕیاری خۆ لێ دابڕانیانداوە، ئەوەبوو تەماشای هێزی گەلەکافرەکەیان کردو، بۆیــان دەرکەوت کە هــەموو دەزگــاو ئــامرازێکی هێــزو دەســەڵاتیان هەیــەو، تەماشــای خۆیشیان کرد کە هیچ هێزێکی ماددیی ئەوتۆیان لەبەر دەست نیە.

ئەمەش مانای وایە گەر ئەوان رووبەڕووی گەلەکــەیان ببنــەوەو لەبەرامبــەریان بجەنگن، ئەوا جەنگێکی نابەرامبەر دەبێتو ئاکامەکەشی هەر پێشتر زانــراوە کــە ئەوان تێیدا سەرناکەون، ئیدی بۆچی جەنگێکی ئاوا بگێڕن؟!

پاشان بەوردی سەرنجی هەڵوێستو ئاکاری گەلەکەشیان داوە، کــە ئــەوان هــەر سوور بوون لەسەر کفرو بێ باوەڕیو گوێ لەهیچ وشەیەکی (بانگەواز بۆ باوەڕهێنان بەخودا) ناگرنو، بەدەم بانگەوازی خاوەن بانگەوازەکەوە ناچن، بەڵکو پەنا دەبەنــە بەر لەنێو بردنی، یان ئازاردانو ئەشکەنجەدانیو، یاخود کوشتنیو ڕژاندنی خوێنی، کەوا بوو هیچ سوودێك لەمشتومڕ لەگەڵ کردنیان، یان لەبانگەوازکردنیاندا نیە.

لەبەر ئەوە لاوە باوەڕدارەکان زانییان، کە هیچ سوودێك لە وجودیان لەگەڵیانــدا نەماوەو، هیچ توانایەکیش بۆمانەوە لەگەڵیاندا نەماوە، بەڵکو تەنانــەت دەترســان لەوەی، کە بەڵایان بەسەردا بێننو لەباوەڕەکەیان پاشگەزیان کە نــەوە. بۆیــە هــیچ ڕێگە چارەیەکیان نەمابوو، تەنها خۆدابڕانو رووکردنە ئەشــکەوتەکە نــەبێت تــاکو لەگەڵ باوەڕەکەیاندا بژینو، خودای پەروەردگاریان تێدا بپەرستن بێگومــان بڕیــاری خۆدابڕانەکەیانو رۆشتن بەرەو ئەشکەوتەکەش، بڕیارێکی ڕاستو بەجێ بوو ولەگەڵ بارودۆخو واقیعیاندا دەگونجا، بۆیەش خودا نزاکــەی بــۆ گیراکــردنو، بــاڵی ســۆزو رەحمەتی بۆ کردنەوەو، وەك مەنزڵگایەکی هێمن بۆی سازکردن.

## "ئایا ئێمـەش لە خۆدابڕاندا شـوێن پێی ئەوان هـەڵگرین"

هەندێك كەس لە موسڵمانان دەربارەی (خۆدابڕانی هـاوەڵانی ئەشـكەوت (لـە گەلەكـەیان) پرسـیارێك دەخـولقێننو دەڵـێن: (بـەو پێودانەگـەی كـە هـاوەڵانی ئەشكەوتەكە ئیماندار بوونو بڕیاری خۆ دابڕانیشیان ڕاستو دروست بووەو خوداش لە قورئاندا ستایشی هەڵوێستەكەیانی كردووە، ئایا دەشێت ئێمەش لـەوەدا شـوێن پێی ئەوان هەڵگرین؟ ئەی چ ئەركێكمان لەسـەرە ئەگـەر خۆمـان لـە گەلەكـەمان دابڕیو ڕوومان كردە ئەشكەوتو چیاكانو یان لە ماڵەكانی خۆماندا گۆشەگیربینو خۆمانیان لێ دابڕین!؟).

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: بـۆ مرۆڤـی موسـڵمان ناشـێت، كـە خـۆی لـە خەڵكی دابڕێتو بەجەستە لێیان جویێ بێتەوەو، پەیوەنـدییان لەگـەڵ بپـچڕێنێتو تێكەڵاوییان نەكاتو بانگەوازو ئاموژگارییان نەكات، بۆیە ناشێت لەم سەردەمەدا مرۆڤی موسڵمان لەخۆ دابڕاندا شوێن پێی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتە هەڵگرێت.

## " جیاوازی یەكانی نێوان ئێمـەو ئـەوان"

چەند جیاوازییەكی بنچینەیی لەنێوان واقیعی ئەمڕۆی موسـڵمانانو هـاوەڵانی ئەشكەوتەدا هەیە، ناشێت كەواقیعی موسڵمانان بەهەمان پێوەری واقیعـی ئـەوان هەڵسەنگێنین، لەو جیاوازیانەش:-

١- هاوەڵانی ئەشكەوت شەرعێكی تری جودا لـەم شـەرعەی ئێمـەیان هـەبووەو، بەپێی ئەو شەرعەیان بۆیان شیاوە كە خۆیان لە گەلەكەیان دابڕنو پاساوی پـێ ڕانەگەیاندنیشیان بۆ داناون، بەڵام ئێمە لەم حوكمەدا شوێن پێیان هـەڵناگرین. بەڕای یەكلاكراوەی زانایانی (اصول)یـش" شـەرعی گـەلانی پـێش ئێمـە، بـە شەرعو یاسا بۆ ئێمە دانانرێت".

٢- شەرعی ئێمە بە ڕاشكاوی ئامـاژەی بـۆ قەدەغـەبوونی دابڕانكـردووەو، بـە ڕاشكاویش باسـی پێویـستبوونی ڕاگەیانـدنو بانگـەوازیكردووە. لـە قورئانـدا چەندین ئایەتی ڕوونو ئاشكرا لەم بارەیەوە هەیە، وەك:

أ- خودا فەرموویـەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ المائدة﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر هەر شتێك، كە لە خودای پەروەردگارتەوە بۆت هاتۆتە خوارەوە بەخەڵكیی ڕابگەیەنە، گەر وانەكـەیت ئـەوا ڕاسـپاردەی خودات نەگەیانـدووە، خـوداش خـۆی لـە دەسـدرێژیی كـافران دەتپارێزێـت، بێگومان خودا ڕێنمایی كۆمەڵی بەدڕەفتاران ناكات.

ب- هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦۚ... ﴿٢٣﴾ الجن﴾، واتە: پێیان بڵـێ مـن جگە لەخودا كەس نامپارێزێت، جگە لە خوداش هیچ پەنایەكم نیە، هەروەها هیچ زیانو ڕێنمایی یەكیشم بۆتان نیە، تەنها ئەو ڕاگەیاندنە نـەبێت، كـە لـە خوداو راسپاردەو پەیامەكانیەوە پێتان دەگەیەنم.

بێگومان ئیـسلام تـەنها بـە تێكـەڵبوون لەگـەڵ خـەڵكیو بانگـەوازكردنیان بڵاودەبێتەوە، مرۆڤـی موسـڵمانیش، تـەنها لـەڕێی بانگـەوازو پێڕاگەیانـدنو ڕوونكردنەوەوە، ئەركی سەرشانی خۆی ڕادەپەڕێنێتو لە بەرپرسارێتیو سـزاش ڕزگاری دەبێت.

٣- بێگومان پێغەمبەر ﷺ هـانی داویـن لەسـەر تیكـەڵبوون لەگـەڵ خـەڵكیو، ئارامگرتنیش لە بەرامبەر ئازارگەیاندنیانو، پاشان ڕێی خۆ لـێ دابڕانیـشیانی لێگرتووین.. لە ڕێنماییو ئامۆژگاریەكانیشیدا ئەم فەرموودەیەمان بەسە، كـە (ابن ماجه) لە (عبدالله كوڕی عومەرەوە) (خودا لێی رازی بێت) گێڕاوێتیـەوە

کە گوتوویەتی: (پێغەمبەری خـودا ﷺ فەرموویـەتی: **((المـؤمن الـذي يخـالط الناس ويصبر على اذاهم، اعظم أجرا من المؤمن الذي لايخالط الناس ولايـصبر على اذاهـم))**[1]... واتە" ئەو ئیمانداره‌ی تێکـەڵاوی خـەڵکی دەبێـتو ئـارام لەسەر ئازاردانیان دەگرێت، لەو ئیمانـداره پاداشـتی گـەورەترە کـە تیکـەڵاوی خەڵکی نابێت وئارام لەسەر ئازاردانیان ناگرێت".

بێگومان (تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی) دەبێـت لـەپێناوی ئامۆژگـاری کـردنو بەیاد هێنانەوەیان لەرێبازی چاکدا بێت، نابێت موسڵمان، باز بەسەر ئاینەکـەی دابدات، یان بنەماکانی پشتگوێ بخات، یاخود بـە بیـانووی خۆتێکـەڵاوکردنی خەڵکی کاری ناشیرینو حـەرامکراو ئـەنجام بـدات. بەڕاسـتی هـاوەڵی بـەڕێزو سەنگین (عبدالله کوڕی مسعود) (خـودا لێـی رازی بێـت) پیـاوێکی هێجگـار وردبینو زیرەكو کراوەو هاوسەنگبووە، کاتێك گوتوویە: (خالط النـاس و دینـك لاتكلمنه)[2]. واتە" بەهاوسەنگیو ڕێکسازی لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ بە، بـەڵام دەخیل وریابە لەوەی کە بەهۆی کاری خراپو، بـەد رەفتـاریو، وازهێنـان لـە ئەرکی سەرشانەوە ئاینەکەت زامدارو بریندار بکەیت".

٤- پاشـان چـوارەمین جیـاوازی لـەنێوان ئێمـەو هـاوەڵانی ئەشـکەوتەکەدا، ئـەو واقیعەیەکە ئێستا تێیدا دەژیین، ئـەوان بێگومـان لـەنێو گـەلێکی کـافرو بـێ بـاوەڕدا دەژیـان کەبـەردەوام سـووربوون لەسـەرکفرو، هەمیـشە بانگـەوازو ئامۆژگاری یەکانیان رەتدەکردەوە، بۆیەهەردەبوایەخۆیانیان لێ دابڕن.

بەڵام ئێمە لەنێوەندی کەسانێکی موسڵمانی وادا دەژین کە زۆرجار مەسەلەیەکی هاوبەش (کە ئایینی ئیسلام) لەنێوانماندا هەیەو دەشێت لێیەوە هـەنگاونێینوکاری لەسەر بنیات بنێینو، لەرێی پێکەوە ژیان ولەگەڵ تێکەڵبوونیانەوە بیانگێڕینەوە بۆ خانەی پابەندیو پەیڕەوی کردنی بەرنامەی خودا.

---

(١) ابن ماجة، كتاب (صلى الله عليه وسلم٦) الفتن، باب ٢٣ – الصبر على البلاء) حديث ٤٠٣١.
(٢) رواه البخاري- تعليقا- في كتاب ٧٨ –الادب- باب ٨١ الانبساط الى الناس في ترجمة الباب.

## "لەنێوان دابڕانی جەستەیی و فیکریی دا"

لێرەشدا پێویستە ئاماژەبکەین بۆ دابڕانی فیکریو، جیاوازیی لەگەڵ دابڕانی جەستەییدا دابڕانی جەستەیی ئەوەیە خەڵکی بەجی بێڵێتو بەلەش ولارەوە خۆتیان لێ دابڕییتو لەگەڵیاندا نەژییت، بەڵکو ئەوەت لاباشتربێت کە لە کونجی ماڵەکەتا لێی دانیشیت، یان لە ئەشکەوتو چیاکاندا، وەك زانیشمان ئەمە شیاو نیە.

بەڵام دابڕانی فیکریی، ئەوەیە بەجەستە تێکەڵاویی خەڵکی بیت، بەڵام بە فیکرو دیدوبۆچوونو ڕەوشتو ڕەفتار لێیان جودا بیت، واتە بەهەستو شعوورو تێڕوانینت خۆت لەو ڕێبازە پووچەڵەی ئەوان دابڕیتو پەیڕەویی هیچ بەشێکی ڕێبازەکەیان نەکەیتو تەنها بە ڕێبازی ئیسلام هەڵسوکەوت بکەیت، بەم رەنگەش تێکەڵاوییان دەکەیتو کاریشیان تێ دەکەیت لەکاتێکدا لەبەر بەستێکی باشی وادایت کە کارت تێ ناکەن.

## "لەنێوان تەنگەبەریی دنیاو، بەرفراوانی ئەشکەوتدا"

لاوە باوەڕدارەکان بڕیاری خۆدابڕان لە گەلەکەیانداو، پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکەو ئومێدەواربوون خودای پەروەردگاریان رەحمەتیان بەسەردا برێژێت، خوداش نزای بۆ گیراکردنو، ئومێدو تکایانی بۆ بەدیی هێنانو، لە ئەشکەوتەکەدا ڕەحمەتی خۆی بەسەردا ڕژاندن بەڕاستی مرۆڤ سەری لەو دیمەنە دەسوڕمێت، بڕوانە:

ئەو دنیا فراوانو پانو بەرینەی کە تێیدا لەگەڵ گەلەکەیان دادەژیان، وێڕای فراوانیەکەی، لەبەرچاویان تەسکبۆتەوە، چونکە، بەتاڵ بووە لە ئیمان، پاشان بۆیە

دنیایان لەلا تەنگەبەربۆتەوە، چونکە پڕبووە لــە کفـرو لــە بــێ بــاوەڕیی بــەخودا. بەرتەسکبوونەوەی دنیاو ژیانی دنیاش لەکاتێکدایە، کە لە ئیمان خــاڵی دەبنــەوەو کە کفرو بەدکاریی وگومڕایی بەتەواویی دایان دەپۆشێت، ئیـدی مرۆڤـی بــاوەڕدار هێندە بە تەسكو تەنگەبەر دەیانبینێــت کەخەریکــە هەناســەکانی لــێ دەبڕێــت- کەچی ئەو ئەشکەوتە — تەسکەشیان- لەلا بەرفراوان بۆتەوەو هەســتیان واکــردووە کە فراوانو پانو بەرینە، جائاخۆ لەکوێوە ئەم هەستەیان بۆ هاتبێت؟!

بێگومان ئەوە هەستکردنێکی ڕاستەقینەیە، نەك خەیاڵێك یان دڵنەوایيەك یــان گومانێك بێت، هەربۆیەش مرۆڤی باوەڕدار کاتێك پەیڕەویی ئیسلامەکەی دەکاتو لەنێو ڕاستییەکانی باوەڕەکەیدا دەژی، هەست بە خۆشیو ئاســوودەییو دڵفراوانــی دەکات. لاوەکان ئەم ڕاستیانەیان لەئەشکەوتەکەدا دۆزیبووەوە، ئەوەبوو بەئیمانەوە لەنێو ئەشکەوتەکەدا ژیان وتامی بەندایەتیو خۆشی پاڕانەوەی شــیرینی ئیمانیــان تێدا چەشتو، هەستیان بە بەرفراوانیەکەی کردبوو.

دیارە ئەوەی، کە ئەشکەوتەکەیانی فــراوانو ئاســوودەو ئــــارام کردبــوو، ئــەو ڕەحمەتە زۆرەی خودا بوو، کە خوازیــاری بــوونو کــە خـــوداش خواســـــتەکەیانی بەجــێ گەیانــدبوو ڕەحمــەتی خــۆی بەســەر داڕشــتبوون﴿...يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ...﴿١٦﴾ الكهف﴾. بەڕاستییش خودا لە ڕەحمــەتی خــۆی بەسەرداڕشــتنو، ئەشکەوتەکەیانی لــێ پڕبوو و، هەر بەوەش بە کامەرانیو بەختەوەری ژیــان. هــەر ســەبارەت بــە ڕەحمــەتیش خــودا فەرموویــەتی: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ...﴿٢﴾ فــاطر﴾، واتــە" گــەر خــودا دەرگای خێر لە هەر کەسو خەڵکێك بکاتەوە، کەس ناتوانێت دایخات، گەر خوداش خۆی دایبخات، کەس ناتوانێت جگە لە خوداو لەجیاتی خودا بیکاتەوە".

## کاریگەریی رەحمـەتی خـودا لە گوتاری (سـید قطب)دا

بێگومان (سید قطب) —خودا لێی خۆشبێت- دەربارەی (کاریگەریی رەحمـەتی خودا لەسەر ژیان کاتێك ئاوێزانی دەبێت)، هەروەها دەربارەی ئەو رەحمەتە لەسـەر دنیا کاتێك تێیدا بلاّودەبێتەوەو، لەسەر مرۆڤی باوەڕداریش کاتێك بـالّی بەسـەردا دەکێشێت، چەند وتەیەکی هەیەو دەربارەی کاریگەریی ژیانیش بەبێ ئەو رەحمەتە، دواوە، لە وتەیەکیدا گوتوویەتی: (هەر نیعمەتێکیش ئەگەر خودا ڕەحمـەتی لەگـەڵ دانەنێـت دەبێتە سزاو ناخۆشی، هەر نیعمەتێکیش ڕەحمەتی خودای لەگـەڵ بێـت، خۆی لەخۆیدا دەبێتە نیعمەت).

مرۆڤ گەر لەسەر دڕکیش بخەوێت بەلاّم ڕەحمەتی خودای لەگەڵ دابێت ئەوا ئـەو جێگە دڕکاوییەی بۆ دەبێتـە پێخـەفێکی نـەرم، کەچـی ئەگـەر لەسـەر ئاوریـشم بخەوێتو، بەلاّم رەحمەتی خودای لـێ بڕابوو ئـەوا دەبێتـە دڕکـەلاّنێکی ئەسـتوورو ئاگرین. گرانترین کێشەش بەرەحمەتی خـودا چارەسـەر دەبێـت، بەکێـشەیەکی زۆر سادەو ساکار دەردەکەوێت. بەلاّم ئەگەر لە چارەسەری ساناترین کێـشەدا رەحمـەتی خودا نەمابێت ئەوە ئالۆزوو دژوار دەبێت. هەر بەو رەحمەتە خـودایی یـەش ڕێگـە ترسناكو ئالّۆزەکان دەبڕێتو وەك ڕێگە هێمنو متمانە پێ کراوەکان دەردەکەوێت. کەچی شێوازو ڕێبازە ئاسانەکان بەبێ رەحمەتی خـودا دەبنـە بنکـەی لەناوچـوونو فەوتان هیچ بارگرانیەکیشی لەگەڵ رەحمەتی خوادا نیە، بەڵکو لەگرتنـەوەی دایـەو کە لەجیاتی ئەو دەست بەشتێکی ترەوە بگیرێت. هیچ بارگرانیەك لـەو رەحمەتـەدا نیە تەنانەت گەر لەمرۆڤی رەحمەت پێ کراو لەتاریکییەکانی زینداندا بێت، یان لە دۆزەخی سزای دنیایـدا بێـت، یـاخود لـە توولـەڕێی تیاچووندا.. هـیچ خۆشـیو بەرفراوانیەکیش لە حالّەتی نەمانی رەحمەتی خوادا نیە تەنانـەت گـەر مـرۆڤ لـەو پـەڕی نـازو نیعمەتـدابێتو بـچێتو لەکانگـەی هـەموو خێـرو خۆشـیو

خۆشگوزەرانیەکیش دابێت. چونکە هەر بە ڕەحمەتی خودا لەناخی دەروونەوە کانیاوی بەختیاریو ڕەزامەندیو ئارامی دەتەقێتەوە، هەر بە نەمانی ڕەحمەتی خوداش لەناخی دەروونەوە میلەکانی کاتژمێری بێ ئارامیو ماندوێتیو بەڵاو نارەحەتیو مەینەتی دەزرنگێتەوە[1]".

هەروەها (سید قطب) چەند نموونەیەك دەربارەی ئەو پێغەمبەرو کەسە پیاوچاکانەش دەخاتە ڕوو، کە خودا بەڕەحمەتی خۆی دەرگای خێرو سەرفرازیی لێ کردوونەتەوەو حاڵو گوزەرانیانی بۆ خۆشیو بەرچاوتێری گۆڕیوە، لەمبارەیەشەوە گوتوویەتی: (رەحمەتی خودا لە هیچ جێگەو زەمانێکدا لە هیچ خوازیارێکی نەگیراوەتەوەو لێی ئاڵۆزنەکراوە، ئەوەبوو پێغەمبەری خودا (ابراهیم) - سلاوی خودای لێ بێت- لە ئاگرەکەدا رەحمەتی خودای بینیەوە، (یوسف) (سلاوی خودای لێ بێت) ڕەحمەتی خودای لەبیرەکەدا بینیەوە، پاشان لە زیندانیشدا هەر دیتی. (یونس) -سلاوی خودای لێ بێت -یش لەنێو سکی نەهەنگەکەداو لە سێ تاریکیدا بەدیی کرد، (موسا)ش -سلاوی خودای لێ بێت- لە دەریادا کاتێك منداڵێکی ساوای دابڕاو لە هەر هێزو هەر پاسەوانیەك بوو، رەحمەتی خودای پێگەیشت، هەروەها لە کۆشکی فیرعەوندا، کە دوژمنێکیشی بوو، لە بۆسەدا بووە بۆیو بەدوایدا گەڕاوە. هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەش لە ئەشکەوتدا ڕەحمەتی خودایان بەدی کردووە لەکاتێکدا ئەو ڕەحمەتەیان لە کۆشكو تەلارو خانووەکانی نێو شاردا لەدەست دابوو، بۆیە هەندێکیان بە هەندێکی تریان گوتبوو: ﴿...فَأْوُۥٓا إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ...﴿١٦﴾ الكهف﴾، دە پەنا بەرنەبەر ئەشکەوتەکەو لەوێ خودا دەتانخاتە بەر ڕەحمەتی بەرفراوانی خۆی.. پێغەمبەری خوداش محمد ﷺ خۆیو (ئەبوبەکر)ی هاوەڵی، لە ئەشکەوتدا رەحمەتی خودایان

---

(١) في ظلال القرآن، ٥: ٢٩٢٢.

بینیەوە لـە کاتێکیـشدا کـە گەلەکـەیان بەدوایانـدا دەگـەڕانو شـوێن پێکانیـان هەڵدەگرتن.. ئیدی هەر کەسێك لەوپەڕی نائومێدییدا تـەنها پـەنای بـۆ رەحمـەتی خودا بردبێتو هەر ڕووی لە قاپیی رەحمەتی خودا کردبێتو وازی لـە هـەر قـاپیو دەروازەیەکی دنیایی هێنابێتو، دەستی لە هەر هێزێکی ڕواڵەتباری رەحمـەتو لـە هەر دیاردەیەکی گومان پێبراویـشی هـەڵگرتبێت، ئـەوە بـە بێگومـان ڕەحمـەتی خودای بەدی کردووەو بەرکەوتووە"[1].

## دیاریکردنی ئەزموونێـکی دی لە مامـەڵە لەگەڵ رەحمەتی خوادا..

هەروەها (سید قطب) کە بە شێوەیەکی واقیعی مامەڵەی لەگەڵ رەحمەتی خوادا کردووەو، کە بەکردەوەش لە حەقیقەتەکانی ژیانیدا هەڵسوکـەوتی کـردووەو، کـە دیویـەتی ژیـان بەرەحمـەتو بـەزەیی خوداییـەوە چـۆنە، ئـەزموونێکی کردەیـیو زیندووی خۆیمان لەمامەڵە لەگەڵ ڕەحمەتـدا بـۆ دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: " ماوتـەوە بڵێم، کاتێك من بەسوپاسکردنی خوداوە ڕوو لە ڕەحمەتێکی تایبەتی خودا بـووم، لەم ئایەتەوە پێم زانیوەوە لەساتێکدا هاتۆتە بەرەو ڕووم، لەساتێکدا، کـە مـن لـە تەنگانەو ماندوێتیو تەنگەبـەریو ناڕەحەتیـدا بـووم، لـە سـاتی وشـك هـەڵاتنی رۆحیو، بەدبەختی دەروونیو، تـەنگ پـێ هەڵـچنین بەتەنگانـەو، بـارگرانی لـە ناڕەحەتیدا، لەوساتانەدا رەحمەتی خودا هاتۆتە بەرەو رووم، لەو ساتانەدا خودا بۆی ئاسانکردم کـە ئاگـاداری بـاری ڕاسـتیو حەقیقەتەکـەی بم، لەوکاتانـەدا بـارانی حەقیقەتەکەی بەسەر رۆحمدا بڕژێت وەك ئەوەی بـۆنو بەرامەیـەکی خـۆش بێـتو هـەڵی دەمـژمو هەسـت بەرۆشـتنو خـشانی بکـەم لـەناخی دەروونمـدا. ئەمـە حەقیقەتێکەو دەیچێژم، نەك مانایەك بێتو پەی پێ ببەم، بەڕاستی خۆی لەخۆیـدا

---

[1] في ظلال القرآن، ٥: ٢٩٢٣.

هەر ڕەحمەت بووەو لەخودی خۆیشدا تەفسیرێکی واقیعیی ئەو ئایەتەم بۆ دەکات کە ئەم کرانەوەیەی خۆی بۆ کردوومەتەوە.

بێگومان من لەمەوپێش ئەم ئایەتەم زۆر خوێندۆتەوەو، زۆرجاریش پێیدا تێپەڕیوم، بەڵام لەو ساتە وەختەدا، کە باسمکرد بۆنو بەرامەو گوڵاوی بەسەردا ڕشتوومو ماناکەیم بەدیی کردووەو، ڕاستیو حەقیقەتەکەیم بەتەنها بۆ دابەزیوەو پێشی گوتووم: (ها ئا ئەوەتا نموونەیەك لەرەحمەتی خودا کاتێك دەکرێتەوە، دەبڕوانە چۆن دەبێت)؟

لەڕاستیشدا خۆ هیچ گۆڕانکارییەك لە چواردەورم (لە دەرەوەی قەوارەی جەستە) پەیدا نەبووە، بەڵام هەموو شتێك لە ناخمدا گۆڕا، بەڕاستی ئەمە نیعمەتێکی هێجگار گەورەیە، ئەگەر دڵ بۆ حەقیقەتێکی گەورە لە حەقیقەتەکانی وجود (وەك بۆ ئەم حەقیقەتە گەورەیەی نێو ئایەتەکە) والآ بێتو بکرێتەوە"[1].

## " شوێنی ئەشکەوتەکە"

لە ئاسانکاریی خودا بۆ لاوە باوەڕدارەکان، ئەو ئەشکەوتەبوو، کە سرووشی پەنا بۆ بردنی پێدان. قورئان ئاماژەی بۆ جێکەوتە (موقع)ی ئەشکەوتەکەو ئەو بەڵگەو نیشانانەی نێویشی کردوە، لەگەڵ ئاماژە بۆ ئەو سەربازە ڕامکراوانەی خودا، کە ڕامو بەردەست (تسخیر)ی کردبوون بۆ خزمەتکردنیانو، ئاسانیی تێدا نیشتەجێ بونیـــان: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴿١٧﴾ الكهـــف﴾: ئیمام (ابن کثیر) – خودا لێی خۆشبێت- لە ئایەتەکەوە بەڵگەی ئەوە دێنێت، کە

(١) في ظلال القرآن، ٥: ٢٩٢٤.

ڕووی دەرگای ئەشكەوتەكە بەرەو باكوور بووە، لـەم ڕووەوە گوتوویـەتی: (لەمـەدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی، كە دەرگـای ئـەو ئەشـكەوتە ڕووەو بـاكوور بـووە، چونكە خودا خۆی هەواڵەكەی وا ڕاگەیاندووە، كـە ئەگـەر تیـشكی خـۆر لـەكاتی هەڵاتنیدا كەوتبێتە نێو ئەشـكەوتەكەوە، ئـەوا بـەلای ڕاسـتدا لار بۆتـەوە، واتـە سێبەرەكەی بەلای ڕاسـتداو لـەرێی لاربوونـەوەی تیـشكی خـۆرەوە كـەم بۆتـەوە. ئەمـەش لەبەرئەوەی هەرچەندە لە ئاسۆدا بەرزتربێتـەوە، تیـشك‌و گەرمییەكەشـی كەم دەبێـتەوە، تا لە كاتی ئاوابووندا هیچ شتێكی وای لەو جێیەدا نامێنێت. هەر بۆیەش فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾: واتـە خۆرەكـە لـە باكووری دەرگاكەیەوە چۆتە نێو ئەشكەوتەكەیان ئەمەش لـە ڕووی خۆرهەڵاتـەوە. بەمەش دەلالەت لەسەر ڕاستیی وتەكەیان دەكات[1].

خۆ ئەگەر ئێمە هاوڕێی (ئیمام – ابـن كـثیر) بـین لـە بەڵگەهێنانەوەیـدا بـەو ئایەتە لەسەر جێكەوتەی ئەشكەوتەكە، بەڵام لەوەدا هاوڕێی نین، كـە خۆرەكـە لـە باكووری دەرگاكەیەوە لەكاتی خۆرئاوابووندا چووبێتە نێو ئەشكەوتەكەیەوە، چونكە ئایەتەكە هەواڵی ئەوەی ڕاگەیاندووە، كە خۆرەكە لە كاتی خۆرئـاوا بوونـدا ڕووەو بـاكوور لێیـان دووركەوتۆتـەوەو لاربۆتـەوە مانـای (تَّقۡرِضُهُمۡ) واتـە: لێیـان دوور دەكەوتەوەو خۆی لێ لادەدات، چونكە لەزمانی عەرەبیـدا (قـرض) مانـای (قطـع) دەگەیەنێت.

زانای ئیـسلام (مجاهـد) گوتوویـەتی: "تَّقۡرِضُهُمۡ - واتـە بـەجێیان دەهـێڵا - (تتـركهم)".

(قتادە)ش گوتوویەتی "تَّقۡرِضُهُمۡ - واتە: وازیان لـێ دەهێنێت (تدعهم)".

(١) تفسير القرآن العظيم لابن كثير (٣: ٧٥)

(نحاس)یش گوتوویەتی: "(القرض) واتە بڕین و وازلێهێنان (القطع والترك)" ئەمەش لە زماندا زانراوە.

(قرطبی)یش گوتوویەتی:" ماناکەی ئەوەیە ئەوان هەڵبەت خۆریان (وەك ڕێزلێنانێك بۆیان) بەرنەکەوتووە.. ئەمە وتەی (ابن عباس)یشە"[1].

## ئەوە لە بەڵگەو نیشانەکانی خودا بووە.. (ذلك من آيات الله).

کۆمەڵی زانایانی تەفسیر بیروڕایان وابووە، کە خۆر نە لە کاتی هەڵاتن و، نە لە کاتی ئاوابووندا بەریاننەکەتووە، ئەمەش بەهۆی جێکەوتەی ئەشکەوتەکەو ئەو دەرگایەشیەوە کە ڕووەو باکوور بووە، لەمەڕ ئەم واتایەش، ئیمام (ابن کثیر) گوتوویەتی: (ئەمە ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەو کەسەی بەوردی سەرنجی داوەو زانیاریی لەسەر زانینی ڕووکارەکەو، سووڕانەوەی خۆرو مانگ و ئەستێرەکان هەیە. ڕوونبوونەوەی ئەمەش لەوەدایە ئەگەر دەرگای ئەشکەوتەکە لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە بوایە، ئەوا لەکاتی خۆرئاوا بووندا هیچ شتێکی وای لەتیشکی خۆر بەرنەدەکەوت، گەر لە ڕووی قیبلەشەوە بوایە ئەوا لەکاتی هەڵاتنداو لەکاتی ئاوابوونیشدا بەرینەدەکەوت، سێبەرەکەش بەلای ڕاست و بەلای چەپدا لار نەدەبووەوە، خۆ ئەگەر دەرگا لە ڕووی خۆرئاواشەوە بوایە ئەوا لەکاتی هەڵاتنی خۆردا تیشکی خۆری تێنەدەچوو، بەڵکو لە نیوەڕۆوە تا خۆرئاوابوون تێی دەچوو"[2].

جێی باسیشە ئێمە هاوڕای (ابن کثیر) نین لە تێگەیشتنیدا دەربارەی بزووتنی خۆر. گوایە ئەو ئەشکەوتەی، کە لاوەکانی تێدابووە، لەکاتی خۆرهەڵاتن و ئاوا

(١) الجامع الاحكام القران للقرطبي (١٠: ٣٦٩).
(٢) تفسير ابن كثير (٣ ٧٥).

بووندا خۆری لێکەوتووە، چونکە ڕێی تەواوو یەکلاکراوە لە وشەکانی ئایەتەکە دایە، کە خۆر هەرگیز نەچۆتە ئەشکەوتەکەوە، نە لە کاتی بەیانیو نە لە کاتی نیوەڕۆداو، خوداش هەرخۆی زانایە (والله اعلم).

قورئانی پیرۆز جێکەوتەی ئەشکەوتەکەو بزووتنی خۆری بە دەوریدا بە دوو نیشانە لە نیشانەکانی خودا داناوە: (ذلك من آيات الله). مانای بەنیشانەبوونی ئەمانەش، ئەوەیە بێگومان خودا خۆی خواستو قەدەری بۆ ئەوان وابووە، کە پەنا ببەنەبەر ئەو ئەشکەوتەو سرووشی چوونە ناوەوەی پێداون، پاشان ویستی خودا لەسەر ئەوەش بووە، کەوا ئەشکەوتەکە لەو جێگەیە دابێتو، بزاوتی خۆریش بەدەوریدا بەو شێوەیە بێت.

بەڵام زانا (زجاج) بۆ چوونێکی تری لە تەفسیری ئایەتەکەدا هەیەو بەڕای خۆی: "بێگومان کرداری خۆرەکە نیشانەیەك بووە لە خوداوە، بێئەوەی دەرگای ئەشکەوتەکە روو لەو لایە بووبێت، کە وای پێویست کردبێت"[(١)].

بە مانای: خۆرەکە، ئەگەر بەپێی سروشتی خۆی بوایە، دەشیا بچێتە نێو ئەشکەوتەکەوە، بەڵام خودا فەرمانی پێکردووە کە لەئاست لاوەکاندا کورت ولار بێتەوەو، لە بەیانیاندا لێیان دوورکەوێتەوەو لەنیوەڕوانیشدا هەروەها، خۆ ئەگەر خودا ئەو فەرمانەی پێ نەکردایە، ئەوا خۆرەکە دەکەوتە نێو ئەشکەوتەکەوە.

ڕای یەکلاکراوەش لەمبارەیەوە ئەوەیە، کە کۆمەڵێ زانایانی ئیسلام پێی گەیشتوون، وێناندنی شێوەی کەوتنیان لەنێو ئەشکەوتەکەدا قورئانی پیرۆز وێنەی کەوتنو راکشانی لاوەکانی لەنێو ئەشکەوتەکەدا بەشێوەیەکی هێجگار وردو دیارو کاریگەرو گرتووەو بەجۆرێکیشە، کە کاتێك بەسەرهاتەکەیان دەخوێنینەوە

---

(١) تەفسیری- قرطبي- (١٠:٣٦٩)، هەروەها (امام- ی- شنقیطي-یش) لە أضواء البيان) (بەرگی ٤، لاپەرە ٣٣-٣٤)دا، رای (زجاج)ی هێناوەو پەسەندی کردووەو، ئەو رایەی پێشووشی ڕەت کردۆتەوە .

وادەزانین خەریکە دەیانبینینو هەست بە وجودیان دەکەین، ئەمەش لە دیارییو زیندوێتیی وێناندنی ئیعازی بێهاوتای قورئانە...

وەك خودا دەفەرموویت: ﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ وَكَلْبُهُمْ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ الكهف ﴾.. لە ئایەتەکەی پێشوودا ئاماژە کراوە بۆ قەدەرو خواستی خودا بۆ ئەوان کە لە ئەشکەوتەکەدا بن، چونکە ئەوە بۆئەوان گونجاو بووە.. لەم ئایەتەشدا ئاماژە کراوە بۆ قەدەرێکی تری خودا بۆیان لەکاتێکدا ئەوان نووستووو جێنشینی نێو ئەشکەوتەکە بوون، پارێزەرێکیان بەیارمەتی خودا بۆ ماوەتەوە،.. ئەم قەدەرو خواستە خوداییەش لە چەند خاڵێکدا خۆی دەنوێنێت، وەك:-

١- وای لێ کردوون کە چەندین ساڵی دوورو درێژ بخەون بێئەوەی زەوی لە لاشەکانیان بخوات، یان هەستەکانیان تێك بچێتو، بێئەوەی هیچ کەسێکیش لێ یان نزیك بێتەوە.

٢- بۆ ئەوەی لاشەو هەستەکانیشیان پارێزراو بێت، چاوەکانیان کراوەبوونو ڕوانینیان هەبووەو سەرەڕایی ئەوەی خەوتوویشن ئەمەش بۆ ئەوەی تێك نەچنو خراپ نەبن، هەروەها بۆ ئەوەی هەوایان بۆ بچێت، چونکە ئەمە زیاتر هۆی مانەوەی چاوانیان بووە.

٣- مەبەستێکی تریش لە هێشتنەوەی چاوانیان بەکراوەیی، لە فەرمایشتەکەی خوادا هاتووە: (لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا )، ئەمەش بەمانای بۆ ترساندنی هەرکەسێك بووە کە بۆی ڕوانیین، تاکو خراپەیەکیان دەرهەق نەکات، چونکە لە کاتێکدا بۆی ڕوانیونو بینیونی کەوا چاوانیان کراونەتەوەو وەك ئەوەش دیاربووە گوایە بۆی دەڕوانن، یەکسەر هەڵاتووە لەلایان.

٤- بۆئـەوەی زەوی لـە لـەش‌و لاریـان نـەخوات، هـەڵگێڕو داگێڕیـان پـێ‌كراوە: (وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ).. هەڵبـــژاردنی فـــەرمانی ڕانـــەبردوو (الفعل المضارع) لەم رستەیەدا (ونقلـبهم) كـە دەلالەتـە لەسـەر نوێ‌كردنـەوەو بەردەوام كـردن، دەلالەتیـشە لەسـەر ئـەوەی كـە هەڵگێڕانـەوەی لاشـەكانیان بەردەوام‌و هەمیشەیی بووە، نەك (وەك هەندێك لە پێشینەكان دەڵێن گوایە: لە ساڵێكدا دووجار بووە).

گەڕانەوەو خستنە پاڵی فەرمانی هەڵگەڕاندنەوەشـیان بـۆ (خـودا) دەلالەتـە لەسەرئەوەی، كە ئەمە كاری خوداو قەدەرو فەرمانی خۆی بـووەو دیـارە خـودا فریشتەیەك لە فریشتەكانیشی ڕاسپاردوە بەئەنجامدانی كاری هەڵگێڕانەوەیان.

٥- لە ڕێكی‌و تـەواویی بایەخپێـدانیان‌و پاراستنیـشیان، ئەوەیـە خـودا خواسـتی وابووە كە سەگێكیشیان لەپێش دەرگای ئەشكەوتەكە هەبووبێت،و لەو شوێنەدا هەڵتووتاوە (دانیشتووە) و، هەردوو پەلی لـێ‌بڵاوكردۆتەوەو نووستووە. بـەڵام بـــاری جەســـتەیی ســـەگەكە جـــێگیرو نـــەگۆڕبووە، واتـــە بـــەملاولادا هەڵنەگەڕێندراوەتەوە، بكەری پەل درێژكردن (بسط) كە لە عـەرەبیـدا (باسـط)ە بە (اسم ی فاعـل= بكەر) دادەنرێت‌و، مانای نەگۆڕی‌و مانەوە لەسەر یەك جۆرە حاڵەت دەگەیەنێت. ئیدی كێ دەتوانێت لێیان نزیـك بێتـەوەو ئازارێكیـان پـێ بگەیەنێت لەكاتێكدا سەگەكەشیان بەو حاڵەتەوە پاسـەوانە لەبـەردەم دەرگـای ئەشكەوتەكەدا.

٦- هەركەسێك بیری لە ئازاردانیان‌و دەستدرێژی كردنە سەریان كردبێتەوە، تـرس‌و بیم خراوەتە نێو دڵییەوە، دەستبەجێ لێیان هەڵاتووە.

وێناكردنی وردی ئەشكەوتەكەو باری جەسـتەییی لاوەكـانیش تێیـدا، بەڵگـەی سەرچاوەگیریی قورئانە.

وەك تێبینی دەكەین قورئان چەند زانیاریەكی وردو گرنگی (بەشێوازی ئیعجازی وێنەگرتنی دیمەنەكان) لەمەڕ ئەشكەوتەكەو جێكەوتـەو بزاوتـی خـۆر لەگەڵیـداو، لەمەڕ لاوەكانی نێو ئەشكەوتەكەش، خستۆتەڕوو.

زانایان ئەم زانیارییـە قورئانیانـەیان بـە بەڵگـەی سەرچـاوەگەریی (مـصدر)ی قورئان داناوە، كەوا لە قورئانـەوە سەرچـاوەیان گرتـووەو، هـەروەها بـەو بەڵگـەو نیشانانەشیان داناون، كە تەنها لەخوداوە هاتوون، نەك لە خودی (محمد)ەوە ﷺ.

ڕێبازی بەبەڵگە دانانەكەشیان ئەوەیە، پێغەمبەر ﷺ سـەبارەت بـە هـاوەڵانی ئەشكەوت پرسیاری لێكراوەو، وەڵامی پرسیارەكانیش بـەو زانیاریانـەوە هـاتووە، بەڵام زانیاریەكانیش نە لە تەوراتو نە لە ئینجلیشدا دیاری نەكراون، بەم ڕەنگەش ئەگەری وەرگرتنیان لەو كتێبانەوە پووچەڵ دەبێـتەوە.

وەك زانراویشە پێغەمبەر ﷺ لەژیانیدا ئەو ئەشكەوتەی نەدیوەو نەچۆتە سـەر لاوەكان لەنێو ئەشكەوتەكەدا.. بەم ڕەنگە ئەگەری وەرگرتنی ئـەم زانیاریانـە لـەو ڕێگەیەشەوە، كە گوایە دواتر خۆی خوێندبنیەوە، پووچەڵ دەبێـتەوە.

تەنها ئەوە دەمێنێتەوە، كە هەر خودای پاكو بێ خەوش زاناو شارەزایەو، هـەر خوداش خۆی سرووشی ئەو مەسەلەیەی بـە پێغەمبەرەكـەی ﷺ گەیانـدووە. بـەم پێیەش ئەوەمان بۆ دەسـەلمێت، كـەوا قورئـانی پـیرۆز سەرچـاوەی زانیارییەكانـەو بێگومان قورئانیش لەلایەن خوداوە نێردراوەتە خوارەوە.

(ئیمام السهیلی) لە كتێبی (الـروض الانـف)دا گوتوویـەتی: (سـوودی گـەورەو زانیاریی دیار لەو سـیفەتانەدا ئەوەیـە، كـە ئـەم زانیـاریو ڕوونكردنەوانـە هـیچ كەسێكیش لەوانەی كەلاوەكانیشی بینیوە، نەزانراوە، چـونكە هەركەسـێ: ئەگـەر چاویشی پێیان كەوتبێت، دەستبەجێ ترسێكی زۆری لـێنیشتووە، بۆیە نەیتوانیوە هەموو ئەو زانیارییە وردو گرنگانە دەربارەی بارودۆخی لاوە نووستووەكان بزانێتو بەوردی سەرنج لە حاڵەتو شێوەی خەوتنەكەیان بدات..

پێغەمبەری خوداش ﷺ هەرگیز نەیدیبوون‌و، هیچ قسەو باسێکی لەبارەیانەوە نەبیستبووو، کتێبێکیشی لەسەریان نەخوێندبووەوە، جگە لەوەی هەر نەخوێندەواریش بووەو لەنێو گەلێکی نەخوێندەواردا بووە، بەڵام بێگومان زانیاری‌و هەواڵێکی وای لەسەر ئەو بەسەرهاتە بۆهێنان کە پێشتر هیچ کەسێکی دی پێی نەگەیاندبوون.

ئەوەش لە ڕێی ئەو سرووش (وحی)ەی کە لە خوداوە بەوشێوە روون‌و ئاشکرایەو بەو بەڵگە تەواوانەوە بۆی هێناون)[1].

## سەگەکەشیان لە پیت‌و بەرەکەتی ئەوان بەهرەمەند دەبێت

قورئانی پیرۆز باسی ئەو سەگەشی فەرامۆش نەکردووە، کە یاوەری لاوەکان بووەو باسی شێوەی دانیشتنی کردووە کە هەردوو پەلی لێ بڵاوکردۆتەوە لەبەردەم دەرگاکەدا لەوانەشە هەندێك کەس پرسیار دەربارەی حیکمەتی باسکردنی سەگەکەیان بکەن، دیارە حیکمەت لەوەدا ئەوەیە کە - وەك پێشتر گوتمان — ئاماژە بۆ چاوگدارێتیی (قورئان)کراوە، دەنا چۆن پێغەمبەریش ﷺ دەیزانی کەوا (سەگیان لەگەڵ بووەو، هەردوو باڵی بڵاوکردۆتەوە، لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکدا) ئەگەر سرووش (وحی)ی بۆنەهاتایە؟!

زانایانی ئیسلام لەم ڕووەوە باس لەوە دەکەن کە بێگومان سەگەکەشیان هەمان پیت‌و بەرەکەتی ئەوانی بەرکەوتووە بەهۆی یاوەریکردنیانەوە.

ئیمام (ابن کثیر) گوتوویەتی (سەگەکەشیان بەهەمان پیت‌و بەرەکەتێك، کە بەر ئەوان کەوتووە، بەهرەمەند بووە، واتە وەك ئەوان بەوحاڵەتەوە خەوێنراوە، ئەمەش

---

(١) الروض الانف للسهيلي، ٣: ١٦٥-١٦٦) (بأختصار).

ســوودێکی یــاوەریکردنی پیاوچــاکانه. بــەم پێیــه ســەگەکەش بــاس‌و هــەوڵ‌و بەسەرهاتێکی هەبووه)[1].

ئیمامی (قرطبـی)یش گوتوویەتی: "خۆ ئەگەر هەندێك سەگ-یـان- سـەگێك- ئەو پله بـەرزەی بـەیاوەریکردن‌و تێکـەڵبوونی لەگـەڵ پیاوچـاکان‌و خواپەرسـتاندا دەستکەوتبێت‌و، بەم شێوەیه خوداش له کتێبەکەیدا هەواڵی لەسەر هێنـابن، ئـەی داخۆ کەسانی باوەڕدارو خواناس (که خودا بەیـەك دەگـرن‌و لـه یـەك خواپەرسـتی دان)و، تێکەڵی پیاوچاکان‌و خواویستان‌و خۆشەویستانی خودا دەکـەن، لـەچ پلـەو پایەیەك دا بن.. تەنانەت لەو جۆره هەواڵانەی تایبەت بـەو سـەگ‌و گیانەوەرانـەدا دڵنەوایی‌و لاواندنەوەیەك بۆ ئەو باوەڕدارانەش هەیـه، کـه هێـشتا نەگەشـتوونەته پلەکانی کامڵ بوون‌و درێغییان هەیه، بەڵام پێغەمبەریان ﷺ خۆشدەوێت"[2].

جا لەکاتی وردبوونەوه لـەم ئایەتانـەدا دەبیـنین جیاوازییـەك لـەنێوان هـەواڵی لاوەکان‌و، هەواڵی سەگەکەیاندا هەیه، جیاوازییەکەش ئەوەیه، ئەوان بەلای راست‌و چەپدا هەڵگێڕدراونەتەوه، کەچی سەگەکەیان وای لێ نەکراوه، بەڵکو تەنها هەردوو پەلی لەبەردەم دەرگاکەدا بڵاوکراوەتەوەو، بەوشێوەیه خەوتووه.

ئیمامی (سهیلی) هەوڵیـداوه حیکمـەتی ئـەو هەڵنەگێڕانەوەیـەی سـەگەکەش دەستنیشان بکات، ئەویش ئەوەیه، کـەوا لاوەکـان بـاوەڕدارن‌و لـه خۆشەویـست‌و شوێنکەوتوانی خودان، لەدنیاو له ڕۆژی دواییشدا، دیاره سەگەکه لـەدەرەوەی ئـەم ئایەتەیه، مەگەر نابینیت خودا فەرموویه (لەبەر دەرگاکه بووه/ بالوصید) واته: له حەوشەی ئەشـکەوتەکه، نـەك لەگـەڵ لاوەکـان لـه نـاوەوەی بوویێـت. بێگومـان مەلائیکەتەکانیش ناچنه نێو ماڵێکەوه، که سەگی تێدا بێـت)[3].

---

(١) تفسير ابن كثير، (٣: ٧٦).

(٢) تفسير القرطبـي (١٠، ٣٧١-٣٧٢).

(٣) الروض الانف (٣: ١٦٦-١٦٧).

جگە لەم حیکمەتە، دەشێت حیکمەتی تریشی تێدا بێت، وەك ئامـاژەکردن بـۆ تواناو قودرەتی خودا لەسەر پاراستنی نووستووەکان. ئەم توانا خودایییەش ژێربـاری هیچ هۆکارێك نیە، چونکە خودا لە ڕێی هەڵگێڕاندنیانـەوە لاوەکـانی پاراسـتووە، زەویـش لـە جەسـتەکانیانی نـەخواردووە، کەچـی لەکاتێکـدا خـودا لـە ڕێـی هەڵگێڕاندنـەوەوە سـەگەکەیانی نەپاراسـتووەو، زەویـش لەلاشـەی سـەگەکەی نەخواردووە سەرەڕایی ئەوەی سێ سـەدو نـۆ سـاڵ سـەگەکە بـەبێ جموجـوڵ لـەو حاڵەتەدا ماوەتەوەو جێگیـر بووە).

## " هەڵسـوکەوتی لاوەکـان دوای وەخەبـەر هێنانەوەیان لە نووسـتنەکـەیان "

خودا فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيْنَهُمْۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْۖ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍۚ قَالُواْ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ١٩ الكهف ﴾.

خودای پەروەردگار لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکەی وەخەبەرهێنان لەو خەوەی، کـە سێ سەدونۆ ساڵی خایاند، لەم ڕستانەشدا گوزارشتە قورئانیەکە، ئاوڕێکی جـوانی لەمـــەڕ بەخەبەرهێنانـــەوەیان بـــەکرداری زیندووکردنـــەوە (بعــث) داوەتــەوە: " وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ " چونکە کردارەکە هاوشـێوەی کـرداری زیندووکردنـەوەی مردووانە لە گۆڕەکانیانەوە، دەنا ئایا دەشێت مرۆڤ پتر لـە سـێ سـەد سـاڵ بـژیو بتوانێت جەستەشی بە پـارێزراویی بهێڵێتـەوەو، دوای ئـەوەش لـە نووسـتنەکەیو خەبەربێتەوە؟ بەڕاستی ئەمە موعجیزەیەکی دیاریی خوداییـەو، بەڵگەیـە لەسـەر توانای ڕەهاو بەربڵاوی خوداو، لەسەر خواستی بەجێگەیەنراوییشی.

هەروەها گوزارشت (تەعبیر) لە زیندووکردنەوە، مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە لاوە باوەڕدارەکان جەستەو هەستو شعورو پۆشاکەکانیان پارێزراو بوونو هیچ کەمو کوورپییەکیان تێدا پەیدا نەبووە.. (بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيْنَهُمْ )= (وەخەبەرمان هێنان تاکو پرسیارو گفتوگۆ لەگەڵ یەکدیدا دامەزرێنن لەمەڕ ماوەی نووستنیان) لە ڕستەکەدا (لام)ی (لِيَتَسَآءَلُواْ ) بەپیتی بەدوا دواچوون (لام العاقبة) دادەنرێت، بەمانای لە ئەنجامی پرسیارو بەدواداچوون لەنێوخۆیانو لەسەر ماوەی مانەوەیان.. دیارە ئەوان لەسەر ماوەی مانەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا پرسیاریان لە یەکدیی کردووە، بۆ نموونە یەکێکیان لێی پرسیون: (ئێوە چەند لەم ئەشکەوتەکەدا بە نووستوویی ماونەتەوە) یەکێکیشیان لە وەڵامیدا گوتوویەتی (ڕۆژێك یان هەندێك لەماوەی ڕۆژێك ماوینەتەوە.. لەوانەیە ڕۆژێك تەواو خەوتبین، یان بەشێك لە ڕۆژەکە خەوتبین).. ئەوان لەو بڕوایە دابوون هەر هێندە خەوتبن، چونکە هەرچی لە ئەشکەوتەکەدا بووە وای بۆ دەرخستوون کە ڕۆژێك یان بەشێکی ڕۆژ خەوتوونو، هەموو ئەو شتانەی نێو ئەشکەوتەکە دەلالەتی لەسەر ئەوە کردووە کە ماوەی خەوەکەیان درێژ نەبووە، چونکە هیچ شتێکی چواردەوری خۆیان تێك نەچووەو نەڕزیوەو نەگۆڕاوە.

وادیاریشە هەندێکیان ئەو وەڵامەیان بە وەڵامێکی وردو تەواو دانەناوەو زانیویانە، کە ناتوانن ماوەی مانەوەیان لە خەوی نێو ئەشکەوتەکەدا مەزەندە بکەن، بۆیە ئەو زانیارییەیان تەنها بۆ خودا گەڕاندۆتەوەو گوتوویانە: "رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ ".

لەم هەڵوێستەشیانەوە پەندو وانەیەك وەردەگرین، ئەوەیە نابێت خۆمان لەوەدا ماندوو بکەین، کە هیچ ئامرازێکی ساغو سەلیمو ڕێنماکاری وامان بۆ قووڵ بوونەوە تیایدا دەست دەکەوێت، چونکە ئەوە تەنها بەفیڕۆدانی کاتو هەوڵو

فیکرە، کەوابوو پێویستە ئەوە تەنها بۆخودا بگێڕینەوەو ئەوەی کە ناتوانین تیایدا قووڵ بینەوە، لەبارەیەوە بڵێین هەر خودا زانایە (الله اعلم).

﴿ قَالُواْ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُواْ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ الكهف ﴾.

واتە: "گوتیان: پەروەردگارتان زانایە لەوەی چەندە لەو خەوەدا ماونەتەوە. بۆیە ئێستاش دوای وەخەبەرهاتنتان ئەم دراوە زیوینەتان بە یەکێکتاندا بۆ بازاڕی نێو شارەکە بنێرن تاکو حەلاڵترین‌و باشترین خۆراکتان بەم پارەیەی پێمانە بۆتان بکڕێت‌و، کە چووە نێو خەڵکیشەوە، با بە هێمنی‌و نەرمی سەودایان لەگەڵدا بکات‌و بەهێواشی بەڕێدا بڕوات‌و کەس هەستی پێ نەکات، کە کێ‌یەو لە کوێوە هاتووە، چونکە ئەگەر خەڵکی کافری ئەو شارە شوێنەکەتان پێ بزانن‌و بیدۆزنەوە، بەرد بارانتان دەکەن‌و دەتانکوژن، یان ناچارتان دەکەن، کە بتانگەڕێننەوە بۆ نێو ئایینە ناشایستەکەی خۆیان، گەر واش بکەن، هەرگیز بە سەرفرازی‌و ڕەزامەندیی خودا ناگەن".

ئەم ئاڕاستەو ڕێنموونیکردنەش، کە بەهۆیەوە نێردراوەکەی خۆیان بۆ نێو شارەکە نارد، چەندین واتاو سرووش‌و ئاماژەی لەخۆ گرتووە، لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین:-

**یەکەم: شیاویی ڕاسپاردن:-**

هەندێك لە زانایان لە وتەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەوە (فَٱبْعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ )دا بەڵگەیەك لەسەر شیاویی راسپاردن لە ئیسلامدا وەردەگرن، ڕێسای

بەڵگە لێوەرگرتنەکەشیان ئەوەیە لاوەکـان کەسـێك لـەخۆیان راسـپارد بـۆ کڕینـی ئاتاجو پێداویستی خۆیان لە شارەکەو، پارەودراوی خۆیان پێسپاردبوو بۆ ئەو کارە.

پێشەوا (شنقیطی) لە (اضـواء البیـان): دا "شـیاوبوونی راسـپاردنو ڕاسـتیو دروستییەکەی دیاریکردوە ئەوەیە کە گوتوویانـە (فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ) دەلالەتە لەسەر راسپاردنی ئەو نێردراوە، یان بە کڕینی خۆراك.

هەندێك زاناش گوتوویانە:- (ئەم ئایەتە بە ڕەهـایی دەلالـەت لەسـەر شـیاوو بوونی راسپاردن ناکـات، بـەڵکو بەڵگـەی سـڵکردنو ترسـاندنە، چـونکە ئەگـەر هەموویان بۆ کڕینی پێویستی یەکەیان دەرچن ئەوا دوژمنانیان لەگومانی خۆیانـدا پێیان دەزانن و ئەوانیش پاساوی خۆیان دەبێـت، بۆیـە ئایەتەکـە دەلالەتـە لەسـەر ڕاسپاردنی کەسێك، کە پاساوی هەیە لەجیاتی غەیری خۆی. ئیمام (ابو حنیفە)ش هەمان ڕای هەیەو، هەر ئەمەش وتەی (سحنون)ە، کـە لـە هـاوەڵانی (مالـك)ەو، دەربارەی راسپاردنی کەسێك بۆ نێو ناکۆكو دژەکان ڕەوا بکرێت"[1].

(شنقیطي) ئـەم سـەرنجەی لەمـەڕ راسـپاردن بەشـیاو دانـاوە تـاکو دەربـارەی ڕاسپاردنو بەشدارکردنو مەسەلەو بەڵگەو لێکۆڵینەوەکانی ئەو وتەیـە دەربڕێـتو هەربۆیەش سی لاپەڕەی لە کتێبەکەی (اضواء البیان)دا بۆ تەرخان کردووە[2].

ئێمەش وای بۆ دەچین، کە (بەڵگە هێنانەوە بەو ئایەتە لەسەر ڕاستی ڕاسپاردن) لە ئایینی خۆماندا جێی تێڕامانو تاوتوێکردنە، چونکە ڕاست تر وایە بڵێین ئـەوە شەرعێکی پێش ئێمە بووە، نەك شـەرعێك بووبێـت بـۆ ئێمـە. هـەروەها وایـشی دەبیـنین، کـە ڕای هـەڵهێنجراوی (ئیمـام شـنقیطي) سـەبارەت بـە ڕاسـپاردنو بەشدارکردن دەرچوونە لەمانەوە سەر دەقەکە، ئەگەرچی ئاماژەکانی نێو دەقەکە لە تەفسیرکردندا واش بگەیەنن.

---

(١) (اضواء البیان، ٤ :٤٥).

(٢) (اضواء البیان ، ٣: ٤٥-٧٥)

## دووەم: شـــیاویی بەشـــداركردن:

(شنقیطي) بەڵگەهێنانەوەی هەنـدێك لـەزانایانی مەزهـەبی (ئیمـام مالـك)ی دەربارەی وتەی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە (فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ) لەسەر ڕاستی وشیاویی بەشداركردن هێناوەتەوە، وەك گوتویەتی: (هەنـدێك لـە زانایـانی سەر بەمەزهەبی ئیمام مالیك لـەم ئایەتـە پـیرۆزەوە شـیابوونی بەشـداریكردنیان خستۆتەڕوو چونكە ئەو لاوانە لەپارە زیوەكەدا بەشدارو هاوبەشبوون، كـە ناردیـان بۆ ئەوەی خۆراكیان بۆ پێ بكڕێت.

زانا (ابن العربي مالیكی) گوتوویەتی: (لەم ئایەتەدا هـیچ بەڵگەیـەك لەسـەر بەشداركردن نیە ئەویش لەبەر ئەو ئەگەرەی لەوانەیە هەریەكە لەولاوانە بەشی خۆی بەتەنیا بەنێراوەكەیاندا ڕەوانەكردبێت تاخۆراكی خۆی بەتەنیا بۆ بكڕێت).

(شنقیطي)یش لە هەڵسەنگاندنی ئـەم وتەیـەدا گوتوویـەتی: (ئـەوەی كـە ابـن العربي- باسی كردووە بەباری بینراوو ڕواڵەتی ماناكەییدا ئاڕاستەكراوە)[1] ئێمەش لە هەڵسەنگاندنی ئەو جۆرە بەڵگەهێنانەوەو جیاوازیی بیروڕایانەش دا ڕامان وایـە كە (هیچ هۆكارو پێویستییەكمان پێی نابێت، چونكە ئەوە شەرعو یاسایەكی پێش ئێمە بووە، نەك شەرعێك بووبێت بۆ ئێمە، چـونكە لەدەقـەكانی خۆمانـدا هێنـدە بەڵگەمان لەسەر شیاویی بەشداركردنو راسپاردن هەیە كە، بەسمانە.

## سـێیەم: گـەڕان بەدوای خـۆراكی حەڵاڵو باشـدا:

ئەوان نوێنەرەكەی خۆیان، كە ناردیـان بـۆ نێـو شـار، ڕاسـپارد بەچـاوگێڕانو وردبینـــیو، هێنـــانی خـــۆراك بۆیـــان، پـــاكو حـــەلاڵ بێـــت (فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ

---

(١) اضواء البيان، ١٠: ٥٠.

أَزۡكَىٰ طَعَامٗا )..بێگومان فەرمان (فعل)ی (فَلۡيَنظُرۡ ) بەڵگەیە لەسەر پێویستبوونی وردبوونەوەو چاوگێڕان‌و پشکنینی خۆراکی باش‌و هەڵبـژاردنی بەچـاکی. ئەمـەش زیاتر لەکاتی زۆریی حەرام‌و حوکمی نـەفامی‌و، کـەمی حەڵاڵـدا دەبێـت. مرۆڤـی موسڵمانیش لەم جۆرە بارودۆخەدا ئەوەی لـێ خـوازراوە، بـە وردیـی‌و وریاییـیـەوە بەدوای خۆراکی حەڵاڵدا بگەڕێت‌و، حەرام هەڵنەبژێرێت.

لە ڕستەکەدا وشـەی (أَزۡكَىٰ طَعَامٗا )یـش ئاوڕدانەوەیـەکی جـوانی قورئانـە لـە خۆراکی پاك‌و خـۆش‌و حـەڵاڵ.. لـەبارەی مانـای (أَزۡكَىٰ طَعَامٗا )ەوە چـەند وتـەو بیروڕایەك هەیە، بۆ نموونە: (ابن عباس) گوتوویەتی: (مانـای- أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا ) واتە: (حەڵاڵترین خۆراك). هەندێك لەزانایانی تریش گوتوویانـە، واتـە: (خۆشـترین خۆراك) هەندێکی تریشیان گوتوویانە، واتە: (هەرزانترین خۆراك) چـەند زانایـەکی تریش گووتوویانە، واتە: (زۆرترین خۆراك) بەڵام (ئیمام ابن کثیر) وتەی یەکەمی بە ڕاست وبەڕای یەکلاکراوە داناوەو گوتوویەتی: (مانای ڕاستی لەوتەی یەکـەم دایـە، چونکە مەبەستی لاوەکان لەخۆراکێکی باش‌و حەڵاڵدا بووە، سائیتر کـەم بووبێـت، یان زۆر بووبێت)[1].

## چـوارەم/ قورئان‌و حـەزی گشـتی لە خـۆراکدا:

لە وتەی لاوەکان ( أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا )دا ئاماژەیەکی دی هەیەو مەبەسـتیان لـە (أَزۡكَىٰ طَعَامٗا ) حەلالترین‌و چاکترین‌و خۆشترین خواردنـە.. لێـرەدا وشـەی (أَزۡكَىٰ) ماناکانی پاك‌و گەیشتوویی‌و چاکی‌و بەپیتیی دەگەیـەنێت. قورئـان ئـەوەمان لـێ دەخوازێت، حەزو میزاجمان لە هەڵبژاردنی جۆرەکـانی خـۆراك‌و پۆشـاکدا، بـەپێی ڕێنماییـیەکانی ئیسلام‌و ڕێساکانی حەڵاڵ‌و حەرام بێت.

(١) تفسیر ابن کثیر/٣ ٧٧

لە ڕێبازی نەفامیدا ئەم مەسەلەیە دەشێوێنرێتو، شوێنکەتووە نەفامەکانیش پیسو ناشیرینی دەکەن، چونکە حەزو میزاجەکانیشیان دەردەدارو شێوێنراوو ساختەن.

بێگومان خۆراکی باش لای ئەوان، کە بە (أَزْكَىٰ طَعَامًا )ی دادەنێن ئەوەیە بەپێی تازەترین شێوازو مۆدێلی کوڵاندنو لێنانو خواردن بێت، بۆ ئەوەی هۆکارە ئایینیەکەی تێدا ڕەچاوبکەن یان لەبازنەی حەڵاڵو حەرامدا بیهێڵنەوە. ئەوەی زیاتر جێی داخە ئەوەیە، ئەم (بۆچوونە جاهیلییە لەسەر پاکژترینو باشترین خۆراك) هەندێك کەسی لە موسڵمانانیش گرتۆتەوەو ئامادەنین مەسەلەی حەڵاڵو حەرام لە خۆراکدا ڕەچاو بکەن، بەڵکو وای دادەنێ، گوایە لەگەڵ حەزی ساغو میزاجی ڕاستدا ناکۆکەو پەیوەندیی بە هەڵبژاردنی چاکترینو ڕەوانترین خۆراکەوە نیە.

بێگومان پوختترین خۆراك لەژیاندا ئەوەیە خۆشترینو حەڵاڵترینیان بێت پوخت ترین پۆشاکیش لەژیاندا ئەوەیە کەوا لەگەڵ ڕێساو ڕێنماییەکانی ئیسلامدا گونجاو بێت دیارە خۆراکی حەرامو، پۆشاکی حەرامیش ئەوەیە پیسترینو خراپترینیان بن.

حەزی موسڵمانیش، کە قورئان بەرزو بەرێزی کردووەو، میزاجیشی، کە ئیسلام ڕێنماکارو ڕێکخەریەتی، خۆراکی حەرامو، پۆشاکی حەرام پەسەند ناکات، چونکە لەبازنەی شتەپیسو خراپو ناپەسەندەکاندا دایاندەنێت.

هەر خۆراکێکی حەڵاڵیش، پاكو پوختە، هەموو خۆراکێکی حەرامیش پیسە، هەموو پۆشاکێکی حەلاڵیش پاكو پوختە، هەموو پۆشاکێکی حەرامیش پیسە.

ئەم ئاماژە قورئانیەش ئەوەمان لێ دەخوازێت ئاوڕو سەرنجی ورد لە ڕێنمایيو ئاڕاستەو پەندە جوانەکانی قورئان بدەینەوەو چەند بەڵگەیەکی ڕاستیان لێ دەربێنین، قورئانیش چەندەها ئاماژەی هەمەڕەنگو چەندین سەرنجی هەمەگیرو هەمەلایەنەی لەسەر هەموو چەشنە بوارێکی ژیان تێدایە، گرنگیش ئەوەیە ئێمە بزانین چۆن ئاوڕیان لێبدەینەوەو وەریان بگرینو سەوداو مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

## پێنجـەم/ "ولیتلطــف"

لاوەکان، نێردراوەکەی خۆیان بۆ نێو شار بەوە راسپارد، کـە نـەرمونیان بێـت، بەباشیو بەنەرمونیانی مامەڵە لەگەڵ خـەڵکی شـارەکەدا بکـات، کاتێـك پێیـان دەگاتو، شتیان لێ دەکڕێت.

نەرمونیانییش لەگەڵیاندا بەوە دەبێت، کە لەخۆبوردوو، ساکارو، هـێمنو، رۆح سووكو، ئاسانکار بێت، ئەم راسپاردەیەی ئەوان بۆ ئەو نێردراوە کەنەرمونیان بێت ئاوڕدانەوەیــەکی زیرەکانــەیان بــووە لــە گرنگیــی نــەرمونیانیو ســاکاریو لــەخۆبووردوویی لەژیانــداو، لــە پەیوەنــدی کــردن بەخــەڵکیو مامەڵــە لەگەڵــدا کردنیانو، لە کڕینو فرۆشتنندا.

ئەمەش ئاوڕێکی پێویستو ڕێنماییەکی گرنگە بۆ هــەر موســڵمانێكو، ئــەوە دووپاتدەکاتــەوە، کــەوا ژیــان تــەنها بــە نــەرمونیانی ڕێکــدەبێتو، بێگومــان پەیوەندیشی لەگەڵ کەسانیتردا تەنها بەنەرمونیانی دەبێت، دیارە مامەڵەکردنیشی لەگەڵیاندا لە گشت بوارە هەمەجۆرەکانی کارو، لەهەمـوو لایەنەکانی ژیاندا تــەنها بە نــەرمونیانی بەدیــدێتو ســەردەکەوێت. بەڕاســتی جیاوازییــەکی هێجگــار زۆر لەنێوان پیاوێکی (نەرمونیان لەگەڵ خەڵك)و پیاوێکی تـری (خـراپو دڵـڕەقو قــین لەدڵو تووڕە)دا هەیە نەرمونیانیو هێمنیو چاوپۆشــیو بەســۆزیی، پەیوەســتن بــە ئاکاری جوانو نەفسی ڕەزامەندو خوونەریتی هێدیەوە، دەشێت ئەم ڕەوشتە جوانانە بە تاقیکردنەوەو کۆشــشکردنو کۆڵنــەدانو هــەوڵی بــەردەوام دەســتەبەر بکرێــت. ئارامی بەئارام گرتنو، نەرمـونیانییش بەرەحمو سۆزبەخشین دەبێــت.

قورئــانی پیرۆزیــش ئامــاژەی بــۆ چــاکیی نــەرمونیانیو گرنگــی چاوپۆشــیو ئاسانکارییو نیعمەتی رۆح سووکی لەگەڵ خەڵکیدا کــردووە، ئەمــەش لەکاتێکــدا خودا ئەو ئاکارە بەرزەی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەخشیوەو پێی فەرمووە:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ لَهُمْ .. ﴿١٥٩﴾ آل عمران ﴾. واتە " ئەی پێغەمبەر بەهۆی رەحمەتی خوداوە تۆ نەرمونیان بوویت لەگەڵیاندا، دەنا ئەگەر کەسێکی دڵڕەقو توندوتیژبوویتایە، هەموویان لەدەورت دەتەکینەوە. دەتۆش لێیان ببوورە وداوای لێخۆشبوونیان لەخودا بۆ بکەو راوێژو تەگبیریشیان لەسەر کاروبارەکان پیٚبکە".

هەروەها پێغەمبەری خوداش ﷺ لە چەندین فەرموودەیدا، هانی داوین لەسەر نەرمونیانیو رەحمو بەزەیی لەگەڵ موسڵماناندا، لەو فەرموودانەش:-

- وەك ئەوەی، کە (مسلم) لە(جریری کوڕی عبدالله) وە — خودا لێی رازی بێت- گێڕاویێتییەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**من يحرم الرفق يحرم الخير كله**))[1].. واتە "هەرکەسێك بە نەرمونیانی بێبەش بوبێت، ئەو لە هەموو خێرێك بێبەش کراوە ".
- هەروەها (مسلم) لە (عائشة)ەوە گێڕاویێتییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((**يا عائشة ان الله رفيق يحب الرفق، ويعطي على الرفق مالا يعطي على العنف**))[2]. واتە.. "ئەی (عائشە)خودا نەرمونیانەو، نەرمونیانیی پیٚ خۆشەو، ئەو پاداشتەی لەسەر نەرمونیانی دەیبەخشێت، هەرگیز لەسەر توندوتیژی نایبەخشێت".

ئەمەش بانگەوازێکە بۆ ئێمە، لە هاوەڵانی ئەشکەوتەکەوەو لە قورئانو لە پێغەمبەری خوداشەوە ﷺ بۆ ئەوەی لە ژیانماندا نەرمونیان بین، لە گفتارو کردارەکانمانو، لە ژیانو پەیوەندییەکانمانو لە ئاشنایەتیو سەوداو ئاڵوێرییەکانماندا هەر نەرمونیان بین.. ئیدی ژیان بەئاسوودەییو بەختەوەریو خێرو خۆشی بەسەر

(١) رواه مسلم في (٤٥) كتاب البرو الصلة، باب (٢٣) فضل الرفق/ حديث (٢٥٩٢).
(٢) رواه في كتاب البـرو الصلة، باب الرفق، حديث رقم (٢٥٩٣).

دەبەین‌و، پەیوەندییەکانیشمان لەگەڵ کەسانی‌تردا لە خۆشی‌و نەرمونیانی‌و چاکیدا دەبێت خوداش فەرموویەتی: ﴿...وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا...﴿٨٣﴾ البقرة﴾، واتە.. "قسەی جوان‌و بەجێ‌و ناسك لەگەڵ خەڵکیدا بکەن".

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ فصلت﴾، واتە: (چاکەو خراپە وەك یەك نین. ئەوەی وتەی چاك‌و پەسەندی هەیە. یەکسان نیە لەگەڵ ئەوکەسەی، کە وتەی خراپ‌و ناپەسەندی هەیە. تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ بە هێمنی‌و نەرمونیانیی خۆت هەڵوێستی باشتر لەئاستیاندا بنوێنە وئیدی ئەوکەسەی دوژمنایەتی لەگەڵتا هەیە دەبێتە هاوڕێیەکی نزیکت، وەك ئامۆزایەك یان وەك کەسێکی نزیکتی لێ دێت. ئەم ئاکاری وەڵامدانەوەی (خراپە) بەچاکەیەش، تەنها ئەوکەسانە پێی بەهرەمەندن کە ئارامیان لە بەرامبەر کەسانی خراپ‌و بەدکاردا گرتووە، هەرکەسیش ئەم ئاکارە جوانەی ئارامگرتنی هەبێت زۆر بەختەوەرەو بەختێکی زۆری لە پێشبڕکێی بەدەستهێنانی خێرو هەڵوێستی چاکەدا هەیە.

### شەشەم: شاردنەوەی دەنگ‌و باسی خۆیان لە گەلەکەیان:

هەر لەو راسپاردانەی لاوەکان بەنێردراوەکەیان ئەوەبوو، هەواڵ‌و دەنگوباس‌و مەسەلەکەیان لەگەلەکەیان بشارێتەوە: ﴿وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ الكهف﴾، واتە:.. " با هیچ کەسێك هەستتان پێنەکات‌و بە هەواڵ‌و دەنگوباستان نەزانێت، چونکە ئەگەر بە کاروبارتان بزانن بەردبارانتان دەکەن‌و

دەتانکوژن، یاخود دەتانخەنە سەر دینی خۆیانو، بەم ڕەنگەش هەرگیز سەرکەوتوو نابن".

ئەوان پێشتر داوایان لە نێردراوەکەیان کرد، لەگەڵ خەڵکی شاردا نەرمونیان بێت وەك ئەوەی لە جموجووڵیداو لە گەیشتنە نێو شارەکەشدا، نەرمونیان بێت. هەروەها لەکڕینی خۆراکەکەو، لە هەڵسوکەوتیو لە گەڕانەوەشدا هێندە نەرمونیان بێت کە مەسەلەکەی خۆییان لێبشارێتەوەو هیچ گومانێکی لێ نەکەنو شك لە مەسەلەکەی نەکەنو دوای نەکەونو شوێن پێی هەڵنەگرن. ئەوان (واتە لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە) هۆی ئەم نهێنگیریو نەرمونیانیو مەسەلە حەشاردانەیان ئەوەبوە، کەوا بێگومان، ئەگەر گەلەکەیان پێیان بزاننو پەردە لەسەر مەسەلەکەیان هەڵدەنەوەو بگەنە ئەشکەوتەکەیانو رازی مانەوەیان دەربخەن، ئەوا بەردبارانیان دەکەنو دەیانکوژن، یاخود دەیانگێڕنەوە بۆ سەر ئەو ئاینە پووچەڵەو ڕێبازە ناڕاستەکەیانو، وایان لێ دەکەن باوەڕبەخودا نەهێننو، هاوەڵ (شەریك)ی بۆ دابنێن. بەم رەنگەش هەرگیز سەرکەوتوو نابن، نە لە دنیاو، نە لە ڕۆژی دواییشدا.

لەمەوە تێدەگەین، کە بێگومان هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە سووربوون لەسەر شاردنەوەی مەسەلەکەیانو، کە نابێت هیچ کەسێك پێیان بزانێت. هەربۆیەش ویستوویانە خۆیان لەچاوانیان بشارنەوە.

ئەمەش ئاماژەیە کەبۆ شیاوییو ڕەوایی شاردنەوەی ڕێکخستن. کەبێگومان دەشێت بانگەوازکاران شێوازی ڕێکخستنیان لەگەلەکەیان بشارنەوەو هەموو جمو جووڵێکیان بەنهێنی بێت و کەس پێیان نەزانێتو خۆشیان بۆیان دەرنەخەن، کە سەر بە چ تاقمو لایەنێکنو پەیوەندییان پێوەیان چۆنەو چەندە!!

دیارە دەشێت (کاری ڕێکخستنی ئیسلامی)یش بەنهێنیو پەنهانی بێت، ئەگەر هۆو زەروورەت وابخوازێت. بێگومان دوژمنانی ئەم ئاینە دەیانەوێت دەستی بەسەردا بگرنو، دژایەتی پیاوانو سەربازانی بکەنو، هەموو رەنگو شێوەیەکی کاری ئیسلامی بسڕنەوە. خۆ ئەگەر بانگەوازکاران لەو جۆرە ژینگەیەی وەك سەردەمی ئەم لاوانە دابوونو، لە قۆناغێکی لاوازیو بێدەسەلاتیدا بوون، ئەوا

بۆیان دەشێت کە ڕێکخستنەکەیان بەنهێنی بێت‌و کاروباری خۆیان لە ناحەزانیان بشارنەوە. بەڵام پێویستە لەسەریان کەوا کەسانی تریش بۆ ئەو ڕێبازەیان بانگ بکەن‌و، ئیسلامبوونی خۆیان بۆ ئاشکراکەن‌و، ئامۆژگاریی گەلەکەشیان بکەن‌و لە هەوڵی سەرختستنی ئاینەکەیاندا بن نەك هەر لێی دانیشن‌و بەو نهێنگیری‌و مەسەلە شاردنەوەیەوە سەرقاڵ بن، واز لە بەجێهێنانی ئەرکەکەیان بهێنن.

بێگومان ڕێکخستن‌و پێکەوە جۆشدانی (بزاوت‌و ڕێکخستنی نهێنی)و (بانگەوازو ڕوونکردنەوەی ئاشکرا) ئاتاجیان بەهاوسەنگی‌و زیرەکی‌و دانایی هەیە، جگە لە ئاتاجی زۆریان بەیارمەتی‌و ڕێنمایی خوداش.

قورئانی پیرۆزیش چەندین نموونەو پەندی لەسەر (نهێنیگیریی‌و پەنهانی‌و باسنەکردنی کارو چالاکی لەلای کەسانی تر) پیشان داوین، وەك بەسەرهاتی خوشکەکەی (مووسا) کە بە ڕاسپاردەی دایکیی کەوتە شوێن هەواڵی براکەی‌و لە دوورەوە چاودێریی دەکرد بێ ئەوەی ناحەزانیان پێی بزانن.

لە ژیاننامە (سیرە)ی پێغەمبەریشدا ﷺ گەلێك نموونەی لەم چەشنەمان لەسەرکاری پەنهانی پێغەمبەری خودا ﷺ هەیە کە چۆن ڕێکخستنە ئیسلامییەکەی لە یەکەمین قۆناغی بانگەوازەوەو لە هەردوو بارودۆخی نێو (مەککە)و (مەدینە)شدا تا دواقۆناغ بەڕێوە بردووە. دیارترین نموونەش لەم ڕووەوە ئەو بەرسەرهاتانەیە کە (ابو ذری غفاری)- خودا لێی رازی بێت- لەسەر موسڵمانبوونی خۆی گێڕاویێتییەوە کەوا باسی هەڵوێستی (فاطمەی کچی الخطاب) لە بەرامبەر دایکی (ابوبکری صدیق)دا دەگێڕێتەوە، کاتێك (فاطمة) هاتووە بۆلای ئەو ژنەو پرسیاری دەربارەی پێغەمبەر ﷺ لێ کردووە.. هەروەها، کە پێغەمبەریش ﷺ مامی (واتە –عباس-ی خودا لێی رازی بێت) ڕاسپاردووە بەوەی لە مەککەدا بمێنێتەوە، تاکو هەواڵ‌و دەنگ‌وباسی دانیشتوانەکەی لەوێوە بە موسڵمانان بگەیەنێت.

# "حیکمـەت لە ناردنی نێردراوەکەیان و، ئاشـکرابوونی بەسـەرهاتەکەیان"

خـودا فەرموویـە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ ..﴾ (٢١) الكهف " لە چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەدا بۆشایی یەکی هونەریی هەیە، بۆشایی یەك لەنێوان ناردنی یەکێکیان بۆ بازاڕی نێو شارەکە، تاکو خۆراکیان بۆ پەیدا بکاتو، لەنێوان گەڕانەوەی ئـەو نێردراوەشـیاندا بۆ لایان لە ئەشکەوتەکە، لەم بۆشایی یە هونەرییەدا بەسـەرهاتو مەسـەلەکەیان ئاشکرا دەبێـت بۆشایی ی ڕۆشتنی ئەم پیاوە، تاگەیشتۆتە شـارەکەو ئـەو دیـاردە سەیرو سەمەرانەی، کە چـاوی پێیـان کـەوتووەو ئـەو هەڵـسوکەوتو مامەڵانـەی لـەنێوان خـۆیو دانیـشتوانی شـارەکەدا بـووەو، گەڕانەوەشـی بـە سەرسـامیو سەرسـوڕمانەوە بـۆ لای هاوەڵـەکانی لـە ئەشـکەوتەکەدا بـە ڕاسـتی بۆشـاییو پانتاییـەکی هونەرییانەیـە، کـە هـیچ شـتێکی لـە ڕیوایەتـە ڕاسـتەکانو لـە ناڕاستەکانیشدا لەبارەوە بەدیی ناکەین.

قورئانی پیرۆزیش هیچی لـەبارەوە نەخـستۆتەڕوو، ئەمـەش وەك ئـەوە وایـە، خوێنەر بانگ کات بۆ ئەوەی بە بیروخەیاڵی خۆی, هۆیەك بۆ ئەو بۆشـاییە دیـاری بکاتو، هەر بە بیروبۆچوونی خۆیشی رووداوو پێـشهاتی کتـوپڕی لـەو بۆشـاییەدا مەزەندە بکات. لێرەدا تەنها ئەوەنـدە هەیـە کـە (نێردراوەکـەیان بـۆ نێـو شـار) کارەکەی لێ ئاشکرا بووەو، (ناشزانین چۆن) بۆ لای هاوەڵەکانی لە ئەشـکەوتەکەدا گەڕاوەتـەوەو، ئـەی داخـۆ چـۆن خـەڵکی شـارەکە دوای کـەوتوونو، کاتێـك گەیشتوونەتە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە، هەموو لاوە ئیمانـدارەکانیان بـەمردوویی تێدا دیوەتەوەو، ئەم جارەیان بەڕاستی بە واقیعی مردوون.

بێگومـان خـودا هـاوەڵانی ئەشـکەوتەکەی بـۆ خـەڵکی ئاشـکراکردووەو وای لەخـەڵکی شـارەکە کـردووە پێیـان بـزانن‌و هەڵوێـستە لەئاسـت مەسـەلەو بەسەرهاتەکەیاندا بکەن، قورئان حیکمەتی ئەمەی لـەوەدا دەرخـستووە، بەدوایـدا هـاتووە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ﴾ واتە: "بەمرەنگە (بەو جۆرەی کـە نێردراوەکـەیان چـۆتە نێوشـارو، خەڵکی شاریش بەنهێنیەکەیان زانیوە دوای کـەوتوونو، پاشـان چـاویان بەهـەموو لاوەکان کەوتووە کەوا تازەو لەکاتێکی کەمـدا بەڕاسـتی گیانیـان لـێ کێـشراوە، بەمرەنگە کاروبارو بەسەرهاتیانمان بۆ خـەڵکی شـارەکە دەرخـستووە تـاکو بـزانن کەبێگومان بەڵێنی خوداو تواناو قودرەتی خودا لەسەر زیندووکردنـەوەی مـردووان راستەو حەقەو، دەبا ئەوانەی ئەم وتەو بەسەرهاتانە بەدرۆ دەخەنەوە بزانن ئەمەیـە وەعدی خوداو بزانن بێگومان رۆژی دوایی هەر دێتە پێشەوەو هیچ گومانێکی تێدا نیە".

حاڵ‌و مەسەلە ئاوابووە تاکو خەڵکی شارەکە بزانن کە بـەڵێنی خـودا ڕاسـتەو قیامەت شك‌و گومانی تێدا نیە. بەڵێنی خودا بۆ بەندە ئیماندارەکانیـشی ڕاسـتەو هیچ لارییەکی تێدا نیە، خـودا لەگەڵیاندایـە بەهـەموو شـیوازێکی سەرپەرشـتی کردنیـان‌و پاراسـتنیان‌و سەرخـستنیان‌و راگیرکردنیـان لەسـەر ڕێبازەکـەی دەبـا هەرکەسێك، مەرجە خوازراوەکان جێبەجی بکات، تەواو دڵنیا بێت لـە بـەدیهاتنی بەڵێنی خودا.

ئـەوەتا هـاوەڵانی نێـو ئەشـکەوتەکە پـەنایان بردۆتـە بـەرخوداو خـوداش لەگەڵیانـدابووەو پاراسـتوونی‌و بـەرگریی لێکـردوون‌و، لاشـەکانیانی بەسـاغی هێشتۆتەوە لەکاتێکدا ئەوان بۆماوەی سێ سەدساڵ لەخەودا بوون.

پاشان خودا مەسەلەکەیانی ئاشکرا کردۆتەوە تاکو خەڵکی شارەکەو (کەسـانی دوای خۆیـان ونـەوەکانی دواتریـان) بـزانن، رۆژی دوایـی (رۆژی زیندووکردنـەوە)

هەردێتو گومانی تێدانیه. شێوازو هۆكاری بەڵگه هێنانەوه به چیرۆكی هـاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكه لەسەر زیندووكردنەوه لەرۆژی قیامەتدا ئەوەیه، ئەوان سی سـەدو نۆساڵ خەوتوونو، رۆحەكانیشیان لەو ماوه درێـژەدا لەلاشـەكانیان جیابووەتـەوەو، پاشـان خـودا رۆحـەكانیانی بەبەرلاشـەكانیاندا كردۆتـەوەو، ئیـدی لەخەوەكـەیان هەڵیساندوونو وبێداری كردوونەتەوه.

جا مادام خودا بەتوانایه لەسەر ئەوەی، كه ئاوایان بەسەر بێنێـت ولـەو خـەوه درێژەش بەخەبەریان بێنێت، ئەوا بەتواناشه لەسـەر زیندووكردنـەوەی خـەڵكی لـه رۆژی قیامەتداو بەتوانایه لەسەر ئەوەش، جارێكی دی رۆحەكانیان بـه بـەر لاشـه رزیوەكانیاندا بكاتەوه.

بـه ڕاسـتی چـیرۆكی هـاوەڵانی ئەشـكەوتەكه لەبـەهێزترینی بەڵگـه كردەیـی (عملی)یەكانی قورئانه لەسەر زیندووكردنەوەی خەڵكی لـه رۆژی قیامەتـدا، ئـەم بەڵگـه قورئانیـەش بـەردەوام ئامـاژەو دەلالـەتی خـۆی، تـا ڕۆژی قیامـەت دەگەیەنێت..

## "گەلەکەیان لەئاستیاندا بوون بەدوو بەشەوە"

گەلەکەیان لەسەر مەسەلەی لاوەکان ناکۆکییان تێ کەوتووەو، واپێ دەچێت دوای ئەوسێ سەدەیە گەلەکەیان باوەڕدار بەخودا بوونو یەکخواپەرستی (توحید)یان رەچاو کردووە، وەك خوداش لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ الكهف﴾.. کەواتە ئەوان دەربارەی لاوەکان بوون بە دوو کۆمەڵەوە:

<u>کۆمەڵی یەکەم</u>/ ئیمانداره ڕاستو چاکەکانن، کە گوتوویانە (بینایەکیان لەسەر دروست بکەنو خوداش خۆی لەکاروبارياندا زانايەو چییان لێ دەکات).

بێگومان ئەوان داوای دروستکردنی بینایەکیان لەسەریان کردووە،ئەم بینایەش مزگەوت نیە، یاخود بۆ مەبەستی بە پیرۆزدانانی لاوەکان نیە، بەڵکو بۆ مەبەستی رێزلێنانیان بووە کەلاشەکانیان دفن بکرێتو، بنێژرێنو، لەو بینایەدا بپارێزرێت. وەك زانراویشە، رێزنان لەمردوو ئەوەیە بنێژرێت. ئەم باوەڕدارانەش زۆر بە مەسەلەکەدا رۆنەچوون، چونکە دەیانزانی، کە هیچ ئامێرو ئامرازێکیان بۆ پشکنین ولێکۆڵینەوەو دیراسەو شیتەڵکاری نیەو، مادام ئەم جۆرە ئامرازانەشیان بەدەستەوە نیە، ئەوا نابێت پەنا بەرنە بەر گریمان وگوتەرەکاریو ئەفسانەکان، هەروەها نابێت کاتو هەوڵو عەقڵ و فیکریشیان لەشتێکدا، کە بۆیان یەکلا ناکرێتەوەو، سوودێکیان پێ نادات بەفیڕۆ بدەن. کەوا بوو تەنها ئەوەیان لەسەرە، مەسەلەکە بخەنە پاڵ زانستی خوداو، زانینی بنجو بناوانی بەسەرهاتەکەش هەر بۆ خودای پاكو زاناو

شارەزا بگێڕنەوە، هەربۆیەش گوتوویانە (رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ) بێگومان (ئیمانداریێتیو باوەڕهێنانیان بەخودا) ڕێنمایی کردوون بۆ ئەو بیروڕایەو سرووشی ئەو وتەیەی (رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ) پێگەیاندوون ئێمەش بەهۆی ئەو باوەڕەیانەوە بەباوەڕدارمان داناون.

<u>کۆمەڵی</u> دووەم/ ئەو حاکمو دەسەڵاتدارە کار بەدەستانەیانن کە قورئان بەوەسفی (ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ )ناوی هێناونو، بیروڕایان وابووە، مزگەوتێك لەسەر هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە بینات بنرێت: قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ، واتە: " ئەوکەسانەش، دەسەڵاتداربوونو دەسەڵاتیان لەکاروباری لاوەکانو ناوچەکەدا بوو گوتیان: (ئێمە بڕیار دەدەین، مزگەوتێك لەسەریان دروست بکەین". لەم وتەیەی دەسەڵاتدارەکاندا هەستێکی خۆ بەزل زانینو خۆبەگەورە دانانو خۆسەپاندنو دیکتاتۆرییش بەدیی دەکەین، چونکە ئەوان بەسەرگەلەکەیاندا (دەربارەی کاروباری لاوەکان) زاڵ بوونو ڕکێفیان لەسەر توندکردوونو، بە لووتبەرزیو خۆبەزل دانانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوونو بەزەبرو زەنگێکی وەهاشەوە قسەیان لەگەڵدا کردوون، بواری هیچ گفتوگۆو موناقەشەیەك، یان پاشگەزبوونەوە لە بیروڕاکەیانی تێدا نەماوەتەوە بەتوندی گوتوویانە: (لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ).

کاتێك زانایانی تەفسیریش، لە نووسینی تەفسیرەکانیاندا گەیشتوونەتە ئەم جێگەیە، دەربارەی حوکمی (بنیاتنانی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان) دواون وچەندین فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ لەوبارەیەوە دیاری کردووە، کە بنیاتنانی مزگەوتیان لەسەر گۆڕەکان تێدا قەدەغەکراوەو، کە نەفرەتی خودای تێدایە بۆجوولەکەو دیانەکان بەهۆی ئەوەی، گۆڕی پێغەمبەرانو پیاوچاکانیان کردۆتە پەرستگا.

لەو فەرموودانەش:-

١- (مسلم) لە (عائشة)وە – خودا لێی ڕازی بێت – گێڕاویێتییەوە: (أم حبیبة)و (ام سلمة) لە (حەبەشە) کڵێسەیەکیان بینیوە، کەوا چەندین وێنەو نیگاری پێغەمبەرانی خودای تێدا کێشراوەو ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ گێڕاوەتەوەو ئەویش فەرمویەتی: **((ان اولئك اذا كان فيهم الرجل الصالح فمات، بنوا على قبره مسجداً، وصوروا فيه تلك الصور، اولئك شرار الخلق عند الله يوم القيامة))**[1]. واتە: " ئەو جوولەکەو گاورانە ئەگەر پیاوێکی باشیان تێدا بمردایە، پەرستگایەکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکردو ئەوجۆرە وێنەو نیگارانەشیان تێدا دەکێشا، بەڕاستی ئەوانە لەقیامەتدا لەلای خودا خراپترین خەڵکن".

٢- (مسلم) لە (عائشة)وە –خودا لێی رازی بێت- گێڕاوێتییەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ لە نەخۆشییەکەی دواجاریدا، کە لێی هەڵنەسایەوە فەرمووی: **((لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبورا أنبيائهم مساجد))**[2]. واتە " نەفرەتی خودا لە جوولەکەو گاورەکان بێت کە گۆڕەکانی پێغەمبەرانیان کردۆتە چەند پەرستگایەك".

٣- (مسلم) لە (جندب)ەوە (خودا لێی رازی بێت) گێڕاوێتییەوە، گوتوویەتی: (گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو ﷺ لەپێش مردنیدا پێنج ناوی هاوەڵی تەنیای هێناو فەرمووی: **((اني أبرأ الى الله، ان يكون لي منكم خليل، فان الله تعالى قد اتخذني خليلا، كما اتخذ إبراهيم خليلا ولو كنت متخذا من أمتي خليلا لاتخذت ابابكر خليلاً الا وان من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور انبيائهم**

(١) مسلم، كتاب (٥) المساجد ومواضع الصلاة، باب (٣) النهي عن بناء المساجد على القبور، حديث (٥٢٨).

(٢) مسلم ، حديث (٥٢٩).

**وصالحهيم مساجد. الا فلا تتخذوا القبور مساجد، اني انهاكم عن ذلك))**[1]...
واته: " من پەنا دەگرم بەخودا لەوەی، تاكه هاوەڵێكی هەڵبژاردە لەئێوه بۆخۆم دابنێم، چونكه خودا خۆی منی كردووه بەتاكه هاوەڵی هەڵبژاردە، وەك چۆن (ئیبراهیم)ی كردۆته تاكه هاوەڵی هەڵبژاردەی پاكو دڵسۆز. خۆ ئەگەر له نەتەوەكەم، تاكه یەك هاوەڵێ پاكو هەڵبژاردەم بۆ خۆم دابنایه، ئەوا (ئەبوبەكر)م بەو جۆره هاوەڵه دادەنا، بەڵام كەسانیو گەلانی پێش ئێوه گۆڕەكانی پێغەمبەرانیان دەكردنه چەند پەرستگایەك، جا ئێوەش ئەو جۆره گۆڕانه (واته گۆڕەكەی منو گۆڕی پیاوچاكانی نەتەوەكەم) مەكەنه چەند مزگەوتێك، چونكه من به تەواوی ئەوەم لێ قەدەغه كردوون".

لەم فەرموودانەوه ئەوه تێدەگەین، گەلانی پێش ئیسلام سەرزەنشتكراون لەسەر بنیاتنانی پەرستگاو مزگەوت لەسەر گۆڕی پێغەمبەرانیانو پیاوچاكانیان. تەنانەت لەسەر ئەم تاوانه نەفرەتیان لێكراوه. ئەمەش دەلالەته لەسەر ئەوەی كەئەوانەی سووربوون لەسەر بنیاتنانی مزگەوت لەسەر گۆڕەكانی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە، لەئیمانداره چاكەكان نەبوونو، بیروڕاشیان ڕاست یان پەسەند نەبووه، هەروەها له جەختكردنەوەیان لەو ڕستەیەی (لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا )دا واتێدەگەین، حاكمو دەسەڵاتدارەكان ئەو رایەی خۆیان، كه لەسەری ڕژدبوون، بەجێ هێناوەو مزگەوتیان لەسەر ئەو ئەشكەوته بنیات ناوه، بەڵام قورئان هیچ شتێكی وای لەبارەی بنیاتنانی مزگەوتەكەوه باس نەكردوه، بەڕوونیش ئاماژەی بەوه نەداوه، ئاخۆ دروستكراوەو كارەكه تەواوكراوه یان نا..؟ ئەمەش لەبەر دوو هۆ:-

یەكەم/ بێگومان قورئان له شێوازی گێڕانەوەی چیرۆكەكاندا هەمیشه بۆشاییەكی هونەری جێدێڵێت، تاكو بوار بدات بەبیرو خەیاڵی خوێنەرو، تا خوێنەر خۆی

(١) مسلم، حديث (٥٣٢).

ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە. ئێمەش وەك خوێنەر لێرەداو لەم چیرۆکەدا خەیاڵمان دەچێتە سەر ئەو گەلە، سەرگەرمی بنیاتنانی مزگەوتەکە بوونو لەخەیاڵی خوێنەریشدا وێنەی مزگەوتەکە دەکێشرێت کەوا لەسەر ئەشکەوتەکە بنیاتنراوە.

دووەم/ لەبەر بێزراوی (كراهية)ی کاری بنیاتنانی مزگەوت لەسەرگۆڕەکانو لەبەر بێزراویی ئەوکارەش کەوا جێبەجێکارانی کردوویانەو، خوداش خۆی زاناو ئاگادارە لێیان.

## "سێ وتە لەسەر ژمارەی لاوەکان"

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ جیاوازیی وتەو بیروڕای خەڵکی لەسەر ژمارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە کردووەو، لەمبارەیەوە سێ وتەی خەڵکی هێناوەتەوە، وەك لە فەرمایشتەکەی خوادا هاتووە:

﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ... ﴿٢٢﴾ الكهف ﴾.

وتەی یەکەم دەڵێن: "ژمارەی لاوەکان سیان بوونو، چوارەمیان سەگەکەیان بووە".

وتەی دووەم دەڵێن: " پێنج بوونو، شەشەمیان سەگەکە بووە".

وتەی سێیەم دەڵێن: " حەوت بوون، هەشتەمیان سەگەکەیان بووە".

لەو دەستەواژانەی پێشووەوە، ئەم چەند خاڵە تێبینی کراوە یاخود گەلاڵە دەبن:-

١- قورئان، وتەی یەکەمو دووەمی ڕەتکردۆتەوەو پووچەڵی کردوونەتەوە، چونکە بەشێوەیەك وەسفی کردوون، هۆکارە بۆ ڕەتکردنەوەو پشتگوێ خستنیان، بۆیەش لەبارەیانەوە فەرموویە: (رجما بالغيب)، واتە (لەخۆیانەوە باسی نادیار دەکەن) وشەی (رجما بالغيب) لەم ئایەتەدا، واتە: (وتەیەك بەبێ زانستو زانیاری)و (ئیددیعایەك بەبێ بەڵگە).

٢- قورئان هەردوو وتە پووچەڵەکە بە (رجما بالغيب) وەسف دەکات، لەوەدا بانگەوازێکە بۆ ئێمە، کە وتەکانی ئێمەش ڕاستو سەلمێنراوبنو فیکرو بیروڕاکانیشمان بەڕاستیو دڵنیاییەوە بخەینەڕوو، دەبێت تەنها بەپێی ئەو زانیارییەی هەمانە بیروڕا دەربڕینو، هیچ وتەیەکیش نەدرکێنین، ئەگەر بەڵگەیەك لەسەر ڕاستیو دروستییەکەی نەبێت. دەنا وتەیەك بەبێ زانستو ڕایەك بەبێ بەڵگەیەك، لەگەڵ ئەو بەرنامەڕێژییە زانستیانەو بابەتیانەدا (کە قورئان خوازیاریەتی لێمان) ناگونجێت.

٣- بێدەنگیی قورئان لەسەر وتەی سێیەم ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ هەروەها بەخراپ دانەنانی ئەم وتەیە لەلایەن قورئانەوە، دیارە ئەمە دانپێدانانێکی قورئانو پەسەند کردنێکی بێت، بەپێی ئەوەی، کە چەند زانایەکی کەم لەزانا لێکۆڵیارەکان ئاوا لێی تێگەیشتوون.. بەپشتیوانی خوداش دوای نەختێکی دی دێینەوە سەر باسی ئەم مەسەلەیە.

٤- ژمارەی هاوەڵەکانی نێو ئەشکەوت ژمارەیەکی تاك (فردی)یە، نەك جووت (زوجی) واتە: ئەوان سێ، یان پێنج کەس، یان ڕاستتر وایە حەوت کەس بووبن، هەرسێ ژمارەکەش تاکن.

٥- لە هەموو وتەکاندا سەگەکەشیان حسابکراوە، ئەمەش لەگەڵ ئەوەدا، کە هەردوو وتەی یەکەمو دووەم جیاوازییان لەگەڵ بە ژمارەدانانی سەگەکەو لاوەکاندا نەکردووە، وەك گوتوویانە: سێ کەسن و چوارەمیان سەگەکەیانە، پێنج کەسن و شەشەمیان سەگەکەیانە ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ﴾ بەلام لەوتەی سێیەمدا، کە وتەی یەکلاکەرەوەیە جیاوازییەکەی نێوانیان بە پیتی واو (و) دانراوە ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾.

وادیاریشە باسی سەگەکەیان لەو دەستەواژانەدا، کە لە هەرسێ وتەکەدا هاتووە بۆئەوەیە، پاسەوانیی کردوون و بۆئەوەی لەگەڵیشیاندا بێت، بۆیە لەخێرو بەرەکەتی ئەوانیشی بەرکەوتووەو، نیعمەتەکەیان ئەویشی گرتۆتەوە، بەجۆرێك کە کاتێك باسی ئەو لاوانە دەکرێت باسی ئەویش دەکرێت و هەواڵی ئەویشیان بۆ زیادکراوە، ئەم زیادکردنەش لە ڕووی خاوەنداریێتیان و تایبەتکاری و ڕێز لێ گرتنەوەیەتی.

## " پیتی (واوی هەشتەمین): (واو الثمانية).

ئەم پیتە (و) ئەوەیە لە فەرمایشتەکەی خوادایە: ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾، ئەم واوەش ئەوەیە، کە دوای ژمارەی حەوتی پێش ژمارەی هەشتەم هاتووە، هەربۆیەش بەواوی هەشتەمین (واو الثمانية) ناوبراوە، ماناکەش کاتێك دیاری دەکرێت ئەگەر وشەی پەیوەست (معطوف)ی دوای خۆی نەچووبێتە نێو ڕستەیەکی پەیوەستکراوی پێش خۆی، چونکە دەلالەت لەگۆڕانکاریی مانای نێوان پەیوەستەکراو دەکات.

رازی دیاریکردنی لێرەشدا ئەو ئاماژەیەمان پێ دەبەخشێت، وتەی سێیەم لەسەر ژمارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە وەك هەردوو وتەکەی پێش خۆی نیە، بەڵکو گۆڕانکاری هەردووکیەتی، جائەگەر ئەو دوو وتەیە رەتکراوەو نا پەسەندبن، ئەوا واوی هەشتەم ئاماژە بۆ ڕاستیو دروستی وتەی سێیەم دەکاتو ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات، قورئان پشتی پێ بەستووە.

(امامی سهیلی) لە کتێبی (الروض الانف)دا دەربارەی ئەم (واوە) وتەیەکی نایابی هەیەو ئاماژەیەکی جوانیشی لێوە دەرهێناوەو گوتوویەتی: (ئەم- واوە- دەلالەت لە بڕوا پێکردنو پشتگیریکردنی خاوەنانی وتەکان دەکات، چونکە گەیەنەری وشەیەکە بەوشەیەکی نادیاری نێو ڕستەکە، بەمەزەندە (وشەی -بەڵێ- یە) بۆ: هەشتەمیان سەگەکەیانە ﴿وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾. بۆ نموونەش گەر کەسێك بڵێت (زەید شاعیرە)و تۆش سیفەتێکی تری بۆ زیاد کەیتو بڵێیت: (هەروەها زاناشە) ئەوا لەوحاڵەتەدا، وەك ئەوەیە تۆ بڵێیت: (بەڵێ وایە ئەوشاعیرەو، هەروەها زاناشە) لە فەرموودەیەکیشدا دەربارەی ئەم پیتی گەیەنەری (واو)ەکە بۆ بەڕاستدانان وپشتگیریکردنی ڕستەیەکی پێش خۆیەتی، لە پێغەمبەری خودا ﷺ پرسیارکرا: ((**أنتوضأ بما افضلت الحمر؟ قال: نعم، وبما افضلت السباع كلها**)) اخرجه الدار القطني[1].. واتە (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا ئێمە دەتوانین بەئاوی بەرماوەی ئاژەڵە گیاخۆرو ماڵییەکان دەستنوێژ بگرین؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرموی: بەڵێ، هەروەها لە بەرماوەی ئاوی ئاژەڵە گۆشت خۆرو دڕندەکانیش).

---

(١) ئەم فەرموودەیە جگە لەوەی (دار قطني)- تخريج-ی کردووە، (شافعی)و (بیهقی)یش لە (معرفة السنن والاثار)دا- تخريج-یان کردووە هەروەها (بیهقي) گوتوویەتی: ئەم فەرموودەیە چەند (سند)ێکی هەیە، ئەگەر هەندێ: (سەنەد یان بە هەندێکی تریان بگەیەنرێت ئەوا بەهێز دەبێت بڕوانە کتێبی (نیل الاوطار)ی- شوکاني- (١: ٤٥).

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەم (واو)ی زیادکردنە لەچەند شوێنێکدا هەیە، وەك لەم ئایەتـــــەدا ﴿... وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا ... ﴿١٢٦﴾ البقرة﴾، واتە" ئیبراهیم لەخودا پاڕایەوەو گـووتی: (خودایـە رزقو رۆزی لە بەرووبوومەکانی دنیا بەوکەسانەی، کە دانیـشتوانی ئـەم ناوچـەیەنو باوەڕیان بەخوداو رۆژی دوایـی هێنـاوە، ببەخـشە). خـودا فـەرمووی: (هـەروەها یەکسانی بێباوەڕو پێ نەزانیش دەبەخشم)" لەم ئایەتەدا بەپیتی (واو)ی گەیەنـەرو زیادکراوی ڕاستییەکان، ئەوە دەگەیەنێت، کە خودای پەروەردگار لەوەڵامی نزاکەی (ئیبراهیم)دا بفەرموێت: "بەڵێ من نەك هـەر رزقـی ئیمانـدارەکان دەدەم، بـەڵکو رزقی ئەو کافرانەش دەدەم، کە لەماوەیەکی کەمی ژیانی دنیادا بەهرەمەند دەبنو لەدواییشدا بەرەو سزای دۆزەخیان دەبەم، کە خراپترین چارەنووسە بۆیان). جا بۆیـە سەبارەت بەمەسەلەی لاوەکـانیش هـەر ئاوایـەو بـەو رەنگەیـە، کاتێـك خـەڵکی گوتوویانە (حەوت کەس بوون) خوداش فەرموویەتی: (هەشتەمیان- سـەگەکەیانە) بەڵام گەر بگوترایە (سادسهم کلـبهم- شەشـەمیان سـەگەکەیان)یـان حەوتـەمیان "وسابعهم کلبهم ئاواو بەم رەنگەی لێ نەدەهات، چونکە لەجێگەی وەسـفی پـێش خۆی دایە"[1].

هەروەها پیتی (واوی هەشت) لە چەندین جێگەی تری قورئاندا هاتووە، وەك:-

١- ئەو فەرمایشتەی خودا دەربارەی ئەو ئیماندارانەی بەیعەتیانداو نەفسو مـاڵو سامانیـشیان بـەخودا فرۆشـتبوو: ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾ التوبـة﴾ لـــەم

(١) الروض الانق (٣: ١٧٠).

ئایەتـــەدا (واو-ی هەشـــت) ئەوەیـــە کـــە چـــووەتە ســـەر (وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ) واتە چووەتە سەر سیفەتی هەشتەم لـە سـیفەتەکانی ئیمانـداران. لەمەشـــدا تـــاووتویّو ئالّوگۆڕکارییـــەك لـــەنیّوان (ٱلْآمِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ) و (وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ)دا هەیـە، واتـە لـەنیّوان رسـتەی پـیّش (واوی هەشتەم سیفەت)و لەرستەی دوایەوە.

٢- هـەروەها لەئایـەتیّکی تـردا خـودا فەرموویـەتی: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ۝٥﴾ التحريم لەم ئایەتەدا (واوی هەشت) چۆتە سەرسـیفەتی هەشـتەم لـە سـیفەتەکانی ژنـە ئیمانـدارەکان، هـەروەها سـیفەتی دوای (واو)ەکـەش پیّچەوانەی سیفەتی پیّش واوەکەیەو ناشیّت هەردوو سیفەتەکە (ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا) لەیەك ئافرەتدا پیّکەوە هەبن چونکە مەحالّە ئافرەتیّـك لەیـەك کاتـدا ژنـیش‌و کچیش بیّت (ثیب وبکر) بەلّکو یان ژن دەبیّت، یان کچی شوونەکردوو.

## "مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ

## تەنها چەند کەسێکی کەم ژمارەی لاوەکان دەزانێـت"

کۆمەڵێك لە زانایانی تەفسیر وای بۆ دەچن کەوا مرۆڤ دەستەو سانە لە زانینـی ژمارەی لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە، بۆئەم بۆچوونەشیان پشتیان بەو فەرمایـشتەی خودا ﴿قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم﴾ بەستووە، کە تیایدا خودا ئەم زانیارییەی، تەنها بۆ خۆی گەڕاندۆتەوە، ئێمەش نابێت دەمەقاڵێو مشتومڕی لەسەر بکەین‌و، ناشبێت پرسیار لەکەسان‌و گەلانی پێشین لەبارەیانـەوە بکـەین. بـەڵام کۆمـەڵێکی دی لـە زانایانی تەفسیر وای بۆچوون، کەوا ئێمە دەتوانین ژمارەی لاوەکان بـزانین، چـونکە قورئانیش ڕێنماییو ئاماژەی بەوە داوەو، ئایەتەکانیشی ئاتاجیان لەلێوردبوونـەوە هەیە، بەوردی لەماناکانیان بکۆڵینەوەو لە ئاماژەو ڕێنمایی یەکانیان تێ بگـەین. لەبەر ئەمەشە گوتوویانە (لاوەکان حەوت کەس بـوون‌و، هەشـتەمیان سـەگەکەیان بووە). ئەوبەڵگانەی لەم ئایەتەوە بەدیی دەکرێن، ئەمانەن:-

١- بێگومان خودا زانینی مرۆڤـی لەسـەر ژمـارەی لاوەکـان، بەشـتێکی مـەحاڵ دانەناوەو، ئەو زانیارییەشی لێ یان نەسڕیوەتەوە، بـەڵکو بەپێـچەوانەوە باسـی مرۆڤـو توانای زانینی تێداکردووەو، دەشێت ئەوە بزانـــن، وەك فەرموویـەتی: ﴿مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ﴾، واتە: (تەنها ژمارەیەکی کەم، تەنها چەند کەسێکی کەم لەخەڵکی ژمارەی لاوەکان دەزانن). خۆ ئەگەر خـودا بیویـستایە زانیـاری مرۆڤ لەوەدا نەبێت، ئەوا دەیفەرموو: (لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ)، واتە (جگە لەخودا کەس زانیاریی لەسەریان نیە). ئایا نابینیت لە سورەتی (ابراهیم)دا خودا باسی

دەستەوسانی مرۆڤ دەکات لەمەڕ زانیاریی گەلانی دوای (سەموود)و، زانیارییەکانی تایبەت بەو گەلانەی تەنها بەخۆیەوە بەندکردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ ... ﴿٩﴾ إبراهيم﴾، کەواتە جیاوازیی کردووە لەنێوان ﴿ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾.

٢- چوونی (واوی هەشت) بۆ سەر وتەی سێیەم ﴿ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ ئەم (واوە) دەچێتە سەر ئەو ڕستەیەی کە لە پێشیەوە هاتووەو پێچەوانەی ماناکەیەتی، چونکە ئەگەر هەردوو وتەکەی پێشتر (واتە وتەی یەکەمو دووەم) ڕەتکرابنەوە، ئەوا وتەی سێیەم وتە ڕاستەکەیەو، والله اعلم.

٣- قورئان لەکاتێکدا هەردوو وتەکەی پێشووی ڕەتکردۆتەوە بەوە وەسفی کردوون (رجما بالغيب) بوون لەکاتێکدا وتەی سێیەمی ڕەتنەکردۆتەوە، بەڵکو لێی بێدەنگ بووە، وەك لێ بێدەنگ بوونێکی دانپیانان وبڕیار بۆدان.

٤- هاوەڵانی پێغەمبەرو ﷺ زانایانی لێکۆڵیاریش لەبواری تەفسیری قورئاندا وا لە ئایەتەکە تێگەیشتوون، دەشێت مرۆڤ زانیاریی لەسەر ژمارەی لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە هەبێت. بۆیە ڕایان لەسەر ڕاستی وتەی سێیەمەو قورئانیش دانی بەوەدا ناوە، پاڵنەریانە بۆ ئەو رایەو بۆ خستنەگەڕی عەقڵو فیکریان تێیدا وەك (ابن کثیر) یش لە (ابن عباس)ەوە — خودا لێی رازی بێت- گێڕاویێتییەوە، گوتوویەتی: **((أنا من القليل الذين استثنى الله عزوجل كانوا سبعة))** .. واتە "من لەوچەند کەسە کەمەم کەخودا جیای کردوونەتەوەو زانیارییان لەسەر ژمارەی لاوەکانی ئەشکەوت هەیە، ئەو لاوانە ژمارەیان حەوت کەس بووە".

هەروەها ناوبراو واتە -ابن عباس- ) گوتوویەتی: (أنا ممن استثنى الله كانوا

سبعة)[1]... واتە (من یەکێکم لەوانەی کە خودا جیای کردوونەتەوە بۆ زانینی ژمارەی لاوەکان، کە حەوت کەس بوون) ئێمەش لەگەڵ (امام عباس) داین لە تێڕوانینیدا بۆ ئایەتەکەو بۆهەڵهێنجاندنی ئەو ڕایەی کە پێی گەیشتووە، بۆیە ئێمەش دان بەوەدا دەنێین، ژمارەی لاوەکان حەوت کەس بوونو هەشتەمیان سەگەکەیان بووەو، خوداش هەرخۆی زانایە.

## حیکمەتێکی دیکەی (واو-ی هەشتەم)

بەتێڕوانینی ورد لە ڕستەی ﴿وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ ئاماژەیەکی دیکە وەردەگرینو بەحیکمەتێکیدیکە دەگەین، ئەمەش بەهۆی ئەوەی (واو-ی هەشت)ی چووەتە سەر.. ئەم (واو)ەش هەرحەوت هاوەڵەکەی، لەسەگەکەیان جیاکردۆتەوە ئەم جیاکردنەوەیەش زۆر پێویستە، چونکە ئەوان چەند ئیماندارێکی پیاوچاك بوونو، سەگەکەشیان ئاژەڵێکی پیس بووە، بۆیە ناشێت مەسەلەی سەگەکەیان بە وتنو ناوبردنیش لەگەڵ ئەواندا بەراورد بکرێت.

کاتێك لەهەردوو وتەکەی پێشووش ڕادەمێنین، دەبینین بەراوردێکیان لەنێوان لاوە ئیماندارەکانو سەگەکەیاندا نەکردووە: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ یان ﴿وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾، دیارە ئەم بەراوردنەکردنەش هۆکارێکی تری بەرهەڵستی کردنی قورئانە بۆ ئەو دوو وتەیەو بۆ ڕەتکردنەوەیان. دیارە جیاکردنەوەی وتەی سێیەمیش بە (واو)ی (هەشت) هۆکارێکی تری پەسەندکردنیو پشت پێبەستنیو دانپیانانیەتی، جا ئەوانەی وتەی سێیەم دەڵێن، تێبینی ئەم مانا ئەدەبییە دەکەن، چێژێکی نایابی تێدایە، چونکە ئەوان بەراوردیان

(١) تفسير ابن كثير(٣: ٧٨)

لەنێوان مرۆڤە ئیماندارەکانو ئـاژەڵێکی وەك ئـەو سـەگەدا کـردووە، بـەراوردیان لەنێوان پیاوە پاکەکانو، سەگە پیسەکەدا کردووە، وێڕایی ئەوەی یاوەریشیان بووە، بەڵام بەو یاوەری کردنە تۆزقاڵێك لە پیسییەکەی نـەگۆڕاوە، هـەر بۆیـەش قورئـان دووری خستۆتەوە لێیانو لەبـەردەم دەرگـای ئەشـکەوتەکەدا داینـاوە (بِٱلۡوَصِيدِ) خوداش هەرخۆی زانایە.

## "وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا"

نزیکترین مانای ئەم دەستەواژەیە ئەوەیە، داوا لە پێغەمبەری خودا –محمد ﷺ دەکات، پرسیار دەربارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە لە هیچ کەسێك نەکات، بەتایبەتیش لە (ئەهلی کیتاب). واتە لە جوولەکەو دیانەکان. هیچ پرسیارێکیان لێ نەکاتو پرسوڕایان پێنەکات، چونکە ئەوان هیچ زانیارییەکیان لەوبارەیەوە نەبووەو خاوەنی زانستێکی ڕاستەقینەو ڕاستو دروستو بڕواپێکراوو جێی متمانەش نەبوون، بەڵام خۆ ئەم دەستەواژەیە تەنها دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە نیە، لەگەڵ ئەوەش، لەسەرئەوان هاتۆتەخوارە- چونکە (پەندو وانە لێوەرگرتنیشی) گشتییەو هەموو مەسەلەیەك دەگرێتەوە، پرسیار لەوان لەسەریان نەکات، لەدوان واتە، نەك تەنیا بەوهۆیەوە، بەڵکو بەگشتییەو پەلدەهاوێت بۆ (سەرجەم چیرۆکەکانی تری قورئانو بەسەر هاتەکانی پێشینان)، نابێت پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لەبارەوە لە جوولەکەو دیانەکانو خەڵکانی تر بکات.

هەروەها ڕێنمایىو داواکاریی (پرسیار لەکەس نەکردنەکەش) تەنها ئاڕاستەی خودی پێغەمبەر خودا ﷺ نەکراوەو تەنها بەوەوە بەندنیە ئەگەرچی ڕووی گوتارەکە سەرەتا ئاڕاستەی ئەو کراوە، بەڵام گوتاری ئاڕاستەکراو بۆ شەخصی پێغەمبەری خودا -محمد- ﷺ گوتارێکە بۆ سەرجەم نەتەوەکەشی تەنها چەند مەسەلەیەکی پەیوەستو تایبەت بەخۆیەوە نەبێت کە بەڵگەیەکی لەسەر هەبێت.

بێگومان داواکارییەکەی ئەم دەستەواژەیە کە دەفەرموێت پرسو ڕاو پرسیار لە هیچ کەسێکیان مەکە ﴿وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا﴾ ئاڕاستەی گشت موسڵمانێك کراوە تاڕۆژی دواییو، ڕێی لێ دەگرێت، پرسیار لە شوێنکەوتوانی

کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوو (بەتایبەتیش لەجوولەکەو دیانەکان) نەکەن یان لە کەسانی غەیری ئەوانیش پرسیار نەکەن دەربارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە، یان دەربارەی کەسانی تری نێو چیرۆك‌و بەسەرهاتەکانی پێشینان لە قورئانی پیرۆزدا.

بێگومان ئەم دەستەواژەیە ڕێسایەکی پتەوی قورئانییمان لە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکەکانی قورئاندا پێ دەگەیەنێت، لەلایەکەوە ڕێمان لێ دەگرێت لە پرسیارکردن لە شوێنکەوتوانی کتێبە ئاسمانیەکان (أهل الكتاب)و لەکەسانی تر دەربارەی ئەو چیرۆکانەو ڕێمان لێ دەگرێت، هیچ وتەیەك لەوانەوە وەرنەگرین‌و بۆلایان نەگەڕێینەوەو، وتەو هەواڵ‌و بەسەرهات‌و گێڕانەوەکانیان نەهێنینەوەو نەگێڕینەوە.

هەروەها ئەمە ڕێسایەکی زانستی‌و مەنهەجی‌و بابەتیانەشە.. نابێت پرسیار لە ئەهلی کیتاب بکەین‌و هیچیان لێوەربگرین، چونکە دەسکاریی کتێبەکانی خودایان کردووەو شێواندوویانەو (لەسەر مێژوو هەواڵی گەلان‌و ڕاستییە مێژووییەکان) دەسپاك‌و جێی متمانە نین. هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە لەبەرئەوەش نابێت پرسیار لەوان بکەین، چونکە چیرۆکەکانی پێشینان‌و ڕووداوو شیکارو وردەکارییەکانیان لەجیهانی نادیارو غەیبی رابردوون. دیارەو بێگومان ئەو ڕووداوو وردەکاریانەی غەیبیش تەنها خودا دەیانزانێت، بۆیە تەنها لە خوداوەو لە کتێبی ڕاستی خودا (لە قورئانەوە) دەبێت وەرگیرێن بەپێی ئەو ڕادەیەی ئاماژەیان بۆ کراوە تێیدا.

ئێمەش بۆ مەسەلەی بەسەرهاتەکانی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەو چیرۆکەکاکانی قورئان- تەنها لەچوار چێوەی هەق‌و ڕاستی‌و دروستیدا پابەندین‌و، ڕاستی‌و یەقینیش تەنها ئەوەیە کە لە قورئانی خواداو لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە. خودا لەو کەسانەش خۆشبێت، بەنەفامی پەنایان بردۆتە بەر ئەهلی کیتاب‌و، وتەو ڕیوایەتیانی لەسەر چیرۆکەکانی پێشینان هێناوەتەوەو، بەو هۆیەشەوە سەرپێچیان لەورێنمایی یە پیرۆزە خوداییە کردووە کە دەفەرموێت ﴿وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾.

(امام ابن كثیر) له تەفسیركردنی ئەم دەستەواژەیەدا گوتوویەتی: "سەبارەت بەم مانایــە ﴿وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾ ئەوەیــە چــونكە ئــەوان هــیچ زانیارییەكیان لەسەر لاوەكان نەبووە، تەنها ئەوە نــەبێت، كــە لەخۆیانــەوەو (رجمـا بالغیب) دەیلێن، واته بەبێ بەڵگە وپــشت بەســتن بــە وتەیــەكی راســت ودروســت قسەیان لەبارەوەدەكەن، جا ئەی (محمد) ﷺ تۆش لەلایەن خوداوە حەق‌و راســتییت بۆ هاتووە، هیچ شك‌و گومانێكی نیەو هەرئەم حەقەش زانیارییــەكانت پێــشكەش دەكات‌و حەكەم‌و هەڵسەنگێنەری ئەو ڕیوایەتە پێشكەشكراوانەی نێــو كتێبــەكانی ترو نێو قسەو باسەكانیانە"[1].

## " لەبیــرچوونەوەكــەی پێغەمبــەر ﷺ "

خــودا فەرموویــەتی: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴿٢٤﴾ الكهف﴾.. لەم ئایەتەدا فــەرمانێك هەیــە لەخوداوە بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، هەروەها بۆگشت موســڵمانێكی لــەدوای خــۆی، تایبەته بەوەی هەركارێك له ئایندەدا دەكەن بەخواستی خوداوە بیبەستنەوەو لەكاتی باسی كارێكی داهاتوویدا بڵێت: (بەخواستی خودا (ان شاء الله) سبەینێ ئــەوكارە دەكەم.. هەر لەم ئایەتەدا ڕێنماییەكی خودای بۆ پێغەمبەر ﷺ تێدایــە، لــەدوای لەبیرچوونی گوتنی (بەخواســتی خــودا) دووبــارە بــەیادخۆی بێنێتــەوەو بیڵێتــەوە: (وَاذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ).. هەروەها ئەم ئایەتــە ئامــاژە بــۆ بۆنــە (مناســبە)ی هاتنەخوارەوەی ئایەتەكانی چیرۆكی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە دەكــات. (كــە لــە سەرەتای لێدوانمان لەم چیرۆكەوە) خستمانەڕووو كەوا پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵێنی

---

(١) تفسیر ابن كثیر (٣: ٧٨).

بەکافرانی قورەیش دابوو بۆ رۆژی سبەینێ وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئاراستەیان کردبوو بداتەوە. ئەوەبوو پێی فەرموون: (سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە) بەڵام لەبیری چووبوو کە بەواژەی (ان شاء الله) جیاکاری (استثناء)یەکی بۆ دابنێت،واتە لەبیری چوو، بەرستەی (سبەینێ – بەخواستی خودا "یان ئەگەر خواویستی" وەڵامتان دەدەمەوە، بەڵێنیان پێبدات.

ئەوەبوو بەم هۆیەوە(جبریل) پازدە رۆژ لێی دواکەوت. ئەمەش زۆرناخۆش بوو بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ، چونکە ئیدی کافرانیش دەستیان کرد بە نوکتەو گاڵتەجاڕیو قاقای پێکەنینو دەیانگوت (بەراستی هاوەڵەکەت خۆی لێ لادایتو نەهاتەوە بۆلات)، بێگومان ئەو دواکەوتنەی سرووشو مەلائیکەت لە پێغەمبەر ﷺ نیازدار بووەو حیکمەتو نیازێکی خودای تێدا هەبووە بۆ ئەوەی ئەم وانەیەمان فێربکاتو ئەورێسا باوەڕدارییەشمان بخاتە بەرچاو کە ئایەتەکە خستویەتییەڕوو.

## " ئایا پێغەمبەر ﷺ شتی بیر دەچێتەوە؟! "

ئەم لەبیرچوونەوەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ نابێتە هۆی لاریو کەمو کووڕی لە پێغەمبەرایەتییەکەیداو، لە عیصمەتو پاکێتیشی کەمناکاتەوە.

ڕاستە، خودا ئەوکارەی بۆ لەئەستۆناوە کە شتی بیرنەچێتەوە ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ۝٦﴾ الأعلى، واتە.. "ئێمە لەم قورئانە هێندەت پێ دەخوێنینەوە کە هێزی لەبەرکردنیت هەبێتو بیرت ناچێتەوە" بەڵام خۆ ئەم (نەفی کردنی لەبیرچوونەوەیەش) هەرلەچوار چێوەی خواستو دانایی خودا دابوو، دەنا ئەگەر خواستی خودا لەکاتێکی تایبەتیو دیاری کراودا وابووبێت کە پێغەمبەرەکەی شتێکی لەبیربچێت، ئەوەی بێگومان لەبیری دەچێت. هەربۆیەش دوای ئەوەی پێی

فەرمووە ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾ بەدوای ئەم فەرمایشتەدا یەکسەر پێی فەرمووە: ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ۝٧ الأعلى ﴾، واتە "ئێمە هێندەت قورئان پیّ دەخوێنین تا لەبیرت نەچێت تەنها شتیّ: کەخودا خواستی لەبیرچوونەوەیتی لەسەربێت، چونکە هەرخوداش لەئاشکراو نهێنی ئاگادارە".

پاشان ئەو لەبیرچوونە نەفیکراوە ئەوەیە، دەربارەی لەبەرکردن (حفظ)ی قورئانە، چونکە خوداش پاراستنی قورئانی بۆ دابینکردووەو ئەوەی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لەئەستۆ گرتووە، کە قورئان لەبەر دەکاتو تاکە پیتێکیشی لەبیرناچێتەوە.

بەڵام بیرچوونی شتی تر لە غەیری قورئان، مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراوە، تەنانەت شتی لەبیرچووی نێو نوێژیشی لیّ ڕوودااوەو لەکاتی نوێژکردندا شتی لەبیرچۆتەوە، پاشان کڕنووشی هەڵەکردن (سجدة السهو)ی لەپێش سەلامدانەوەدا بردووە. لەم ڕووەوە (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا لە (عبدالله-ی کوڕی- بحینە) وە – خودا لێی رازی بێت- گێڕاوێتییەوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ لە هەندێك نوێژدا دوو ڕکاتی بۆ کردووین (واتە پێشنوێژی بۆ کردووین) پاشان هەستاوەتەوەو دانەنیشتووە بۆ (تەحیات خوێندن) خەڵکی نوێژ خوێنیش لەدوایەوە هەستاونەتەوەو کاتیّ: نوێژەکەی تەواوکردووەو چاوەڕێی سەلامدانەوەی بووین، تەکبیری کردۆتەوە (واتە – واژەی – الله اکبر-ی دەربڕیوەو دوو سوژدەی بردووە (پێش سەلامدانەوە بەدانیشتنەوە) ئینجا سەلامی داوەتەوە)(1). کەواتە پێغەمبەر ﷺ لەنوێژەکەیداو (خوێندنی تەحیاتی یەکەم)دا سەهوی کردووەو، یەکسەر چۆتە سەر ڕکاتی سیّیەم، بەڵام (کاتێك پێی زانیوەو بەبیری هاتۆتەوە)، دوو سوژدەی سەهووی پێش سەلام دانەوەی بردووە.

---

1) رواه مسلم. كتاب ٥ المساجد ومواضع الصلاة باب ١٩ السهو في الصلاة والسجود له، حديث ٥٧٠.

هەروەها (مسلم) لە (عبداللهی کوڕی مسعود)ەوە خودا لێی رازی بێت – گێڕاوێتییەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژێکی کردووەو کاتێ: سەلامی داوەتەوە لێی پرسراوە: -(ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا شتێك لەنوێژەکەدا رووی داوە؟ ئەویش فەرموویە: (چی بوو)؟ گوتوویانە (نوێژەکەت ئاواو ئاواکرد) ئینجا ئەویش هەردوو پێی ڕێکخستۆتەوەو ڕووی لە قیبلە کردووەو دوو سوژدەی بردووەو، سەلامی داوەتەوە پاشان ڕووی تێکردین‌و فەرمووی: ((**انه لوحدث في الصلاة شيء انبأتكم به، ولكن انما انابشر، انسى كما تنسون ، فأذا نسيت فذكروني، واذا شك احدكم في صلاته فليتحر الصواب، فليتم عليه، ثم ليسجد سجدتين**))[1]. واتە.. "ئەگەر لە نوێژەکەدا شتێك- سەهوویەك – ڕووی دابێت ئەوا ئێوەی لێ ئاگادار دەکەم، بەڵام خۆ منیش مرۆڤم‌و وەك ئێوە شتم بیردەچێتەوە، جا ئەگەر شتێکم بیرچوو، بەبیرم بخەنەوە، هەروەها ئەگەر هەرکەسێك لەئێوەش گومانێکی لە نوێژەکەیدا هەبوو، با بەدوای ڕاستییەکەیدا بگەڕێت‌و نوێژەکەی لەسەرتەواو کات‌و، پاشان دوو سوژدەی سەهوو ببات" هەروەها (مسلم) لە (ابو هریرەوە) گێڕاوێتیەوە گوتوویە: (پێغەمبەری خودا ﷺ پێشنوێژی نوێژێکی کاتی ڕۆژی بۆکردین (سائیتر یان نوێژی نیوەڕۆ بووە، یاخود نوێژی عەسر) لەدوای دوو ڕکات سەلامی دایەوەو پاشان هاتە لای (پەلە دارخورمایەکی) قیبلەی مزگەوتەکەوەو بە زویری باڵی لەسەر دانا، لەنێو خەڵکەکەشدا (ابوبکرو عمر)ی لێ بوون‌و، بەڵام ترسان کە لەوبارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکەن. خەڵکیش چوونە دەرەوەو دەیانگوت، گوایە نوێژ کورت کراوەتەوە. پیاوێك کە ناسرابوو بە (ذو الیدین) لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: (ئەرێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا نوێژەکە کورتکراوەتەوە یاخود خۆت لەبیرت چوو؟ پێغەمبەریش ﷺ سەیرێکی لای ڕاست‌و چەپی کردو فەرمووی: (ذو الیدین،

---

١) مسلم/ هەمان سەرچاوە، هەمان (کتاب و باب) حدیث (٥٧٢).

چی دەڵێیت؟ ئایا وایە، گوتیان: (بەڵێ ڕاست دەکات تەنها دوو ڕکاتت بۆکردین) ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی تری لە نوێژەکە کردەوەو، سەلامی دایەوە)[1].

کەواتە، لەونوێژەدا پێغەمبەری خودا ﷺ شتی لەبیرچووەو سەهوویشی تێدا کردووەو، لەڕکاتی دووەمدا سەلامی داوەتەوە، بەڵام کاتێك هاوەڵان ئەوەیان بەبیرهێناوەتەوە، هەردوو ڕکاتەکەی تریشی کردۆتەوەو، پاشان سوژدەی سەهووی بردووەو سەلامی داوەتەوە. لەفەرموودەکەشیدا بەڕاشکاوی دانی بەوەدا ناوە، کە بێگومان ئەویش خۆی مرۆڤێکەو، وەك مرۆڤەکانی دی شتی لەبیر دەچێتەوەو، داوایشی لێیانکردووە، هەرکاتێك شتێکی لەبیرچوو، بەیادی بێننەوە.

بێگومان هەر ئەو لەبیرچوونەوەیەی پێغەمبەریش ﷺ بەڵگەیەکە لەسەر مرۆڤبوونی پێغەمبەری خودا ﷺ، چونکە مەسەلەی لەبیرچوونەوە، خوویەکی هەمیشەیی مرۆڤەو بەڵگەیەکیشە لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی. چونکە خودا خۆی بەبیری هێناوەتەوەو، ئاگاداری کردۆتەوە لەوشتەی کەلە بیری چووە.

لەوانەشە هەندێك کەس پرسیار بکەن دەربارەی ئەوەی: چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ سەهووی لەنوێژیدا کردووە؟! ئەی داخۆ فیکروخەیاڵی لەکوێ بوو بێت؟! بۆ لێکدانەوەی مانای ئەم مەسەلەیەش شاعیرێك گوتوویەتی:

**ياسائلي عن رسول الله كيف سها**

**والسهو في كل قلب غافل لان**

**قد غاب عن كل شيء قلبه منها**

**عما سوى الله في التعظيم لله..**

---

١) مسلم – هەمان (كتاب) وهەمان (باب حديث)، (٥٧٣)

واتە: (ئەی ئەوکەسەی پرسیارم لیَ دەکەیت، ئاخۆ چۆن دەبێت پێغەمبەری خودا ﷺ سەهووی کردبێت، لەکاتێکدا سەهوو لە هەموو دڵێکی بێئاگاو ئاڵوودەدایە.. بەڵام دڵی پێغەمبەر ﷺ خەیاڵی لەسەر هیچ شتێکی دنیایی نەبووە. تەنها ئەوەنەبێت کەدڵی بەخوداو بەگەورەگرتنی خوداوە سەرقاڵ بووە).

## "چەند پێغەمبەرێکی دیکەش شتیان لەبیرچۆتەوە"

دیارە هەر پێغەمبەری ئێمەش ﷺ شتی لەبیر نەچووە، بەڵکو چەندین پێغەمبەری تریش (سەلامی خودایان لیَ بێت) ئەو حاڵەتەیان بەسەردا هاتووە، لەمبارەیەوە پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی بەسەرهاتێکی (سلێمان سەلامی خودای لیَ بێت) بۆ گێڕاوینەتەوە، کە لەبیری چووە بڵێت: (ان شاء الله)، ئەمەش لەو فەرموودەیەیدا هاتووە، کە (بخاري) لە (أبوهريرە)وە —خودا لێی رازی بێت- و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویتیەوە، فەرموویەتی: (قال سليمان بن داود — عليه السلام- : **((لاطوفن الليلة على مائة امراة- او تسع وتسعين- كلهن يأتي بفارس يجاهد في سبيل الله. فقال له صاحبه: قل إنْ شاء الله. فلم يقل إنْ شاء الله. فلم تحمل منهن الا أمراة واحدة جاءت بشق رجل. والذي نفس محمد ﷺ بيده لو قال ان شاء الله. لجاهدوا في سبيل الله فرسانا اجمعون))**[1]..

واتە (سلێمانی کوڕی داود- سڵاوی خودایان لیَ بێت- جارێکیان گوتی (ئەمشەو بەسەر سەد ئافرەت) (یان نەوەدونۆ ئافرەتدا) دەگەڕێم (واتە لە هاوسەرەکانی، چونکە ناوبراو خاوەنی ژمارەیەکی هێجگار زۆری هاوسەران بووە) دەگەڕێمو هەریەکەشیان شۆڕە سوارێکی وام بۆ دەخاتەوە، کە لەپێناوی خوادا بجەنگێت) هاوڕێیەکی لەو کاتەدا پێی گوت: (بڵێ: ان شاءالله)، بەڵام ئەو نەیگوت (ان شاءالله)

(١) (البخاري) كتاب الجهاد، باب (٢٣) من طلب الولد للجهاد. حديث رقم (٢٨١٩).

لەدواییدا تەنها ئافرەتێکیان سکی لێی هەبوو، ئەویش کوڕێکی شان خوارو کەم ئەندامی لێبوو.. دەسا بەو خودایەی کە گیانی (محمد)ی ﷺ بەدەستە ئەگەر (سولەیمان) بیگوتبایە " ان شاء الله" لە هەر هاوسەرێکیان شۆڕەسوارێکم دەبێت- ئەوا لە هەموویان ئەو شۆڕەسوارانەی دەبوو کە لە پێناوی خودادا جیهاد بکەن).

هەروەها لە سوورەتی (کهف)ەوە ئەوەشمان زانیوە کاتێك (مووسا) (سڵاوی خوای لێ بێت) بەڵێنی بە هاوڕێکەی داوە (کە- خضر- بووە سڵاوی لێ بێت) دەربارەی هیچ هەڵسوکەوتێکی (خضر) پرسیاری لێ نەکات و، بەرهەڵستی هیچ کارێکی نەکات، بەڵام کاتێك دیتی پاپۆڕێکی کونکرد، بەرهەڵستی کردو گوتی: ﴿أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴿٧١﴾ الكهف﴾، ئایا ئەو پاپۆڕەت بۆیە کون کرد، تاکو سەرنشینەکانی سەرنگوم بکەیت، بەڕاستی کارێکی ناشایستەو غەریبت کرد".

کاتێك هاوڕێکەشی بەڵێنەکەی بیردەخاتەوە لەسەرئەوەی گلەیی لەهیچ کارێکی نەکات، خێرا (مووسا)ش دان بەبیرچوونەوەکەی دەنێت و پێی دەڵێت: ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ الكهف﴾، واتە (سەرزەنشتم مەکە لەسەر ئەوەی، کە لەبیرم چووەو بارگرانی وکاری قورسم بەسەردامەدە بەوەی، کە گوایە هەرنابێت شتم بیربچێت).

هەروەها قورئان ئەو بەسەرهاتەشی لەسەر یەکەم مرۆڤ، کە باوکی مرۆڤەکانو یەکەم پێغەمبەریشە (واتە ئادەم- سڵاوی لێ بێت) بۆگێڕاوینەتەوە، کە شتی بیرچۆتەوەو لە درەختەکەی خواردووەو، بەوەش فەرمانەکەی خودای بیرچۆتەوە، ئەمەش بە ئانقەستو بەسەرپێچیو سووربوون لەسەر گوناهەکە نەبووە، چونکە مرۆڤێك، کە پێغەمبەری خوداش بووە (واتە ئادەم) بەئانقەست سەرپێچی لە فەرمانو پەیمانی خودا نەکردوە.

## " هـەموو کارێـك بەخواسـتی خـودایـە "

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ...﴿٢٤﴾ الکهـف ﴾ .. ئەم ئایەتە (لـەڕێی ئاگادارکردنـەوەی پێغەمبـەرەوە ﷺ هـەموو موسـڵمانێکیش ئاگادار دەکاتەوە لەوەی، لە داهاتوودا هەر کارێك دەکات بیبەستێتەوە بەخواسـتی خودایی یەوە، هەروەها ئاگاداری دەکاتەوە لەوەی بەبێ جیاکاریی (استثناء) هـیچ بـەڵێنێك نـەدات ( وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ...).. لەوانەشە مرۆڤ پرسـیار بکـاتو بڵێـت (بۆچـی ئـەم جیاکارییـە هـەبێتو بۆچـی سبەینێو داهاتوو بەخواستی خـوداوە ببەسـترێتەوە؟ ئـەی ئایـا ئەوکەسـەی، کـە (کارەکانی داهاتوو بەخواستی خوداوە دەبەسـتێتەوە) دەستەوسـانە لـەوکارەی لـە داهاتوودا دەیکات؟ ئەی بۆچی دەستەوسانە لێی؟

بێگومان داهـاتوو شـتێکی نادیـارە لەمرۆڤـ، چـونکە ئـەم داهـاتووە تـەنها بەدەستی خودا خۆیەتیو، خوداش هیچ ئامرازێکی وای بەمرۆڤـ نـەداوە تـا بـەو هۆیەوە ئاگاداریی هەبێت وبتوانێت ئەوەی لە داهاتوودا دێتەڕێی دیـاریی بکـات، یان ئەوکارەی لە داهاتوودا دەیکات بیزانێت.

جا لەبەرئەوەی داهاتووش نادیارە، ئەوا هەر خودا خۆی دەیزانێت، چونکە خودا خۆی کلیلەکانی نادیـاری هەیـە:﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾ النمـل ﴾. مرۆڤ نازانێت لە داهاتوودا، چ ڕووداوێکـی تووش دەبێتو لە سـبەینێشیدا چی دەکات، لەم ڕووەشـەوە خـودا دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٌ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدًاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٍ تَمُوتُۚ ...﴿٣٤﴾ لقمـان ﴾. واتـە:

"بێگومان خودا زانستی رۆژی لێپرسینەوەی لەلایەو جگە لەخودا هیچ کەسێك نازانێت کاتی قیامەت کەی دێت، هەروەها خودا هەرخۆی باران دەبارێنێت و، هەرخۆیشی دەزانێت چی لە ڕەحمەکانی دایکان دایە، هەر خوداش دەزانێت سبەینێ چی ڕوودەدات و، هیچ نەفسێك ئاگاداری رووداوەکانی سبەینێ نیەو، هیچ نەفسێکیش نازانێت لەچ خاکێکدا دەمرێت".

بێگومان سبەینێ (الغد) پڕە لە رووداوی کتوپڕو ئەگەرەکان بۆ مرۆڤ ، بەپێی بیرکردنەوەی مرۆڤیش لەوانەیە لە سبەینێدا فلان کارو فلان شت و فلان مەسەلەی وای بۆ ڕووبدات، هەرگیز حسابی بۆ نەکردوە. هەروەها لەوانەیە مرۆڤ بەتەمای کارێك بێت و لە ئایندەدا تووشی ببێت، لەوانەشە نەخشە بۆکارێك بکێشێت، سبەینێ دەیکات و هەموو جۆرە ئامرازو کەرەسەیەکی پێویستیشی بۆ دابین بکات و هیچ سستی و درێغی یەکیشی تێدا نەکات و، کارەکەشی بەپێی حسابات و مەزەندە مرۆییەکان لەسەداسەد بە مسۆگەرکراوی دەرکەوتبێت، کەچی دواتر شتێکی کتوپڕیی بێتە پێشەوەو هەموو مەسەلەکان هەڵگێڕێتەوە، هەموو نەخشەو بەرنامەیەکیشی بۆ هەڵوەشێنێتەوە، ئەم شتە کتوپڕییەش لە حساب و مەزەندەیدا نیەو تواناش لەسەر لابردنی نیە.

**ئەمە سەبارەت بە تێڕوانین و زانست و توانای مرۆڤ.**

بەڵام سەبارەت بەخودای پاك و میهرەبان، ئەوە دیارە توانایەکی باڵا دەستیی رەهاو، خواستێکی بەجێگەیەنراوو ئیرادەیەکی بێسنووری هەیە، بەڕاستی خودا بەخواست و هەڵبژاردنی خۆی دەتوانێت هەموو کارێك بکات، هەروەها هەر کارێکیش بیەوێت دەیکات و هیچ ڕەتکەرەوەیەك بۆ کارو فەرمانی نیە، هەر خواستە ئیرادەو توانای خوداشە، کە بڕیار لەسەر ڕووداوەکان و هەواڵەکان و فەرمان و هەڵس وکەوتەکانیش دەدات، هیچ کەسێکیش و هیچ فەرمانێکیش لەو خواستە ئیلاهییە دەرناچن، تەنانەت گشت مەخلووقێکیش لەم گەردوونەدا، سائیتر

لە مرۆڤـ یان —جن-یان —مەلائیکە بن- هـەموویان ملکەچـی ئـیرادەو خواسـتی خودان، دیارە هیچ کەسێکیش لەو مەخلووقانە ناتوانن بەرامبـەر خواسـتی خـودا بووەستن، یان نکوولّی لیّ بکەن، یاخود پێچەوانەی بوەسـتن، یـان دژایـەتی بکـەن، یاخود پووچەڵی بکەنەوە. چونکە ئەوە فەرمانی خودای خالق‌و بەهێزو توانایە.

بۆیە دەبینین هەرشتێك لـە گەردوونـدا روودەدات، بەخواسـتی خودایـەو هـیچ شتێکیش بەبیّ ویست وئیرادەی خودا نابێت. خواستی خـەڵکیش لـەژێر خواسـتی خوادایە، ئیدی هەرشتێك خواستی خودای لەسەربێت، دەبێت هەرشتێکیش خواستی خودای لەگەڵدا نەبێت، نابێت خەڵکیش هەموویان هیچ خواستێکیان بەجیّ ناگات، گەر خواستی خودای لەگەڵدا نەبێت، وەك لەمبارەیەوە خودا فەرموویە:

﴿... فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ الإنسان﴾.

هەروەها خودا فەرموویـەتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ التکویر﴾، جا بەهۆی ئەوەی مرۆڤ نازانێـت لـە سـبەینێدا چـیی بـۆ ڕوو دەدات، بەهۆی ئەمەش، کە بیّتوانایە لەسەر بەرگری لەهەرشتێك، کە خودا خواستی وایـە تووشی ببێت‌و، بیّ تواناشە لەسەر پەیداکردنی ئەوشتەی خودا خواستی وایـە پێـی نەگات، بۆیە دەبینین مرۆڤـ شکست‌و دەستەوسانە لە زانین‌و پێشبینیکردنی ئەوەی (لە خێر یان لەشەڕ) دێتە ڕێی، تەنانەت لەمسۆگەر کردنی نەخشەو بەرنامەکانی‌و، لە دەستە بەرکردنی ئەوەش، کە نەخشەو بەرنامەی بۆ دادەنا.

لەبەرئەمـە ئایەتەکـە ڕێنمـایی دەکـات، بـۆ هەڵس‌وکـەوتی شـیاو لـەو مەسـەلەیەداو، داواشـی لـیّ دەکـات، کەهـەموو بـەڵێن‌و نەخـشەیەکی ئایـندەی بەخواستی بەجێگەیەنراوی خودا وەگریّ بدات، ئیدی مـرۆڤ ناکەوێتـە بـەر گلـەیی خەڵکی، لەکاتێکدا دەستەوەسان بێت لەبەجیّ هێنانی ئەوەی بەڵێنی لەسـەرداوە..

دیارە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت، مرۆڤی موسڵمان هۆکارەکان نەگرێتەبەرو، هەموو نەخشەو بەرنامەو هیواو ئاواتێکیشی هەڵوەشێنێتەوە، چونکە وەبەرنانی هۆکارەکان لە بنەماکانی باوەڕو لەبوارەکانی بەندایەتیو عیبادەتە. تەنها ئەوەندە هەیە، نابێت پەنای تەواو بۆهۆکارەکان ببات‌و هەر چاوی لە نەخشەو بەرنامەکان بێت، بەڵکو دەبێت پێودانگی یەکەم بۆخواستی ئیلاهی دابنێت..

## " وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ "

لەبیرچوونەوەی پێغەمبەر ﷺ لـەوەدا بـوو، کاتێـك بـەڵێنی بـە موشـریکانی مەککەدا لەسەر ئەوەی سبەینێ وەڵامی پرسیارەکانیان دەداتـەوە، نەیفـەرموو (ان شـاءالله) ئەمــەش هۆیــەکی گونجاوی قورئانــه، ڕێنماییــەکی خـودای تێدایــه بــۆ پێغەمبەرو ﷺ هەرموسڵمانێکی دوای خۆیشی، که ئەم بنەما جوانه قورئانیه لەم سەرزەوییه پیادە بکات.

هەر بۆیەش خودا فەرموویەتی: (وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ) کاتێك شتێکت بیر چوو، یادی خـودا بکـەرەوە.. ئـەم وتـە نایابـەش ڕاسـتی یـەکی بنـچینەییە لـە ڕاســتییەکانی ئیــسلامو، چارەســەرێکی سوودبەخشیــشە بــۆ لادان، یــان بــۆ کەمتەرخەمی، یان بۆ بێ ئاگاییو لەبیرچوونەوە.

بێگومان مرۆڤی موسڵمان لەم ژیانەدا جەنگێکی حـەتمیو بەسـەردا سـەپێنراو دەگیرێت، جەنگێك لەگەڵ –شەیتان- و لەگەڵ شوێنکەوتووانی، جـەنگێك لەگـەڵ ناهەق (باطل)و شوێنکەوتوانی...

بێگومان خوداش سەرکەوتنی لەو جەنگەدا بۆ مسۆگەرکردووە گەر ئەو مرۆڤـە موسڵمانە پەنا بباتە بەرخودای پەروەردگاریو پشتی پێ ببەستێت. هەروەها خـودا ئەو مرۆڤەی لە دوژمنەکەی (لە شەیتان) ئاگادارکردۆتـەوەو بۆشـی روونکردۆتـەوە کـەوا شـەیتان تـەنها دەسـەڵاتو ڕکێـفو کاریگـەریی لەسـە رشـوێنکەوتوانو سەربازانی خۆی هەیە، لەدەروازەی (بێ ئاگاییو لەبیرچـوونەوەو پـشتگوێ خـستنو کەمتەرخەمیشەوە) دەچێتە نێو بیرو خەیاڵی مرۆڤەوە.

هەربۆیـــە خـــودا مرۆڤـــی لـــەم دەروازانـــەی (بێئاگـــایی‌و لەبیرچـــوونەوە، کەمتەرخەمیی، پشتگوێ خستن) وریاکـــردۆتەوەو، پێشی فەرمووە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر.

واته: " ئەی ئیماندارن لەخودا بترسن باهەر کەسێك بڕوانێت بۆ ئـەوەی بزانێـت چی ی بۆسبەینێی خۆی دابینکردووە، بەمەش لەسزای خودا خۆتان بپارێزن، چونکە شارەزاو ئاگاداری کردەوەکانتانە. هەروەها ئێوە ئەی ئیمانداران وەك ئەوکەسـانەی پێش خۆتان نەبن، کە خوداو ڕێبازی خودایـان لـەبیرکردو،خوداش ئـەوانی لـەبیری خۆیان بردەوەو وایان لێ هات نەفسی خۆیـانو ئەرکـەکانی نەفـسی خۆیـان لـەبیر چووەوە، بەم ڕەنگە ئەوان بەدکارو لە ڕێ لادەر دەرچوون".

جا ئەگەر مرۆڤ بـێ ئاگـابوو، یـان شـتێکی لەبیرچـوو (بێگومـان هەرتووشـی حاڵەتی بێ ئاگاییو لەبیرچوونەوەش دەبێت) ئەوا لەسەری پێویستە، بە بیری خـۆی بێنێتەوەو وریاو ئاگادار بێتەوە،بەم پێیەش پەنابەرێتـە بـەرخودای پـەروەردگاریو داوای لێخۆشبوونی لێ بکات وداوای کۆمەكو یارمەتیشی لێ بکـات، خـودا لـەم بارەیەشەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ الأعراف.

واتە " ئەوکەسانەی خۆپارێزو لەخواترس بوون هەرکاتێك خورپـەو خـەیاڵێکی نابـەجێیان لەشـەیتانەوە بەرکـەوێت، خێـرا یـادی خـودا دەکەنـەوەو بەرچـاویان ڕووندەبێتەوەو باری ڕاستیی واقیعەکە دەبینن، بەڵام برایـانی شـەیتان کـە (کـافرو

موشریکەکانن) لەلایەن شەیتانەکانەوە کۆمەك وهاریکاریی دەکرێن تاکو هەر لە گومڕاییدا بمێننەوەو پاشان لەو کۆمەكو هاریکارییانەیاندا درێغی و کەمتەرخەمیی ناکەن).

هەروەها فەرموویە (وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ).. جابۆیە زیکرو یادی خودا باشترین چەکە بۆ سەرکەوتن بەسەر شەیتانو سەربازانییدا، هەروەها زیکرو ناوهێنانی خودا چارسەرێکی کارای قورئانە بۆ کەمتەرخەمیو پشتگوێخستنو دەربازبوون لە حوکمەکانو گوناهکردن.

هەمدیسان زیکرویادی خودا ژیانێکە بۆ دڵ و، بەختیارییە بۆگیانو، حەوانەوەیە بۆ مرۆڤی باوەڕدارو، ڕۆشناییەکە بۆ ژیانو، ڕێگایەکە بۆ خۆشویستنی خوداو ڕەزامەندی خوداو، هۆیەکیشە بۆ چوونە نێو بەهەشتەکەیو، ڕزگاربوون لە سزای دۆزەخەکەی.

هەروەها ئەم ئایەتە ڕێنماییمان دەکات بۆ جێگەیەکی ترلە باسی یادی خودا، کە (لەبیرچوونەوەیە) واتە مرۆڤ بیری خودا بکاتەوە لەکاتی لەبیرچوونەوەدا.

"وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ " لێرەدا لەبیرچوونەوە سنووردارو دیاریکراو نیە، بەڵکو گشتیو ڕەهایە. قورئانیش لەسەربارەگشتییەکەی دایناوە تاکو هەموو شێوەو ڕەنگێکی ئەو (لەبیرچوونەوە) یە بگرێتەوە، هیچ چارسەرێکی نیە تەنها بەیادکردنەوەی خودا نەبێت.

باشتریش وایە دەستەواژەکە لەسەربارەگشتییەکەی خۆی بهێڵرێتەوەو، سنووردارو دیاریکراو نەکرێت، چونکە ئەمە یەکێکە لەکلیلەکانی مامەڵە لەگەڵ قورئانو ڕێسایەکیشە لە ڕێساکانی لێ تێ گەیشتنی.

هەندێك لەو وێنەو ڕەنگو حاڵەتانەی، کە دەستەواژەی (لەبیرچوونەوەکە) دەیانگرێتەوە، ئەمانەن:-

١- لەبیرچوونەوەی خوا (نسیان الله)، خودا بەیادت بێنەوە ئەگەر لەبیرت چوو، چونکە بۆ هیچ موسڵمانێك ناشێت، بۆ ساتێکیش خودای لەبیربچێت. لەبیرچوونەوەی خوداش (واتە ئەگەر موسڵمانێك خودای لەبیربچێت) ئەوە بێگومان گوناهو کەمتەرخەمییەکە. بۆیە هەر دەبێت یادی خودا بکاتەوەو داوای لێخۆشبوونی لیٚ بکات. هەروەها لەبیرکردنی خودا هۆیەکە بۆ کەوتنە نێو گوناهانەوەو، چارەسەری ئەمەش تەنها یادکردنەوەی خودایە.

٢- لەبیرچوونەوەی (جیاکاریو دانانی ئەگەر)و هەڵپەساردنی بەڵێن بەخواستی ئیلاهی یەوە:- واتە یادی خودا بکەرەوە ئەگەر لەبیرت چوو بڵێیت: (سبەینیٚ – ان شاءالله - ئەوە دەکەم) بۆیە لەکاتی بەبیرهاتنەوەدا ئەو (جیاکاریو ئەگەردانانە)ش دیاری بکەو مەسەلەکە بەخواستی خوداوە ببەستەرەوە. ئەم شێوازەی بەبیرداهاتنەوەیە زۆربەی زانایانی تەفسیریش لەشیکردنەوەی ئەم ئایەتەدا باسیان کردووە.

٣ -لەبیرچوونەوەی دوژمنایەتیی دوژمنە گەورەکە (شەیتانو شوێنکەوتوانی)، چونکە بیرچوونەوەی دژایەتی کردنیان هۆیەکی بەدەمەوە چوونی وەسوەسەکانیانە بۆیە یادی خودا خاوەنەیادکەرەکەی بەکەسێکی بیناو بەرچاو ڕۆشنو ئاگادار لەو دوژمنانە دەهێڵێتەوە.

٤- لەبیرچوونەوەی ئەرکەکان: یادکردنەوەی خودا هۆیەکە بۆ یادکردنەوەی ئەرکەکانو بەجیٚ گەیاندنیان، هەمدیسان هۆکارێکی راستەوخۆشە لەمامەڵەکردنی باش لەو ئەرکانەو لەتێڕوانین بۆیاندا.

٥- بیرچوونەوەی (مەبەست لە ژیان)و فەرمان تیایداو نەخشەی سەرکەوتوو بۆ بەسەر بردنی ژیان لەسەر بەرنامەی خودا.

٦- لەبیرچوونەوەی مردنو، دەرچوون لەم دنیایەونەمانەوەی بەنەمری تێیدا.

٧- لەبیرچوونەوەی رۆژی دوایی‌و لەبیرچوونەوەی دۆزەخ وسزاکانی‌و، لەبیرچوونەوەی بەهەشت‌و نیعمەت‌و خێروخۆشییەکانی.

بێگومان ئەم وێنانەو ئەوانی تریش، ترسناکن‌و چەندین زیانی کاریگەریان لەژیانی موسڵماندا هەیەو، هیچ چارەسەرێکی نیە تەنها بەردەوامی لەسەر زیکرو یادی خودا نەبێت (وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ).

## "کێ گوتوویەتی (سێ سەد ساڵ) لە ئەشکەوتەکەیاندا ماونەتەوە"؟

لە فەرمایشتەکەی خوادا ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ٢٥﴾ الکهف هەواڵێکە لەسەر ئەوماوەیەی کە لاوەکان لە ئەشکەوتەکەدا ماونەتەوە، یان لەسەر ئەو ماوەیەیی لە ئەشکەوتەکەدا (بەدەربڕینێکی وردتر) خەوتوون، ئەمەش ئەو ماوەیەی نێوان چوونە نێو ئەشکەوتەکەیانە تائەو کاتەی گەلەکەیان پێیان زانیون، پاشان هەواڵەکە بڕیاری ئەوە دەدات، گوایە ئەو ماوەیە سێ سەدو نۆ ساڵ بووە. بەڵام کێ ئەم هەواڵەی گوتووەو راگەیاندووە؟! ئایا ئەمە فەرمایشتی خودایە تابیێتە بڕیار لەسەر ئەو ماوەیە؟! یان وتەی ئەوکەسە پێشینانەیە، کە جیاوازیی وتەو بیروڕایان لەنێواندا هەبووە لەسەر بەسەرهاتی لاوەکان؟ تا بەم رەنگە قورئانیش لە (باب)ی گێڕانەوەی حیکایەت‌و داستانەکانەوە هێنابێتی یان لە(باب)ی دان پیانان‌و بڕیاردانەوە؟!

زانایان لەمەدا بیروڕای لێك جودایان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: (ئەمە فەرمایشتی خودایە لەسەرماوەی لاوەکان لە ئەشکەوتەکەدا) هەندێکی دیکەشیان گوتوویانە: (ئەمە وتەی ئەوکەسە پێشینانەیە لەسەر مەسەلەی بەسەرهاتی لاوەکان ناکۆك بوون).

وتەی یەکەم/ وتەی ئەو پێشینانە بوو لە مەسەلەی لاوەکاندا ناکۆك بوونو قورئانیش دانی پێدانەناوە یان پشتی پێ نەبەستووە، بەڵکو بەرهەڵستی کردووەو ڕەتیکردۆتەوە.

پیتی (واو) لای ئەوان لەو وتەیەدا﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ ﴾ - لەمەدا- واوی پەیوەندییە، واتە ئەم وتەیەی بە وتەکەی ترەوە﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾پەیوەست کردوە. ماناکەش ئاوای لێدێت (دەڵێن: ئەوان سێ کەسن، چوارەمیان سەگەکەیانە﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ ﴾ ... (هەروەها دەڵێن: ئەوان سێ سەد ساڵ لە ئەشکەوتەکەیاندا ماونەتەوە ﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ ﴾قورئانیش ئەو وتەیەی ئەوانی لەم وتەیەی خۆیدا پووچەڵکردۆتەوە کەخودا تیایدا فەرموویە: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ...﴿٢٦﴾ الكهف﴾، واتە: (بڵێ خودا هەرخۆی دەزانێت چەندە ماونەتەوە، زانستی نادیارەکانی ئاسمانەکانو زەوی لەلای خۆیەتی)... کەواتە بەم وتەیە قورئان ماوەی مانەوەیانی بۆ زانستی خودا حەواڵە کردووە. خۆ ئەگەر وتەی ئەو کەسە پێشینانە ڕاستو جێی باوەڕ بوایە ئەوا مانایەکی نوێ بۆ وتەکەی قورئان دەبوو،واتە بۆ وتەی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) خۆ ئەگەر ئەم وتەیە لەخوداوە بوایە ئەوا هیچ مانایەك بۆ فەرمایشتی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) نەدەبوو..

زانای ئیسلام (سیوطي) لە (الدر المنثور)دا لە (ابن عباس-ەوە- خودا لێیان ڕازی بێت) وتەیەکی هێناوە، گوتوویەتی: مرۆڤ کاتێك تەفسیری ئایەتەکە دەکات، وادەزانێت بەو ڕەنگەیە، کە خۆی دەبینێت، بۆیە دوورتر لەماوەی نێوان ئاسمانو زەوی بۆی دەڕوات.

پاشـــان (ابـــن عبـــاس) رســـتەی ( وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ )ی خوێندۆتەوەو ئینجا گوتوویەتی (ئەو لاوانە چەندە ماونەتـەوە)؟ گوتوویانـە (سـێ سەدو نۆساڵ) ئەویش گوتوویەتی: (ئەگەر ئەوەندە ماونەتەوە، خودا نەیدەفـەرموو: ( قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) بەڵكو تەنها وتەی ئەو خەڵكـەی پێـشینانی گێڕاوەتــەوە، وەك چۆن لـە ڕسـتەی ( سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ )دا وتـەی ئـەو خەڵكـەی گێڕاوەتەوەو هەواڵی ئەوەشیداوە، ئەوان نازانن (ئینجا (ابـن عبـاس) گوتوویـەتی: ئەوان دەڵێن: سێ سەد ساڵ ماونەتەوەو، نۆ ساڵی تریشیان بۆ زیاد کردوە ( وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ ).

هەروەها (سیوطي) له (قتادة)وە — خودا لێی ڕازیبێـت —گێڕاوێتیـەوە: ئەمـە خەڵكی گوتوویەتی، ئایا نابینێت ئـەو گوتوویـەتی ( وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ ) پاشان گوتوویەتی: ( قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) له ڕوایەتێكی تردا، هەر له (قتادە) وەیە گوتوویەتی: (ئەمە وتەی ئـەهلی كیتابـە، خـوداش بـە فەرمایـشتی ( قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) وەڵامیداونەتەوە[1].

وتەی دووەم/ بێگومـان هـی خودایـە، هەوڵدانێكـە لـەخوداوە دەربـارەی مـاوەی مانەوەی لاوەكان لەئەشكەوتەكەدا، وەك (سیوطي)یش لە(مجاهد)ەوە وتەیەكی ئەوی دەربارەی ئایەتەكە هێناوە، گووتوویەتی (ئەوە ژمارەی ئەو ماوەیانە، كە لەنێو ئەشكەوتەكەدا ماونەتەوە[2].

پێشەوا (ابن كثیر)یش ئەم وتەیەی تەبەننی كردووەو پشتگیریـشی لێكـردووەو، وتەی یەكەمینی ڕەتكردۆتەوەو، پاشان گوتوویەتی: "ئەمە هەواڵێكە لەخوداوە بـۆ

(١) الدر المنثور للسيوطي (٥ : ٣٧٩).

(٢) هەمان سەرچاوە

پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ دەربارەی ژمارەی ساڵانی ئەو ماوەیەی، کە لاوەکان لەرۆژی خەولێکەوتنیانەوە ژمارەی بەخەبەرهاتنەوەیان وپێزانینی خەڵکی و وڵاتەکەش بە کاروباریان" تێیدا ماونەتەوە ژمارەی ئەو ساڵانەش سێ سەد ساڵ بووە بەڵام بە ساڵی مانگی (هیلالی) نۆ ساڵی تریشی دێتەسەر فەرمایشتەکەی خوداش (﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟﴾)، واتە: ئەگەر دەربارەی ماوەی مانەوەیان پرسیارت لێکراو، بێگومان تۆش زانیاریەکت لەسەری نیەو، ئەمەش لەلای خودا بەندە ئەوا لە وەڵامدا هیچ شتێك مەخەرەڕوو، بەڵکو لە وەڵامی ئەوجۆرە پرسیارانەدا بڵێ: (خودا خۆی دەزانێت چەند ماونەتەوە، هەواڵی نادیارەکانی ئاسمانەکانو زەوی هەر لەلای خودا خۆیەتی: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾.. بەمانای کەس ئەوە نازانێت تەنها خودا نەبێت، جا کێ هەیە لەبەندەکانی خودا بتوانێت ئەو زانیاریانە بەخودا بدات؟

ئەمەی ئێمەش (واتە: ابن كثير) گوتوومانە ڕای پتر لەیەك کەسی زانایانی تەفسیری لەسەرە، وەکو ڕای (مجاهد)و زانایانی پێشین وپاشین (السلف والخلف)، بەڵام وتەکەی (قتادە) کە گوتوویە گوایە (دیدوبۆچوونێکی لەسەرە)، ئەوە دیارە ئەوەیە (ئەهلی کیتاب) دەریان بڕیوە، کەوا (سێ سەدساڵ لاوەکان لە ئەشکەوتەکەدا ماونەتەوە، واتە بەبێ حسابکردنی ئەو نۆ ساڵەی لە ساڵنامەی (مانگی) حسابی بۆ کراوە، بەڵام بەپێی ساڵنامەی (هەتاویی/ شمسی) تەنها سێ سەدساڵ دەکات. خۆ ئەگەر خودا وتەی ئەوانی بگێڕایەتەوە ئەوا نەیدەفەرموو: (وازدادوا تسعا). وەك لە ئایەتەکەشەوە بەدیی دەکرێت، ئەم ماوەیە هەواڵێکە لە خودا خۆیەوە نەك گێڕانەوەی بێت لەزاری ئەهلی کیتابەوە ئەمە ڕای هەڵبژێرراوی (ابن جرير)یشە ڕەحمەتی خودای لێ بێت"[1]. بۆ ئەوەی ماوەی جیاوازیی نێوان ساڵانی (هەتاوی)و (مانگی) بزانین.

---

(١) تفسير ابن كثير، (٣ ٧٩)..

## "ئایا نۆ ساڵەکە ئەو جیاوازییەی نێوان هەردوو ژمارە حسابکراوەکەیە"؟

چەندین زانای دێرینو هاوچەرخی (تەفسیر) وای بۆچوون، لاوانی نێو ئەشکەوتەکە بەپێی ساڵنامەی (هەتاوی (شمسی) سێ سەدساڵ لە ئەشکەوتەکەیاندا ماونەتەوە، ئەم ژمارەیەش (٣٠٠ ساڵ) بەپێی ساڵنامەی (مانگی/ قمری) دەکاتە (٣٠٩) ساڵ. جا ئەو نۆ (٩) ساڵەی دواییش ئەو جیاوازییەی نێوان هەردوو ژمارە حسابکراوەکەی ساڵنامەی (هەتاوی)و (مانگی)یە.

ئەو زانایانە (ئەو نۆ ساڵەی قورئان باسی کردووە) دەکەنە بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی، تەنها قورئان تاکە سەرچاوەی چیرۆکەکەیە، دیارە قورئانیش فەرمایشتی خودایە، نەك فەرمایشتی پێغەمبەری خودا ﷺ.

(ئیمام ابن کثیر) دەربارەی (بوونی ئەو نۆ ساڵە بە جیاوازیی نێوان هەردوو حسابەکە) گوتوویەتی: "بێگومان میقداری ساڵانی مانەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا سێ سەد ساڵ بووە، بەڵام بە ساڵی مانگی (نۆساڵی تریشی بۆ زیاد دەبێت) ئیدی بەپێی ساڵنامەی (هەتاوی) سێ سەد ساڵە، چونکە جیاوازیی نێوان هەردوو ساڵنامەکە لە هەر سەد ساڵ جارێکدا سێ ساڵە، بۆیەش خودا دوای ئەو سێ سەد ساڵە فەرموویەتی: (نۆ ساڵی تریشیان زیاد کردووە)، (ازدادوا تسعا)"[(١)].

بەڵام هەندێك لە زانایانی هاوچەرخ بەم رایە قایل نینو، وای دادەنێن لەگەڵ حسابەکەدا ناگونجێت.. یەکێك لەوانەش (عبدالرحمن الوکیل-ی خودالێی خۆش بێت) لە لێکدانەوەی (الروض الأنق)یدا بۆ ئەم وتەیە، دەڵێت، (ئەم لێکدانەوەیەی ژمارەی ساڵەکان، بۆ کتێبی خودا ناشایستەیە، هەروەها بۆ فەرمایشتی خوداش

---

(١) تفسیر ابن کثیر (٣: ٧٩).

هـەر ناشایـستەیە، دەبیـنن ڕسـتەی ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ﴾ لـە فەرمایشتی خودا خۆی بێت نەك وتەیەك بێت لە خەڵكانی دیكەوە گێڕابێتەوە، لـە ئایەتەكەشدا بەڵگەیەكی وانیە بـەرەهایی (مطلق) ئامـاژە بـۆ ئـەم لێكدانەوەیـە بكات"[1].

پێش ئەوەش وتەی كۆمەڵی زانایان بـسەلمێنین كـە (ابـن كـثير) لەنموونـە هـەرە دیارەكانیانە، دەبێت لەوە بكۆڵینەوە، ئاخۆ جیاوازیی نێـوان هـەردوو سـاڵنامەكە لەسێ سەد ساڵدا، نۆ ساڵە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسـیارەش، پرسـیارێكی دیكـە دەكـەین، (ئایـا جیـاوازیی نێـوان سـاڵی هـەتاوی‌و سـاڵی مـانگی چـەندە؟!.. مێژوونووسی هاوچـەرخی ئیـسلامی (احمـد عـادل كمـال) لەكتێبەكەیـدا (جـداول التقويم الميلادى المقابل للتقويم الهجرى)دا دەڵێت:

(یەك ڕۆژ لەساڵی —هەتاوی- بەمیقداری (سێ دەقیقەو- ٩ر٥٥- ی چركە) لـە ڕۆژێكی ساڵی —مانگی- زیـاترە لـەلای عەرەبـەكانیش "ڕۆژ لـەكاتی ئـاوابوونی خۆرەوەیە تا ئاوابوونی جارێكی تری لە ڕۆژی دواتـردا) مـانگی سـاڵی (مـانگی/ قمری)یش (٢٩ر٥٣٠٥٨٨) ڕۆژە.

(ساڵی مانگی)یش: (٣٥٤) ڕۆژو (هەشت سەعات)و (٤٨دەقیقە)و (٣٦) چركە (ثانية)یە. واتە نزیكەی (١١) ڕۆژی لە (ساڵی هـەتاوی) كـەمترە، چـونكە سـاڵی (هەتاوی)-٣٦٥- ڕۆژو- شەش سەعات-و- ٩ دەقیقەو- ٥ر٩- چركەیە"[2].

دوای ئەم هەژماركردنە وردە دەبینین جیاوازیی نێوان هەردوو حـسابە هـەتاوی‌و مانگییەكە تەنها نۆ ساڵ نیە، بەڵكو لەوە زیاترە (ئیمـامی- ئالووسـی)یـش لـەم مەسەلەیەی كۆڵیوەتەوەو تێبینی جیـاوازیی نێـوان هـەردوو سـاڵەكەی كـردووەو،

---

(١) الروض الانق بتحقيق الوكيل (٣ : ١٧٣).

(٢) جداول التقويم الميلادى الهجرى لاحمد عادل كمال (٣-٤).

گوتوویەتی: (جیاوازیی نێوان هەردوو ساڵنامەکە لەیەك ساڵدا- دە ڕۆژو- بیستو یەك سەعاتو- یەك دەقیقەیە.

جا ئەگەر ئەمە جیاوازیی یەك ساڵیان بێت، ئەواجیاوازیی سەد (١٠٠) ساڵیان (هەزارو هەشتاو حەوت ڕۆژو، سیازدە سەعاتو چوار دەقیقەیە، ئەمەش دەکاتە (سێ ساڵو بیستو چوار ڕۆژو یازدە سەعاتو شازدە دەقیقە)، بەم پێیە جیاوازیی سێ سەد ساڵیشیان دەکاتە (نۆ ساڵو حەفتاو سێ ڕۆژو، (نۆ سەعاتو، چلو هەشت دەقیقە)"[١].

کەواتە جیاوازیی نێوان هەردوو جۆرە ساڵنامەکە نۆ ساڵی بێ کەم و زیاد نیە وەك قورئان دیاری کردووە،بەڵکو پتر لە (٧٣) ڕۆژیشی زیاترە.

جا لە بەر ئەم ژمارە زیاترەی کە لەسەر (نۆساڵە زیادەکە)ش پەیدا بووە، چەند زانایەك گووتوویانە: (ئەمە هەواڵێك نیە لە خوداوەو، بڕیاردانی خوداش نیە، بەڵکو دیاریکردنی وتەی ئەو کەسە پێشینانەیە، لە بەسەرهاتی هاوەڵانی ئەشکەوتەکەدا ناکۆك بوونو، بیروڕای جیاوازیان دەربڕیوە لەسەریان. جا ئەم کەسانە وەك چۆن لەسەر ژمارەی لاوەکانیش بیروڕای هەمە جۆریان هەبووە، لەسەر ماوەی مانەوەی لاوەکانیش لەئەشکەوتەکەدا هەربیروڕای لێکجوداو جیاوازیان هەبووە، بۆ نموونەش کۆمەڵێکیان وایان ڕاگەیاندووە، ئەو لاوانە سێ سەدو نۆساڵ لە ئەشکەوتەکەیاندا ماونەتەوە، بەڵام ئەم وتەیەشیان ڕاست نیە. چونکە ئەگەر ئەمە فەرمایشتی خوداو (هەواڵێك بوایە لە خوداوە) ئەوا زۆر وردو تەواو دەبوو، قورئانیش هەموو هەواڵو بەسەرهاتو وتەیەکیشی بەوردیو تەواوی هێناوەو بەم شێوازە ڕایهێناوین.

هەندێك لە زانایانی دیکەی ئیسلام گوتوویانە: ئەم جیاوازییە کەمە (واتە ئەو زیادەیە لە نۆ ساڵەکە)ش گرنگ نیەو دەشێت، چونکە لەچوار مانگ کەمترە،

---

(١) روح المعاني للالوسي (١٥: ٢٥٢).

نەریتی عەرەبەکانیش هەر وابووە، هەمیشە پارچە وپاشماوەکان دەبڕنو ئەگەر لە نیوە کەمتر بووبێت باسیان نەکردووە، هەر بۆیەش قورئان نەیفەرمووە (نۆ ساڵی زیاترو چارەکە ساڵێك، یان نۆساڵی زیاترو حەفتاو سێ ڕۆژی زیاتریش ماوەنەتەوە).. لەم ڕووەوە (ئالووسی) دەڵێت: " دانانی جیاوازییەکە هەر بە تەنیا بۆ نۆ ساڵ، لەسەر بنچینەی بەنزیکی دانانەیەتی، چونکە ماوە زیادەکە نەگەیشتۆتە نیوەی ساڵێكو وەرزێك لە وەرزکانیشی تەواو نەکردووە، بۆیە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە"[١].

## "ڕای ڕاستتر ئەوەیە: ئەمە هەواڵدانێکە لەخوداوە"

لێرەدا، دوای هەڵوێستەیەك لەئاست بەڵگەکانی هەردوو لادا، هەوڵ دەدەین ڕای ڕاستتر یەکلابکەینەوە.. بەڵگەکانی کۆمەڵی یەکەمی زانایان، کە دەڵێن (ماوەی مانەوەی لاوەکان لە ئەشکەوتەکەدا بەسێ سەدو نۆساڵ دیاری بکرێت)، ئەوە وتەی ئەو پێشینانەیە،کە ڕای جیاوازو لێکجودایان لەسەر ژمارەی لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە دەربڕیوە. قورئانی پیرۆزیش ئەم وتەیەی لە (باب)ی (گێڕانەوەی وتەو باسی ئەو پێشینانەوە) هێناوەتەوە، بەڵگەکانی ئەم کۆمەڵەش لە ڕووی وردبینیو، ژمێریارییەوە بەهێزن.

بەڵام کاتێك گومانی جیاوازیی ژمێریارییەکە دەڕەوێنینەوە بەوەی گوایە عەرەب خۆیان ئەگەر کەرتەکان لە چوار کەمتربێن دایدەشکێنن، بۆیە لەمەوە ئەگەر نزیکەی هەشتا (٨٠) ڕۆژیش لەو نۆساڵە زیاتر مابنەوە، ئەوە قەیدی ناکات گەر حساب نەکرێت، بۆیە ئێمە لەگەڵ کۆمەڵی (جمهوری) زانایان داین بەوەی، ئەم هەواڵە (وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ) هەواڵدانێکە لەخودا خۆیەوە

---

(١) روح المعاني، (١٥: ٢٥٢)

دەربارەی ماوەی مانەوەی لاوەكان لـە ئەشـكەوتەكەدا، نـەك گێڕانـەوەی وتەیـەك لەوتەی پێشینان بێت.

ئەم فەرمایشتەش بایـەخی هـەردوو سـاڵنامە (هـەتاوی) و(مـانگی)یەكەشـی پاراستووە، واتە ئەمە بەساڵنامەی (هەتاویی- رۆمی ی — زایـین) كـە (دەوڵـەتی رۆمانی) ئەوسا كاری پێ دەكردو دەوڵەتە هاوچەرخەكانی خۆرئـاواش بەكەڵـەپوور لێیان گرتوونەتەوە، سێ سەد ساڵە، بەڵام بەساڵنامەی (مانگی)ی عـەرەبی — كـە (عەرەب) لەسەردەمی جاهیلیدا لەسەری بـوونو، بەسـاڵنامەی كۆچـی (هیجـری) دادەنرێت وموسڵمانانیش لەدواییدا كاریان پێكردووە، سێ سەدو نـۆ سـاڵە. ئیـدی ئەو نۆ ساڵەو، ئەوكەرتـە كەمـەی لێـی داشـكێنراوە، جیـاوازیی نێـوان هـەردوو ساڵنامەكەیە.

## سـووودی بڕگـەی " قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ "

لەرێی بەهێزترین بەڵگەی ئەوانەی گوتبوویـان (دیـاریكردنی مـاوەی مانـەوەی لاوەكان لە ئەشـكەوتەكەدا بـەڕای كەسەپێـشینەكانی شـوێنكەوتووی كتێبـەكانی دیكەی خودان، (واتە بەڕای ئەهلی كیتـاب) دەبێـت، قورئـانی پیرۆزیـش لـەدوای هێنانی وتەكەیانەوە، دەفەرمویـت (قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ) ئەمە وەك ئـەوە وایـە قورئان ئەو وتەیەی ئـەوان ڕەتدەكاتـەوەو بـەتاڵ و پووچـەڵی دەكاتـەوەو، وایـشی لەقەڵەمدەدات، لەسەر بنچینەی زانستێكی ڕاست نیەو ڕێنماییـشمان دەكـات بـۆ ئەوەی مەسەلەكە بۆ زانستی خودا بگێڕینەوە.

(عبدالرحمن الوكيل) لە (تحقيق الروض الانف) دا گوتوویـەتی : لێكدانەوەكـەی (ابن هشام) بۆ فەرمایشتەكەی خـودا (ولبثـوا في كهفهـم) لێكدانەوەیـەكی نایابـە

(بەپێی ئەوەی لەم فەرمایشتەدا وتەی پێشینەکان هاتووە) ئەم وتەیەش بە وتەی (ئەهلی کیتاب) دادەنێت، بەم رەنگە تێگەیشتنیشمان لەئایەتەکە ڕێکو راست دەبێتەوە، هەر ئەمەش لەگەڵ ڕستەی دواتریدا (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ)دا ڕێك دەکەوێت چونکە گەر دەستەواژەی (ولبثوا) لەفەرمایشتی خودا خۆی بوایە ئەوا فەرمایشتەکەی خۆی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ) هیچ مانایەکی نەدەبوو.(١)

بەڵام کۆمەڵی زانایان ئەم لێکدانەوەیە پەسەندناکەنو ئەو بەرهەڵستی یەش لادەبەنو، وای دادەنێن کەهەردوو ڕستەکە لەفەرمایشتی خودان، واتە ڕستەی (ولبثوا فی کهفهم..)و ڕستەی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ)..

لێرەدا پوختەیەکی بەسوودی ڕستەی پاشینەی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ) دێنینەوە لەگەڵ روون کردنەوەی هاوڕێکبوونی بەرامبەر بە ڕستەی پێش خۆی کە (امامی الوسی) هێناویەتی یەوە.. (ولبثوا فی کهفهم) ڕستەیەکی بەرایی ودەسپێکراوی روونکراوەیە، لە فەرمایشتی خودا (فضربنا علی آذانهم في الكهف سنين عددا)دا پوخت کراوەتەوە. هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش فەرمایشتەکەی تری خودا (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ) بڕیار دەدات لەسەر ئەوەی ماوەی مانەوەیان لەو خەولێخستنەدا ئەوەندەبووە، کەئاماژەمان بۆ کرد، وەك ئەوەی بفەرموێت (بڵێ هەر خودا خۆی ئاگادارو زانایە لەماوەی مانەوەیانداو، ئەو زانیارییەشی بەئێمەی داوەو، ئەم زانیاریەش ئەو حەقە ڕاست ودروستەیە هیچ گومانێکی لەسەر نیە.

سوودی دواخستنی ئەم روونکردنەوەیەش دەربارەی ماوەی مانەوەکەیانە، بۆ ئەوەیە ئاگاداربین، لەسەر ئەوەی کەسانی پێشینەکان لەسەرماوەی مانەوەکەیان ناکۆك بوون، وەك چۆن لەسەر ژمارەی لاوەکانیش ناکۆك بوون، بۆیە دوابەدوای

---

(١) الروض الانف- بەرگی سێ (٣) لاپەرە (١٧٢-١٧٣) پەراوێز.

ناکۆکیان ولێك جودایی بیروڕاکانیان لەسەر ژمارەی لاوەکان ئـەم روونکردنەوەیـەی هێناوە.

پاشگری ڕستەی دواییش بە فەرمانی (قل/ قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) هێنـاویێتی تاهەر بە پاشگری[1]. (قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم )یش بیگێڕێتەوە، پاشـان بـۆ ئەوەشـە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی ئەم چیرۆکە لە نادیار (غیـب)ەوە بـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ گەیەنراوە تاکو ببێتە موعجیزەیەکی تر بۆی"[2].

هەروەها (ئالووسی هەڵوێستەیەکی نایابو زیرەکانەی لەئاست ئـەو وتەیەشـدا کردووە، کە درابووە پاڵ (ابن عباس) خوداڵێیان رازی بێـت- لێیـەوە گێڕرابـووەوە کـەوا گوتوویـەتی: " وتـەی کەسـانی پێـشین دەربـارەی مانـەوەی لاوەکـان لـە ئەشکەوتەکەدا بۆ دیاریکردنی ماوەکـەیان بـە ڕاسـت دادەنرێـت) قورئـانیش ئـەو وتەیەی بەفەرمایشتی (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) بەتاڵکردۆتەوە. هەروەها (ئالوسی) ڕای (ابن عـباس) مان دەربارەی ژمارەی لاوەکانی نێـو ئەشـکەوتەکە بـۆ بەڕاسـت دادەنێت وای بۆچووە ژمارەیان حـەوت کـەس بـووەو، هەشـتەمیان سـەگەکەیانە، سەرەڕایی ئەوەش خودا لەدوای ڕسـتەکەیەوە فەرموویـەتی: (قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم ) ئەم بەدوا داچوونەش مەسەلەی زانینی ژمارەکەیان حەواڵەی زانست وعلمـی خـودا دەکات، ئەو وتەیە بەدرۆ ناخانەوە کـە (ژمارەکـەیان حـەوت بـووەو هەشـتەمیان سەگەکەیان بووە، ئیـدی بۆچـی لێـرەدا فەرمایـشتەکەی دواتـر کـە بەدواداچـوون (تعقیب)ە لەسەر ژمارەکە (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ ) ڕێگر بێت لە پشت بەستن بـەو هەواڵەی پێشتریەوە؟!

---

(١) ئێمە وشەی پاشگریی (التذیل) بۆ شێوازی قورئان بڕیار نادەین، بەڵکو باشتر وایە رسـتەی (ختم الایة بكذا- ئایەتەکە بەوە کۆتایی پێ هێناوە) بەکاربێنین. (نووسەر)

(٢) روح المعاني (١٥: ٢٥٢)

(ئالوسی) گوتوویە: (وادیارە ئەمە لەزانایەکی وەك (ابن عباس)ەوە- خودا لێی ڕازی بێت - (واتە: کە دەربارەی ماوەی مانەوەی لاوەکانە) بەڕاست نەهاتووە، بێگومان وتەی پێشتری دەربارەی ژمارەی لاوەکانی نێو ئەشکەوتەکە بەڕاست هاتووە، کە گوتوویەتی (ژمارەیان حەوت کەس بووەو، هەشتەمیان سەگەکەیان بووە) لەکاتێکدا خوداش لەدوای باسکردنی ئەم ژمارەیەوە فەرمووشیەتی: (هەر خودا ژمارەکەیان دەزانێت "قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم " هیچ جیاوازی یەکیش لەنێوان هەردووفەرمایشتی "قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم " و، " قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ " دا نییە ئەی بۆچی ئەمەیان دەلالەتی کردۆتە سەر ڕەتکردنەوەو بەتاڵکردنەوەی وتەکەو، ئەوی تریشیان دەلالەتی نەکردۆتە سەر ڕەتکردنەوەکە"[1].

## "بەڵگە دارێتی (وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ) لەسەر بە چاوگبوونی قورئان"

زانایانی ئیسلام هەڵوێستەیەکی هێواشو لەسەرخۆیان لەئاست فەرمایشتی (وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا)دا کردووەو هەوڵیانداوە حیکمەتی دیاریکردنی ئەم فەرمایشتە بدۆزنەوە.

پوختەی دیدو بۆچونیشیان ئەوەیە: ئەم ڕستەیە (وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا) دەلالەتێکی ئاشکرا دەکاتە سەر بەچاوگبوونی قورئان، واتە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، قورئان سەرچاوەی چیرۆکەکەیەو لەخوداوە نێردراوەتە خوارەوە، نەك کتێبێکی دانراوی پێغەمبەر خۆی بێت ﷺ رووکاری دەلالەت کردنەوەکەشی ئەوەیە: -ئایەتەکە بێگومان (دوو ساڵنامەی (هەتاوی)و (مانگی)ی لەمەڕ ماوەی مانەوەی لاوەکان لەئەشکەوتەکەدا) لەخۆگرتووە: ( وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ

(١) روح المعاني (١٥: ٢٥٢-٢٥٣).

تِسۡعٗا ).. ماوەکەش بەحسابی ساڵی (هەتاوی) سێ سەد ساڵ بووەو، بەحسابی ساڵی مانگیش نۆ ساڵ و کەرتێکی بۆ زیاد دەکرێت.

ئەمەش هەواڵدانێکە لە خوداوە بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ. خۆ ئەگەر قورئان لە دانانی پێغەمبەر ﷺ بوایە، ئەوا چۆن دەیزانی ئەو ماوەیە سێ سەدساڵە؟ لەکاتێکدا. (ئەهلی کیتاب)یش لە جوولەکەو دیانەکان نەیاندەزانی، هەروەها پێغەمبەر ﷺ (بێگومان کەسێکی نەخوێندەواریش بووە) نەیشیدەزانی، ئەوماوەیە بەحسابی ساڵی مانگی: (سێ سەدو نۆ ساڵ)بووە.

وشەی (وازدادوا)ش ئەم مانایە دەدات، ئەم (نۆ ساڵە) زیادکردنێکە بۆ ساڵە هەتاوییەکە، چونکە جیاوازیی نێوان هەردوو جۆرە ساڵنامەکەشە.

بێگومان جوولەکەکانیش گرانی ئەم پرسیارەیان دەزانی. هەربۆیەش پرسیارەکەیان ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کردۆتەوە، هەروەها زانیونیشیانە ئەمە بەڵگەو دەلالەتە لەسەر کاری پێغەمبەرێتییەکەی‌و ﷺ لەسەر پەیامەکەشی لە حاڵەتی وەڵامدانەوەدا. وەڵامەکەی خوداش بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو حەقیقەتە هاتووەو، بۆ زیاد کردنی بەڵگەیەکی تری بنەبڕیش بۆ سەر بەڵگە زۆرەکانی لەسەر ئەوەی بێگومان ئەم قورئانە فەرمایشتی خودای پاك‌و میهرەبانەو، خودا بەسرووش بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ناردووە.

## "چەند بەڵگەیەکی دی لەسەر بەچاوگبوونی قورئان"

ئەمەی پێشوو هەرتاکە بەڵگەیەك نیە لەسەر چاوگدارێتی قورئان. بەڵکو هەموو چیرۆکەکە بۆ ئەو دەلالەتە هاتووە، هەر بۆیەش موعجیزەیەك بووە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ..

ئەو بەڵگانەی تریش لەم ڕووەوە، ئەمانەن:-

١- فەرمایشتەکەی خودا (إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ )، وێڕایی دیاریکردنی حاڵەتی تەمەنیان کەلاو بوون.

٢- فەرمایشتەکەی خودا (وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ )ئەم ئایەتەکە پێشتر بەدرێژی ماناکەیمان لێکدایەوە، وێناکردنێکی وردی بزاوتی خۆرە.

٣- فەرمایشتەکەی خودا (وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ): بەم شێوەیە کە (لە گۆشەیەکی پانتایی ناوەڕاستی ئەشکەوتەکەدا بوون) وێنەگرتنێکی وردی شێوەی پاڵکەوتنیانە لەنێو ئەشکەوتەکەدا.

٤- ئەوەی لە وێنەگرتنی پێشووی جێگەی ئەشکەوتەکەیانەوەو لە ڕووگەی دەرگاکەشیانەوە لێی دەفامرێتەوە.

٥- فەرمایشتی خودا: ( وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ) لەگەڵ ئاماژە بۆ (کراوەیی چاویان) وێڕای ئەوەش کە نوستوون.

٦- فەرمایشتی خودا (وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ) و وێنەگرتنی جموجوڵی هەڵگێڕانەوەی لاشەکانیان لەنێو ئەشکەوتەکەدا.

٧- فەرمایشتی خودا (وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ) دیاریکردنی جێگەی سەگەکەو ئەوبارە جەستەییەی، کە بەسەریدا خەوتبوو.

٨- فەرمایشتی خودا (لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ) لەگەڵ دەلالەتی ئەو ڕاستییەی، کە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری حاڵەتەکەشیان نەبووە، چونکە لەم ئایەتەدا ئامرازی (لو) پیتی قەدەغەکردنە، بۆ قەدەغەکردنێك، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی لێیان هەڵنەهاتووەو لەترسان ڕای نەکردووە، لەبەر ئەوەی ئاگاداری‌و بینەری حاڵەتەکەیان نەبووە، ئیدی

چۆن ئەو هەموو شیکارو باسە وردانەو، ئەو وێنەگرتنە وردبینییانەشی زانیوە، کە هیچ کەسێکی دیکە نەیزانیون؟!

٩- فەرمایشتی خودا (قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا )و ئاماژەکردن بۆ بنیاتنانی مزگەوتەکەش کەبیروڕای ئەوکەسە حاکمو کاربەدەستانەیان بوون، کە ڕای خۆیان بەسەر شێوازی مەسەلەو کاروباری ناشتنی تەرمەکەکانیاندا سەپاندووە.

١٠- دیاریکردنی وتەکان لەبارەی ژمارەی لاوەکان لەسێ وتەدا، کەچوارەمیان‌نیە.

١١- فەرمایشتی خودا: (وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ) کە وتەی هەرە ڕاستترو یەکلاکەرەوەیە لەسەر ژمارەیان.

١٢- فەرمایشتی خودا (وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ )و، ئاماژەی بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەو، لەبیرچوونی پێغەمبەر ﷺ کە بەڵێنی وەڵامدانەوەکەی بە خواستی خوداو گوتنی (ان شاء الله)وە پەیوەست بکات، جگە لە دواکەوتنی (سرووش) لەسەر وەڵامەکەی بەهۆی ئەو لەبیرچوونەوەیەوە.

١٣- ئەوەی لە ڕیوایەتەکاندایە دەربارەی هۆیەکانی هاتنەخوارەوەی قورئان و دەربارەی دواکەوتنی هاتنە خوارەوەی (جبریل) – سلاوی لێ بێت- بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئەمەشدا زۆر پێویستی پێ بووە، بەتایبەتیش، کە بەڵێنی بە موشریکان دابوو لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان لەرۆژی سبەینێداو، هەرجارێکیش، دەچوونە لایو ئەویش پێی دەفەرمون: (هێشتا سرووشم بۆ نەهاتووە)، ئەمەش وای لێدەکردن گومانو پڕوپاگەندە لەدژی بلاوبکەنەوە، دیارە ئەمەش ناڕەحەتیو ئازارێکی زۆری بە پێغەمبەری خودا ﷺ گەیاندووە.

١٤- فەرمایشتی خودا ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ﴾و جەخت کردنەسەر دیاریکردنی ئەوماوەیە وەك باسمان لێوەکرد..

١٥- فەرمایشتی خودا (وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا) ودیاریکردنی ئەوسالآنەش بەبێژە (لفظ)ی ئەو زیادکردنەی کەئاماژە بۆ جیاوازیی نێوان هەردوو جۆرە سالْنامە (هەتاوی‌و مانگی)یەکە دەکات.

## "حیکمەت لە بەدواداچوونی قورئان بۆ چیرۆکەکانی"

وەك تێبینی دەکرێت قورئانی پیرۆز بەچەند ئایەتێك بەدواداچوون‌و لێکدانەوەی لەسەر ئەو چیرۆکانە هەیە کە هێناونیەوە، لەو بەدوا داچوونەشدا گرنگترینی ئەو مانایانەی چیرۆکەکەو ئەو بەڵگەو دەلالەت کردنانەشی دیاریکردووە، کە لێیەوە وەردەگیرێن، لەگەڵ دیاریکردنی ئاتاجی موسڵمانان بەدەرس‌و عیبرەتەکانی ئەو چیرۆکانە. ئەم بەدواداچوونە قورئانیەش چەند مەسەلەیەکی وەك ئەمانەی لای خوارەوەمان بۆ نیشان دەدات:-

١- بێگومان چیرۆکەکانی قورئان بۆ گێڕانەوەی خودی بەسەرهات‌و رووداو نیە، بەڵکو ئەمە ئامرازێکی سەرکەوتووانەیە بۆ گەیشتن بەچەند ئامانجێکی پاك‌و چەند نیازێکی بەهادار.

٢- قورئان داوامان لێ دەکات، کە نیازو مەبەست لە چیرۆکەکەدا بەدیی بکەین‌و پەی بەو زانستە ببەین‌و هەڵوێستەشی لەسەربکەین‌و، لێی وردبینەوەو مامەڵەی چاکی لەتەکدا بکەین.

٣- قورئان داوامان لێ دەکات، خۆمان ماندووکەین لە لێکدانەوەی وردەکارییەکانی چیرۆکەکەدا، واتە لەو مەسەلە وردو گرنگانەیدا کە نە لە قورئان‌و فەرموودەی ڕاست (صحیح)یشەوە تیشکیان نەخراوەتە سەر، بەلآم

نابێت خۆمان بە ڕوونکردنەوەی لایەنە شاراوەو نەزانراوەکانی ئەو چیرۆکانەوە خەریك بکەین‌و، کەسان‌و زەمەن‌و جێگەکانی دیاریبکەین، بەڵکو لەجیاتی ئەوە پێویستە ئاوڕ لەپەندو ئامۆژگاری‌و نیازو مەبەستەکانی بدەینەوە.

٤- قورئان داوامان لێ دەکات، شوێنکەوتووی ئەو بیروباوەڕو ڕێبازە بین کە لە چیرۆکەکانەوە دەیانخەینەڕوو، ئەمەش بەو جۆرەی مەبەست‌و ئامانجمان تێدا هەبێت‌و لەڕێی ئەو چیرۆکانەوە هەوڵی بەدی هێنانیان بدەین.

## "بەدواداچوونی قورئان بۆ چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە"

بەدوادا چوون‌و لێکۆڵینەوەی قورئان بۆ چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە لەم ئایەتانەی خوارەوە دایە، کە خودای پەروەردگار تێیاندا فەرموویە:

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن
دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ
يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا
قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ
فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن
يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾
أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ
وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ
وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ الكهف﴾.

واتە: "ئەی پێغەمبەر بڵێ خودا خۆی دەزانێت ماوەی چەندە ئەو لاوانە لە ئەشکەوتەکەیاندا ماونەتەوە، یان لە رۆژی بەخەبەرهێنانەوەیانو پاشان مراندنیان تائەمرۆ خودا خۆی دەزانێت ماوەکەی چەندە، جاتۆش هەر لەو ڕاستییە بڕوانە کە خودا چەندە بیناو بیسەرەو هیچ شتێکی لەبەرچاو ون نابێتو، هیچ شتێکیشی لێ تێك ناچێت، خەڵکی ئاسمانەکانو زەویش جگە لە خودا هیچ سەرپەرشتکارێکی دیکەیان نیە سەرپەرشتی کاروباریان بێت، هەروەها هیچ کەسێکیش بەشداریی حوکمو دادوەریی خودا نیە. جا ئەی پێغەمبەر ﷺ (لەویشەوە بۆ هەر موسڵمانێك بەردەوام) بە لەسەر خوێندنەوەی قورئان، کە بەسرووش ناردوومانە بۆت، ئەمە کتێبی پەروەردگارتەو هیچ کەسێك ناتوانێت لە وتاری خودا بگۆڕێتو جگە لە خوداش هیچ پەناگەو پشتیوانێك نیە. پاشان تۆ هەر لەگەڵ ئەو هەژارو کەم دەستانەدا (وەك بیلالو ابو ذرو ابن مسعودو سەلمانی فارسیو صهیبو ئەوانی دیکەدا) دانیشەو ئارام بگرە لەدانیشتن لەگەڵیاندا، چونکە هەر ئەوانن، بەیانیان و ئێواران لەخودا دەپاڕێنەوەو بەتەمای رەزامەندی خودان. دەتۆش ئەم موسڵمانە هەژارانە بەکەم مەزانەو چاویان لێ مەترووکێنەو مەڕوانە بۆ دەوڵەمەندان تا ڕازییان بکەیت، ئایا دەتەوێت کۆڕوکۆمەڵی ژیانی دنیات بەدانیشتن لەگەڵ دەوڵەمەندانو دەسڕۆیشتواندا بڕازێنیەوە،؟! لەگەڵ ئەوەدا، حاڵەتی دەوڵەمەندیی دیاردەیەکی کاتیو لەنێو چووە، بۆیە نابێت گوێڕایەڵی ئەوکەسانە بیت، کە دڵو دەروونیانمان (بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە) لەیادی خۆمان بێ ئاگاکردووەو، ئەوانیش شوێنکەوتووی هەواو ئارەزووی خۆیان بوونو لەوکارە نالەبارانەیاندا لەسنوور تێپەڕیوون.

هەروەها ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی دڵیان لەیادی ئێمە بێئاگایە، پێیان بڵێ: (هەق ئەوەیە خاوەنی موڵکەکە دادوەریی تێدا دەکات، هەق لەپەروەردگارتانەوەیە، جا هەرکەسێك بڕوای پێدەکات باپێی بکاتو، هەرکەسێکیش نایەوێت بابێ باوەڕ

بێت، هەرکەسە بەئارەزووی خۆیەتیو، ئەمە بەزۆرکاری نیە، بەلاّم دوایی ئێمە ئاگری دۆزەخمان بۆ ئەو زالّم وکافرانە ئامادەکردووە، هەموو شوورەو دیوارەکانی ئەو دۆزەخە چوار دەوری تەنیوون، خۆ ئەگەر لەو دۆزەخەدا لەبەر زۆری تینوێتیان داوای ئاو بکەن، ئەوا ئاوێکی وەها گەرمو توندو تیژیان بۆ دێنن کەوا وەك ئاسنی تواوە وایەو دەمو چاویان دەبرژێنێت، ئەمەش خراپترین خواردنەوەیە فریایان دەخەن، ئەو دۆزەخەش ژینگەیەکی زۆر خراپو نالەبارە.

جا ئەوانەی باوەڕیان بەخودا هێناوەو شوێنکەوتووی ڕێبازەکەی بوونو کارو کردەوەی چاکیان کردووە، ئێمە پاداشتی چاکەکاران، ون ناکەین، ئەوچاکە کارو ئیماندارانە دەخەینە نێو بەهەشت وباخاتێکەوە، جۆبارو رووبارەکانیان لەژێردا دەڕواتو، تیایدا چەندین بازنەی ئالتوونو پارچە پۆشاکی سەوزو ئاوریشمین لەبەردەکەنو بەرگی تەنكو ئەستووری تێدایەو، لەسەر تەختی شاندانان پالّی لێ دەدەنەوەو، ئەمەش باشترین پاداشتەو، شوێنی بەهەشتەکەشیان باشترین شوێنی لەبارو گونجاوە بۆیان".

## هەندێك ئاماژەو وتەی نەستەقی نێو ئەم بەدواداچوونە:

١- فێرمان دەکات ئەدەبمان لەگەلّ خوادا چۆن بێتو، پاشان هەموو کاروبارو مەسەلەو زانیارییەکی تایبەت بەچیرۆكو ڕووداوەکان بۆ زانستی هەمە لایەنەی خودا بگێڕینەوە، وەك لەفەرمایشتەکەشیدا هاتووە: (قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْ).

٢- فێری ستایشکردنی خوداو سوپاسگوزاریمان دەکاتو، کە دەبێت بەشێوەیەکی هێجگار زۆر ستایشی بکەین، وەك لەم فەرمایشتەشیدا دیارە (ابصر بە واسمع) ماناکەشی واتە: (خودا چەند بینەرو چەند بیسەرە!!)، چونکە دیتنی خودا هەمەگیرەو هەموو شتێك لە وجوددا دەگرێتەوە.

٣- خودا هەرخۆی سەرپەرشتیارو هەڵسوڕێنەری کاروباری خەڵکی یەو، هیچ کەسێکی دی جگە لەخۆی شایستەی ئەو جۆرە سەرپەرشتیارێتییە نیە، هەرکۆمەڵە خەڵکێکیش کەسێکی دی جگە لەخودا بکەن بە سەرپەرشتیارو کاروباری خۆیانی پێ بسپێرن، سوودێکیان پێ ناگەیەنێت. بۆیە هیچ سەرپەرشتکارێك لەجیاتی خودا نیە (مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيٍّ).

٤- بێگومان خودا پێویستی بەهیچ هاوبەشێك نیەو بێ باکە لە کەسانی جیهان، هەربۆیەش کەس لەحوکمیدا بەشدار نیە (وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا).

٥- بانگەوازێکە بۆمان، کە داوای خوێندنەوەی قورئانو لێوردبوونەوەیو تێگەیشتنی ماناکانیو گوزەران پێیو بانگەواز بۆ لای قورئانمان لێ دەکات. ئەم جۆرە خوێندنەوەیەی قورئان ژیانی دڵان وگیانو جەستەکانیشی تێدایە: (وَٱتْلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ).

٦- قورئان هەواڵی ئەوەشمان پێ دەدات کە، فەرمایشتەکانی خودا هیچ گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕێکیان بەسەردا نایەت. وشەکانی ئەم فەرمایشتانەش هەمەگیری خواستو نیازەکانیەتیو، پەل دەهاون بۆ هەموو ئەو ڕێسا گشتییانەی، کە ژیانی مرۆڤ ڕاگیر دەکەنو، بۆهەموو ئەو بەڵگەو نیشانەو ئایەتە حەکیمانەیەی قورئان کە: (لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ).

٧- قورئان فەرمانی ئەوەشمان پێ دەکات، کە لەگەڵ پیاوچاکاندا بینو، لێیان بێ ئاگا نەبین وچاویان لێ نەنووقێنین، لەم ڕووەشەوە ئارامیو خۆڕاگرییەکی وەهاش بۆ دەروونمان مەیسەر بکەین، کە بتوانین هەر لەگەڵ ئەو پیاوچاکانەدا بژیین: " (وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا).

٨- قورئان هەواڵی ئـەوەشمان پـێ دەدات، کـە هەرکەسـێك خـۆی لـە پیاوچـاکان دابڕێتو، دەستبەرداریان بێت، وەك ئەوە وایە ژیانی دنیاو شتە جوانەکانی دنیـا بەتەنیا بخوازێت : (وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا).

٩- (خەڵکی) لە دوو کۆمەڵ پێکدێنو، سێ هـەمیان نیـە، یەکـەمیان: کۆمـەڵی چاکانو، ئەو باوەڕدارانەی شـەوو ڕۆژ لـەخودا دەپاڕێنـەوەو خوازیـاری ڕێبـازی ڕاستو ڕەزامەندیی خودان. دوەمیشیان: کۆمەڵی ئەو کافرو ستەمکارانەن، کـە دڵیان لەیادی خودا بێ ئاگایەو دوای هـەواو ئارەزووەکانیـان کـەوتوونو ژیـانی خۆیان شێواندووە. هەرکەسێکیش واز لەچـاکانو مرۆڤـە ئیمانـدارەکان بێنێـت، ئەوە بێگومان هەر لەگەڵ کۆمەڵە خراپەکەی دیکەدایە.

١٠- هەروەها قورئان دەلالەت دەکاتە سەر ئەوڕاستییەی، کە باوەڕهێنان بـەخودا ئەو سیستەمە ڕێکوپێکەیە ژیانی مرۆڤـ کۆ دەکاتەوەو، ئـەو ڕایەڵـە پتەوەشـە، کە گەردیلەکانی ئەم ژیانە پێکەوە دەبەستێتەوەو یەکیان دەخات. جا ئەگەر ئەم سیستەمە لەنێو بچێتو، ئەم ڕایەڵەش بپـچڕێت، ئـەوا گەردیلـەکانی ژیانیـشی پەرش و بڵاو دەبنەوەو ون دەبنو، دەبن بەو سنووربەزاندنە پشت گوێ خراوو گوم بووەی، کە هیچ خێرو چـاکەیەکی تێـدا نیـە: (وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا).

١١- ئێمە ئەوەمان لێ خوازراوە (واتە بەشێوازێکی ڕوونی بانگکردنو ڕاسـپاردنو بە بەڵگەو ڕوونکردنەوەو پێناسـاندنەوە) لێمـان خـوازراوە، هـەق بـە ڕۆشـنیو بەئاشکرا بۆ خەڵکی ڕوونبکەینـەوەو ڕێ نیـشاندەریان بیـن بـۆ ئـەو هەقـەو، بانگیان بکەین بۆ ئەوەی لەگەڵ هەقدا بـن، بـەم ڕەنگـەش ئەرکەکـەمان بـەجێ دەگەیەنرێت: ( وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ ).

١٢- خەڵکی سەربەستن کە چ ڕێگایەك دەگرنە بەرو، دوای چ کۆمەڵێك دەکەون، ئێمە لەسەرخاڵی لێکجیابوونەوەی ڕێگاکان دەیانوەستێنینو ڕێگاکانیان پێ دەناسێنین، ئەوانیش بەخواستی خۆیان، یان ڕێگای باوەڕ، یان ڕێگای بێ باوەڕیی، هەڵدەبژێرن، (فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ).

١٣- بۆ ئەوەی یارمەتییان بدەین لەسەر هەڵبژاردنی ڕاستو، لەسەر دوورکەوتنەوە لەڕێی چەوت، ئاکامو کۆتایی ڕێگاکانیان پێشاندەدەین، بۆ نموونە باسی چەند دیمەنێکی بەهەشتو نیعمەتەکانیان بۆ دەکەین، هەروەها باسی چەند دیمەنێکی دۆزەخو ئازارو ئەشکەنجەکانی دۆزەخیان بۆ دەکەین.

١٤- دنیا خانەی کارکردنەو، ڕۆژی دواییش خانەی پاداشتە، جا هەرکەسێك لەدنیادا ڕێی چاك بگرێتەبەرو، باوەڕ بێنێتو کاری چاکە بکات، ئەوا خودا پاداشتی ئەوکەسانە ون ناکات کە ڕای چاك دەگرنەبەر، (إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا).

١٥- سەرەڕایی ئەوەی هەردوو کۆمەڵی ئیمانداران و کافرانیش لەژیانی نێو دنیادا هاوبەشن، بەڵام لە ئاکامو چارەنووسی ڕۆژی قیامەتیاندا لێك جیان، بەهەشتەکەی باوەڕداران باشترین پاداشتو، چاکترین شوێنی حەوانەوەیانەو، ئاگری دۆزەخەکەی کافرانیش خراپترین خۆراكو خواردنەوەو، خراپترین شوێنی مانەوەشیانە.. ئای چەند جیاوازو لەیەك دوورن، ئای چەند جوداو ناتەبان هەریەکە لە (چاکە)و (خراپە)، (بەهەشت)و (دۆزەخ)، (پاداشت)و (سزا)..

## "پوختـەی گرنگـترین وانەکـانی ئەم چیرۆکـە"

لەکۆتایی لێدوانماندا دەربارەی چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە هەڵوێستەیەك دەکەین، بۆ ئەوەی گرنگترین وانەو ئاماژەو پەندی لێ وەرگیراوی لێ تۆمارکەین:-

١- بێگومان کافران لەنێو خۆیاندا هاوکاریی یەکدی دەکەنو، هەڵوێستو راوێژیان یەك دەخەن بۆ بەربەرەکانێ ی بانگەوازی هەقو، بە ڕوودا وەستانی، وەك چۆن قوڕەیشییەکانو جوولەکەکان هاوکاریی یەکدیان کرد لە ئاڕاستەکردنی ڕاسپاردەکانیاندا بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ.

٢- جوولەکەکان توندترین دوژمنایەتییان بۆ موسڵمانان هەیە (وەك قورئانیش بە ڕاشکاوی ئەم ڕاستییەی دەرخستووە). هەروەها زۆرترین ڕقیان لەموسڵمانان هەیە، وەك لەو پرسیارە قورسو ئاڵۆزانەشدا ئەم ڕقە بەدیارکەوتووە، کە ئاڕاستەی پێغەمبەریان ﷺ کردووە.

٣- جوولەکەکان وەستای خراپەو شێواندنن، بۆیە کەسانی خراپی هاوشێوەیان پەنایان بۆ دەبەن، تاکو لەسەردەستی ئەوان فێری خراپەو شێواندن بن، وەك چۆن قوڕەیش لەوانەوە فێربوون.

٤- بۆ زانینی ڕووداوەکانو وردەکارییەکانی ئەو چیرۆکانە، پێویستە تەنها پشت بە قورئان ببەسترێتو لە سنووری قورئان تێپەڕنەبێت بۆ وتەی ئیسرائیلیات و ئەفسانەکانیان.

٥- دیارینەکردنو لەخۆوە دەسنیشان نەکردنی لایەنە نەزانراوەکانی قورئان، سەبارەت بەو کەسە نەزانراوانەو کاتو جێگە نەزانراوەکانی ڕووداوەکانیش.

٦- چیرۆکی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە، لەدیارترینی ئەو بەڵگانەی قورئانە دەربارەی ئەگەری بوونی پلەی (کرامات) بۆ بەندە چاکەکانو، پەیدا بوونی لە

جیهانی واقیعدا، چونکە ئەم چیرۆکە ئاماژەی بۆ چەندین حاڵـەتی (کرامـات)ی ئەو لاوە باوەڕدارانە کردووە، کە بۆیان پەیدا بووە.

٧- لەم چیرۆکەدا چەندین ئایەتیش دەربارەی وجودی خوداو، ناسینی خودا هەیـەو هەندێك سیفەتو کردارییشیمان بۆ دەخاتەڕوو.

٨- ئەم چیرۆکە روونترین بەڵگەیە لەسەر پارێزگـاریی خـودا بـۆ شـوێنکەوتوانیو، سـەر خـستنیان ئیـدی ئـەوانیش لـەئارامیو ئاسـوودەییدا دەژیـنو، بـە لـە سەرخۆییو خۆڕاگرییەوە بەرەو ڕووی دوژمنانیان دەوەستن.

٩- ئەم چیرۆکە فێری ئەوەمان دەکات، دەبێت مرۆڤـی بـاوەڕدار پـەنا بباتـە بـەر پەروەردگاریو دەست بە ڕێبازەکەیەوە بگرێـتو پـشتی پـێ ببەسـتێتو داوای ڕەحمەتو لێخۆشبوونی لێ بکات، ئەمەش بـەهێزترین ئـامرازی ئـارامگرییو خۆڕاگرتنو جیهادکردنو سەرکەوتنە.

١٠- قورئان چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتی بە ڕاستیو بەحـەق بـۆ گێڕاوینەتـەوە، ئەمەش مانای وایە هەر هەواڵو بەسەرهاتێك، لەقورئاندا هاتبێت، ڕاستنو ئەو ڕاستییەشن، کە هیچ گومانێکیان تیادا نیە، ئیـدی هەرچـی لەگـەڵ قورئانـدا نەگونجێت ڕاستی تێدا نیە.

١١- قورئان کاتێك وەسفی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەی بەچـەند لاوێـك کـردووە، ئەوە وەسفێکی ستایـشکردنو ڕێـز لێنانـە، ئەمـەش ئاماژەیەکـە بـۆگرنگیی قۆناغی لاویو گەنجێتی بەو پێودانگەی قۆناغی بەخششو چالاکیو بنیاتنـانو خوێن گەرمییە.

١٢- خودا توانای بەدەستهێنانو هەڵبژاردنی ڕێگای بەمرۆڤیش داوە، مرۆڤ گـەر ڕێگای خۆی هەڵبژێرێت، ئەوا لەو هەڵبژاردنەشدا هەر بەپێ ئـیرادەی خودایـەو، سائیتر ڕێی ڕاستی هەڵبژارد بێت، یان ڕێی خراپ، خوداش بۆی زیـاد دەکـات، گەر هەر ڕێگایەکیشیان بێت.

١٣- دڵی هاوەڵەکانی نێو ئەشکەوتەکە پڕ ببوو لەئیمانو بەسەقامگیریی لەسەر ئەو باوەڕەشەوە ڕوویان لەخودا کردبوو، خوداش دڵیانی پێوە پەیوەستکردبوو، بۆیە موسڵمانیش پێویستە دڵی خۆی پڕکات لەباوەڕو پاشان داوا لەخودا بکات دڵی پێوەی پەیوەستبکات، تاکو باوەڕی تیا کەم نەبێتەوە، یاخود تاکو شتی دیکە بەباوەڕەوە لەدڵیدا تێکەڵ نەکات.

١٤- دوای بڕینی قۆناغی هەڵبژاردنی ڕێی باوەڕو پڕکردنی دڵ بەباوەڕو پێوە پەیوەستبوونی، قۆناغێکی دیکە دێتە ئاراوە، کە هەوڵو بانگەوازو هەڵسووڕانەو، کارکردنە بەجیددیو تێکۆشانیشە لەپێناوی ئەوباوەڕەدا کە هەڵی بژاردووە..

١٥- بنەماکانی عەقیدەو کاروباری باوەڕ لەنێو دڵو هەستدا، تەنها بە بزاوتو کارکردنو، بانگەواز بۆ ئایینو، هەڵسووڕان بەحەقەوەو، بە بەرەنگاربوونەوەی ناهەق، دەچەسپێت.

١٦- هیچ بیرۆکەو بانگەوازێك پەسەند ناکرێت، تەنها دوای لەئارادابوونی بە بەڵگەی بنەبڕو ڕۆشن نەبێت، دیارە چەندەها بیروباوەڕو بانگەوازی لابەلاش ئاتاجیان بەم ڕێسا بنچینەییەیە.

١٧- ستەمکارترین کەس ئەوەیە کەدرۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستێت، جا ئەگەر درۆ کردن لەگەڵ خەڵکیدا تاوانێك بێت، ئەوە دیارە درۆکردن لەگەڵ خوداشدا تاوانێکی گەورەترەو، بەڵگەیەکیشە لەسەر نەمانی چاکەو خێر لەدڵ و دەروونی خاوەنەکەیدا (واتە تاوانبارەکەدا).

١٨- بێگومان هاوەڵانی ئەشکەوتەکە لەبەرئەوە خۆیان لەگەلەکەیان دابڕی، چونکە تەنها ئەو ڕێی خۆدابڕانەیان لەبەردەمدابوو، خۆ ئێمەش نابێت لەوەدا لاساییان بکەینەوەو خۆمان لەگەلەکەمان دابڕین، چونکە چەندین جیاوازیی لەنێوان ئێمەو ئەوانو بارودۆخەکانماندا هەیە.

١٩- بێگومـــان تێکـــەڵاوبوون لەگـــەڵ کەســـانی تـــرو پەیوەنـــدیی پێوەکردنیـــانو ئامۆژگاری کردنیانو بانگکردنیـان بـۆ ڕێبـازی ڕاسـتو بـەیاد هێنانـەوەیان، ئەرکێکی مرۆڤی بانگەوازکارەو نابێت خۆی لە کەسـانی تـر دابـڕێـت، مەگـەر لەکاتێکدا نەبێت کە ئەو ئامرازی تیکەڵاو بوونانەیانی لەبەردەمدا نەمابێت.

٢٠- لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤی بانگەوازکار تێکـەڵی خـەڵکی دەبێـتو پەیوەنـدییان پێوەدەکات، پێویستە هەر لەڕووی هەستو نەستەوە خۆیانی لیَ دابڕێتو (ئەم جۆرە دابڕانەی لیَ یان هەبێت) ئەمەش بەومانایەی لەرێبازە چـەوتەکەی ئـەوان هیچ وەرنەگرێتو، هەموو دڵو دەروونو هەستو قەوارە گیانیو جەستەییەکەی بەخودای خۆیەوە بهێڵێتەوە.

٢١- کاتێك هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە چوونە نێـو ئەشـکەوتەکەیانەوە، خـوداش ئەشکەوتەکەی بۆ ئاسانو لەبارکردن، ئەمەش بەهۆی ئەو رەحمەتـەوە بـوو کـە پەخشی کرد بەسەریاندا، جا چەند خۆشە ژیان بەرەحمەتی خوداوەو، چەند تـاڵو ناخۆشیشە بەبیَ رەحمەتی خودا.

٢٢- خـودا لـەو ئەشـکەوتەدا چـەندین سـەربازو هاوکـاری بـۆ لاوەکـانی نێـو ئەشکەوتەکە فەراهەمکردبوو و، چەندین ئامرازی مـاددیی بـۆ پاراستنیـشیان دابینکردبوو.

٢٣- یاوەریکردنی پیاوچاکان خێرو بەرەکەت بەسـەر ئەویاوەرانەیانـدا دەڕژێنێـت، ئەمەش بەهۆی هاوەڵێتیکردنیانەوە، بەڵام یاوەریکردنی پیاوخراپان بەشـێك لـە خراپەو زیان بەسەر یاوەرانیاندا دەبارێنێت.

٢٤- تێپەڕاندنی ئەو مەسەلە لاوەکیو بەتاڵانەی، کە هیچ سوودو خێرێکیان تێـدا نیەو، بەفیڕۆ نەدانی کات تیایدا، وەك چۆن هاوەڵانی نێو ئەشـکەوتەکە لـەوەدا وایان کردو مشتو مڕو دەمەقاڵێی بیَسوودیان لەگـەڵ گەلـە بیَباوەڕەکەیانـدا نەکردو بەئەندازەی ئەو ماوەی نووستنەیان لەو ئەشکەوتەدا مانەوە.

٢٥- ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەش کە نوێنەردانانو نێرراو بۆ کارێکی تایبەتی دەشێتو رەوایە، ئەوە بوو لاوەکان یەکێك لەخۆیان راسپاردو ناردیان بۆ نێو شارەکە تا خۆراکیان بۆ بکڕێتو پارەو پوولیشیان بۆ ئەوکارە پێدابوو.

٢٦- هەروەها ئەم چیرۆکە ئاماژە بۆ بێزرانو نەویستراویی قەرز دەکاتو، ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات، باشتروایە کڕین بەپارەی حازر بێت، وەك لە سرووشی وتەی لاوەکان دایە کە خودا لەسەرزاریان فەرموویەتی: (فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ ).

٢٧- هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە فێری ئارامگریو لێوردبوونەوەمان لەکاتی کڕینی خۆراکدا دەکەن، دەبێت بەدوای خۆراکی حەڵاڵ وباشدا بگەڕێینو، واز لەخۆراکی حەرامو پیس بێنین.

٢٨- وتەی لاوەکان بۆ ئەوکەسەیانن کە ناردیان بۆ شار(فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامًا ) بڕیار لەسەر ڕێسایەکی بنچینەیی قورئان دەربارەی خۆراك دەدات. ڕێساکەشی ئەوەیە بێگومان خۆراکی پاك تەنها خۆراکی حەڵاڵە، دەنا جگە لەخۆراکی حەڵاڵ تەنها خۆراکی پیسو بێزراو هەیە.

٢٩- ئەم رێسا قورئانیە دەلالەتە لەسەر بایەخدانی قورئان بەحەزو میزاجی تایبەتی تاکە کەسی، بۆ نموونە ئەوە لە موسڵمان دەخوازێت، زەوق ومیزاجی بەپێی شەرع بێتو داخۆ شەرع بڕیاری حەڵاڵکردن یان حەرامکردن لەسەر چ خۆراکێك دەدات.

٣٠- وشەی (ولیتلطف) (با نەرمو نیان بێت) ڕوخسارێکی جوانو دەرکەوتووی قورئانیەو، رووناکییەکی ڕێ نیشاندەرە دەربارەی پێویستی ی نەرمونیانیو هێمنی لەژیانداو، دەربارەی پەیوەندیو سەوداو مامەڵە لەگەڵ کەسانی تردا.

٣١- وتەكەی تریشیان (وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ) سرووشی مەسەلەیەكی دی دەدات، شیاوی‌و ڕەوایی خۆشاردنەوەیە لە كافران‌و دوژمنان‌و پەنهانیی بانگەوازو ڕێكخستنەو، هەروەها سووربوونیشە لەسەر دەرنەخستنی ئەو بانگەوازو ڕێكخستنە بۆ دوژمنان.

٣٢- سەرەڕایی سووربوونی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە لەسەر خۆ حەشاردان، كەچی خودا لە كۆتاییدا ئاشكرایان دەكات بۆگەلەكەیان‌و مەسەلەكەیان بۆ دەردەخات، ئەمەش لەبەر حیكمەتێك، كە خودای دانا خۆی خوازیاری كەشف كردنیان بووە تاكو بیكاتە بەڵگەیەكی كردەیی (عملی) لەسەر زیندووكردنەوەو، لەسەر رۆژی دوایی.

٣٣- بەخەبەرهێنانەوەی هاوەڵانی نێو ئەشكەوتەكە لەو خەوەی كە پتر لە سێ سەدەی خایاندووە، لەبەهێزترین بەڵگە عەمەلی‌و واقیعییەكانە لەسەر زیندووكردنەوەو رۆژی دوایی..

٣٤- لەو وتەیەی حاكم‌و كاربەدەستەكانی ئەوشارەدا كە كاری ناشتن‌و شێوازی ڕێ‌و ڕەسمەكەیان بەدەستەوەبووەو گوتبویان (مزگەوتێك لەسەر گۆڕەكانیان دروست دەكەین "لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ") نەغمەیەكی خۆ بەزلدانان‌و دەسەڵاتداریێتی‌و باڵا دەستی تیا بەدیدەكرێت، ئەمەش نەریتێكی هەمیشەیی هەموو ئەوحاكم‌و دیكتاتۆرانەیە، كە بەمەنهەجی خوداوە پابەند نین.

٣٥- قورئانی پیرۆز هەندێك وتە دەخاتەڕووو ئاماژەش بۆ هۆكاری ڕەتكردنەوەو بەرهەڵستیكردن‌و بەتاڵكردنەوەشیان دەكات، ئەمەش لەئیشارەت‌و هۆیەكی ئاماژە بەخشی وادا دەردەكەوێت، كە زۆركەس سەرنجی لێنادات، بەڵام لەو كەسە زیرەكانە پەنهان نیە، كە بە وردی‌و تێڕامانەوە قورئان دەخوێنن.

٣٦- سەرەڕایی جیاوازی بیروڕای خەڵکەکە لەسەر ژمارەی هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکەو،سەرەڕایی هێنانەوەی سێ وتە لەسەر ژمارەکەیان، بەڵام قورئان بڕیاری شیاوی و ئەگەری زانینی مرۆڤی لەو ژمارەیەدا داوە.

٣٧- وتەی ڕاست ترو یەکلاکراوە ئەوەیە، هاوەڵانی نێو ئەشکەوتەکە، حەوت کەس بوونو هەشتەمیان سەگەکەیان بوویێت. دەشێت لەخودی قورئانەوە چوار بەڵگە لەسەر یەکلاکردنەوەی ئەم وتەیە دەرهاوێژین.

٣٨- لەم چیرۆکەدا پیتێکی (واو) هەیە، کە بە (واو-ی هەشتەمین) دادەنرێت، وەك لە فەرمایشتەکە دایە (وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ) ئەم -واوە-ش چەند ئاماژەیەکی بەخشیوە.

٣٩- فەرمایشتی خودا (وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا) ڕێسایەکی قورئانیە لەسەر چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ چیرۆکەکانی پێشیناندا، ئەمەش قەدەغە کردنێکی توندە لە خوداوە لەسەر ئەوەی، نابێت پرسیارو داوای ڕوونکردنەوە لە هیچ کەسێك لەپێشینەکان بکرێت، یان وتەکانیان لەوبارەیەوە وەرگیرێت.

٤٠- لەبیرچوونەوەی وشەی (ان شاءالله) لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ وهێنانەوەی نموونەش لە قورئاندا لەسەر نەریتی لەبیرچوونەوەی پێغەمبەرانی تر، بەڵگەیەکە لەسەر مرۆڤبوونی پێغەمبەرانو لەسەر ئەوەی، کەوتوونەبەر چەندین نەریتی مرۆڤایەتییەوە.

٤١- لە ڕاستییەکانی تری قورئان: ئەوەیە هەرشتێك لە گەردوونو ژیانو هەڵسوکەوتی مرۆڤدا، بەقەدەرو ئەندازەی خوداو، بەپێی خواستو ئیرادەی خودایەو، هیچ شتێك بەبێ ئاگاداریو خواستی خودا ڕوونادات.

٤٢- مرۆڤ لەبەردەم نادیاردا دەستەوسانو نەفامە، چونکە هیچ کەسێك لە غەیبو نادیار نازانێت، تەنها خودا نەبێت، هەرخودا خۆیشی چواردەوری نادیاری گرتووەو لێی ئاگادارە.

٤٣- لەوانەیە مەزەندەکاری‌و نەخشەو بەرنامەکانی مرۆڤ دوا بکەوێ‌و، لەوانەشە دەستەوسان بێت لەبەدی هێنانیان چونکە خودا خواستی لەسەر بەدیی هاتنیان نەبووە، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە گرتنەبەری ئەوهۆیانە پێویست نیەو گوایە پێویستییەکەیان لابرێت، بەڵکو دوای گرتنەبەری ئەو هۆیانە دەبێت پشت بەخودا ببەسترێت.

٤٤- قورئان فێری ئەوەمان دەکات، کە بەڵێنەکانمان بەخواستی ئیلاهییەوە ببەستینەوەو، لەکاتی بەڵێندانیشدا ئەگەرو جیاکارییەك بە وشەی (ئەگەر خودا کردنی/ ان شاء الله) دابنێین.

٤٥- لەبیرچوونەوە نەریتێکی پێوەلکاوی مرۆڤەو، هیچ مرۆڤێك نیە، کە شتی بیرنەچێتەوە، هەندێکجاریش لەبیرچوونەوە دەبێتە نیعمەتێکی خودا، وەك لەبیرچوونەوەی کارەساتەکان، هەندێك جاریتریش لەبیرچوونەوە لەئەرکەکاندا دەبێت، وەك لە فەرزەکان‌و فەرمانەکاندا، ئەم جۆرە بیرچوونەوەیەش لە شەیتانەوەیە.

٤٦- قورئان ڕێنماییمان دەکات، بۆ پێویستی یادکردنەوەی خودا لەکاتی لەبیرچوونەوەدا تاکو بەسەر وەسوەسەو خورپەکانی شەیتاندا زاڵ بین‌و دڵ‌و قەوارەی جەستەو گیانیشمان لەگەڵ خوادا بهێڵینەوە.

٤٧- قورئان دانی بەوەداناوە کە خەوەکەی هاوەڵانی نێوئەشکەوتەکە درێژەی کێشاوەو ماوەیەکی زۆریی تا سێ سەدو نۆ ساڵ خایاندووە.

٤٨- نۆساڵەکە جیاوازیی نێوان هەردوو ساڵنامە (هەتاوی) و(مانگی) یەکەیە، لە ماوەی مانەوەیاندا. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەسەرچاوەبوونی قورئان‌و کە بێگومان لە خودای پاك ومیهرەبانەوەیە.

٤٩- ئەم چیرۆکە پتر لەپازدە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی قورئان لەلایەن خـوداوە نێراوەو لەدانانو هەڵبەستنی پێغەمبەری خودا ﷺ نیە. دەنا کێ ئـەو هـەموو شیکارو وردەکارییانەی فێردەکردو پێ دەگەیاند، کە هیچ مرۆڤێك نەیزانیون.

٥٠ — قورئان هەمیشە بۆ هەموو چیرۆکەکانی، لێکدانەوەو بەدواداچوونی هەبووە، ئەمەش بۆ چارەسەری ئەو مەسەلەو کێشانەیە، لەژیانو واقیعـی موسـڵمانانـدا دروسـت دەبـن، پاشـان قورئـان ئـەو دەرسو پەندانـەی نێـو چیرۆکەکانیـشی دیاریکردووە.

# چـیـرۆکـی دووەم

## چیـرۆکی "خاوەنی هەردوو باخـەکە"

ئەم چیرۆکە لە قورئان دا بەم شێوەیە هاتووە:-

خودا فەرموویەتی:

﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ
وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا
خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ
نَفَرٗا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾
وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾
قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ
رَجُلٗا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٣٨﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ
قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ
رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا
زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ
يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا
﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ

ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ
مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ
ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ الكهف ﴾

## مانای چەند ووشەیەکی گران لە ئایەتەکان دا[1]:

١- وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ : واتە (چواردەوری هەردوو ڕەزەکەیمان بە دارخورما گرتبوو).

٢- وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ : واتە (ئەو دو ڕەزە هیچ کەموکوڕی یەك لە بەروبوومیان دا نەبوو).

٣- وَأَعَزُّ نَفَرٗا : واتە (بەهێزترین پشتیوانو دەستو پێوەند).

٤- أَن تَبِيدَ : واتە (پێم وانییە کە ئەمە لەناوبچێتو نەمێنێت).

٥- مُنقَلَبٗا : واتە (پاشینەیەکی چاکتر).

٦- حُسۡبَانٗا : واتە (سزایەکی وەك چەخماخەو هەورە بروسکە).

٧- فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا : واتە (وەك خاکێکی بێرِوونی ڕەقو بێ سەوزایی).

٨- غَوۡرٗا : واتە (ئاوەکەی بەناخی زەویدا بچێتە خوارەوەو سوود بە باخەکان نەگەیەنێت).

---

(١) هەرچەندە لە ماوەی لێکدانەوەی ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەو بڕگەکانی باسەکەشدا هەموو وشەو ڕستەکانی ئەم ئایەتانەم بە کوردی لێکداوەتەوە، بەڵام وەك سپاردەیەکی نووسەری کتێبەکە، بەپێویستم زانی ماناکانی ئەو چەند وشەیەشی لەهەمان ماناکانی خۆیەوە تەرجەمە بکەم. (وەرگێڕ)

٩- وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ : واته (ماڵ و سامانەکەی لەنێو برا).

١٠- وَخَيْرٌ عُقْبًا : واته (باشترین سەرەنجام بۆ خاوەنانی باوەڕ).

١١- هَشِيمًا : واته (وردوخاش بووو وەك کایەکی وشكو وردکراوی لێ هات).

١٢- تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ : واته (با دەیبرد بەحەواداو پەرشو بڵاوی دەکردەوە).

## "کورتـەی چیـرۆکەکـە لەڕێی گێڕانەوەی قورئانـەوە"

ئـەم چیـرۆکە دوو تێڕوانینـی لێـك جـودا بـۆ ژیانمـانو بـۆ دیـاردەو مولـكو سـامانەکانی ژیانمـان دەخاتـە بەرچـاو: تێروانینـی کابرایـەکی ئیمانـدار، کـە لـە ڕواڵەتەکانی دنیا، خاوەنی هیچ شتێك نیە، لەگەڵ ئەمەشدا کاری نەکردۆتـە سـەر چاویلکە ئیمانیەکەیو تەرازووە ئیسلامی یانەکەی. بۆیەش بەوردی بـۆ کەرەسـەو موڵکی دنیای ڕەوانبـوەو، ئەوەشـی بـە کێـشێکی ڕاسـتو دروسـتەوە کێـشاوە، هـەروەها تێڕوانینـی پیـاوێکی کـافر کـە خـودا دوو ڕەزی جـوانو دوو بێـستانی فراوانیشی پێ بەخشیوە. هەردوو باخەکەش لـەترێ بـوون، ترێکـانیش بەچـەندین ڕیزی دارخورما چواردەوریان درابـوون، تـۆوی میوەکـانیش لـەنێوان درەختەکانـدا دەچێنران، خوداش فەرمانی بەهەردوو باخەکە کردبوکە هەموو جۆرە بـەروبوومێك بۆ خاوەنە بێ ئیمانەکـەیان بەرهـەم بێـنن، ئـەو دوو باخـەش فـەرمانی خودایـان بەجێهێناو بەروبوومەکانی خۆیان بەتەواوەتی بۆ بەرهەم هێنا.

کابرای بێ باوەڕیشی بەو موڵكو سامانەی دنیا خرۆشاو لەخۆبایی بـوو و، وای دادەنا، گوایە ئەمە هەموو شتێکەو، ئیدی خوداو ڕۆژی دوایی بیرچووەوەو، خـۆی بەسەر هاوڕێ ئیمانداره‌کەیدا بادەداو، فیزی بەسەردا دەکردو خۆی لەلای خـەڵکیو

لەلای خوداش لەو بەباشتر دادەنا، لەکاتێکدا قسەی لەگەڵ دا دەکردو موناقەشەو دەمەتەقێی لەگەڵدا دەکردو خۆی بەسەریا بادەدا، پێی دەگوت: (من ماڵو سامانو کەسو عەشیرەتم لەتۆ زۆر زیاترە)، ئەمەش چونکە دیاردەکانی چاکیو خۆ بەباشتر دانانی لەسەر بنچینەی ماڵو سامانو هۆیەکانی خۆشگوزەرانی بوو، بۆیە بەڕای خۆی وای دەبینی گوایە بەماڵو سامانەکەیەوە لەلای خەڵکی لەو لەپێشترەو، کەسوکارو پاڵپشتی زۆرتری هەیەو، پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرزیشی لەلایان هەیە.

ئەم کابرا بێباوەڕە جارێکیان دەچێتە نێو باخەکەیەوەو بەنەریتێکی (ستەم لەخۆکاری)یەوەو بەدڵێکی داپۆشراو بەکفرەوە خۆی پێ دادەکات، دیارە بەگومانو بۆچوونە تایبەتییەکانیشی ئەمە هەمیشەییەو نەمرەو هەموو شتێکە بۆخۆی یەو، گوایە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو قیامەت نیە، بۆیە دەڵێت: (وا گومان نابەم کە ئەمە هەرگیز لەنێو بچێت، واش گومان نابەم کە قیامەت بێتە کایەوە).. بەڵام بۆ بەدواداچوونی وتەکانی خۆی، دووبارە دەڵێت: "خۆ ئەگەر بۆ لای خودای پەروەردگاریشم بگەڕێنرێمەوە ئەوا پێگەو پاشینەیەکی باشتر لەمەم دەست دەکەوێت، جا ئەگەر زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەی مرۆڤەکانیش ڕاست بێتو، بۆ لای خودا بگەڕێنرێمەوە ئەوا ئەو کاتەش لەوپەڕی ڕێزو حورمەتی لای خودادا دەبمو، خودا لەم باخانەی ئێستام باشتر پێ دەدات، چونکە لەدنیادا ئاوا ڕێزو کەرەمی لێ ناومو ئەم باخەی پێ داوم، جا لەبەر ئەوەی من شایانی ئەم ڕێزلێنانو نیعمەتانەم، ئەوا خوداش لەوێ — لەقیامەت -دا خێری زیاترم پێ دەبەخشێت.. ئەمە ئەگەر بۆ لای خۆی بگەڕێنرێمەوە، (ئەگەر)..".

بەڵام هاوڕێ ئیماندارەکەی بەردەوام هەر پابەند بووە بە ئیمانەکەیەوەو هەر بە تەرازووو چاویلکەی ئیمانداریتی یەکەی، ئەو مەسەلەیەی هەڵسەنگاندووەو، بەو دیاردەی ماڵو سامانەش کە پیاوە دەوڵەمەندە کافرەکە خاوەنی بووە فریوی

نەخواردووە، هەروەها لەبەردەمی دا بێ هێــز نــەبووەو، بــێ دەنــگو ترسـنۆكیش نەبووە، بەڵكو بەلۆژیكی دانایانەی كەسێكی موسڵمانی بڕوا بەخۆو جـێگیرو بینـا دواندوویەتی و، وەڵامی داوەتەوەو، پێی گوتووە: (ئەرێ تۆ بێ باوەڕیت بەرامبـەر ئەو خودایەی كە لەخۆڵ دروستی كردوویتو پاشان لەئاوێكی لینجو ئینجا گۆشـت پارەو، پاشان كردوویتی بە پیاو؟ بەڵام من ئەو خودایە بەپەروەردگاری خۆم دەزانمو هیچ شتو كەسێكی بۆ ناكەم بەهاوەڵو بەشدار). دوای ئەم وتەیە كابرای ئیماندار، هاوڕێ بێ ئیمانەكەی ڕێنمایی كردووە بۆ زانینی چاكەی خوداو، بۆ فریونـەخواردن بە دیاردە لەنێوچووەكانی دنیاوەو، پێی گوتووە: (ئەوە بۆچی كاتێك دەچیتە نێـو باخەكانتەوە ناڵێیت ﴿مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ ئای خودا چی ی بـۆ كـردوومو هیچ هێزێك نیە تەنها لەخوداوە نەبێت) هەروەها ( لە سەرەنجامی كفرو پێنەزانینو بێباكیو تەفرە خواردن بەباخەكانی)ی وریا كردۆتەوەو تێی گەیاندووە كە بێگومان خودا بەتوانایە لەسەر ئەوەی هەردوو باخەكـەی بـۆ وێـرانو خـاپوور بكـاتو، لـە ئاكامی كفرو بێ باكییشی دا سزای بدات، پاشان داوای لێ دەكات كە لە ئەنجامی سپڵەییو بێ باوەڕیەكەیدا پێشبینیی چەخماخەیەكی لەنێو بەر بكات كـە هـەردوو باخەكەی وێران دەكاتو، هەرچی ترێو خورماو میوە چـێنراوەكانیەتی ناهێڵێـتو هەریەكـەیان وەك خـاكێكی ڕەقو ڕووتو بـێ سـەوزایی لێ بێـت، هەمدیـسان پێشبینیی بەناخی ئەرزا چوونی ئاوی ئـەو ڕووبـارەش بكـات كـە بـەنێو هـەردوو باخەكەدا دەڕواتو بە فـەرمانی خـودا بـۆی نـەمێنێت، جـا ئایـا لـەو حاڵەتـەدا دەتوانێت ئەم ئاوە بگێڕێتەوە؟

لە ئاكامدا خودا سزای كفرو بەدكارییەكەی داو نیعمەتەكەی نەهێشتو لەنێوی بردن وەك چۆن هاوڕێ ئیماندارەكەی پێـشبینیی دەكـرد.. كـابرای كـافر پەشـیمان بووەوە، بەڵام لەكاتێكدا كە پەشیمانی سوودی پێ نەدەگەیاندو، هـەردوو چـەپۆكی خۆی دەشكاندەوەو، دڵتەنگیش بوو بە لەدەستدانی ئەو پارەو خەرجییەی كە تێیـدا

سەرفی کردبوو، ئەمەش دوای ئەوەی ئەو هەموو ئەو موڵکەی لەدەست چووو پێگەو پایەکانی نەماو بەسەریەکدا هەپروون بوون.

ئینجا ئەو پیاوە بێباوەرە وای لێهات خۆزگەی بەوە دەخواست کە باوەڕی بەخودا بهێنایەو باوەڕدارو سوپاسگوزاری خودا بوایە، وەك دەیشیگوت: "خۆزگە هیچ کەسێکم نەکردایە بەهاوەڵی خودا: ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾.

ئیدی چیرۆکی هەردوو پیاوەکە: (باوەڕدارە بەرچاو ڕۆشنەکە)و (بێباوەرە بەدرەفتارەکە) بەشێوەیەکی دەرکەوتوو ماوەتەوەو بووەتە مەشخەڵێکی باوەڕداریتیو ، ڕۆشناییەکی یادەوەریو پەند لێ وەرگرتن.

قورئانی پیرۆزیش لە لێکدانەوەی ئاکامی چیرۆکەکەدا ئەوەی ڕاگەیاندووە کەوا بێگومان کابرای بێباوەڕ خەسارەتمەندو لەنێو چووە، ئەو سزاو فەرمانەی خوداش کە بۆ خۆیو هەردوو باخەکەی دانراوە هیچ هێزو دەستەو تاقمو سوپاو حیزبێك بەهانایەوە نەهاتوونو، نەیانتوانیوە بیپارێزنو سزای خودای لەسەر ڕاگرن، لەبەر ئەوە لەناوچووەو زەرەرمەند بووەو، سەرکەوتوو نەبووە.

لەو پلەو جێگەیەشدا سەرکەوتن تەنها بۆ خودای حەقو مافپەروەرە. مرۆڤی سەرکەوتووو سەرفرازیش ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خودا بێتو کە خوداش لەگەڵی دایەو ڕێنماکارو پاڵپشتو پارێزەرو سەرخەریەتی، هەر ئەم جۆرە کەسەشە کەخودا خۆشیی دەوێت تەنانەت گەر هیچ بەشێکی لەدنیاو خۆشی یە براوەکانی دنیاش پێ نەدابێت، تەنها ئەوەندە بەسە کە خودا ئیمانو یەقینو متمانەو سەربەرزیو بەختیاریو کامەرانیو خۆشی ی پێ بەخشیبێت، وەك ئەو پیاوە ئیماندارەی کە گفتوگۆو مشتومڕی لەگەڵ پیاوە بەدکارو بێ ئیمانەکەدا کردووە. دنیاش هەمووی دەبڕێتەوە، هەرچی شتو مەكوماڵو سامانو نەوەو دیاردە ڕازێنراوەکانی تریشیەتی، چەند ڕووکارێکی جوانن کە بەپەلە لەناو دەچن وك لەناوچوونی هەردوو

باخەكەی پیاوە بێ باوەڕەكە، دیارە هەر ئەو كردارە چاكو باشانەش لەلای خودا دەمێنن كە پیاوە باوەڕدارە بەرچاو ڕۆشنەكە ئەنجامی داون. خەڵكیش هەر ئەوەیان لەسەرە كە یەكێك لەم دوو نموونەیە هەڵبژێرن: یان نموونەی پیاوە باوەڕدارە چاوكراوەكە، یان نموونەی پیاوە كافرە بەدكارە بێباكو لەخۆبایی یەكە. بەڵام دەبێت ئەنجامی هەڵبژاردنەكەشیان لەئەستۆ بگرن لە دوای ئەوەی ئەنجامی ئیمانداریتییان زانیوە، دوای ئەوەش كە سەرەنجامی كفرو ستەمو لەخۆبایی بوونیشیان بۆ دەركەوتووە.

## "ئەمە چیرۆكێكی ڕاستەقینە بووە، نەك نمایشكاریی"

هەندێك لێكۆڵیار گومانیان وایە كە "چیرۆكی خاوەنی هەردوو باخەكە چیرۆكێكی هێماكاریی (ڕەمزی)یە، نەك واقیعی، هەروەها چیرۆكێكی نمایشكاریی (تمثیلي)یە نەك ڕاستەقینە".

(گوایە قورئانیش وەك نموونەیەكی نواندن بۆ خێرو شەڕو، ئیمانو كفرو، ڕووكردنە دنیاو نەویستنی دنیا، باسی لێوە كردوە، چونكە ئەم چەمكو واتایەی لە دوو نموونەی شوبهاندنو لێك نزیك خستنو، لە دوو دیمەنی تەمسیلیدا خستۆتەڕوو).

وتەی ئەم لێكۆڵیارانە ساغو پەسەندكراو نیە، چونكە پەسەندكردنی ئەم وتەیە دەبێتە هۆی گومان كردن لە واقیعی بوونی چیرۆكە قورئانیەكانو، گومان بردن بەوەی گوایە هێماكاری یەكی تەمسیلیانەن، واتە گوایە ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو لە ئەفسانەكانە، ئەمەش وتەی ئەو كافرانەیە كە قورئانیان بە (ئەفسانەكانی گەلانی زوو)ی دادەنا.

بەڵام لێكۆڵیارە ساغ كەرەوەو دادپەروەرەكان لە چینی زانایان ڕایان وایە كە چیرۆكەكانی قورئان واقیعین نەك ڕەمزییو، ڕاستەقینەش بن نەك تەمسیلكردن. بە

مانـای: ئـەم چـیرۆکانە لـەزەمانێکی زوودا بەڕاسـتیو بـەواقیعی ڕوویـان داوەو، کەسەکانی نێو چیرۆکەکەش چەند مرۆڤێکی زیندووی بەشداری نێـو بەسـەرهاتەکە بوونو، ڕووداوەکانیش بەعەمـەلی لەسـەر ڕووی زەوی هاتوونـە ئـاراوە. چـیرۆکی کابرای خاوەن دوو باخەکەش لەم چوارچێوەیە بەدەر نیـە. چـونکە بەسـەرهاتی دوو پیـاو لـە واقیعـدا دەخاتـە ڕوو کـە ئـەو ڕووداوانـەی لـە ئایەتـەکانی تایبـەت بەچیرۆکەکەدا هاتوون دەگێڕێتەوەو، دیارە چەند ڕووداوێکی ڕاستو واقیعین.

## "وردەکاری یەکانی ئەم چیرۆکـە نەزانـراوە"

لەوانەشە هەندێك کەس لە مەسەلەی واقیعی بـوونی چـیرۆکەکەوە بـچنە سـەر مەسەلەیەکی ترو، داوای شیکارو وردەکارییەکانی چیرۆکەکە بکـەنو، بلـێن: (دەی مادام ئەمە چیرۆکێکی ڕاستو واقیعییـە، شـیکارو دریـژەی ناوەرۆکەکـەیمان پـێ بلێن)، ئێمەش دەڵێین: (لە ڕووی بەواقیعی بوونی ئـەم چـیرۆکەوە مـەرج نیـە کـە بەدوای وردەکارییەکانی ڕووداوەکاندا بگەڕێین، چونکە دوو مەسەلەی لێـك جـوداو پێکەوە نەبەستراون، واتە مەسەلەی بەواقیعی بوونی چیرۆکەکە شـتێکەو، گـەڕانمان بەدوای درێژەی ناوەرۆکەکەی دا شتێکی ترە.

بێگومان ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە لەزەمانێکی هێندە زوودا بووە کە بەڕاستیش سەرزەوی لەو ڕۆژگـارەدا ئـەو ڕووداوانـەی بـەخۆوە دیـوە. بـەڵام ئـەوەی لەئێمـە خوازراوە ئەوەیـە دریـژەو شـیکاری چـیرۆکە واقیعـیو ڕاسـتەقینەکانی پێـشینان لەسەرچـاوە ڕاسـتو بـێ‌گرێو گـۆڵو متمانـە پێکراوەکانـەوە وەرگـرین کـە ئـەو سەرچاوانەش بەپلەی یەکەم لە قورئانی پیرۆزو فەرموودە ڕاسـتەکانی پێغەمبـەردا بەندن، تاکو لە غـەیری ئەمـەوە وتـەو بەسـەرهاتی ناڕاسـت لەسـەر پێـشینەکان هەڵنەبەستینو، هیچ شتێکی زیـادەش نەخەینـە سـەر ڕووداوەکـان گـەر وا نـەبنو لەڕاستیدا نەبووبن.

جا ئەگەر ڕوو بکەینە سەرچاوە ڕاستەکان بۆ زانینی درێژەی چیرۆکی کابرای خاوەن دوو باخەکە ئەوا دەبینین تەنها ئەوەندەی لەسەر هەیەکە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هیچ شتێکی بۆ زیاد کراویشی لە فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر نیە. لەبەرئەوە بڕیار دەدەین لەسەر ئەوەی کە درێژەو شیکاری چیرۆکەکە لەو لایەنە نەزانراوانەیەتی کە بۆ ڕوون کردنەوەیان لێی ناکۆڵینەوە.

هەر لەدوای ئەمەش چەند پرسیارێکی بێ وەلام پەیدا دەبن، وەك (کێن ئەو دوو پیاوەی کە وتووێژیان لەگەڵ یەکتردا کردووە؟ ناوەکانی هەردووکیان چی بوون؟ لە چ وڵاتێکدا دەژیان؟ ئەی لە چ سەردەمێکدا هەبوون؟ پلەی نزیکیو خزمایەتییان چەند بووە؟ چی بەیەکی گەیاندوون؟ هەردوو ڕەزەکەی کابرا بێ باوەڕەکە لەکوێ بوون؟ باسی کشتوکاڵو درەختەکانیان بەدرێژی چۆنە؟ ئەی کەی خودا سزای وەك هەورە تریشقەی لەئاسمانەوە بۆ ناردوون؟ ئەی خۆیان دوای وێران کردنی هەردوو باخەکە چییان بەسەرهاتووە؟

ئەم پرسیارانەش لە مەسەلە نەزانراوەکانن، بۆیە هیچ وەلامێکیان لەسەرچاوە ڕاستەکانەوە لەسەرنیەو، لەبەر ئەمە ئێمەش وزەی کەمی سنووردارمان لە لێکۆڵینەوەیاندا خەرج ناکەینو، کاتی خۆمانو خەڵکی تریشی تێدا بەفیرۆ نادەین، بەڵکو ئەوەی قورئان باسی کردووە هەر ئەوەندە بەسەو لەوەشدا پەندو وانەی لێوە بەدیی دەکرێت.

## وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ

بۆچی قورئان ئەم دوو پیاوەی بۆکردووین بە نموونە؟ ئەی بۆچی چیرۆکی ئەم دوو پیاوەی بۆباس کردووین؟ ئەی بۆچی خودا لە قورئاندا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە بەنموونە بۆ خەڵکیان بهێنێتەوە؟ ئەی ئەو ڕاستییانە چین کە ئەم چیرۆکە بڕیاری لەسەر داون؟

چیرۆکی (پیاوی خاوەن دوو باخەکە)و (هاوەڵە ئیماندارەکەی) لە چوارچێوەی نیازە بنچینەییەکەی نێو چیرۆکەکانی سوورەتی (کهف)دان کە ئامانجیان (ڕاستکردنەوەی عەقیدە)و (ڕاستکردنەوەی فیکرو تێروانین)و (ڕاستکردنەوەی چەمك‌و بەهاکان بە تەرازووی عەقیدە)یە..

بێگومان ئەم چیرۆکە عەقیدە ڕاست دەکاتەوە، ئەمەش لەکاتێکدا پیاوە ئیماندارەکە داوای لە هاوڕێکەی کردووە کە ئیمان بەخودا بێنێت‌و سوپاسی بکات‌و لە سەرەنجامی کفرو ستەمەکەشی ئاگادار کرۆدتەوە.

هەروەها ئەم چیرۆکە چەمك‌و بەهاکان (قیم)یش بەتەرازووی عەقیدە ڕاست دەکاتەوە، ئەمەش لەکاتێکدا سەرەنجامی ئەو کەسە ڕوون دەکاتەوە کەوا بە موڵك‌و ماڵی دنیا تەفرەی خواردووەو سەرگەرمی بووەو شانازیشی پێوەکردووە، بەڵام لەبەرچاوی خۆی ئەو موڵك‌و ماڵەی وردوخاش‌و پەرش‌و بڵاوبۆتەوە..

پاشان ئەم چیرۆکە چارەنووسی ئەو کەسە باوەڕدارەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شانازیی بە خودای پەروەردگارییەوە کردووەو پەنای بۆ بردووەو هۆگریی پاداشتی نەبراوەی لای خودا بووەو، ئیدی باشترین پاداشت‌و باشترین هیوای تێدا بەدیی کردووە.

ئەم دوو پیاوەی كە سوورەتی (كهف) بۆی كردووین بە پەندێك، لە دوو نموونەی مرۆیی (بشری) پێكهاتوونو، لە هەر پارچە خاكێكی سەرزەوی داو لە هەر سەردەمێكی مێژووشدا نموونەكانیان هەیە، تەنانەت هیچ سەردەمێك نەبووە كە بەدەربێت لەم دوو نموونەیە. هەربۆیەش قورئانی پیرۆز داوامان لێ دەكات، تێبینی ئەم دوو حاڵەتە بكەین لەكاتی دیتنو سەرنج لێدانیاندا.

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ﴾، "ئەی پێغەمبەر تۆ بەسەرهاتی دوو پیاو بە نموونەیەك بۆ گەلەكەت بگێڕەوە"، هەرچەندە ئەم فەرمانە ئاڕاستەی پێغەمبەری خودا ﷺ كراوە، بەڵام لەویشەوە هەموو لێكۆڵیارو پەیڕەوكارێكی قورئانیش دەگرێتەوە لەوانەی كە ئەركی (بانگەواز بۆ لای خودا)و (ئامۆژگاریو ڕێنوێنی كردنی كەسانی تر) لەئەستۆ دەگرن، بۆیە قورئانیش داوا لەم كەسانە دەكات كە ئەم نموونانە بەبیسەرانیان بگەیەنن تاكو ئەمە باشترین هۆی بەدەمەوە هاتنیان بێت، هەروەها داواشیان لێ دەكات لەكاتی بانگەوازدا پەنا بەرنە بەر چیرۆكەكانو وەك ئامرازێك لە ئامرازەكانی بانگەواز بەكاریان بێنن.

## "خودا نیعمەتی دنیایی بەسەر كافردا دەڕێژێت"

لە چیرۆكەكەدا ئەو هەموو نازو نیعمەتە ماددییە دنیاییەش بەدیی دەكەین كە خودا بەمرۆڤی كافری بەخشیوەو بەلێشاو بەسەریدا ڕشتویتیی.. بۆ نموونە ئەم پیاوە كافرە دوو ڕەزی گەورەی تریی هەیەو چواردەوریان بەڕیزەدار خورماكان تەنراوەو لەنێوان هەردوو ڕەزەكەشدا كشتوكاڵێكی تری هەیەو ڕووبارێكیش بەنێوانیاندا دەڕوات، هەردوو ڕەزەكەش بەری خۆیان بە تەواوەتی گرتووەو، خاوەنەكەیان بەهۆیەوە بەروبوومێكی گەورەی دەست كەوتووەو هەست بە دەوڵەمەندییو ماڵو سامانو گەورەییو پلەو پایە دەكات. كاتێك دەچێتە نێو

باخەکەشیەوە ستەم لەخۆی دەکات، بەهۆی ئەم وتەیەوەی کە گوتوویەتی: ﴿مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾ هەرگیز پێم وانیە کە ئەمەم لەدەست دەرچێت".

هاوڕێ باوەڕدارەکەشی هیچ شتێکی لەموڵكو ماڵی دنیا نەبوو، بەڵام ئەم پیاوە بێ باوەرە خۆی بەسەر ئەودا بەگەورە دەگرێتو پـێی دەڵێـت: ﴿أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾ من ماڵوسامانو کەسو عەشـیرەتم لـەتۆ زیـاترو بـەهێزترن"، ئـەم هاوڕێ باوەڕدارەشی وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێـت: ﴿إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ﴾، "ئەگەرچـی ئێـستا تـۆ دەمبینی کە من بە ماڵو کەسوکار لەتۆ کەمترم، بەڵام نابێت ئەوە بەدوور بگریت کە خودای پەروەردگارم پێدەچێت لەو باخەی تۆ باشترم پێبدات".. جا ئەو پەندەی کەوا لەم ئایەتانەوە بەدیی دەکەین ئەوەیە: بێگومان ئەم جۆرە بەخشینە بۆ مرۆڤی بێباوەڕو ئەو جۆرە بەخشینەش بـۆ مرۆڤـی بـاوەڕدار، تاقیکردنـەوەی خـودان بـۆ هەردوو پیاوەکە. کابرای بێ باوەڕ بەو هەموو ماڵو نیعمەتە تاقیکراوەتـەوەو، لـە تاقیکردنەوەکەشدا کەوتووەو دەرنەچووەو، ئیدی کفرو بێباوەڕییەکەشی زۆر بـوون، کـابرای بـاوەڕداریش بـە بێبەشـکردنی لـەو ڕواڵەتـە مادديیانـە تاقیکراوەتـەوەو لەتاقیکردنەوەکەدا دەرچووەو سەرکەوتوو بووەو، ئیمانو باوەڕیشی زیاتر بووە.

هەر لەوەشدا ڕاستییەکی حاشا هەڵنـەگری بـاوەڕدارێتیی نێـو قورئانمـان دێتـە بەرچاو، ئەوەیە: "بێگومان خۆشیو دارایی دنیا کەشتێکی براوەشە، دیاردەیـەکی ڕێزلێنانی خودا لەمرۆڤ نیە بەهەمان شـێوە، بێگومـان بـێ بـەش بوونیـشی لـەو خۆشیو داراییانەی دنیاێ یانی دیاریدەی بەکەم دانانی ئەو مرۆڤە نیە لەلای خودا، چونکە ئەم دارایی‌یەی دنیا زۆر سووکترو ساناترە لەلای خودا کـە ببێتـە بـوارێکی ڕێزلێنان یان بەکەم گرتنی بەندەی خودا، یان مایەی خۆشەویستی یاخود ڕقو کینە بگەیەنێت لەخوداوە.. هەر بۆیەش خودا ئەم داراییو کەرەسەو کەلوپەلە براوانـەی

دنیا (کە بێگومان هەر دەبڕێنەوە) بەشێوەیەکی زۆر زیاتر بەکافران دەدات وەك لەوەی، کە بەموسڵمانانی بدات.

قورئانی پیرۆزیش سەرزەنشتی ئەو کەسە کورتبینانەی کردوە، کە ئەم جۆرە گومانە بەخودا دەبەنو، ئەگەر خودا کەرەسەو دارایی زۆری لەدنیا بەمرۆڤێك بەخشیبێت، ئەوە گوایە خودا خۆشی دەوێتو ڕێزی لێناوە، یان ئەگەر ڕزقو ڕۆزیی لێ کەم کردەوەو شتێکی ئەوتۆی لەماڵی دنیا پێ نەدا، ئیتر گوایە خودا بەکەمی داناوەو ڕێزی لێ نەناوە، نەخێر ئەمە وانیە، ئەم دوو سێ دێرەی دواییش واتای ئەم ئایەتانە بوون، کە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکەن، کە خودا تیایاندا لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ الفجر﴾.. کەوابوو خودا لەدنیادا بەشی زۆری هەر کەسێك دەدات، سا ئیتر ئەو کەسەی خۆش بوێت یان خۆشی نەوێت، بەڵام دینو ئیمان تەنها بەو کەسانە دەدات کە خۆشیی دەوێن.

## "گێڕانەوەی فەرمانەکان بۆ لای خودا"

لە ئایەتی سەرەتای چیرۆکەکەدا تێبینیی ڕێسایەکی ڕوونی زمانەوانی دەکەین، کە دەلالەتێکی باوەڕداریتیو عەقیدەییشی هەیە، ئەویش لەم ئایەتەدا ﴿جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا﴾.. بێگومان لەم ئایەتەدا سێ فەرمانی ڕابردوو (الافعال الماضية) بۆ لای خودا گێڕاوەتەوە:

١- جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ.

٢- وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ.

٣- وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا.

ئەم ئاماژە روونە ڕێزمانیەش دەلالەتی ئەوەمان دەخاتە بەرچاو کە بێگومان خودا هەر خۆی بکەر (فاعل)ی ڕاستەقینەو دانەری ئەو کشتوکاڵو درەختو بەروبوومانەی نێو هەردوو ڕەزو باخەکەی کابرای بێباوەڕە. بێگومان ئایەتەکەش خاوەنە بێباوەرەکەی ئەو دوو باخەی لە هەر کردو کۆششێك دابڕیوە سەرەڕایی ئەوەش کە کابرا زەوی یەکەی کێلاوەو تۆوەکانی تێدا چاندووەو درەختەکانی ڕواندووەو ئاوی داونو پاراستوونیو هەمیشە بەسەریانەوە گەراوەو چاودێریی کردوون.. ڕاستە کابرا ئەم ئەرکە ماددیانەی بەئەنجام داوە، بەڵام ئەو خۆی تەنها هۆکارێکی ڕواڵەتیو مادیی بووە لەوەدا. دەنا خۆ ئەگەر خواست ئیرادەی خودای لەسەر نەبوایە، هەوڵو کۆششی ئەو بەئەنجام نەدەگەیشتو، ئیشەکانیشی بەفیڕۆ دەچوونو، باخو ڕەزو درەختەکانیشی نەشونمایان نەدەکردو بەریان نەدەگرت، ئەمە هەمووی ئەگەر ویستو نیازی خودای لەسەر نەبووایە، خاوەنی هەردوو باخەکە تەنها هۆیەك بووە، بەڵام خودا خۆی (هۆ خۆڵقێنن/ مسبب) بووە. کابرا ئەو کەسە (بەهۆکار دانراوەی خودا) بووە کە زەویی کێلاوەو چاندووە، خوداش بەمەزەندەو خواستی خۆی بڕیاری لەسەر بەئەنجام گەیشتنی کارەکەی بۆداوە، ئیدی هەرچی خواستی لەسەر بێت، بووە، هەرچیش خودا خواستی لەسەر نەبێت، نابێت. هەر بۆیەش فەرمانەکان دراونەتە پاڵ خوداو، کابرای کافریش هەر هەوڵو کۆششێکی لەدوو باخەکەدا بووبێت لێی داماڵراوە.. ئەم ڕاستییە لە سوورەتی (الواقعة)شدا جەختی لەسەر کراوەتەوە، وەك خودا تیایدا دەفەرموێت:

﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ (٦٣) ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ (٦٤) لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ (٦٥) إِنَّا لَمُغْرَمُونَ (٦٦) بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (٦٧) ﴾ الواقعة..

واته: "ئەریّ دیوتانه ئەو تۆوەی دەیچێنن؟ ئایا ئێوە بەرهەمی دێنن یان ئێمە بۆتان دەچێنین‌و بەرهەمی دێنین؟! خۆ ئەگەر ئێمە بمانویستایه دەمانکردە پووش‌و پەلاشی بەر (با)و ئەوسا ئێوە هەر سەیرتان دەکردو هیچتان بۆ نەدەکرا، بەڵکو دەتانگوت: (ئێمە لەدەستمان چووو دۆڕاندمان، تەنانەت دەتانگوت ئێمە بێ بەش‌و مەحرووم بووین).

هەروەها لە گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ دەسەڵاتی خوادا، لایەنێکی تری لێ تێدەگەین، ئەویش بەناشیرین دانانی ڕەفتارو کردەوەی کابرای خاوەن دوو باخەکەیە، کە لە بێباوەڕی‌و لادان‌و لووتبەرزییدا دەردەکەوێت، هەمدیسان ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەشە، کە ئەو خۆی هیچ مافێکی لەو هەڵسوکەوتانەیدا نیە، چونکە ئەو دوو باخەی، کە ئەو بەهۆیانەوە فریوی خواردووەو پێیان سەرسام‌و دڵخۆش بووە، هیچ دەستێکی خۆی تیایان دا نیە، بەڵکو خودا بۆی داناون، خودا چواردەوریانی بە دارخورماکان ڕازاندۆتەوە. خودا لەنێوانی هەردوو ڕەزەکەدا چەندین کشتوکاڵ‌و ڕووەك‌و سەوزایی تری بۆ داناوە.. خودا ڕووبارێکی سازگاری بە نێوانی هەردو باخەکەیدا تەقاندۆتەوە.. ئەم کابرایەش لەباتی ئەوەی سوپاسی خودا لەسەر ئەو هەمو نیعمەتانە بکات، کەچی سپڵەو بێباوەڕ دەرچووەو، لە لووتبەرزی‌و خۆ بەزل زانیدا تەفرەی خواردووەو، ئاکارو نەریتیشی تێکچووە.

## "هونەرێکی کشتوکاڵی لە ڕێکخستنی هەردوو باخەکەدا"

دیسان ڕوانینێکی دی بۆ ئەو ئایەتانە هەیە، کە ئەو دوو باخە دەخەنە بەرچاوان، ئەوەش ڕوانینێکی هونەرییانەی ئەندازیاری نێوکشتوکاڵیە بۆ ڕێکخستنی باخەکان..

ئەم ئایەتانە وێنەیەکی نموونەیی هونەریی لە ڕێکخستن باخەکەو، ئەندازیاریی بێستانەکەو ڕواندنی درەختەکان تێیدا بەشێوازێکی هونەریانەی جوانو سەرنج ڕاکێش، جا بە وردی سەرنج بدە:-

- دوو ڕەزە جوانەکەی ترێ.
- خودا چواردەوری هەردوو ڕەزەکەی بەچەند ڕیزێکی دارخورما گەمارۆ داوە.
- پاشان خودا کشتوکاڵێکی تری لەنێوانیاندا داناوە.
- هەروەها بەنێویاندا (بەنێوانی هەردوو باخەکەدا) ڕووبارێکی تەقاندۆتەوە.

لە ئەنجامی ئەمانەدا هەردوو ڕەزەکە بەروبوومی خۆیان گرتو هیچ کەمو کوورییەك لەو بەروبوومەیاندا نەبوو. ئێمە واتێدەگەین، کە مەبەست لەم شیکاری ئەندازیارییانەوەیەو لە بنیاتنانی هەردوو ڕەزەکە (کە بەبێ باری ئاساییی قورئان لە تێپەڕاندنی خێرا بەسەر نموونەکانی ئەم مەسەلە درێژە پێدراوە مامناوەندیانەدا)، بانگکردنی بینەرانی قورئانو لێوردبووەوانیەتی بۆ بەدییکردنی ئەم هونەرە ئەندازەییە ڕێکخەرە.

جا کاتێك سەرنج لەم ئاوڕە هونەرییەی قورئان دەدەین، چەند مەسەلەیەکی دی بەدیی دێنین، وەك:

١- زەوقی جوانکارییو هونەرییانە، لە ئایەتەکانی قورئاندا لەڕووی ئاماژەکردنیەوە، بۆ ڕەهەندی ئەندازیاریی کشتوکاڵی لە ڕێکخستنی باخچەو بێستانەکاندا.

٢- پەیڕەوکردنی ئەم ڕێسا قورئانیەو، ڕێکخستنی باخچەو بێستانەکان لەسەر ئەم بنچینەیە.

٣- سوودوەرگرتن لە قورئان لەڕیزبەندکردنی شتەکاندا، بەم ڕیزبەندییە ئەندازەییو هونەرییە، سا ئیتر لە جیهانی کشتوکاڵ، یان لە جیهانی هەر پیشەیەکی تردا

بێت. چونکە هەر تەنها ئامادەکردنی شتەکانو بەئەنجامگەیاندنی کارەکە گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئەنجامدانی کارەکە بەچاوێکی هونەریو، زەوقێکی جوانکاریو، دەستێکی ڕێز بەندو ڕێکخەرەوە بێت.

جا بڕوانە چەند جوانە ڕێکخستنو لایەنی ئەندازیاریی هەردوو باخچەکە.

- ئەو دارو درەختانەی کە مێوی ترێکانیان پیا هەڵواسراوەو کەپریان بۆ ترێکە کردووە.
- ئەو مێوانەی کە بەبێ کە پر ترێیان گرتووە.
- پۆلە دارخورماکان بەڕیز چواردەوری ئەو باخچەیەیان داوەو هەردوو ڕەزەکەیان بەکەپردارو بێ کەپرەکانیشەوە گەمارۆ داوە وەك ئەوەی بووبنە پەرژینێك بۆیان..ئەو کشتوکاڵو کێڵگەو دانەوێڵە چێنراوانەی کە لەتەنیشت ڕەزەکانەوە نەشونمایان کردووە.
- ئەو ڕووبارەی کە بەنێوانی هەردوو ڕەزەکەدا دەڕوات.

دیارەو ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە ئەم ڕێکخستنو ڕیزبەندی یە ئەندازەییو جوانکاریو هونەرییانەیە هەر تەنیا تامو بۆی جوانیو قەشەنگی نابەخشێت، بەڵکو لەهەمان کاتدا دەسکەوتێکی کشتوکاڵیو ئابووریشی دەستەبەر کردووە، چونکە هەردوو ڕەزەکە بەروبوومی خۆیان هەبووەو هیچی لێ کەم نەبۆتەوە. بێگومان ڕێکخستنو ڕیزکردن کار بەرەو چاکیی ئەنجامدانی دەباتو، وزەی زەوی لە بەخشیندا دەقۆزێتەوەو وزەی دارو درەختەکانیش لەبەرگرتندا پاشەکەوت دەکات، زەویش بەئەندازەی ئەوەی پێی دەدەیت، بەرهەمت پێ دەبەخشێت، درەختیش ئاتاجی بە بایەخدانو سەرپەشتیارییو هەوڵو تەنسیقی تۆیە تاکو ئەوەی لە بەروبوومی هەیەتی پێت ببەخشێت.

## مانای ﴿وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْئًا﴾و زوڵمی خاوەنی باخەکان چییە؟

لە ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەدا دووجار ئاماژە بۆ زوڵمو ستەم کراوە کە جارێکیان بە (نەرێ)و جارێکیش بە (ئەرێ) هاتوون، واتە لەجاری یەکەمدا زوڵم لەنەریتی باخەکان دوور دەخاتەوە کە بەبێ کەموکوڕی بەروبوومی خۆیان بۆ کابرا گرتووەو لەمبارەیەوە زوڵمیان نەکردووە: ﴿كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْئًا﴾ بێگومان هەردوو ڕەزەکە هەرچییان بووە لە بەروبوومو بەرهەم بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێکی لێ کەم کەنەوە دەستەبەریان کردووە، قورئان ئەمەی بەوەناو بردوە کەوا ڕەزەکان، باخەکەو کشتوکاڵەکانیان ستەمیان لەکاری خۆیاندا نەکردوە ﴿وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْئًا﴾. لە جاری دووەمیشدا کە وشەی (ظلم)یان تێداهاتووە قورئان کاری ستەمو زوڵم کردنی داوەتە پاڵ خاوەنی ئەو دوو ڕەزە: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ واتە: (کابرا زاڵم بووە کاتێك بەبێ پەروایی‌و لووتبەرزی یەوە خۆی بەنێو باخەکەدا کردووە) کەوابوو ئەو خۆی ستەمکارو زاڵم بووە نەك باخەکان. دیارە ئەو کەسەی بەوردی لەماناو ڕاڤەی قورئان سەرنج بدات لەم دیمەنە سەرسام دەبێت: (باخێك پێکهاتووە لە کێڵگە ڕەزی ترێو دارخورما.. باخێکی عادڵو بەئەمەك کە هیچ زوڵمێکی لەخاوەنەکەی نەکردووەو هیچ بەشێکی بەروبوومەکەی لێ نەشاردۆتەوە).. دیمەنێك کە (ڕووەكو خۆڵو شتی بێ‌گیانو بێ دەنگ بوونو قورئان زوڵمی لێ دوورخستوونەتەوە). (مرۆڤێکیش پێکهاتووە لە عەقڵو گیانو، هەستو سۆزو بیروڕیی هەیەو، لەگەڵ ئەوەشدا لەژیانیدا ستەمکاربوە، ئەم مرۆڤە ستەمکارە کاتێك دەچێتە نێو ئەو باخە بێ ستەمەیەوە کە بەدڵفراوانی‌و بەخشندەیی یەوە بەروبوومەکانی خۆی پێ‌دەبەخشێت، کەچی ئەو بەزوڵمو لووتبەرزی‌و خۆبەگەورە دانانەوە وەریان دەگرێت)، سەیرە ئەم مەسەلەیە: (کێڵگە بەخشندەو بەردارەکە

ستەم ناکات، لەگەڵ مرۆڤێکی چاوچنۆك و لەخۆبایی و ستەمکار).. دەبێت لەبیرمان نەچێت کە قورئان ستەمی مرۆڤە بێباوەڕەکەی بۆ سەر مرۆڤەکە خۆی زیادکردوە،واتە ئەو مرۆڤە ستەمی لەخۆی کردوە، ئەمەش بەوەی کەوا بەرامبەر بەخودا کافرو بێباوەڕ بووە، ئەم بێباوەڕییەشی بەرەو ڕۆخەکانی تیاچوونی بردوە.. هەمدیسان ئەو بۆیە ستەمکاری نەفسی خۆی بووە، چونکە ماڵو سامانی ونکردوە، هەروەها بۆیەش ستەمکاری نەفسی خۆی بوە، چونکە هەردوو باخەکەی لەدەست کفرو بێباوەڕ بوون گۆڕیوە، لەڕاستیشدا هەر ستەمکارێك تەنها ستەم لەخۆی دەکات ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا ...﴾(٤٣) فاطر، واتە: (فروفێڵو نەخشەو پلانی خراپ لەئاکام دا هەر خاوەنە پیلانگێڕەکەی دەگرێتەوە).

## "تێڕوانینێکی لەخۆبایی یانەی فریوخواردوو"

قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی سەیرو سەرسوڕهێن وێنەی هەڵسوکەوتی کابرای خاوەن دوو باخەکەی بۆ کێشاوین‌و، لە ڕەفتارە سەیرەکانی ئاگاداری کردووین‌و، وتەو ڕستەکانی خۆ بەزل زانی‌و خەیاڵ پلاویی بۆ تۆمارکردووین،و پەردەی لەسەر تێڕوانینە پووچ‌و دەردەدارەکەشی هەڵداوەتەوە.

جێی باسە ئەو ڕووبەندەی، کە هەموو ئەم هەڵسوکەوت‌و ڕەفتارو گفتارانەی لەخۆگرتوە ئەوەیە، کە لە مرۆڤێکی لەخۆبایی‌و فریوخواردووەوە دەرکەوتوون، کە ماڵو سامان‌و ڕواڵەتە ماددییەکان کوێری کردوون‌و، ئەو دەوڵەمەندیی یە زۆرەیشی خستوویێتی یە نێو خۆ بەزل زانی‌و دەعیەو لوتبەرزییەوە، ئیدی هەموو ئەم دەردو پەتایانەش، پەردەیەکی ڕەشیان بەسەر ئاسۆی تێڕوانینی داهێناوەو، نەیزانیوە چی بڵێت‌و، چۆن ڕەفتارکات‌و، چۆن سەنگی خۆی بزانێت‌و، بەهاونرخیشی چۆن بزانێت.

بێگومان قورئانی پیرۆز ئەم ڕەفتارو گفتارانەی بۆ تۆمارکردووە:-

١- کە چۆتە نێو باخەکەیەوە ستەمکاری نەفسی خۆی بووە ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾.

٢- گومانی وابووە ئەم باخە هەر دەمێنێت بۆی و، گوایە نیعمەتو بەخششەکانی هەمیشەیین هەر بۆیە سەرگەرمی بووەو گوتوویەتی ﴿مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾.

٣- بەهۆی ملکەچبوونی بۆ باخەکەو قایل بوونی بەتەنیا بۆ نیعمەتەکانی و، لەبیرچوونەوەی ڕۆژی دوایی و، سەرکێشی کردنی لە بەدیهێنانی ڕۆژی لێپرسینەوەوە گوتبووی ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾.

٤- جا ئەگەر (وەك گوتبووی) ڕۆژی لێپرسینەوەو قیامەتیش بەوتەی باوەڕداران هەبێتو، ئەگەر خودا ئەم کابرا دەوڵەمەندەی لەگۆڕەکەیەوە زیندوو کردەوەو، بردی یەوە بۆ لای خۆی ئەوا (بەڕای خۆی) گوایە خودا نیعمەتی باشتر لەو بەهەشتەی پێ دەدات، جا لەبەر ئەوەی خودا لەدنیادا ئەو دوو باخەی پێ بەخشیبوو، ئەوا لەڕۆژی دواییشدا لەوە باشتری پێ دەدات (ئەمە ئەگەر بەڕای جەنابیان ئاخیرەت هەشبێت) هەر بۆیەش گوتبووی: ﴿وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾.

٥- هەر ئەمەش (واتە هەموو ئەم بیروبۆچونە فریوخواردوانەی) پەلکێشیان کردبوو، بۆ ئەوەی خۆی بەسەر هاوەڵە باوەڕدارەکەیدا بەرز بگرێت لەکاتی ووتو وێژ لەگەڵ کردنیدا، بۆیەش پێی گوتبوو:- ﴿أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾.

ئەم پیاوە گومانی وابووە گوایە بـواری بەچـاکتربوونی کەسـێکی دی بـەزۆریی ماڵو سامانەو، ئیدی بەهۆی زۆریی ماڵو سامانەوە لەهاوڕێکەی باشترە، هـەروەها گومانی وابووە گوایە مەیدانی ڕێزو بواری ئەم شتانە بێت ئەوا بە(پێوەرو تەرازووی خۆی) لە هاوڕێکەی خۆی سەنگینترە.

بێگومان لەخۆبایی بوون خاوەنەکەی (واتە مرۆڤە لەخۆبایی بووەکـە) لەئاسـت ڕاستی یەکان دا کوێر دەکات، ڕووکردنە سەر کەرەسەو باقو بریقی دنیای بـراوەش چاوەکانی خاوەنەکەی بەپەردەیەکی وا دادەپۆشـێت کـە ناهێڵێـت ڕێگـای ڕاسـتو دروست ببینێت.

## "ژیـربێـژیی باوەڕدارانە لە قسـەکردنی پیـاوە ئیمانداره‌کـە"

هەرچـەندە ئاگـاداریی لۆژیـك (منطـق)ی خۆبـەزل زانـیو لـەخۆبایی بـوونو لووتبەرزییو سپڵەیی کابرای بێباوەڕ بووین، بەڵام قورئان لۆژیکێکی تـری پیـشان داوین، ئەویش لۆژیکی ژیربێژییو نەرمونیانیو میهرەبانیە خۆشویـستراوەکەیەتی، ئەمەش ئەو ژیربێژییە باوەڕدارانەیەتی کە بە ڕوونی لە ئاخاوتنی پیاوە ئیماندارەکە بۆ پیاوە بێئیمانەکەدا ڕەنگی داوەتەوە، ئەم پیاوە باوەڕدارە لە هەموو ڕواڵـەتێکی فریودەری ماددەپەرستیو لە هەموو کەرەسەیەکی جوانو سەرنج ڕاکێشی ساختەی دنیـای بـراوە دوور بـووەو، هەمیـشە دەسـتی گرتبـوو بەباوەڕویـەقینو دڵـسافیی یەکەیەوە. کاتێك هاوڕێ بێئیمانەکەشی دیوە کە بەهۆی موڵكو ماڵەوە لەخۆبایی بووەو، کە گوێی لە وتەکانیشی بووە وەك کەسێکی لەخۆ ڕازیو بەهەیبەت خـۆی پیشان داوەو لە ستەمو زۆرداریدا ڕۆچووە، بەم هەڵوێـستەی نەخەڵـەتاوەو، بـەڵکو پیاوێکی داناو بەرچاو ڕۆشن بووە، هـەروەها هەسـتی بـەلاوازیو سەرشـۆڕی یـان بەترسنۆکی نەکردووە لەبەردەم هاوڕێ بەدکارەکـەی داو، خۆیـشی بـەهۆی ئـەوەوە

هەڵنەسەنگاندووەو، هیوای ئەوەشی نەخواستووە کە وەك ئەو خاوەنی موڵك و سامان بێت، حەزی لەوەش نەکردووە کە لەمەیدانەکە بکشێتەوە یان لەگۆشەیەکدا گۆشەگیربێت و تەنها بەسوپاس و زیکری خوداوە خەریك بێت. بەڵکو بەرامبەر هاورێ لوتبەرزو لەخۆبایی یەکەی وەستاوەو دەمەتەقێ و ووت وویێژی لەگەڵدا کردووەو، بەجورئەت و سەربەرزی و باوەڕی پتەوو خۆڕاگری و سەربلندی یەوە قسەی لەگەڵ دا کردووەو، وەك ئامۆژگارو ڕوونکەرەوەو تێگەیەنەرێك دوواندوویەتی و ڕێی ڕاستیی پیشان داوەو ڕێنموونیی کردووە بۆ ڕێبازی چاك و هەرەباشترو، فێریشی کردووە چۆن بڕوانێت بۆ ئەو ماڵو دارایی یەی کە خودا پێی بەخشیوەو، چۆن بەکاریشی بێنێت، هەروەها داوای لێ کردووە کە لەخۆبوردوو بێت و بەباشی هەڵسوکەوت بکات و، بە چاکی ئەو پەروەردگارەیشی بناسێت کە نیعمەتی پێ بەخشیوەو پاراستوویەتی و ڕزق و ڕۆزیی پێداوە.. پاشان بەر لەوەی تووشی ئەو چارەنووسە بێت سەرەتاو ڕەگ و ڕیشەی کاروبارەکانی پێ ناسان دووە. وەك خوداش فەرموویەتی: ﴿ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّـٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾.. ﴾

ئەوەی لەم پیاوە ئیماندارەوە سوودی لێ وەردەگرین ژیربێژی و شێوازە نایابەکەیەتی لە دواندن و ئاخاوتندا، چونکە فێرمان دەکات چۆن کەسانی تر بدوێنین و، گومانەکانیان پووچەڵ بکەینەوەو، پەردە لەسەر چاوانیان لابدەین و، دیدو تێڕوانینەکانیان بۆ ڕاست بکەینەوەو، ئیدی (ئەو پلەو پایەو دەسەڵات و نازو نیعمەتانەشیان) نەبنە ڕێگر لەکاری دواندنیاندا. هەروەها فێرمان دەکات خۆمان

نەخەڵەتێنینەو، خۆمان بەوان هەڵنەسەنگێنینەو خۆزگە بەحاڵو ماڵیان نەخوازین.. چونکە ئێمە لەوان بەهێزترو خۆڕاگرترو سەربەرزترو باشترو دەوڵەمەندترو لە خوا نزیکترین، مادام ئێمە خاوەنی باوەڕین بەخودای پاکو باڵادەست.

## " مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ "

پیاوە باوەڕدارەکە لەکاتی دواندنی هاوڕێ کافرەکەی دا ڕێنموونی ی کرد بۆ هەڵسوکەوتێکی شیاوو ڕاست بەو ڕەنگەی سوپاسی خودای پەروەردگاری تێدا بکاتو هەوڵ بدات بۆ بەردەوامیی نیعمەتی خودا لەسەری، داواشی لێکرد پەنا بەرێتە بەر خوداو، کاروباری بەخواستی خوداوە هەڵپەسێرێتو، بەقودرەتی خوداشەوە بیبەستێتەوەو، هێزی خۆی لەهێزو کۆمەکی خوداوە وەربگرێت. وەکو پیێی گوت: ﴿ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ ﴾.. لەمەدا حیکمەتێکی گەورە هەیە کە پیاوە ئیماندارەکە بەم دەستەواژەو ڕستە باوەڕدارێتییانەوە دواوە لەکاتێکدا (نەختێك لەماڵو سامان یان لەکەسو کارو عەشرەت)ی کەسێکی دی سەرسامی کردبیت. نەکردوە.

بێگومان ئەو دانی بەوەدا ناوە کە ئەوەی پەیدای کردووە بەخواستو ئیرادەی خودا بووە، نەك (کابرایی بێ باوەڕ) بەهەوڵو کەسایەتیو کۆششی خۆی بێت، هەر بۆیەش پیێی گوتووە: (ماشاءالله) پاشان باوەڕی وابووە کە هێز پەیدا نابێت تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە لەهێزی خوداوە کۆمەکی بکرێت، چونکە هەر خودا خۆیەتی کە بەهێزەو بەتواناو باڵادەستە، هەر خۆشیەتی هێز بەخەڵکی دەدات، خۆ ئەگەر خودا هێز لە مرۆڤێك بسێنێتەوە ئەوا هەموو هێزەکانی تری سەرزەوی سوودی پێ نابەخشنو هەر ناشتوانن هێزی پێ بگەیەنن، لەبەر ئەمەشە بە گوتەی زمان پیێی وتووە ﴿لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ ﴾. بێگومان ئەم دەستەواژە قورئانیە ئیماندارانەیە بەڵگەیەکە لەسەر هێزی ئیمانداریتیی خاوەنەکەیو لەسەر پەنابۆخودابردنی و، هەستکردنی بەپێویستیو ئاتاجی زۆری بەخوداو بەلاوازیی خۆی لەبەردەم خوادا..

هەروەها ئەم دەستەواژەیە خاوەنەكەی ڕادەسپێرێت بە لەخۆبوردنو میانڕەوی و، پاشان نەریتەكانی بەخۆنازینو لووتبەرزیو خۆبەزل دانانو فیزو هەوا لەناو دەبات. هەروەها داوای لێ دەكات كە ئەو نیعمەتەی خودا پێی داوە لەسوودو بەرژەوەندیی بەندەكانی خوداو لەڕێی لەخوا نزیك بوونەوەیدا بەكاری بێنێتو، بەو شێوازەش بەكاری بێنێت كە ڕایدەگرێت لەسەر زیكرو سوپاسی خوداو لەسەر بەچاكی پەرستنی خودا.

بەندە چاكەكانیش لەم ڕستە ئیماندارانەیە هۆشیار بوونەتەوە، كە چ واتاو سوودێك دەبەخشێت، هەر بۆیەش هەموو جموجۆڵو كاروبارێكیان ژێرباری ئەوەكردووەو بەوەوە پابەند بوون، هەروەها ئەم ڕستەیەیان بەزمان گوتووەتەوە، كاتێك بەسەرسامییەوەماڵو سامانی دەوڵەمەندانیان بینیوە، یان كوڕو نەوەیان، یان خانووو زەویو زاریان بینیوە.

له (عروەی كوڕی زبیر)ەوە —خودا لێی ڕازی بێت- ئەوەی گێڕراوەتەوە، كە هەركاتێك شتێكی لەماڵو موڵكەكەی بدیایەوە، پێی سەرسامو دڵگیر ببوایە، یان دیوارێك لە دیوارەكانی ماڵەكەی بدیایە دەیگوت: ﴿مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ ئەو بەم نەریتەی خۆی ئەم فەرمایشتەی خودای لێكدەدایەوە، كە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾.

له (ابن شهابی زهری)یشەوە گێڕراوەتەوە، كە خۆی هەر كاتێك بەنێو موڵكو سامانیدا بگەڕایە دەیگوت: ﴿مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾. له (امام مالك)یشەوە گێڕراوەتەوە، كە ئەگەر بچوایەتە نێو ماڵەكەیەوە دەیگوت: ﴿مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾.. قوتابییەكی خۆی، كە ناوی (مُطَرّف) بوو لێی پرسی (مامۆستا بۆ وا دەڵێیت؟) ئەویش پێی گوت: (ئەرێ نەتبیستووە خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾.

(میسرە)ش گوتوویەتی: " لەسەر دەرگای (وهبی کوڕی منبە) دیتم ئەم ڕستەیە نووسرابوو (ماشاءالله)، ئەمەش بەپێی فەرمایشتی خودا: ﴿ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴾"[1].

پێویستە ئێمەش ئەم دەستەواژە باوەڕدارانەیە بکەینە دروشمێکی هەمیشەیی بۆ خۆمان کە دڵەکانمان لێی هۆشیار بێتەوەو زمانەکانیشمان بیلێینەوەو، لەجەستەو واقیعو ژیانیشماندا لەگەڵیا بژیین تاکو نیعمەتی خودامان لەسەر بەردەوام بێت و، هەتا سوپاسی خوداشی لەسەر بکەین.

(١) (الدر المنثور، للسيوطي ٥:٣٩١).

## "وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ"

پیاوە باوەڕدارەکە هاوڕێ بێباوەڕەکەی لە (نەمانی نیعمەتی خودا لەسەری بەهۆی کفرو لە خۆبایی بوونەکەیەوە) ئاگادارکردەوە. ئەو باخەی کە پێوەی دەنازێت بێگومان خوای گەورە دەتوانێت لە ناوی ببات، بۆیە پێی گوت: (دوور نیە خودا لەو باخەی تۆ باشترم پێ بداتو لە ئاسمانەوە سزایەکی وەك هەورە تریشقەی بۆ بنێرێتو وەك بەردێکی ڕەقی بێ سەوزایی لێ بکات، یاخود ئاوەکەی بەقوولایی زەویدا بباتە خوارەوەو باخەکەی پێ ئاو نەداتو، تۆش هیچ دەسەلاتێکت نەبێت)، وەك خوداش لەسەر زاری ئەو فەرموویەتی: ﴿ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ الکهف ﴾.. کەچی هاوڕێکەی وازی نەهێناو پەشیمانو وریا نەبۆوە، بەڵکو هەر لەسەر کفرو خۆ بەزل زانیو لووتبەرزیو بەدرەفتاری یەکەی مایەوە. لەدواییشدا خودا بەپێی ئەو سزایەی کە شایستەی بووە مامەڵەی لەگەڵدا کردووەو، لەسەر کارەکانی گرتوویەتیو، ئازاری توندی لەسەرەنجامی بەدکاریو بێ پەروایيو بێ باوەڕیی داوەو، هەردوو باخەکەی بۆ وێران کردووەو، هەرچی ترێو دار خورماو کێڵگەی هەبووە نەیهێڵاوەتەوەو، هەموو بەرو بوومەکەشی بۆ پەرشو بڵاو کردۆتەوەو ئەو ئاوەی پێشیان دادەڕۆی بەناخی زەویدا بردوێتی یە خوارەوە، قورئان هەموو ئەم ڕووداوانەی بەڕستەی ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾ درکاندووە، لێرەشدا، ئەم ڕستەیە کە مانای (لەناوچوونی هەمووماڵو سامانەکەی دەگەیەنێت)و کە فەرمانی

(واحیط)ش لە (الاحاطة) وە هاتووە، واتاکانی (لەناوبردن‌و، وێرانکردن‌و، نەمان) دەگەیەنێت.

ئیدی هەموو ئەو ماڵ‌و سامان‌و نیعمەتانەی کە کابرای بێ باوەڕ تەمەنێك‌و زەمەنێك‌و هەوڵ‌و کۆششی تێدا بەسەر بردبوو و، کە پارەو پوولێکی زۆرو ماندووبوونێکی تەواویشی لە سەرپەرشتی‌و پەرەپێدانیدا تێدا خەرج کردبوو، هەمووی ڕۆیشت، هەموو ئەمانە لەساتەوەختێکی کەم دا، لەچاوترووکانێك دا ڕۆشتن‌و نەمان‌و، بوونە شوێنەوارێك‌و، بەسەرهاتێك.

تەنانەت فەرمانەکەش (واحیط) بەفەرمانی نادیار (مبنی للمجهول) هاتووەو، بکەر (فاعل)ەکەشی لابراوە (حذف) ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ﴾.

لەم نادیارییەی فەرمانەکەدا هەندێك حیکمەت هەیە، وەك :

١- بێگومان خاوەنی هەردوو باخەکە، بکەر (فاعل)ەکەی نەناسیوە، واتە هۆی نەمانی هەردوو باخەکەی نەزانیوەو، گومانەکانیش بەرەو هەموو جۆرە بیروڕایەکی لە زانینی بکەرەکەدا بردوون.

٢- جیاوازیی بیروڕاکانی چاودێران‌و ئاگایان‌و لێکۆڵیاران لەدیاری کردنی بکەردا، چونکە هەندێکیان بیروڕایان وایە گوایە هۆکارەکانی کەش‌وهەوا بوونەتە هۆی لەناوچوونی باخەکانی، هەندێکی تریشیان هۆکارە کشت‌وکاڵی یەکان بۆ نەمانی باخەکان دادەنێن، هەندێکی تریشیان بۆ مەسەلەی چۆنیەتی ماڵ‌و پەرەپێدانی خەرج کردنی دەگێڕنەوە، هەندێکی تریشیان دەیبەنەوە بۆ هۆی کەمتەرخەمی‌و درێغی کردنی خاوەنەکەیان.. جگە لەچەندین هۆی تر کە لێکۆڵیاران‌و چاودێرانی ڕووداوەکان دایدەنێن. بەڵام کەم کەسیان هەیە کە زیرەکانە بیخەنە پاڵ هۆی باوەڕداریێتی‌و هۆکاری خودایی، کە ئەمەش لەبێ باوەڕی‌و لەڕا لادان‌و یاخی بوون‌و کابرای خاوەنی باخەکاندا دەردەکەوێت، هەر بۆیەش بەخراپیی کارو کردەوەکانییەوە تووشی زەرەرو سزاکە بووە.

٣- قورئانی پیرۆز کاری نیعمەت بەخشینەکەی خستۆته پاڵ خـوداو فەرمانـەکانی نێو ڕستەکانیشی هـەر بـۆ خـودا گەڕاندۆتـەوە: ﴿جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ الكهـف﴾. جـێی باسـه پێـشتر ئاماژەو دەلالەتی ئەم، خسته پاڵو بۆ گەڕاندنەوەی نیعمەتو فەرمانەکانـمان، ڕوون کردەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی فەزڵو چاکەی خودا لەسەر مرۆڤ دەرکـەوێت، کە خودا چ فەزڵو ڕێزلێنانو نیعمـەتو بەخشـشێکی بـەمرۆڤ بەخـشیوەو، تـا مرۆڤیش سوپاسی خوداو گوێڕایەڵیی خودا لەسەر ئەو نیعمەتانە بکات.

لێرەشدا – واته لەم جۆره حاڵەتەشدا کارێکی گونجـاو نیـه کـه نەهێـشتنەوەی نیعمەتەکەو نەهێڵان لەلای خاوەنەکەی بخرێته پاڵ خودا، لەکاتێکدا بێگومان خودا خۆی داناو دادگەره له کاری نەهێشتنەوەکەدا.. خوداش خـۆی زانایـه لـەم ڕووەوە (والله أعلم)..

## "پەشـیمانیو زیانمـەندیـی"

کابرای بێباوەڕ، کتوپڕ بـه لەناوچـونی مـاڵو سـامانەکەیو، بەهەدەرچـوونی کارەکـانی، کـه لـه مـاوەی چـرکه سـاتێکدا لەناوچـوون، شـڵەژاو، هەسـتی بـه زەرەرمەندییو گومڕابوونیو فەوتانی پاشەڕۆژو چارەنووسیی دەکرد، بۆیه پەشیمان بووەوەو زۆریش پەشیمان ببووەوە، وەك قورئان لەفەرمایشتەکەی خوادا گوزارشـتی لـێکردووە: ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَدًا ﴿٤٢﴾ الكهـف﴾، واته (له ئاکامدا بـەپێی بۆچـوونی باوەڕدارانـەی هـاوڕێ ئیماندارەکـەی، مـاڵو سـامانو بەروبوومـەکانی لـەناوبراو، ئـەویش بـەدەم ناڵـەو ئاخوداخـەوە دەسـتەکانی بەیەکـدا دەکێـشاو

ئەفسووس‌و پەرێشانیی لەسەر ئەو هەموو مەسرەف‌و خەرجییەی تێیدا کردبوو، دەردەبڕی، ئەمەش لەکاتێکدا باخەکە خاپوور کرابووو بەتەواوی وێران‌و پەرش‌و بڵاو ببوو، هەروەها دەیگوت: بریا من هیچ جۆرە هاوڵو شەریکێکم بۆ خودای پەروەردگارم دانەنایە). لەم ئایەتەدا ڕستەی ﴿فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ﴾ مانای ئەوە دەگەیەنێت کە کابرا لە حەسرەت‌و پەشیمانی‌و شڵەژاندا هەردوو دەستی بەیەکتردا کێشاوەو پەشیمان بووە لەو هەموو مەسرەفەی کە لەباخەکەدا کردوویەتی‌و کە بەسەر یەکتر داتەپیوەو خاپوور بووە.. واتە بەحسابات‌و خەرجییەکانیدا چۆتەوەو، بۆ دەستمایەی خۆی ڕوانیوەو، خەرجییەکانی کۆکردۆتەوە کە لەو باخەدا تێ‌ی چوون. وشەی (مَآ أَنفَقَ فِيهَا) وشەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنەو هەمە جۆرو شێوازێکی خەرج کردنی ماددی‌و مەعنەوییش دەگرێتەوە. بێگومان پارەوپوولێکی زۆری لەو باخەی دا خەرج کردبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، باخەکەی لەدەست دەرچووەو پەرش‌و بڵاو بووە.. هەروەها کات‌و ڕۆژگارێکی زۆریشی تێداو لەپێناودا خەرج کردووەو، کەچی ئەو هەموو وەختانەی بەفیڕۆو بەزیان لێ ڕۆشتوون.

هەمدیسان گوڕوتوانایەکی زۆریی جەستەییشی لەهات‌و چۆو پێداگەران‌و بەسەرکردنەوەو کارتێ کردن بۆ خەرج کردووەو، کەچی ئەوا لەبەردەمیا هەموو هەوڵەکانی بە (وێرانی‌و تەفروتوونابوون‌و نەمان) دەبینێتەوە. پاشان خەون‌و خەیاڵ‌و هیواو ئاواتێکی زۆریشی تێدا خەرج کردووەو لەپێناویاندا ژیاوەو پشتی پێ‌یان بەستووە، کەچی ئەوا هەموو هیواو خەونەکانی لەژێر بەرداشی ڕاستییەکی تاڵ‌و واقعیدا پووچەڵ دەبنەوە. دیسان هەموو ئەو ژیانەی خۆی کە لەپێناویدا بەسەری بردووەو هەموو ئەو تەمەنەیشی کە تێیدا بۆی ژیابووو ئەو موڵك‌و ماڵەش کە بۆی کردبووە دەستمایەو سەرمایەو تێیدا خەرجی کردبوون، کەچی ئەوا هەموو ئەوەی لەپێناویدا خەرجی کردوون‌و مامەڵەی پێوە کردوون بوونەتە زەرەرو وێرانەو کاول بوون..

لەبەر هەموو ئەوانـە لەوپـەڕی پەشـیمانی دا پەشـیمان بۆتـەوەو، دەسـتەکانی بەتوندی بەیەکدا کێشاوەو، چاوی بەهەموو ئەو خەرجیو مەسرەفە هەمەجۆرانەیدا گێڕاوەتەوەو، ئەو هەموو زەرەرو زیانانەشی هێناوەتە بەرچاوی خـۆیو سـەرنجی لێ داون. ئیدی زمانیشی هاتۆتە گۆو ئەم ڕسـتەیەی پـێ درکانـدووە ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾ خۆزگە هەرگیز هیچ کەسێکم نەکردایە بەهاوەڵ بۆ خـودا" ئـای چـەند پەشیمانی یەکی گەورەو بەربڵاوە.. ئای چ زیانێکی سـەختو کاریگـەرە.. ئـای چ ژیـانێکی بەدبـەختیو نەگبەتییـە.. ئـای چ تەمـەنێکی بـەفیرۆ دراوە.. ئـای چ مرۆڤێکی گومڕاو سەرلێشواوە! ئەو مرۆڤەی، کە بە کەشخەییو بەخۆنازینو بـەبێ پـەروایيو لووتبەرزییـەوە خـۆی دەنوانـد.. ئـەو مرۆڤـەی، کـە بـەهۆی مـاڵو باخەکانییەوە شانازی بەسەر هاوڕێ ئیماندارەکەیدا دەکـردو پـێی دەگـوت ﴿أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا﴾.. ئـەو مرۆڤـەی کاتێـك بـۆ باخەکـەی دەڕوانـی، لەبارەیەوە ڕای وابوو، کە دەیگوت: ﴿مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا﴾.. ئـەم مرۆڤـە ئێستا دەبینێت باخەکەی بەسەریەکدا تەپیوەو خاپوورو وێران بووە، بۆیە بـەکردەوە (عەمەلی) پەشیمان بووەتەوەو، پەشیمانیەکەشی لەدەست بەیەکدا کێـشانەکەی دا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها بەوتەو درکانـدنی زمـانیش پەشـیمان بۆتـەوەو لـەوەدا ڕەنگی داوەتەوە، کە گوتوویەتی: ﴿يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾.

## " هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ "

قورئـانی پـیرۆز لەبەدواداچـوونی دا بـۆ ئـەو زیانـە سـەختەی کـابرای کـافرو لەناوچوونی هەردوو ڕەزەکەی، بەم شێوەیە دۆخەکەی هەڵـسەنگاندووە: ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ الكهف﴾.. واتە: (لەو جۆرە بارودۆخانەدا یارمەتیو کۆمەك تەنها لەخودای حەقو حاکمی هەقپەروەرەوەیەو، خودای حاکم هەر خۆیشی باشترین پاداشتی بۆ چاکەکاران لەلایەو، چاکترین چارەنووسو سەرەنجامیشی بۆ بەختەوەران داناوە).. ئەم بەدواداچوونەش حەقیقـەتێکی ڕاسـتگۆیانەی قورئـانو بنەمایـەکی هەمیشەیی ی باوەڕداریتیشمان دەخاتە بەرچاو لەسەر ئەوەی بێگومان خـودا هـەر خۆی یارمەتی دەرو پشتیوانەو، ئەم سیفەتەش تەنها لە خوادایـەو، هـەر کەسـێك خودا پشتیوانو یارمەتیـدەری بێـت سـەرکەوتووە، هەرکەسـێکیش خـوا وازی لێ بێنێتو پشتیوانی نەبێت ئەما زەرەرمەندو سەرشۆرە.. سەرەنجامی پـشتیوانێتی ی خوداش بۆ هەر کەسـێك سـەرفرازیو سـەرکەوتنو خێروخۆشـیی ئـەو کەسـەیەو، لەڕۆژی دواییـشدا لـە لایـەن خـوداوە پاداشـتێکی فـرەی چـنگ دەکـەوێت. ئـەم مەسەلەیەش زیاتر لەبەسەرهاتی ئەو دوو پیاوەدا دەرکەوتووە، پیاوێکیـان بـاوەڕی بەخودا هێناوەو، پیاوەکەی هاوڕێیشی بێ باوەڕ بووەو ئیمانی بـەخودا نـەهێناوەو، شـانازیی بەهـەردوو ڕەزو باخەکەیـەوە کـردووە، پیـاوە باوەڕدارەکـە خـودای بـە یارمەتیدەرو پشتیوان داناوەو، خوازیاری پاداشتی لای خودا بووەو، خۆی لەسـەروو ماڵو دارایيو کەرەسە دڵڕفێنەکانی دنیـاوە دانـاوەو پێیـان نەخەڵـەتاوە، لـەکاتی گفتوگۆیشی لەگەڵ هاوڕێ دنیا پەرستەکەیدا پـێی گوتـووە: ﴿لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا

بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ ...﴿٤٠﴾ الكهف﴾، واتە (بەڵام من هەردەڵێم ئەو خودایە پەروەردگارمەو هیچ کەسێك ناکەمە هاوەڵ بۆی، تۆش کاتێك دەچیتە نێو باخەکەت بۆچی ناڵێیت: (ماشاالله)، ئەمە بەخواستی خوا دادەبینیت، کە بەماڵو منداڵ لەتۆ کەمترم، ئەوا بەدووری مەزانە کە پەروەردگارم لەو باخەی تۆ باشترم بۆ دابین بکات). ئەوەبوو سەرەنجامی باشو پاداشتی فرەو نەبڕاوەش بۆ ئەو پیاوە باوەڕدارە بووو، دیتی هەر خودا ﴿خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴾.. بەڕاستی باوەڕێکی تەواوی بە خودا هێنابووو، داوای یارمەتیی هەر لەخودا دەکردو، لەبەرئەمەش ڕزگارکار خودایەو، تواناو هێزو کۆمەکیش هەر لەخوداوەیە، جائەگەر منیش سەرکەوتووبووم، ئەمەش تەنها بەوە دەبێت، کە یارمەتیو کۆمەکی ڕاستەقینە بەمافی خودای حەقو پشتیوان بزانرێت. بەڵام کابرای بێباوەڕ غەیری خودای بەیاریدەدەرو پشتیوان دادەناو، پەنای بۆ غەیری خودا بردبووو شانازیشی بەغەیری خوداوە دەکردو، بەشتومەکی لای غەیری خوداوە سەرسام بوو و، تەنها سەری کردبووە سەر هەردوو ڕەزەکەیو گۆشەگیریان ببوو و بە نیعمەتەکانیان خرۆشابووو، خۆیشی بە کەسوکاری زۆرو سەروەتو سامانیەوە بادەدا.. ئەی داخۆ چیی لێوەیان دەسکەوتبێت؟ بێگومان هەموو ئەو شتانەی سەرقاڵی ببووو پشتی پێ بەستبوونو پێیانەوە دەنازیو گۆشەگیریان ببوو، لەچەند چرکەساتێکدا نەمان، ئیدی ئەم پیاوە بووە کەسێکی لاوازو بێ دەسەڵاتو خەمبارو سەرشۆڕو پەشیمانو حەسرەتکێشو، زەرەرمەندو گومڕا، هیچ کەسێکیش لەجیاتی خودا نەیتوانی سەرخەرو یارمەتیدەری بێت ﴿...فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ القصص ﴾.

بێگومان مێژووش گەلێك لەم نموونانەی لەخۆ گرتووە، کە ئەم حەقیقەتە قورئانیەو، ئەو بنەما باوەڕداریتییەشیان تێدا ڕەنگ دەداتەوە، چونکە (مێژوو)

زیانو بچووکیو لاوازیی ئەو کەسانەی بۆ تۆمارکردووین، کە جگە لە خودایان بە پاڵپشتو یارمەتیدەر بۆ خۆیان داناوە، ئەو کەسانەش وەك (قاروون)و (فیرعەون)و هەزارانی دی.

هەروەها مێژوو چەندین نموونەی کەسانی باوەڕداریشی بۆ تۆمارکردووین، کە هەر خودایان بەیارمەتیدەرو پشتیوانی خۆیان ناسیوەو، بەم هۆیەشەوە کۆمەكو سەرکەوتنو سەروەریو بەختەوەریو سەربەرزییان لەدنیادا (پێش ڕۆژی دواییش) بەدەست هێناوە. قورئانی پیرۆز، ئەم دوو نموونەیەی بۆ ئەوە خستۆتە بەرچاومان، تاکو خۆمان یەکێکیان هەڵبژێرینو، بشزانین چۆن هەڵی دەبژێرینو ئۆباڵی ئەو هەڵبژاردنەش لەئەستۆ بگرین. دەی ئایا پشتیوانێتیی خودا هەڵبژێرینو ڕووی تێ بکەینو بەتەمای پاداشتی لای ئەو بین؟! گەر ئەم لایەیان هەڵبژێرین، ئەوا بێگومان شوێن پێی پیاوە باوەڕدارەکەی نێو ئەم چیرۆکەمان هەڵگرتووەو، هەمان دەسکەوتی ئەویشمان (ان شاء الله) دەست دەکەوێتو، خێرو چاکەی خوازراویشمان بەردەکەوێت، هەر کەسێکیش جگە لە خودا پاڵپشتێکی دی هەڵبژێرێتو، لەمەدا شوێن پێی پیاوە کافرەکەی (خاوەنی دوو باخەکە) هەڵگرێت، ئەوا لەئاکام دا تەنها گلەیی لەخۆی دەکات، چونکە خۆی وادەبینێتەوە، کە هیچ هێزو تواناو پلەو پایەو دەسەڵاتێکی نەماوە، ئیدی لەو ڕۆژەدا پەشیمان دەبێتەوە، کە ڕۆژێکەو پەشیمانی تێیدا سوودی نیەو، ئەوێ ڕۆژێ زەرەرو زیانەکانیشی بێکۆتاییو نەبڕاوەن ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ الكهف ﴾..

# " مَثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا "

لەکاتێکدا دڵ ودەروونەکانی خەڵکیی ئاگادار لەم جۆرە بەسەرهاتانە، سەرنجی شێوازی گێڕانەوەکەی قورئان دەدەنو، چوونەتە نێو قووڵاییی ئەو سەرەنجامەی کە کابرای بێباوەڕی خاوەنی دوو ڕەزەکەی تێکەوتووەو، دوای ئەوەش (ئەم دڵو دەرونانەی خەڵکی) ئەو ڕاستییە بنچینەیەی ژیانی مرۆڤایەتییان بۆ دەردەکەوێت کە (بێگومان مافی پشتیوانێتیی حەقو ڕاستەقینە هەر بۆ خودایە)، لەم جۆرە کاتانەو لەسایەی ئەم ڕاستییانەدا خودا لە قورئاندا نموونەیەك لەژیانی دنیامان بەئاوێك بۆ دێنێتەوە کە لە ئاسمانەوە باراندوویەتی، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ الکهف ﴾.. واتە (ئەی پێغەمبەر نموونەیەکیان لەژیانی دنیا بۆ بهێنەرەوە وەك ئاوێك وایە کە لەئاسمانەوە باراندوومانەتە خوارەوەو هەموو جۆرە ڕووەكو دانەوێڵەیەکی لەزەویدا چێنراوی لێ بەرهەم هاتووەو لەدواییشدا هەمووی بووەتە پووشو پەلاشێکی بێنرخی وەها کە (با) پەرشو بڵاوی کردۆتەوە، بەم ڕەنگە خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە). خودا ئەم نموونەیەی لەقورئاندا لەو جێگەیەدا هێناوەتەوە کە لەدوای بەسەرهاتی پیاوی خاوەن دوو ڕەزەکەوە خستوێتی یە بەرچاومان، وەك بەدواداچوونێك بۆ چیرۆکی کابرا کە هەردوو ڕەزو باخەکەی لەچەند چرکەساتێکدا بۆ وێران کردووەو، لاپەڕەی وجودیانی پێچاوەتەوە لەکاتێکدا خاوەنەکەیان بەتەمای بەردەوام بوونیانو مانەوەیانو، لەناونەچوونیان بووە، جا هەموو ژیانی دنیاش لەم نموونەیەدا "بەکورتو خێراو بڕاوە" دەرکەوتووە، ئەمەش ئاوێکەو لەئاسمانەوە خودا

له‌ماوه‌ی چه‌ند چركه‌ ساتێكدا باران دوویه‌تی یه‌ سه‌رزه‌وی ورووه‌ك‌و سه‌وزاییه‌كانی زه‌وییشی له‌چه‌ند چركه‌ساتێكدا تێكه‌ڵ بووه‌و، پاشان هه‌ر ئه‌م ڕووه‌ك‌و سه‌وزاییانه‌ له‌ چه‌ند چركه‌ساتێكدا بوونه‌ته‌ پووش‌و په‌ڵاشێك كه‌ به‌هۆی باوه‌ په‌رش‌و بڵاوبوونه‌وه‌.

بێگومان ئه‌م نموونه‌ به‌رچاو خراوه‌ی، ژیانی دنیا له‌شریتێكی سینه‌مایی ی كورت‌و خه‌یاڵی دا، كه‌ به‌خێرایی‌و له‌چه‌ند ئه‌ڵقه‌یه‌كی كه‌م دا پیشان ده‌درێت، باس ده‌كات، ئه‌مه‌ش نموونه‌یه‌كه‌ بۆ چه‌ند دیمه‌نێكی كورت‌و خێرا له‌قورئاندا.

ئه‌وه‌تا ئاوه‌كه‌ له‌ئاسمانه‌وه‌ دێته‌خواره‌وه‌و، ڕووه‌ك‌و كشتوكاڵه‌كانیش تێكه‌ڵی بوون، (نه‌ك ئاوه‌كه‌ خۆی تێكه‌ڵیان بووبێت).. ئه‌مه‌ش له‌پێناوی خێرایی پیشاندانی نموونه‌كه‌دا، ئینجا دوباره‌ ڕووه‌كه‌كان وشك بوونه‌وه‌و، ده‌بنه‌ پووش‌و په‌ڵاشێكی وشكی دووراوه‌ی هاڕراو، كه‌ له‌ تۆپه‌ڵه‌یه‌كی بچووكدا خۆی ده‌نوێنێت‌و، كت‌وپڕ بایه‌ك دێت‌و په‌رش‌و بڵاوی ده‌كاته‌وه‌و له‌گه‌ڵ خۆیدا بۆ جێگه‌یه‌كی دووریان ده‌بات.

له‌و ئایه‌ته‌دا "پیتی -ف- (فاختلط به‌..) -و- (فأصبح هشیماً).." پیتی (فاء) له‌مانه‌دا بۆ ڕێكخستنی ڕووداوه‌كان‌و، به‌دواداچوونی كت‌وپڕیی یه‌ له‌ خێرا پیشاندانی دیمه‌نه‌كان‌و ڕیزبه‌ندی‌و ئه‌ڵقه‌كاندا. جا بۆ ئه‌وه‌ی به‌سه‌رنج دانی قووڵتره‌وه‌ بۆ خێرایی پیشاندان‌و كورت كردنه‌وه‌ی دیمه‌نه‌ پیشاندراوه‌كه‌ی ژیانی دنیا بڕوانین، نموونه‌یه‌كی تری قورئانمان به‌یاد دێته‌وه‌، كه‌ هه‌ر ده‌رباره‌ی ژیانی دنیا هێناویه‌تی یه‌وه‌، به‌ڵام دیمه‌نێكی درێژكراوه‌یه‌و، به‌پیشاندانێكی خاوی (دژی خێرا)و به‌چه‌ند قۆناغێكی هێواشه‌وه‌یه‌، ئه‌مه‌ش له‌و فه‌رمایشته‌ی خودادا هاتوه‌، كه‌ فه‌رموویه‌تی:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ ﴿٤٣﴾ النور﴾. واته: "ئایا نابینیت خودا

بە ئارامی یەوە هەورەکان بەئاسمان دا دەباتو، پاشان بەیەکیانەوە دەبەستێتەوەو، ئینجا لەسەر یەك کۆیان دەکاتەوەو، بەم ڕەنگە دەبینیت لەو هەورانـەوە (کـە وەك چیاکان دەرکەوتوونو هەروەك چیاکانیش دۆڵو شێو لە نێوانیـان دا هەیـە) بـارانو تەرزە دەبارێنێتو لەسوودی ئـەو بارانـە خـودا بەخواسـتی خـۆی بەشـی خـەڵکی دەداتو، بەشی خەڵکانێکی تریش (هەر بەخواسـتی حەکیمانـەی خـۆی) نـاداتو لێیان دوور دەخاتەوە، هـەوره تریـشقەکانیش هێنـده بـەهێزو بروسـكەدارن، کـە خەریکە برووسکەکانیان بینایی چاوانی تەماشاکارانی نەهێڵێت).

بێگومـان دیمەنەکـەی نێـو سـوورەتی (کهـف)، کـە دەربـارەی ژیـانی دنیایـە بەخێرایی‌و بەکورتی پێشان دراوەو لەگەڵ کەش‌و دۆخی دیمەنەکەدا ڕێك کـەوتووەو، هەروەها لەگەڵ ئەو شوێنەو شێوازەی، کە تێیدا پشتی پێ بەستبوون، کـە لەچـەند چرکەساتێکدا نەمانو، کە بەشێك بوون لەژیانی دنیا.

جا وەك چۆن ئەو دوو باخە لەچەند چرکە ساتێکدا نەمانو وێران کران، بەهەمان شێوە ژیانی دنیاش لەچەند چرکەساتێکدا نامێنێـت، خـاوەنی هـەردوو باخەکـەش چۆن هەموو شتێکی لەنێوانیاندا بەدەستەوە نەما، بەهەمان شێوە هـەر کەسـێکی تریش خۆی تەنها سەرقاڵی دنیا بکاتو خودای پەروەردگاری لەبیر بچێتەوە، ئـەوا هەموو شتێکی تێدا لەدەست دەدات، چونکە پەنا دەباتە بەر سـێبەرێکی بـڕاوەو، ماڵو سامانێکی ڕۆیشتوو و، خەوو خەیاڵێکی تەفرە دەر.

جا ئایا ئەم نـمایشەی، کە ژیـانی دنیـای بـەخێرایی‌و بـەکورتی تێـدا پیـشان دەدرێت، خەیاڵییە، یان واقیعییە؟ ڕاستەقینەیە، یان مەجازی‌و پێوانەکاری؟

بێگومان واقیعی‌و ڕاستەقینەیەو، لەژیاندا ڕاستگۆیی‌و بوونی هەیە، ئیدی دنیا بەهـەموو شـێوەو جۆرەکانیـەوە، بەبـەراورد لەگـەڵ ژیـانی ڕۆژی دواییـدا لـەچ ئاستێکدایە؟ ئەی داخۆ تەمەنی مرۆڤ چەند بێت، کە تێیدا دەژی؟ ئەی داخـۆ ئـەو تەمەنە لەئاست دنیاشدا بە چ بەراوردێك هەڵسەنگێنرێت؟ ئەی داخـۆ بـە بـەراورد

لەگەڵ ژیانی نێو قیامەتو ڕۆژی دواییدا چۆن بەراورد بکرێت؟ بەڕاستی هێندە جێی بەراوردو شایانی باس نیە، چونکە کورتو کورتە. خێراو خێرایە.. بەڕاستی ژیانێکی کورتو بێ بەهایە.. هەر لەم ڕووەوە خودا فەرموویەتی: ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡۚ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿٤٥﴾ يونس ﴾. واتە: (خودا ئەوان لەڕۆژێکدا کۆ دەکاتەوە کەوا هەست دەکەن گوایە تەنها یەك سەعاتی ڕۆژێکیان لەژیاندا بەسەر بردووەو، لەنێو خۆیشیاندا خزمو ئاشنایان یەکتر دەناسنەوە. بێگومان زیانبارن ئەو کەسانەی، کە بڕوایان بە دیداری خودا نەبوەو شارەزای ڕێگەش نەبوون.

هەروەها خودا فەرموویەتی: ﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١٤﴾ المؤمنون ﴾. واتە: "خودای گەورە لەقیامەتدا لەکافران دەپرسێت: ئەرێ ئێوە چەند ساڵ لەسەر زەوی مانەوە؟ ئەوانیش لەوەڵامدا دەڵێن: ڕۆژێك، یان ماوەی هەندێك لەڕۆژێك لەژیانی سەر زەویداماینەوە (بەمانای ژیانی دنیا هێندە کەمە، لە قیامەتدا وادەزانن) دەی پرسیار لەو کەسانە بکەن، کە زانیارییان لەسەر حسابی کاتو ڕۆژگار هەیە، ئینجا خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: "بەڕاستی مانەوەی ئێوە لەدنیادا ماوەیەکی هێجگار کەم بووە، ئەگەر بەچاکی بتانزانیایە".

هەروەها خودا فەرموویەتی:

﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴿٢﴾ التكاثر ﴾. واتە (ئەی خەڵکینە زۆرکردنیماڵو سامانو دارایيو بیناسازییتان، ئێوەی لەزیکری خوداو بەندایەتی سەرقاڵ کردوەو، بێئاگای کردوون، تا ئەوکاتەی دەمرنو دەبرێنە نێو گۆڕەکانتان).

# "زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا"

دوای ئەوەی قورئانی پیرۆز کورتیی ژیانی دنیاو خێراییی بەسەر بردنیو بەسەرچوونیی ڕوون کردۆتەوە، ئەوەشی بۆ ڕوون کردووینەوە کە ئەوەی (لە ماڵو سامانو کوڕو نەوەو کەرەسەی هەمەڕەنگ) تێیدایە خۆشییەکی کەموبڕاوەیە، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ﴾. ئەمەش هەمدیسان ڕاستی یەکی بەڵگەنەویستی قورئانە کەوا ماڵو کوڕو نەوە، یان باشتر بڵێین (ماڵو منداڵ) هەموو ژیانی دنیا نیین، هەروەها گرنگترین شتی نێو ژیانی دنیاش نیین، بەڵکو جوانیو ئارایشتی ژیانی دنیان، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە بەم چاویلکەیە بۆی بڕوانینو لەسەر ئەم بنچینەیەش مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. وشەی (زینة) لەو ئایەتەدا ئەم واتایە دەگەیەنێتو ئەو سێبەرەش دەنیشێنێت، چونکە مانای (زینة) ڕووکاری دەرەکی ی شت دەگەیەنێت کە بۆ جوانیو ڕازاندنەوەو چێژی هونەریی جوانکاری یە، بەڵام بەشێك نیە لەڕاستی یەکانی مەسەلەکەو لەبنچینەکانی.

(ئیمام راغیبی ئەسفەهانی) لەکتێبی (مفردات)ەکەیدا دەربارەی وشەی (زینة) گوتوویەتی: "زینەتو جوانکاریی ڕاستەقینە ئەوەیە مرۆڤ لە هیچ شتێکی بارودۆخو حاڵەتەکانی، نە لە دنیاو نە لە ڕۆژی دواییدا ناشیرین نەکات، بەڵام ئەوەی لە جۆرە حاڵەتێکی تایبەتیدا زینەتێکی پێ بداتو لە حاڵەتێکی تردا پێی نادات، ئەوە لەبۆتەی ناشیریندایە. هەروەها بەپوختیو بەکورتی (زینەتو جوانکاری) لە سێ باردایە:-

١- جوانکارییەکی دەروونی: وەك زانستو بیروباوەرە جوانەکان.

٢- جوانکارییەکی جەستەیی: وەك هێزو درێژیو باڵاو بەژن ڕێکی.

٣- جوانکاری یەکی دەرەکی: وەك ماڵو پلەو پایە"[١].

بەڵام خۆ دانانی (ماڵو منداڵ) بەجوانکاریی ژیانی دنیا، مانای پشتگوێ خستنیانو واز لێهێنانیان ناگەیەنێت بەو بیانووەی گوایە تەنها بۆ جوانیو زینەتی ژیانن، بەڵام لەوانەیە ببنە هۆی باوەڕنەهێنان بەخوداو، خاوەنەکەیان لە ڕووکردنە خودا دوورخەنەوە.

دیارە مرۆڤی موسڵمان ئەوەی لێ خوازراوە کە مامەڵەو هەڵسوکەوت بەجوانکاریی ماڵو منداڵەوە بکاتو، بەڵام تێڕوانینی بۆیان بەگوێرەی فەرمانەکانی قورئانو حەقیقەتەکانی بێت. مامەڵەو ڕەفتاری بەم دوو دیاردەیەوە لەسەر ئەو بنچینەیە بێت کە تەنها جوانیو زینەتێکی دنیان، جوانکاری یەکن بۆ ڕازاندنەوەی ژیانو باش کردنیو سوود لێ دیتنیان بەخۆشی، دەنا خۆنابێت لەم بارستایی یە گەورەتری پێ بداتو ڕۆڵێکی لەمە گەورەتریشیان بۆ دانەنێت. واتە بۆی ناشێت کە ماڵو منداڵ (المال والبنين) بەهەموو شتێك دابنێت لەژیاندا، یان لەخودای دوور بخەنەوە، یاخود لەجیاتی خودا پشتی پێیان ببەستێت.

ئەم دوانە (ماڵو منداڵ) زینەتن، وەك زینەتیش مامەڵەیان پێوە بکاتو، وەك زینەتیش بۆیان بڕوانێتو، هەڵسوکەوتیشیان وەك زینەت پێوە بکات.. خوداش لەمبارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ آل عمران ﴾

واتە: (خۆشویستنی ئارەزووەکان لەئافرەتو بوونی کوڕو نەوەو، لەهەبوونی زێڕو زیوی زۆرو لەسەریەك دانراوو، لەئەسپی ڕەسەنو چاكو لەمەڕو ماڵاتو لە

(١) المفردات : ٢١٨.

زەویوزاری کشتوکاڵی، بۆ خەڵکی جوانو ڕازێنراونەتەوە، ئەمانەش هەموویان کەرەسەی خۆشیو نازو نیعمەتی ژیانی دنیان، خوداش باشترین شوێنی گەڕانەوەی بۆ عەبدەکانی سازو ئامادەکردووە).

وەسف کردنی ماڵو منداڵ بە (جوانیو زینەتی ژیان) سێبەرێکی گونجاوی تر بۆ ئەم دۆخەو بۆ ئەو شوێنەی، کە ئایەتەکەی تێدا لەبارەوە هاتۆتە خوارەوە، دەخولقێنێت، ئەویش مەسەلەی لەناوچوونی هەردوو ڕەزەکەو وێرانبوونیانە، کەواتە (زینەت) مانای نەمانی شتەکەو لەناوچوونی دەگەیەنێت، نەك مانەوەیو جێگیر بوونیو بەردەوامیی، هەروەها قورئان لەجێیەکیتردا ماڵو منداڵی بە (گوڵی ژیانی دنیا) وەسف کردوون، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴿١٣١﴾ طـه ﴾، واتە: (ئەی مرۆڤی خاوەن باوەڕ چاوەکانت مەبڕە لەو نازو نیعمەتەی، کە بەهەندێك خەڵكمان داونو کە زینەتو جوانیی ژیانی دنیاو: کە "گوڵی ژیانی دنیان" تاکو بەوە تاقییان بکەینەوە).

کەوابوو گوڵیش تەمەنی کورتەو بەخێرایی دەژاکێتو سیس هەڵدەگەڕێتو دەمرێت، زینەتو جوانکارییش، ماوەکەی کەمەو بەخێرایی نامێنێتو لەناودەچێت، بەم ڕەنگەش ماڵو سامان سێبەرێکی بڕاوەنو، منداڵو نەوەش بەخششێکی پێدراوو سەنراوەن. جا ئاخۆ ئەو کەسانەی پەنا دەبەنەبەر ئەم سێبەرە دوابڕاوو بەسەرچووی، کە (پێیان دراوەو لێیان سەنراوەتەوە) چەندە خەسارەتمەندو ڕەنجەڕۆن.

## "وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ"

جا ئەگەر ماڵو منداڵ جوانیی دنیا بن، ئەوا قورئانی پیرۆز ڕێنموونییمان دەکات بۆ شتێکی جێگیر لەدنیادا کە شایانی ئەوەیە هەموو گرنگیو بایەخێکی پێ بدرێتو، تەمەنی تێداو لەپێناودا بەسەر ببرێتو، کاتو ڕۆژگاریشی بۆ تەرخان بکرێت، وەك خوداش فەرموویەتی: ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾.. لێرەدا ئەوەی بەمەبەست گیراوە (الباقیات الصالحات)ە لەدوای دیاریکردنی زینەتی ژیانی براوەی دنیاو، لەبەدواداچوونی بەسەرهاتی هەردوو ڕەزە وێرانکراوەکەو، زیانمەندیی خاوەنەکەیاندا.. جا ئەگەر ماڵو منداڵ جوانیەکی براوەبن، ئەی چی هەیە کە مابێتەوە؟

دەی باشە ئەوا هەردوو باخەکەی سەر زەوی نەمانو لەناو بران، ئەی چی ماوەتەوە؟ وەڵام (الباقیات الصالحات) ئەو نیەتە چاکانەو ئەو کردەوە باشانەن کە دەمێننەوەو کە لە لای خودا پاداشتی تەواویان هەیەو، کە خاوەنەکەیان باشترین پاداشتو زۆرترینو جوانترین پاداشتی دەدرێتەوە.. ئەمەش باشترین هیوایە (خیر املاً) واتە باشترین شتێکە کە خاوەنەکەی هیوای بۆ دەخوازێتو ئەگەر هیوای لەسەر هەڵچنی ئەوا ئەو هیوایە ون ناکات، هەمدیسان ئەگەر بەتەمای شتێك بوو، ئەوا بێ ئومێدو هیوا بڕاو نابێت.

ئاخۆ (الباقیات الصالحات) لەم ئایەتەدا چی بن؟! زانا پێشینەکانی ئیسلام لەم بارەیەوە چەند وتەیەکی لێك نزیكو هاوشێوەی یەکدییان دەربڕیوە، بۆ نموونە (ابن عباس)و (ابن جبیر)و پتر لە زانایەکی پێشین دەربارەی (الباقیات الصالحات): (چاکە ماوەکان) گوتوویانە: " (ئەو کارە چاکانەی کە دەمێننەوەو ون نابن/

الباقیات الصالحات) پێنج نوێژە فەرزەکەن". هەر لە (ابن عباس)یشەوە گێڕراوەتەوە، گوتوویەتی: (ئەم کارە چاکانە گوتنی زیکرەکانی: (سبحان الله و، الحمد لله و، لا اله الا الله و، الله أكبر)ن.

لە (عثمانی کوڕی عفان)یشەوە ﷺ گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (ئەوە گوتنی زیکرەکانی سبحان الله و، الحمد لله و، لا اله الا الله و، الله أكبر و، لاحول ولا قوە الا بالله العلي العظيم)ن.. هەروەها لە (ابن عباس)ەوە وتەیەکی تریشی گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (ئەوە وتە جوانو چاکەکانن). لە (عبدالرحمنی کوڕی زیدی کوڕی اسلم)یشەوە گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی: (الباقیات الصالحات) تێکرا هەموو کردەوە چاکەکان دەگرێتەوە)[1].

جا ئەگەر بەوردی سەرنج لەم وتانەی پێشوو بدەین، دەبینین هەموویان لێك نزیکنو هاوواتای یەکدیین، نەك پێچەوانەی یەکدی، هەروەك دەشێت کە پێکیانەوە بلکێنین بەو پێودانگەی هەموویان باسی کارە چاکە بەردەوامەکان دەکەن کە لەدواییدا دەمێننەوە. چونکە هەر یەکێك لەو زانایانە ئاماژەیان بۆ نموونەیەکیان کردووە، دیارە هەموو نموونەکانیانو بەچەندین نموونەی هاوشێوەی تریانەوە تێکرا بەکۆی هەموویان (الباقیات الصالحات) پێك دەهێنن. (الباقیات الصالحات)یش کردەوە باشەکانن، بەگشتی هەموو ئیسلامن بەرێو ڕەسمە عیبادییەکانو بەیاساو شەریعەتو ڕەفتارو مامەڵەکانەوە. قورئانیش ئەمانەی بەکارە چاکەماوەکان (باقیات) داناوە، چونکە لەڕاستیدا ماونو لەلای خودا دیارن.. هەروەها لە شوێنەواری ژیانی خاوەنەکەیاندا دەمێنن. هەروەك کە لە قووڵبوونەوەی میزاجو تێڕوانینو قەوارەی گیانو کەسێتییەکەشیدا دەمێنن، پاشان لەنێو کۆمەڵگەو دابو نەریتەکانیدا دەمێنن.. هەروەها لەتەرازووی ڕۆژی یارمەتیشی دا بۆ خاوەنەکەی دەمێنن، پاشان لەکاتێکدا -بەیارمەتی خودا- ئەو کەسە شایستەی چوونە

---

(١) (ابن كثير/ ٣: ٨٥-٨٧) بەکورتی.

بەهەشت دەكەن، دەمێنن كە بێگومان لەنازو نیعمەتی هەمیشەییدا دەبێـتو، لـە نەمریی هەمیشەیی نێو باخەكانی بەهەشتیشدا دەبێـت.. ئـەم كـارە چـاكە مـاوو بەردەوامانەش پێویستە گشت موسڵمانێك بایەخی پـێ بـداتو ڕووی تـێ بكـەنو بەشێوەو بڕێكی زۆر زۆر ئەنجامیان بدەن.

## پوختەی گرنگتـرین وانەو ئاماژەكانی ئەم چیرۆكـە

١- چیرۆكی كابرای خاوەنی دوو باخەكە چیرۆكێكی ڕاستەقینەیەو لـە زەمـەنێكی ڕابردوودا ڕووی داوەو، بەسەرهاتێكی دەسهەڵبەستی خەیاڵی نیە.

٢- شیكارو درێژەی چیرۆكەكە نەزانراوەو لەو نەزانراوانەشە كە ناشێت هەوڵی ڕوون كردنەوەیان بدەین، هیچ زانیاری یەكیش لەم بارەیـەوە پەسـەند ناكـەین تـەنها ئەوە نـەبێت كـە لـە قورئانـەوە دەربـارەی هـاتووە، چـونكە لـە پێغەمبـەری خوداشەوە ﷺ هیچ شتێكی وای لەسەر نەگێڕاوەتەوە.

٣- هێنانەوەی نموونەكان لە قورئاندا واتا تیۆری (نظري)یەكان لە دەروونی بەشەری نزیك دەكاتەوەو ئەو مانایانەش كە نموونەیان لەسەر هێنراوەتـەوە پتـەوو بـەتین دەكات.

٤- هەردوو پیاوەكە لەم چیرۆكەدا (ئیماندار)و (بێئیمان)ەكە، دوو نموونەی مرۆیـی دووبارە بووەوەن كە لە هەموو كاتو شوێنێكدا وجودیان هەیە.

٥- پێویستە بانگەوازكاران سوود لـە شـێوازی بانگـەوازو ڕوونكردنـەوەی قورئـان وەرگرن، ئەمەش بەو ڕەنگەی كە چیـرۆكو بەسـەرهات بێننـەوەو نموونـەكان بخەنە ڕوو.

٦- خودا مۆڵەت بەکافر دەدات‌و نیعمەتێکی زۆریشی پێ دەدات، ئەمەش بۆ هەڵسەنگاندن‌و تاقیکردنەوەیەتی، نەك بەڵگەیەکی خۆشویستنی خوداو لێ ڕازی بوونی بێت.

٧- بێگومان خودا مرۆڤی ئیمانداریش بەوە تاقی دەکاتەوە کە ڕزق‌و ڕۆزیی لێ کەم‌و گران دەکات‌و، ماڵو سامانی بڕاوەی دنیای لێ دەشارێتەوە، ئەمەش مانای ڕق هەستانی خوداو تووڕەبوونی لەو کەسە نیە، چونکە دارایی دنیا لەلای خودا ساناترە لەوەی ببێتە بوارێك بۆ ڕێزلێنان، یان بۆ سووکایەتی پێکردن، خوداش بەخواستی خۆی دنیا بەکەسانێك دەدات، سا ئیتر ئەو کەسانەی خۆش بوێتیش یان نا، بەڵام ئایین تەنها بەکەسانێك دەدا، کە خۆشیانی بوێت.

٨- خودا هەر خۆی ڕزق‌و ڕۆزی‌و نیعمەت دەبەخشێت، دەنا هەوڵو کۆشش‌و تێفکرین‌و پرۆژەو ماڵو سامانەکانی مرۆڤ تەنها چەند هۆکارێکی ماددیی‌و ڕواڵەتیین.

٩- لەقورئاندا سەرنجێکی هونەرییانەی کشت‌وکاڵی هەیە، دەربارەی شێوازی ڕێکخستنی ڕەزو باخ‌و باخچەکان‌و بێستانەکان.. ئەوەش لەو گێڕانەوەیەی چیرۆکەکەدا بەدیار دەکەوێت، کە باسی ڕێکخستنی کێڵگەو بەروبوومی نێو هەردوو باخەکە دەکات.

١٠- بایەخدان بەزەوی‌و ڕێکخستنی چاندنی‌و ڕێك دانانی کێڵگەو دارو درختەکانی، چێژێکی هونەریی دەبەخشێت‌و، دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرهەم‌و بەروبووم تێیدا.

١١- زەوی ستەم لەباخەوان ناکات‌و بەروبوومی لێ قەدەغە ناکات، بەڵکو بە بێ جیاوازیی‌و جیاکردنەوەی ئەم‌و ئەو، بەرهەمی خۆییان پێ دەدات، کەچی وێڕای ئەوەش خەڵکانێکی کافرو بێباوەڕ، ستەم دەکەن‌و کافرو سپڵە دەردەچن بەرامبەر بەخوداو، بەرهەمەکانیش لە کەسانی تر قەدەغە دەکەن. جا ئایا ناتوانن لەو بەخشینەدا لاسایی زەوی بکەنەوەو بیکەن بە پێشەنگ بۆ خۆیان؟

١٢- خاوەنە کافرەکەی هەردوو باخەکە بەهۆی خۆ بەزل زانیو لەخۆبایی بوونەوە چاوەکانی لەئاست دیتنی ڕاستی یەکاندا کوێر ببوون، بۆیە بەڕەفتارێکی خەڵەفاویو تەفرە خواردووانەوە دەجووڵایەوە.. هەر کەسێکیش بەهۆی دیاردەکانی دەوڵەمەندیو ماڵو سامانی براوەی دنیایی یەوە لەخۆی بایی بێت وەك ئەو وایەو هەمان نەریتو ڕەفتاری هەیە.

١٣- یەکێك لەو دیدو بۆچوونە گومرایی یانەی لەخۆبایی بووان ئەوەیە وا گومان دەبەن گوایە خودا لەڕۆژی قیامەتیشدا بەماڵو سامانیان ڕێزیان لێ دەنێت، چونکە گوایە لەدنیاش دا ڕێزی لێ ناون، گومانیشیان وایە گوایە خودا لەقیامەت دا ڕێز لەباوەڕداران نانێتو پاداشتی نەبڕاوەیان ناداتەوە، چونکە لەدنیادا ماڵو سامانو دیاردە جوانەکانی دەسرۆیشتوویی دنیای لێ قەدەغەکردوون.

١٤- (باوەڕداریتی) زمانەی دڵنیایی (صمام الامان)ە بۆ خاوەنەکەی، چونکە بەئیمانەکەیەوە سەربەرزەو، بەپەروەردگاریشیەوە شانازی دەکات، ئیدی لاوازو سەرشۆڕنابێتو لەبەردەم خاوەن ماڵو سامانەکانیشدا ترسنۆك نابێت، تەنانەت هیوای ئەوەش ناخوازێت کە وەك ئەوانی لێ بێت.

١٥- پێویست بوونی ئامۆژگاری کردنی ئەو کەسانەی لەخۆبایی بوونو بەنازو نیعمەت هەڵخەڵەتاون، هەروەها پێویستی ی ئاگادارکردنەوەشیان لەسەرەنجامی ئەو ڕەفتارو نەریتانەی کە هەیانەو، داواشیان لێ بکرێت کە سوپاسی فەزڵو چاکەکانی بکەنو کەدەبێت نیعمەتو بەخششەکانی خودا لەگوێرایەڵی ی فەرمانەکانی خودادا بەکاربهێنن.

١٦- ڕێسایەك لە ڕێساکانی تێڕوانینی ئیسلامی ئەوەیە، کە هیچ شتێك بەبێ ویستو ئیرادەی خودا نایەتە کایەوە، هەرچی خوداش بیەوێت دەبێتو، هەرچییەکیش خودا خواستی لەسەر نەبێت نابێت، هیچ هێزێکیش نیە تەنها

لەخوداوە نەبێت، هەرکەسێکیش خودا هێزو توانای پێ نەدات، ئەوا هیچ هێزو توانایەکی نیە.

١٧- وشەکانی (ماشاءالله)و (لا قوة إلا بالله) بڕگەیەکی باوەڕداریتییانەی قورئانن کە مرۆڤی باوەڕدار لەکاتێکدا (بەدیتنی کەس‌وکارێکی یان کوڕێکی یان مالّو سامانێکی) سەرسامو دڵشاد بێت، دەیانڵێتەوە. بەم ڕەنگەش سوپاسی خودا دەکاتو، هەوڵ بۆ بەردەوامیی نیعمەتەکانی دەداتو، لەکاری جیّی ڕەزامەندیی خوادا بەکاریان دێنێت.

١٨- سزای خودا هەر تووشی لەخۆبایی یەکان دەبێتو، بەو سزایەش هەر مالّو نازو نیعمەتێکیان هەبێت لەناو دەچێت، ئەوەش سزای کردەوە نابەجێکانیانە.

١٩- لەوانەیە بۆچوونو لێکدانەوەو مەزەندەکارییەکانی خەڵکی (دەربارەی ئەو کارەساتو مەینەتییانەی بەسەر کافرە لەخۆباییەکاندا دێت) لێك جوداو جیاوازبن، بەڵام دەبێت لەوەدا یەك دەنگ هاوڕێ بن، کە ئەو کارەساتانە بە فەرمانی خودا وەك سزایەك بۆ دوژمنانی خودا نازل دەبن لە بەرامبەر کردەوە خراپەکانیاندا.

٢٠- کاتێك نیعمەت نامێنێتو ڕزقو ڕۆزی لەنێو دەبرێت، مرۆڤی کافرو لەخۆبایی تووشی حەسرەتو پەشیمانی دەبێت، بەڵام لە وەختێکدایە کە پەشیمانی سوودی نابێت.

٢١- مرۆڤی لەخۆبایی لەکاتی سزاو مەینەتییەکانیدا ڕاستیی ئەو سەرەنجامەی بۆ دەردەکەوێت کە پێشتر لەلایەن پیاوچاکانو ڕێنماکارانەوە لێیان وریا کرابۆوە، بۆیە لەو کاتەدا خۆزگە دەخوازێت کە بڕوای پێ بکردنایە، بەڵام ئەم خۆزگەیەی قەت بەدی نایەت.

٢٢- پشتیوانێتیی ڕاست تەنها بۆ خودایەو، هەر کەسێك شانازیی بەخوداوە بکات ئەوەی دەیەوێت لەلای خودا دەستی دەکەوێت، هەر کەسێکیش شانازی

بەغـەیری خـوداوە بکـات، سەرشـۆڕو زیانمەنـد دەبێـت. هـەموو لایـەنگرو شوێنکەوتوانی خوداش خۆیان بەتەنیا توانای بەدەستهێنانی سەرکەوتنو سوود وەرگرتنیان نیە، هەموو هێزو دیاردەو هۆکـارو شـتەکانی تـر لەئاسـت توانـاو ئیرادەو سەربازانی خودادا دەستەوسانن.

٢٣- بێگومـان هـەر کەسـێك لەگـەڵ خـوادا بێـت، هـیچ شـتێك لـە حەقیقـەت نادۆڕێنێت، تەنانەت گەر هەموو دنیاو نیعمەتەکانیـشی لەدەسـت بـدات، خـۆ ئەگەر هەر کەسێك لەگەڵ خوادا نەبێت، ئەوا هیچ شتێکی دەسـت نەکـەوتووە، تەنانەت گەر خاوەنی هەموو شتەکانی نێو دنیاش بێت.

٢٤- ژیانی دنیا خێراو کورتو بڕاوەیـە، ئـای چـەند خەسـارەتمەندە ئـەو کەسـەی سەرقاڵی دنیا دەبێـتو پـشتی پـێ دەبەسـتێت، ئەمـەش ڕاسـتی یـەکی ڕەگ داکوتاوە.. جا داخۆ چەندی لەسەر بژیو چەندی لێ کۆبکاتەوەو، دوای ئـەوەش چی ڕوودەدات؟!

٢٥- هەموو ماڵو سامانو نیعمەتی دنیاو ئەوەی لەدنیادایە زینەتو ئارایشتێکن بۆ دنیا، پێویستیشن بۆ ژیانو جوانکردنی ژیان، هەروەها بۆ ئێمەش پێویـستن، تا لەژیان دا بژین.. بەڵام شیاو نیە، کە بیکەینە گەورەترین خەمانو، فراوانترین ئەڵقەی پێزانینمانو، بەهەموو شتێکی خۆمانی دابنێین.

٢٦- دانانی هەرچی لەدنیادایە (بەجوانیو بەگوڵ) دەلالەت لـە کـورتیو نـەمانی دەکات، وەك (جوانیەکە لەنەمانی دا)و (گوڵەکەش لە کورتیی تەمەنیـدا) دەی ئاخۆ چەند زەرەرمەندن ئەو کەسانەی، کە دنیا بە هەموو شتێك دادەنێن.

٢٧- پێویستە مرۆڤی موسڵمانی عـاقڵ، بایـەخ بـە مەسـەلە بنـچینەیی یـەکان بداتو، ئەوەی ماوە (باقی)یە بیخاتـە پـێش نەماوەکـە (زائـل)ەوە، هـەروەها ئەوەی جێگیرە، بیخاتە پێش ڕۆیشتووەکەو، دوایین بخاتە پـێش هەوەڵێنـە تیـژ تێپەڕەکەو، ئیدی بەزۆریی ئەو کردەوە چاکانە ئـەنجام بـدات، کـە لەئاینـدەی ژیانیدا سوودی پێ دەگەیەننو، لەکاتی ئاتاج پێیاندا ئەنجامیان دەچێنیتەوە.

٢٨- خواپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداو کردەوەی باش لە چاکە ماوەکانن (الباقیات الصالحات)، ئەمەش لەڕووی پاداشتی لای خوداوە بەخێرو بەرەکەتن، لەڕووی هیواو ئاواتەکانی خاوەنەکەشیانەوە هەر بەخێرو بەرەکەتن، بۆیەش بەخێرو بەرەکەتن، چونکە خاوەنەکەی لەبەردەمی خۆی لە ئایندەدا دەیانبینێتەوەو، ئاواتەکانیشی بە وەدی هێنراویی دەبینێتەوەو، پاداشتی فرەو زۆرو جوانیشیان لەسەر دەبینێتەوە.

# چیـرۆکی سـێیـەم

## چیـرۆکی ( مووسا )[١] لەگەڵ ( خـدر ) دا ـ سڵاوی خودایان لێ بێت ـ

ئەم چیرۆکە لە قورئاندا بەم جۆرە گێڕراوەتەوە، کە خودا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ
حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾
فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَـٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ
أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَـٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ
وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا
﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَـٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾
قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ
مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ
صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ
لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا

---

(١) شیکارو لێکدانەوەی ئایەتەکان لە یەکەبەیەکەی بڕگەکانی ئەم چیرۆکەدا بەدرێژی دیاری کراون بۆیە لەسەرتاوە تەرجەمەیەکی کورتی ئایەتەکانمان بەپێویست نەزانی.. (وەرگێر).

لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا
تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن
تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن
لَّدُنِّي عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا
فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾
قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا
السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ
سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا الْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا
وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا الْجِدَارُ
فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ
رَبُّكَ أَن يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي
ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾ الكهف ﴾.

## چیـرۆکەکـه له فەرموودەی پێغەمبـەردا ﷺ

ئێمه لەباسی ئەم چیرۆکەدا ئەو شێوازی بەرنامه ڕێژییه زانستییه دەگرینەبەر کە زانایان بڕیاریان لەسەرداوەو کە داوایان له لێکۆڵیارانی چیرۆکی پێشینەکانی نێو قورئانیش کردووه کە پێوەی پابەندبن‌و ڕەچاوی بکەن، ئەمەش پێویستیی پەنا بردنەبەر فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺو، هەروەها پێویستی تێنەپەڕاندنی ئەم سنووره بۆ ئەفسانه ووته دروستکراوەکانی جوولەکەو دەقەکانی (ئیسرائیلیات)و چیرۆکه نەسەلمێنراوەکان، دەردەخات. لەچیرۆکی (مووسا) لەگەڵ (خدر)دا ـ سلاویان لێ بێت ـ پێغەمبەری خودا ﷺ چەند لایەنێکی لێ ڕوون کردۆتەوەو چەندزانیاریەکی تری خستۆته پاڵ گێڕانەوەکەی قورئان. زۆربەی زانایانی فەرموودەش له کتێبەکانیاندا، چەندین فەرموودەیان لەم ڕووەوه دیاری کردووه. فەرموودەکانی تایبەت بەم چیرۆکه، له کتێبەکانی (بخاری)و (مسلم)وو (ابو داود)و (ترمذي)و (نسائی)و (ابن ماجه)و (احمد)و (الحاکم)و ئەوانی تردا هاتوون.

هەروەها چەند زانیاریەکی تری ئەم چیرۆکه له کتێبەکانی مێژووشدا هاتوون، وەك کتێبی (تأریخ الطبري)و (ابن کثیر)و (ابن اثیر)و ئەوانی تر.. زانایانی تەفسیریش لەکاتی باسکردنی ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەدا ئاماژەیان بۆ زانیاریەکان کردووه. لێرەشدا ئەوەی لەلای ئێمه گرنگ‌بێت ئەو فەرموودەڕاست‌و (صحیح)انەیه کە لەم ڕووەوه هاتوون، تەنها بەو فەرموودانەشەوه پابەند دەبین، کە هەردوو زانای گەوره (الشیخان)، (بخاري)و (مسلم) لەسەر ڕاستی‌و (صحة)یان کۆکن.

ئیمامی (بوخاری) لەچەندین جێگەی (صحیح)ەکەیدا، کە به کتێبی (صحیح البخاري) ناسراوه، ئەم چیرۆکەی له ڕوانگەی فەرموودەکانەوه هێناوەو، چەندین بەش‌و (باب)ی له (کتاب العلم)و (في الاجازة)و (في الشروط)و (بدء الخلق)و (في الانبیاء)و (في التفسیر)و (في الایمان والنذور) و (في التوحید) بۆ تەرخان کردوه.

ئیمامی (مسلم)یش لە (كتاب الفضائل)، (باب فضائل الخضر) (عليه السلام)دا فەرموودەکانی تایبەت بەم چیرۆکەی (تەخریج) کردووە ئێمەش پوختەی فەرموودەگێڕراوەکانی نێو هەردوو کتێبەکەی (بخاري)و (مسلم) کە بە (الصحيحين) ناسراون، دێنینەوە.

(بخاري) و(مسلم) لە (عبیداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی عتبەی کوڕی مسعودی کوڕی عبداللەی کوڕی عباسەوە ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ گێڕاوێتیانەوە کە (ابن عباس) خۆیو (حری کوری قیسی کوڕی حصنی فزاری) لەسەر هاوەڵەکەی (مووسا) ـ سڵاوی لێ بێت ـ هاوڕێ نەبوونو هەریەکەیان کەسێکی دیاریکراوی بۆ داناوە، بەڵام (ابن عباس) گوتوویەتی: (ئەو هاوەڵە خدرە) لەوکاتەدا (ابی کوڕی کعبی انصاری ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ بەلایان دا تێپەڕیوەو (ابن عباس)یش بانگی کردووەو پێی گوتووە ئەی (أباء الطفيل)وەرە بۆلامان، وا منو ئەم هاوڕێیەم مشتومڕمانە لەسەر هاوەڵەکەی (مووسا) کە مووسا داوای چۆنیەتی ناسینو پێگەیشتنی کردبوو، جا ئایا تۆ هیچت لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ نەبیستووە کە دەربارەی ئەوپیاوە باسی فەرموبێت)؟

لە وەڵامیدا (أبي) دەڵێت: (بەڵێ لە پێغەمبەر خودام ﷺ بیستووە، فەرموویەتی:

" لەکاتێکدا (مووسا) لەنێو کۆمەڵە کەسێکی گەلەکەی خۆی (بنو اسرائيل)دا دەبێت، پیاوێك دێتە لای ولێی دەپرسیت: (ئەرێ تۆ دەزانیت کەسێکی تر لە تۆ زاناتر هەبێت"؟

ئەویش دەڵێت: (نەخێر)، واتە کەسی دی لەمن زاناتر نیە.. خوداش لەوکاتەدا سرووشی بۆ (مووسا) ناردو پێی فەرمووە: بەڵێ کەسێکی دی لە تۆ زاناتر هەیە، کە بەندەمان (خدر)ە، مووساش داوای هۆی چۆنیەتی پێگەیشتنو ناسینی کرد. خوداش ماسییەکی بۆ کردە نیشانە، ئەوەبوو بە مووسا گوترا: (هەر کاتێك لە هەر

شوێنێك دا ئەو ماسیەت ون کرد ئەوا بۆ ئەو شوێنە بگەڕێرەوەو، لەوێ دا خدر دەبینیت ئیدی مووساش بە پێی خواستی خودا ماوەیەك ڕۆیشتو کوڕێکی نەوجەوانی خزمەتکاری لەگەڵ دابوو. دوای ئەو ماوەیە داوای لە خزمەت کارەکەی کرد کە پشویەك بدەنو قاوەڵتی یەك بکەن، خواردنی قاوەڵتییەکەشیان ماسییەکی برژاو بوو، ئەوە بوو بە خزمەتکارەکەی گوت: (خۆراکەکەمان بۆ بێنە). ئەویش لە وەڵامیدا پێی گوت: (ئەرێ لە بیرتە کاتێك چووینە سەر بەردە گەورەکەی کەنار دەریاکە بۆ حەوانەوە، بیرم چوو پێت بڵێم، کە ماسییەکە بەڕاستی زیندوو بۆوەو بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر خۆی کردەوە بەناو دەریاکەدا.. ئەم بەسەرهاتەش، تەنها شەیتان لەبیری بردمەوە).. (مووسا)ش پێی دەڵێت: (دەی مەبەستی ئێمەش ئەمەبوو)، واتە (لەکوێ ئەو ماسییە زیندوو بۆوەو خۆی کردەوە بەناو دەریادا، لەوشوێنەدا بەخدر- دەگەم).

ئنجا بەناچاری گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی، کە بەجێیان هێشتبوو، لەوێدا (خدر)یان بینیو، لەوێوە ئەو بەسەرهاتانەیان لێ ڕوداوە، کە قورئان دەربارەیان گێڕاویێتیەوە"[1].

ئەم فەرموودەیەش بە کورتەیەکی چیرۆکەکە دادەنرێت.. لێرەدا فەرموودەیەکی درێژو تێروتەسەلیش دەربارەی ئەم چیرۆکە دیاری دەکەین، کە هەر (بخاري)و (مسلم) گێراویانەتەوە:-

لە (سعیدی کوڕی جبیر)ەوە ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ گێڕراوەتەوە، گوتوویەتی: (ئێمە جارێکیان لەلای (ابن عباس) بووین لەماڵی خۆیداو، پێی گوتین (پرسیارم لێ بکەن) منیش گوتم: (ئەی ابا عباس خودا بمکات بەفیدای تۆ، لە شاری (کووفە) پیاوێکی چیرۆکزان هەیە، کە ناوی (نوف البکالی)یەو گومانی وایە، کە

---

(١) البخاري (٦٠) كتاب الانبياء (٢٧) باب الخضر مع موسى عليهما السلام، حديث رقم (٣٤٠٠) ومسلم (٤٣ كتاب الفضائل (٤٦) باب فضائل الخضر- عليه السلام- حديث رقم (٢٣٨٠).

(مووسا) ـ سلاوی لیّ بیّت ـ پیّغەمبەری بەنوئیسرائیل ئەو مووسایە نیە کە هاوەلّیّ (خدر)بووە ـ سلاوی لیّ بیّت ـ) (ابن عباس)ش گوتی: (ئەوە دوژمنی خودایەو درۆ دەکات: چونکە لە (ابی ی کوری کعب)ەوە گویّم لیّ بووەکە ئەویش لە پیّغەمبەری ﷺ بیستووە، فەرموویەتی: لەکاتیّکدا (مووسا) لەنیّو گەلەکەی دا وتاریّکی دەداو رۆژانی خوداو رۆژگاری نازونیعمەتو بەلام کارەساتی بەبیردەخستنەوە، لەوکاتەدا پرسیاریّکی لیّ کرا لەسەر ئەوەی (ئاخۆ زاناترین کەس کیّ بیّت) ئەویش لەوەلامدا گوتبووی (من زاناترین کەسم) خوداش لەسەر ئەوە گلەیی لیّ دەکات، چونکە هیّندەی زانست پیّ نەدابوو کە زاناترین کەسی سەرزەمین بیّت. هەر بۆیەش خودا سرووشی ئەوەی پیّگەیاند کەوا (بەندەیەك لە بەندەکانم کە لە ناوچەی بەیەککگەیشتنی هەردوو دەریادایە، لەتۆ زاناترە).

مووساش گوتی: (ئەی خودای پەروەردگارم، چۆن پیّی بگەم؟ ریّنوومابیم بکە بۆ لای)، ئینجا پیّی دەگوتریّت: (ماسییەکی سوور کراوە لە زەمبیلەیەکدا هەلگرەو بیکەتویّشووی سەفەرو برۆ، هەر برۆ تا دەگەیتە ئەوشویّنەی کە ماسییەکەت تیا لیّ ون دەبیّت، ئیدی لەویّدا بەو پیاوە زانایە دەگەیت.

(مووسا)ش خۆیو کوریّکی میّرد منداڵی خزمەتکاری بەریّ دەکەون کەناوی (یوشعی کوری نون)بوو. مووساش ماسییەکەی لە زەمبیلەیەکدا هەلگرتو لەگەلّ خزمەتکارەکەیدا دەرۆیشتن تاکو گەیشتنە لای بەردە گەورەکە لەویّدا مووساو خزمەتکارەکەی راکشانو خەوتن لەکاتی خەوتنیاندا ماسییەکە لەنیّو زەمبیلەکەدا دەست بە جموجوولّ دەکات تاکو لیّی دەردەچیّتو دەکەویّتە نیّو دەریاکەوە، خوداش ریّچکەی ئاوەکەی لیّ دەگریّتەوەو ناهیّلّیّت ئاوەکە بروات تا وای لیّ دیّت کەلّەکە دەبیّت وەك تاقیّکی بەرزو ماسیەکەش ریّی خۆی دەدۆزیّتەوەو ریّی دەریا دەگریّتەبەر. پاشان مووساو کورە میّردمنداڵەکە پاشماوەی ئەو رۆژەیانو شەوەکەشی بەرۆشتن دەست پیّدەکەنەوە، کورەکەش بیری دەچیّت کە (مووسا) لە نەمانی ماسییەکەیان ئاگادارکاتەوە. لەکاتی بەیانیدا مووسا بە یاوەرەکەی دەلّیّت:

(ئادەی خۆراکەکەمان بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا تووشی ماندوێتیو هیلاکییەکی زۆر بوون). بێگومان مووساش، تا ئەوکاتەی لە شوێنی دیاریکراو، واتە لە (بەردە زلەکەی ناوچەی بەیەکگەیشتنی هەردوو دەریاکە) تێپەڕنەبووبوون، ماندوونەبووبوو، بۆیە لەوێدا کوڕە یاوەرە خزمەتگوزارەکەشی ڕووداوی دەرچوونی ماسییەکەی بەبیرداهاتەوەو گوتی: "گەر لەیادت بێت ئەو وەختەی چووینەپاڵ بەردە گەورەکە بۆ پشوودان، من بیرم چوو مەسەلەی ماسییەکەت بۆ باسکەم، کە ڕۆشتو، ئەمەش تەنها شەیتان لەبیری بردمەوە، تا بۆت بگێڕمەوە، ئیدی ماسییەکەش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن ڕێی خۆی لە دەریاکەدا گرتەبەر.

ئنجا (مووسا) بە کوڕەکە دەڵێت: (ئەمەبوو مەبەستی ئێمە) ئیدی بەخێرایی گەڕانەوە بۆ ئەو ناوچەیەی کە لێی تێپەڕ ببوونو بەدوای ئاسەوارەکەیدا دەگەڕان تا گەیشتنە لای بەردە گەورەکە، کە لەوێدا ماسییەکە دەستی بەدەرچوون کردبۆوە (مووسا) گوتی: (ئائەم شوێنەم بۆ وەسف کراوە). بۆیە دەست دەکات بەگەڕان لەو شوێنەدا، تاکو سۆراخی (خدر) بکات، ئینجا بە دیداری دەگاتو دەبینێت، کەوا کاڵایەکی لەخۆی ئاڵاندووەو دەموچاوی پێ داپۆشیوەو لەسەر پشت لێی ڕاکشاوە. (مووسا) سەلامی لێ دەکات، خدریش کاڵاکە لەسەر دەموچاوی لادەباتو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوەو دەڵێت: (سەلام لەتۆش.. بەڵام سەلامو ئاشتی لە کوێی زەویەکەی تۆ دایە؟!) ئینجا ئاخاوتنێکی لەم جۆرە لەنێوانیاندا دروست دەبێت:

(مووسا) گوتی: (من مووسام).

(خدر): تۆ (مووسای) بەنوئیسرائیلیت.

(مووسا): بەڵێ.

(خدر) تۆ زانیاریەکت لەزانستی خوداوە هەیە، کە خودا فێری کردوویتو، من نایزانمو لێی ئاگادارنیم..منیش خودا زانیاریەکی وەهای لەزانستی خۆی فێرکردووم، کە تۆ نایزانیت. (مووسا): ئایا دەتوانم بەدووت بکەوم، تامنیش لەو زانیارییەی، کە فێری کراویت فێرم بکەیت.

(خدر): ئاخر تۆ ناتوانیت لەڕێگەدا بەرامبەر بەمن خۆڕاگربیت، کاتێك کارێك دەکەم، کە بە ڕواڵەت جێی ڕەزامەندیی تۆ نەبێت (واتە من کاری سەیرو سەمەرە دەکەمو تۆش پێیان ڕانەهاتوویت) ئیدی چۆن خۆت ڕادەگریت لەئاست کارێکدا کە هیچ هەواڵو زانیارییەکت لەسەری نیە)؟ من بێگومان فەرمانم بەشتێك پێکراوەو ئەگەر تۆ بیبینیت ئارامی لەسەر ناگریت.

(مووسا): ان شاء الله دەمبینیت بە ئارامو خۆڕاگرمو سەرپێچیی هیچ فەرمانێکت لێ ناکەم.

(خدر): دەی کەوابوو ئەگەر بەدووم دەکەویت پرسیارم لەسەر هیچ شتیك لێ مەکە، تاکو ئەوکاتەی خۆم لە مەبەستەکەیت ئاگادار دەکەمەوە.

(مووسا):- بەڵێ باشە.

(ئینجا ـ مووساو خدرـ بەسەر کەناری دەریاکەدا ڕۆشتنو پاپۆڕێکیان پێ نەبوو، لەوکاتەدا پاپۆڕێك بەلایان داهات، ئەوانیش داوایان لێکردن لەگەڵ خۆیاندا هەڵیان گرن، سەرنشینانی پاپۆڕەکە لەبەر ئەوەی (خدر)یان دەناسی، بەبێ کرێ هەڵیانگرتن. چۆلەکەیەك هاتو لەسەر لێوارێکی پاپۆرەکە نیشتەوەو دەنووکێك یان دوانی دا بە دەریاکەدا.

(خدر) بە (مووسا)ی گوت: ئەی (مووسا)، کەمیی زانیاریی منو تۆ لە زانستی خوداوە، وەك دەنووك کێشانی ئەم چۆلەکەیە بەدەریاکەدا.. لەوکاتەدا (خدر) بەدەستی ئانقەست پارچە تەختەیەکی لەبن پاپۆرەکە کردەوەو هەڵی کێشا.

(مووسا) خێرا پێی گوت: (ئەم کۆمەڵە کەسەی سەرپاپۆرەکە بەخۆڕاییو بەبێ کرێ ئیمەیان لەگەڵ خۆیاندا سواری پاپۆرەکە کردوو، کەچی تۆش بەئانقەست کونێکت کردە بنەکەی، تاکو سەرنشینەکانی لەدەریادا بخنکێنیت، بەڕاستی کارێکی ناهەمواری دیارت کرد.

(خدر)یش پێی گوت: (ئەرێ من پێم نەگوتیت تۆ ناتوانیت هەرگیز لەگەڵ مندا بەرامبەر کارەکانم خۆراگر بیت.

(مووسا)ش گوتی: (دەی لەسەر ئەم لەبیرچوونەم سەرزەنشتم مەکە).

پاشان لەدوای ئەوەی لە کەشتییەکە دابەزیبوون، دووبارە بەسەر قەراغێکی تری دەریاکەدا ڕۆشتن، لەوێدا کوڕێکی نەوجەوانیان بینی، لەگەڵ منداڵانی تردا یاریی دەکرد.

کەچی (خدر) ئەو منداڵەی گرتو سەری هەڵکەندو بەدەستی خۆی کوشتی. مووساش زۆر بەتوندی ترساو گوتی: (ئەرێ چۆن کەسێکی بێگوناهت کوشت کە هیچ تاوانێکی نیە، بەڕاستی کارێکی ناڕەواو دزێوت ئەنجامدا)؟!

(خدر)یش پێی گوت (ئەرێ پێم نەگوتیت تۆ ئارام لەسەر کارەکانم بگریت)؟ دیارە ئەم جارەیان بەتوندتر لێی پرسیوە بیری هێناوەتەوە کە بە ئارام بێت..

پێغەمبەری خودا محمد ﷺ فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە ئێمەو لە (مووسا)ش بێت، گەر (مووسا) هێندە پەلەی نەکردایەو خێرا لە هەموو شتێکدا پرسیاری لێ نەکردایە، ئەوا شتی زۆر سەرسوڕهێن تری دەبینی، بەلاّم بەهۆی گلەییو گازاندەوە لە هاوڕێکەی دابڕاوە.

(مووسا) گوتی: (ئەگەر لەمەولا لەسەر شتێکی دی پرسیارم لێ کردیت ئەوا هاوڕێیەتیم مەکە بەڕاستی هیچ بیانووو پاساوێکم لەلای تۆ نەماوە).

ئینجا دەستیان بەڕۆشتن کردەوە تاگەیشتنە گوندێك کە خەڵکێکی نەفامو سپڵەی تێدا دەژیان ئەوانیش هەردووکیان بەنێو کۆمەلاّنی خەڵکی ئەو گوندەدا سووڕانەوەو داوای میوانداریو خۆراکیان لێ دەکردن، خەڵکەکەش قایل نەبوون کە میوانداریان بکەن، کەچی وێڕای ئەوەش خدر (دیوارێکی درز تێبووی ماڵێکی کە خەریك بوو دەڕووخا) چاك کردەوەو نەیهێشت بڕووخێت.

لەوکاتەدا (مووسا) جارێکی تر ڕەخنەی لە(خدر) گرتەوەو پێی گوت: (ئێمە هاتینە ناو ئەم خەڵکەو، میوانداریشیان نەکردین‌و، خۆراکیان پێ نەداین، تۆش گەر بتویستایە کرێیەکت لەسەر ئەو دیوارە وەردەگرت).

(خدر) لەوەڵامدا پێی گوت: (ئیتر بەسە ئێستا هۆو مەبەستەکانی ئەو کارانەمت پێ دەڵێم کە لەتواناتدا نەبوو ئارامیان لەسەر بگریت‌و قسەیان لەسەر نەکەیت. سەبارەت بە پاپۆرەکە: ئەو پاپۆرە موڵکی چەند هەژارێك بوو کە لە دەریادا کاریان پێ دەکرد، من بۆیە ویستم کونی بکەم‌و عەیبداری بکەم، چونکە لەوسەرەوە پادشایەکی زۆردار هەبوو دەیویست هەموو پاپۆڕێکی چاك بە زوڵم‌و ستەم داگیر بکات، جا ئەو پاپۆرەی کە بەرەو لای دەچوو کە ئەو دەیوست قۆرخی بکات بۆ خۆی، دیتی کون کراوەو بەکەڵکی نایەت، بۆیە چاوی لێنووقاندو، دواتر خاوەنە هەژارەکانی کەشتییەکەش بە تەختەیەك چاکیان کردەوە سەبارەت بەکوڕە مێردمنداڵەکەش: لەو ڕۆژەوەی لەدایك بووە بەنەریتێکی کافرانە دەژیاو، باوك‌و دایکیشی نازوسۆزێکی زۆریان پێدابوو، خۆ ئەگەر گەورە ببوایەو لەلایان بوایە ئەوا بە کوفرو زۆردارییەکی زۆرەوە تەنگی پێ هەڵدە چنیین، ئێمەش ویستمان خودای پەروەردگاریان کوڕێکی باشتریان پێ ببەخشێت کە پاکترو بەڕەحمتر بێت بۆیان.

دیوارەکەش هی دوو کوڕی مێردمنداڵی هەتیوو بوو لە ناوچەکەداو لەژێر دیوارەکەیاندا گەنجینەیەکی حەشاردراو هەبوو دایك‌و باوکیشیان دووکەسی چاك‌و بۆ خوا سوڵحاو بوون، خودای پەروەردگار لەمەدا خواستی وابوو کە ئەو دوو کوڕە تا گەورە دەبن‌و باڵغ دەبن ئەو گەنجینەیەیان بۆ بمێنێت‌و دەری بێنن‌و سوودی لێ ببینن)[1].

---

(١) بڕوانە ئەم فەرموودەیە لە چەند ڕێگەو ڕیوایەتێکی هەمەجۆرەوە لە (مسلم‌و بخاري)یەوە گێڕراوەتەوە. بڕوانە (صحیح مسلم) —٤٣- كتاب الفضائل (٤٦)باب من فضائل الخضر، حیث: ٢٣٨٠. بڕوانە (صحیح بخاري) —٣- كتاب العلم (١٩)باب الخروج في طلب العلم، حدیث رقم

## "هەندێك مەبەستو واتای فەرموودەكان"

لێرەدا گرنگترین ئەو ئاماژەو واتایانە وەردەگرین كە لە فەرموودەكانی تایبەت بەم چیرۆكەوە دەرهێنراون "ئیمامی (نووي) لە (شرح صحیح مسلم)داو (ئیمام ابن حجر)یش لە كتێبی (فتح الباري)دا ئەم واتایانەیان دیاری كردووە".

١- خۆشویستنی سەفەر بۆ وەرگرتنی زانست، تەنانەت گەر ماوەكەش دووربێت.

٢- خۆشویستنی وەرگرتنی زانستی زۆر، چونكە مرۆڤ هەرچەندێك زانستی دەستكەوێت لە زۆربەی مەسەلە زانستییەكانی تر بیَ‌ئاگایە.

٣- خۆشویستی فێربوونی زانایەك لە زانایەكی لەخۆی زیرەكترەوەو، ڕۆشتنی بۆلای.

٤- فەزڵو چاكیی خواستنی زانست.

٥- شیاوبوونی هەڵگرتنی ئامرازەكانی توێشووو جۆرەكانی خۆراك لە سەفەردا.

٦- نواندنی ئەدەبی جوان لەگەڵ زاناداو ڕێزگرتن لە پیرانو، وازهێنان لە بەرهەڵستی كردنیان.

٧- لێكدانەوەو پاساو هێنانەوە بۆ ئەو وتەو كردارو كردەوانەی كە بەڕواڵەت لێیان تیَ‌ناگەین.

٨- پابەندی بە پەیمانو بەڵێنەكانەوەو داواكردنی لێبوردن لەكاتی شكاندنی پەیماندا.

٩- شیاو بوونی بەكریَ گرتنی پاپۆڕ.

(٧٨)و كتاب العلم (٤٤) باب مایستحب للعالم، حدیث رقم (١٢٢) و (٦٠) كتاب احادیث الانبیاء (٢٧) باب حدیث الخضر مع موسى حدیث (٣٤٠٠)و (٣٤٠١) و(٦٥) كتاب التفسیر (٢) باب (واذ قال موسى لفتاه، حدیث (٤٧٢٥) ورقم (٤٧٢٦)و (٤٧٢٥) .

١٠- شیاو بوونی سواربوونی پاپۆڕو هۆیەکانی تری گەیاندنو، دانیشتنی نێو خانووبەرەو لەبەرکردنی جلو بەرگ بەبێ کرێ وبەرەزامەندیی خاوەنەکەی.

١١- حوکم کردن بەڕواڵەت تاکو پێچەوانەی ڕواڵەتەکە (ناوەڕۆك) ڕوون دەبێتەوە.

١٢- خۆشویستنی دووعاکردنی مرۆڤ، یەکەم جار بۆ خۆیو، پاشان بۆ کەسانی تر لە کاروباری ڕۆژی دوایی دا، بەڵام بۆکاروباری دنیاو دەسکەوتەکانی دنیا باشتروایە مرۆڤی ئیماندار یەکەمجار ئەوانەی بۆ کەسانی تر بوێتو، خەڵکی تر بخاتە پێش خۆی.

١٣- شیاو بوونی خزمەتکردنی مرۆڤی زاناو پیاوچاكو، دابین کردنی پێویستی یەکانی بەبێ بەرامبەر.

١٤- هاندان لەسەر لەخۆبوردوویی لەزانستو کاری تردا.

١٥-ڕێنماییکردنی کەسی زانا لەکاتێکدا ئەگەر پرسیاری ئەوەی لێ کرا کە ئایا کێ زاناترین کەسە، با لەوەڵام دابڵێت (خودا دەزانێت کێیە).

١٦- پێویست بوونی خۆ تەسلیم کردن بە هەر یاسایەك هێناویێتی، تەنانەت گەر هەندێك هۆو حیکمەتیشی بۆ عەقڵی خەڵکی دەرنەکەوتبێت[1].

١٧- شیاوبوونی مشتومڕ لەسەر زانست ئەگەر بەبێ نکوولیو سەرکێشی بێت.

١٨- پێویستبوونی گەڕانەوە بۆ لای زانستمەندان لەکاتی ناکۆکی دا.

١٩- کارکردن بەیەك هەواڵو بەسەرهاتی ڕاستەقینە[2].

٢٠- ڕای ڕاستو یەکلاکراوە دەربارەی (خدر) ئەوەیە، کە پێغەمبەرێك بووبێت، ئەمەش بەگوێرەی چەندین بەڵگە کە (ان شاء الله) لەدواییدا باسیان دەکەین.

---

(١) بۆ ئەم بەڵگانە بڕوانە: (شرح النووي على مسلم، (١٥/١٣٧)و (١٥/١٤٦-١٤٧).

(٢) بۆ ئەم بەڵگانەش بڕوانە: (فتح الباري ١: ١٦٩.

٢١- بێگومان خودا بەخواستی خۆی هەڵس وکەوت لە موڵکی گەردووندا دەکاتو هەر بەخواستی خۆیشی حوکم لەنێو مەخلووقاتی دا دەکات.

٢٢- ڕای یەکلاکراو لەسەر ژیانی (خدر) ئەوەیە، کە پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەرمان محمد ﷺ مردووە، (ان اشاء الله) لەدواییدا دێینە سەر ئەم مەسەلەیەش.

٢٣- شیاوبوونی گوتنی زانا بە خەڵکی (لێم بپرسن)، ئەگەر دووربوو لە نەریتی بەخۆوە نازین، یان ئەگەر پێداویستی ڕۆژگار وای دەخواست، کە وەك زانا خۆی بە خەڵك پیشان داتو داوایان لێبکات، کە پرسیاری لێ بکەن.

٢٤- ماسییەکە ماسییەکی مردووی سوێرکراو بوو، خوداش زیندووی کردەوەو، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر زیندووکردنەوە.

٢٥- بێگومان کوڕە مێردمنداڵەکەی یاوەری مووسا، کە لە هۆزەکەیدا جێنشینیشی بووە، ناوی (یوشعی کوڕی نون) بووە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ.

٢٦- شیاوبوونی ناوبردنی شوێنکەوتووی کەسێك بە (فتی) وەك ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴾[1].

٢٧- شیاوبوونی کارپێکردنی مرۆڤی ئازاد (حر) لەکارێك لەکارەکاندا.

٢٨- پێویست بوونی گوێڕایەڵی کردنی خزمەتکار بۆ گەورەو خزمەتکراوی.

٢٩- ڕەوایی پاساوی کەسێك کەشتی لەبیرچۆتەوە، چونکە هیچ چارەیەك بۆ لەبیرچوونەوەکەی نیە.

---

(١) لەزمانی عەرەبیدا وشەی (فتی) جگە لە کەسێکی نەوجەوانو تازە پێگەیشتوو، چەندین مانای تری وەك (خادم) خزمەتکارو، (سخی/ بەخشندە) و (ذوالنجدة/ فریاد ڕەس) و چەند مانایەکی تریش دەگەیەنێت. مێ یینە (مؤنث) یشی (فتاة)ە (وەرگێڕ)

٣٠- وەرگرتنی دیاری له کەسێکی ناموسڵمانیش.

٣١- مرۆڤی موسڵمان بۆی شیاوه کەئەگەر ماندوێتی یەك، یان نەخۆشی یەك، یان هەژارییەکی تووش بوو، کەسانی تر لەو حاڵەتەی خۆی ئاگادار بکاتەوه.

٣٢- ئەوکەسەی له سەفەردا ڕوو له خودایەو خودای لەبیره، خوداش لەو سەفەرەدا کۆمەکی دەکاتو، ئیدی بەزوویی تووشی ماندوویێتیو برسێتی نابێت، ئەمەش بەپێچەوانەی کەسێکەوه که لەجیاتی ڕووکردنه خودا بەتەمای کەسانی دییه.

٣٣- شیاوبوونی داواکردنی میوانداریێتیو، داواکردنی خۆراكو خواردەمەنی.

٣٤- خستنەڕووی پاساوو له جاری یەکەم داو، خستنه ڕووی بەڵگەش لەجاری دووەم دا.

٣٥- ئەدەبی جوان لەگەڵ خواداو، هیچ وەسفو بێژەیەکی ناشیرین نەخرێته پاڵ خودا[1].

## "مانای چەند وشەیەکی گرانی نێو ئایەتەکان"

١- مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ : (شوێنی پێك گەیشتنی هەردوو دەریاکه).

٢- أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا : (چەندن ساڵی درێژ دەڕۆم)

٣- سَرَبٗا: (ڕێگەیەکی کراوەو جێی پیاتێپەڕبوون).

٤- نَصَبٗا : (زەحمەتو ماندوێتی).

٥- فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا : (له ڕێگەدا گەڕانەوه بۆ سەر ئاسەواری یەکەم (شوێن پێ)یان لەو جێگەیەوەی که پشوویان لێ دابوو).

(١) بۆ ئەم بەڵگانە بڕوانە: "فتح الباري (٨ : ٤٠٩-٤٢٢)"

٦- خُبۡرٗا : (زانستو زانیارییەك).

٧- وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا : (بارگرانیو نارەحەتی مەخەرە ئەستۆم).

٨- شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا : (شتێکی نابەجێ)

٩- وَرَآءَهُم مَّلِكٞ : (لە پادشا یەك بەدواوەیانە).

١٠- يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ : (خەریك بوو دەڕووخا)

١١- يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا: (لە ئاکامدا بە ستەمو زۆرداریی تەنگی پێ هەڵدەچنیین).

١٢- زَكَوٰةٗ : (پاکیی ئایینو چاکیی دەروون).

١٣- وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا : (ڕەحمیان پێ بکاتو چاكو بەئەمەك بێت بۆیان).

١٤- يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا : (گەورەبنو بگەنە کاتی ژیریو عاقل بوون).

## "خزمەتکارەکەی مووسا (یوشع) ی کوڕی (نون)ە"

خودا فەرموویەتی: ( وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ). لێرەدا (فتی) بەو لاوە دەوترێت، کە لە هەرەتی پێگەیشتن دایەو لە سەرەتای تەمەنی لاوی دایە.. هەروەها وشەی (فتی) بەکەسێکی (بەندە)و بەکەسێکی (شوێنکەوتوو یاوەری کەسێکی تر)یش دەگوترێت. ئەم لاوەی (مووسا)ش (یوشعی کوری نون) بووە - خوا لێی ڕازی بێت ـ ئەمەش لەخۆمانەوە نایلێین، بەڵکو لە دیاریکردنی ئەم ناوەدا پشتمان بە فەرموودەیکی پێغەمبەر ﷺ بەستووە، چونکە گەر فەرموودەکە ئەو ناوەی دیاری نەکردایە، ئێمەش دیاریمان نەدەکردو، بەڵکو هەر لە چوارچێوەی لایەنە نادیارەکانی ئەم چیرۆکەدا دەمانهێشتەوە.

وەك لە بڕگەیەکی پێشوودا ئەو فەرموودەیەمان هێنایەوە کە (بخاري ومسلم) لە (ابن عباس)ەوە - خوا لێی رازی بێت- و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویێتیەوەو کە لە دەقی فەرموودەکەدا هاتبوو: ((**فانطلق، وانطلق معه فتاه وهو (يوشع بن نون، فحمل موسى عليه السلام حوتا في مكتل، وانطلق هو فتاه يمشيان**))[1]. واتە (مووسا دەستی کرد بەڕۆشتنو کوڕە مێردمنداڵەکەی یاوەریشی لەگەڵیدا دەستی کرد بە ڕۆیشتن، کە (یوشعی کوڕی نون) بووە، مووساش ماسییەکی لە زەمبیلەیەکدا هەڵگرتو هەردووکیان (خۆیو کوڕەکە) بەرێگاوە هەنگاویان دەنا).

(یوشعی کوڕی نون) کە نەوجەوانێکی خزمەتکارو یاوەری (مووسا)بووە - سڵاوی خودای لێ بێت - بەرای هەندێك کەس لە زانایانی تەفسیر، پلەیەکی نزیکتری لە ئاشنایەتی (مووسا)دا هەیە، بەڵام زاناکان لەم پلەیەدا وتەو بیروڕای لێك جوداو جیاوازیان هەیە، کە وتەکانیان زۆر لەیەکتر جیاوازن. هەندێك زانای تری تەفسیریش ڕایان وایە، کە ئەم لاوە تەنها خزمەتکارێکی مووساو بەندەیەکی، یان نیمچە کۆیلەیەکی بووە، لەم ڕایەیانەدا پشتیان بەشێوە دەربڕینەکەی قورئان ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ ﴾ بەستووە، بەوپێودانگەی، کە وشەی (فتی) بۆ خزمەتکارێکی بەندە دەگوترێت. بەڵام وادیارە مەسەلەکە لەمە ساناترەو، ئایەتەکەش دەلالەت ناکاتە سەر ئەو مانایانەی ئەوان،.. ئەی کێ گوتوویەتی، کە گوایە وشەی (فتی)، تەنها بۆ خزمەتکارێکی بەندە بەکاردێت؟! لەم ڕووەوە (ئیمام راغبی اصفهانی) لەکتێبی (مفردات)ەکەیدا لەبارەی ئەم وشەیەوە گوتوویەتی:

---

(١) من پێشتر لە سەرەتای ئەم چیرۆکەوە دەقە عەرەبییەکەی فەرموودەکەم نەنووسیوەتەوە، چونکە زۆر درێژەو لاپەرەیەکی گەلێ زیاتر داگیر دەکات بەڵکو تەنها تەرجەمە کوردییەکەیم دیاری کردووە، جێی باشیشە لە نوسخە عەرەبییەکەی ئەم کتێبەدا (دەقی فەرموودەکە) هەیەو، لە (صحيحين)یشدا هەیە.

"(الفتی) واته ئەو گەنجەی تازه پێدەگاتو هێشتا نەرمو ڕۆح سووكو تازه بالّغ بووه.. مێیینەی وشەکەش (فتاة)ە، چاوگ (مصدر)ەکەشی (فتاء)ەو، بەلاّم له کینایەتدا بۆ بەندەش ـ پیاوبێت یان ئافرەت ـ بەکاردێت"[1].

ڕیشەی بەکارهێنانی (فتی) بۆ ئەوگەنجه ناسكو تازه پێگەیشتووەیە، که له سەرەتای تەمەن دایە، بەلاّم بەکارهێنانیشی بۆ بەندەکۆیلەکان لەڕووی خوازراویی ناوو کینایەتو مەجازه وەیە.

قورئانی پیرۆز له شوێنێکدا وشه (فتی) واته (وشەی لاوی تازەپێگەیشتووی) بۆ (ئیبراهیمی خەلیل) ـ سلاّوی خودای لێ بێت- داناوه وەك له فەرمایشتەکەی خوادا هاتووه، که لەسەر زاری کافرانی گەلەکەی خودا فەرموویەتی: ﴿قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠﴾ الأنبياء، واته (گوێمان له گەنجێکی تازه پێگەیشتوو بوو، که ناوی (ئیبراهیم) بوو و هێرشی قسەی دەکرده سەر بتەکانمان).

(یوشعی کوڕی نون)یش له هەرەتی لاویدا بووه، کاتێك لەو سەفەرەدا یاوەریەتی (مووسا)ی کردووه، وەك له ئایەتەکەشەوه دەرکەوتووه، که لاوێك بووه.

هەروەها سەرنجێکی تر له بەکار هێنانی وشەی (فتی)دا بۆ (یوشعی کوڕی نون) هەیه، ئەوەش ئاماژه دانێکه بەگوێڕایەڵی (یوشع) بۆ پێغەمبەری خودا (مووسا)ــ سلاّوی خودای لێ بێت وــ هەروەها بۆ شوێنکەوتنیو پەیڕەوییکردنی، دیاره ئەمەش هاوشێوەی گوێڕایەڵیی بەنده (عەبد)ێکه بۆ ئاغاکەیو شوێنکەوتنی، پاشان زیادکردنی وشەی (فتی) بۆ مووسا، که فەرموویەتی: (فتاه) زیادکردنێکی ڕێزلێنانو قەدرگرتنی (یوشع)یشه، ئیدی هیچ وەسفێك لەوه باشتر نەبووه، که (نەوجەوانو شوێنکەوتووو یاوەری پێغەمبەرێکی بەڕێزه)و، که له پێغەمبەرانی خاوەن عەزمو کۆششی قورسن..

---

(١) (المفردات، ص٣٧٢-٣ و٣٣٣.

## ئایـا (یوشـعی کـوڕی نون) پێغەمبـەر بووە ؟

هەندێك لە زانایانی تەفسیر وای بـۆ دەچـن، کـەوا (یوشـع) یـەکێك بێـت لـە پێغەمبەران، لەوانەیە ئـەم بـۆ چوونەشـیان لـەو جوولەکانـەی (بنـو اسـرائیل)ەوە وەرگرتبێت، کە گوویانە (ئەو پێغەمبەر بووە، گوتووشیانە (یوشـعی کـوڕی نـون) دوای کۆچی دوایی (مووسا) ـ سـلاوی خـودای لـێ بێـت ـ سـەرکردایەتی گـەلی (بنوسرائیلی کردووەو گەیاندونیە نێو فەلەسـتینەوەو، بیـت المقـدس)ی پـێ ئـازاد (فتح) کردوون لەمەشدا هـیچ بەڵگەیـەك لەسـەر پێغەمەرێتییەکـەی نیـە. چـەند زانایەکی تریش بەڵگەیان بۆ پێغەمبەرێتی (یوشعی کوڕی نون) ئەو فەرموودەیـەی پێغەمبەری خودایە ﷺ، کە (ئیمامی مسلم) لە صحیحەکەیدا هێناویەتی، کە لە (ابـو هریـر)ەوە ﷺ و ئـەویش لـە پێغەمبـەری خـوداوە ﷺ گێڕاوێتیـەوە، کـە فەرمـوویەتی: ((**غزا نبـي من الانبياء فقال لقومه: لا يتبعني رجل قد ملك بـضع امراة بضع امراة وهو يريد أن يبنى بها، لمايبن، ولا آخر قد بنى بنيانـاً وهـو يريـد غنما أو خلفات ولما يرفع سقفها، ولا آخر قد اشترى غنمـاً أو خلفـات وهـو منظـر ولادها فغـزا فأدنى للقرية حيـن صـلاة العصر، أو قريبـا من ذلك فقـال للشـمس: ان مأموره وانا مأمـور. اللّهم احبسها علي شيئا. فحبست عليـه، حتـى فـتح الله عليـه**))[1].. ئەم فەرموودەیە باسی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران دەکات، کە ناوی نەبردووەو داوای لە گەلەکـەی کـردووە بـۆ جیهـاد دوای کـەون، مەگـەر پیاوێـك خانوویەکی تازەی دروست کردووەو هێشتا سەربانی بۆ نەکردووە، یـان کەسـێك، کە مەڕو ماڵاتێکی کڕیوە، یـاخود ئـاژەڵی شـیردەرو گوانـداری کڕیـوەو چـاوەڕێی زاووزێ کردنیان دەکات...

---

(١) مسلم (٣٢) كتاب الجهاد والسير (١١) باب تحليل الغنائم لهذه الامة، حديث (١٧٤٧).

ئینجا جیهادەکەی بەئەنجام داوەو لــه شــارەکه نزیــك بۆتــەوە لــەکاتی نوێــژی عەسرا یان له کاتێکی نزیك له نوێژی عەســردا، بــه (خۆرەکەشــی) گوتــووە: "تــۆ فەرمان پێکراوێکیت، وەك چۆن منیش فەرمان پێکراوێکم، خودایه ماوەیــەك ئــەم خۆرەم بۆ بووەستێنه) ئینجا خۆرەکەی بۆ وەستێنراوە هەتا ئەوکاتــەی بەیارمــەتی خودا فەتحی شارەکەی کردووە".

لەم فەرموودەیەدا نــاوی ئــەو پێغەمبــەرە نــەهاتووە کــه خــودا خۆرەکــەی بــۆ وەستاندووە، بۆیه ئێمــەش نــاتوانین نــاوێکی بــۆ دیــاری بکــەین.. ســەبارەت بــه پێغەمبەرێتیی (یوشع)یش وای دەبینین که باشترو ڕاستتر وایه لەوەدا بوەستین، نه دان بەناوەکــەدا بنــێین‌و نــه ڕەتیــشی بکەینــەوە، چــونکه ئەگــەر دان بــه پێغەمبەرێتییەکەی دابنێین، ئەوا لەوانەیه پێغەمبەر نەبووبێت‌و ئێمەش وامان لــێ دێت بیخەینه ڕیزی پێغەمبەرانەوەو لەوانیش نیەو، ئەمەش کارێکی نەشــیاوە خــۆ ئەگەر لەخۆمانەوە (بەبێ بەڵگەیــەك) پێغەمبــەرێتیی لــێ بکەینــەوەو دانــی پــێ دانەنێین، ئەوا لەوانەیه ئەگەر پێغەمبەرێك بووبێــت وامــان لــێ دێــت یــەکێك لــه پێغەمبەران لەو بازنەیەدا لابەرین، ئەمەش دووبارە کارێکی نەشیاوە..

بۆیه وای دەبینین که (ڕاستترو گونجــاوتر لەگــەڵ بــاری زانــستی‌و مەنهەجیــدا) ئەوەیه لەئاست ئەمەدا هەڵوێسته بکەین‌و هیچ ڕایەك لەسەر ئەوەی که (یوشــع)ی کوڕی (نون) پێغەمبەر بووە، یان نا، دەرنەبڕین.

## ڕۆڵی (یوشع) لە کۆمەڵگای (بنو اسرائیل)دا

هەموو ئەو وتانەی دەربارەی (یوشعی کوری نون) گوتراون، ئەوەیە (ناوبراو ئەوکەسەیە، کە دوای مووسا جڵەوی سەرکردایەتی (بنواسرائیل)ی گرتۆتە دەستو، پیاوێکی چاكو ئیمانداروو خواپەرست بووەو، پەیڕەویی حوکمو شەریعەتی خودای لە جیهادو کوشتاردا کردووە.

هەروەها لەلای (بنواسرائیل) لەوپلە بەرزەدابووە، کە (ابوبکری صدیق) ﷺ لەلای موسڵمانان هەیبووە.

بەڵام لە سەرچاوەکانی بەسەرهاتی (بنواسرائیل)دا، چەندین داستانی ئەفسانەی دروستکراو لەسەر (یوشعی کوڕی نون) گێڕراوەتەوە، بەتایبەتیش دەربارەی جەنگو کوشتاریی لەگەڵ دوژمنانداو، چۆنیەتی فەتح کردنی شارەکانی فەڵەستین، وەك (ئەریحا)و (بیت المقدس). دیارە ئەوادستانە ئەفسانەیی یانە، هەموویان چەندین درۆو دەلەسەو شتی پووچەڵو دروستکراونو، چەند کەسێکیش لە عەرەبەکان بڕوایان بەو درۆو دەلەسەو ئەفسانە ئیسرائیلیانە کردووەو، (یوشع)یان بە زوڵمو زەبرو زەنگو وێرانکاریو توندوتیژیو تۆقاندنو شێواندن، خەتابار کردووە، هەروەها ڕقیان لێی بۆتەوەو سەرزەنشتیان کردووە. وەك دەشبینینو زانیومانە، (یوشع) لە هەموو ئەو وتانە بەریو بێتاوانەو، لە هەموو ئەو پڕوپاگاندەو قسە هەڵبەستراوانەش پاكو تەمیزەو، بەندەیەکی چاکی خوداو، موجاهیدێکی دادپەروەرو بانگەوازکارێکی ڕێبازی خودا بووە.

## "هەڵوێستەیەك لەگەڵ (نوف البكالی)دا"

پێشتر لە بڕگەیەكی سەرەتایی ئەم باسەدا وتەیەكی (ابن عباس)مان لە (سعیدی كوڕی جبر) لەبارەی (نوف البكالی)یەوە هێنایەوە كە (سعید) بە (ابن عباس)ی گوتبوو: " خودا بمكات بەفیدای تۆ، لە (كووفە) پیاوێكی چیرۆكزان هەیە ناوی (نوف البكالی)یەو وای ڕادەگەیەنێت گوایە (مووسا) ـ سڵاوی لێ بێت ـ كە پێغەمبەری (بنو اسرائیل)ە، ئەو (مووسا)یەتی یە كە لەگەڵ (خدر)دا ئەو سەفەرەی كردووە). (ابن عباس)یش گوتبووی:- (ئەوە دوژمنی خودایەو درۆ دەكات) پاشان فەرموودەكەی پێغەمبەری لە (ابی ی كوڕی كعب)ەوە هێنابووەوە.

وادیارە ئەوەی پاڵی بە (نوف البكالی)یەوە ناوە بۆ ئەم وتەیە، دووهۆن، یەكەم: گوایە مەحاڵەو بەهیچ شێوەیەك نەشیاوە، كە (مووسا)ی پێغەمبەری خودا -سڵاوی خودای لەسەر بێت- زانست لە (خدر)ەوە فێربێت. ئەمەش لە ڕادەو پلەی بەرزی (مووسا)دا نیە، سائیتر (خدر) بە پێغەمبەری دابنێین، یان بە پیاوچاكێك. بەیارمەتی خودا لە دواییدا وەڵامی ئەم گومانەش دەدەینەوە.

دووەم: ناوبراو ئەم وتەیەی لە دەقە ئیسرائیلیەكانەوە وەرگرتووە، هەر بەو دەقانەش فەرمایشتەكەی خودای تەفسیر كردووە.

بێگومان (نوف) خۆیشی پەیوەندییەكی بەهێزی بە (كعب الأخبار)ی زانای جوولەكەكانەوە هەبووە، چونكە ئەو (نوف)ی كوڕی (فضالەی بكالی) بووەو سەر بە بنەماڵەی (بنی بكال) لە هۆزی (حیمیەر)ی یەمەنەوە بووە. هەروەها كوڕی ژنەكەی (كعبی احبار)بووە[1]، واتە: (كعب) (زڕباب)ی بووە. نابێت ئەو ڕاستییەشمان

---

(١) بڕوانە (فتح الباري، ٨: ٤١٣).

لەبیرچێت كە (كعبی احبار) جوولەكەیەك بووە لە جوولەكەكانی (یەمەن)، پاشان لەسەردەمی خەلافەتی (عومەری كوڕی خطاب)دا رضي الله عنه موسڵمان بووە.

زانایانی ئیسلام قسەوباسێكی فرەیان لەسەر (كعبی الاحبار)و لەسەر ڕادەی زانستو بەسەرهاتو هەواڵەكانی هەیەو كە لە دەقەكانی (ئیسرائیلیات)ەوەی وەرگرتوونو فەرمایشتی خودای پێ تەفسیر كردوون.. لەوانەشە (نوف البكالی) ئەم بیروڕایانەی لە مێردەكەی دایكییەوە واتە (كعب الاحبار)ەوە وەرگرتبێت، بۆیە نكۆڵیی كردووە لە (گەیشتنی (مووسا)ی پێغەمبەری خودا بە (خدر)سلاوی لێ بێت) و، لەجیاتی ئەوە كەسێكی تر لە هۆزی (بنواسرائیل) كە گوایە ئەویش ناوی (مووسا) بووەو بەیاوەری (خدر) داناوە.

بێگومان ئەم هەڵوێستەی (نوف البكالی) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە كە بە چەند بڕیارێكی نامۆی پێشترەوە تەماشای قورئانی كردووەو بەو بڕیارانەو بە چیرۆكو بەسەرهاتی پێشینەكانی نێو دەقە ئیسرایلییەكانەوە فەرمایشتی خودای لە قورئاندا پێ تەفسیر كردووە.. ئەمەش هەڵەیەكی نێو مەنهەجەكەیەتیو، لە ئەنجامیشدا هەر بۆ هەڵەو كەموكووڕی پەلی هاویشتووەو، بە هەڵەش تەفسیری كردووە. بەڵام بێگومان هاوەڵان (صحابە)ی پێغەمبەری خودا —خوا لێیان ڕازی بێ- سووربوون لەسەر پابەندیی بە مەنهەجی زانستیی پتەوەوە لە تێگەیشتنی قورئانو تەفسیركردنیو، دەرهێنانی پەندو ئامازەكانیو، گەیاندنیان بەم جۆرە بە قوتابییەكانیان، هەروەها هاوەڵانی بەتوندی دژی هەركەسێك بوون لەوانەی كە سەرپێچییان لەم مەنهەجە دەكرد. ئەم ڕژدییەشیان لەسەر مەنهەجەكە لەو وتەیەی (ابن عباس) ڕەنگی داوەتەوە كە دەربارەی (نون البكالی) گوتبووی: (ئەوە دوژمنی خودایەو درۆ دەكات).

(ابن حجر) لە لێكدانەوەی وتەكەی (ابن عباس)دا گوتوویەتی: "وتەی (ابن عباس) كە لەبارەی (نوف البكالی)یەوە گوتبووی (درۆ دەكات)و، (دوژمنی

خودایە) ئەم دوو بڕگەیە لەوپەڕی سەرزەنشتو بەدرۆخستنەوەی وتەکەی کابرادان کە هیچ جێی بڕوا پێکردن نیە"[1].

خۆ (نوف) لەڕاستیدا درۆزن نەبوەو دوژمنێکی خوداش نەبووە، چونکە موسڵمانێکی ڕاستگۆو بەتەقواش بووە، بەڵام وتەکەی خۆی دەربارەی (مووسا)، کە گوایە (مووسا پێغەمبەر نەبووە لەگەڵ (خدر)دا) تەنها ئەم وتەیەی بووە، کە هەڵەیەکی لە (مەنهەجی مامەڵەی لەگەڵ قورئاندا) دەرخستووە، هەر بۆیەش (ابن عباس) بەتوندی سەرزەنشتی کردووەو وای وەسف کردووە، کە درۆزنو دوژمنی خودایە: (کذب عدو الله)..

## "هاوڕێکەی (مووسا)ش (خدر) بووە"

ئەو بەندە چاکە (العبد الصالح)ەی خوداش، کە لەگەڵ (مووسا)دا بەڕێدا ڕۆشتوە (خدر) بووە. ئەم ناوەش لە قورئاندا نەهاتووە، هەرچەندە لە ناوو مەسەلە نادیارەکانی قورئانیشە، بەڵام لە فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا ڕوونکراوەتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم ناوەی دەسنیشان کردووە.. وەك لەو فەرموودانەیدا، کە (بخاري و مسلم)و ئەوانی دی گێڕاویانەتەوە.

خۆ ئەگەر لە فەرموودەدا ناوی نەهاتبایە، ئەوا ئێمەش لە خۆمانەوە هەوڵی دیاری کردنیمان نەدەدا، بەڵکو هەر لە ڕیزی نادیارەکانی قورئاندا دەمانهێشتەوە.

بەڵام لە فەرموودەیەکدا هۆی ناونانی بە(خدر) دەستنیشان کراوە، فەرموودەکەش (بخاري) لە (ابو هریره)ەوە ـ خودا لێی رازی بێت ـ و ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوێتیەوە، کە فەرموویەتی: **((انما سمي الخضر، لانه جلس**

---

(١) بڕوانە فتح الباري، ٨: ٤١٣).

**على فروة بيضاء فأذا تهتز من تحته خضراء))**[1]، واته‌: " بۆیه‌ به‌ (خدر)، یان به‌ (خضر) ناوبراوه‌ چونكه‌ له‌سه‌ر خورییه‌كی سپی دانیشتووه‌و له‌ژێر خۆیشیه‌وه‌ وه‌ك سه‌وزاییه‌ك له‌ریوه‌ته‌وه‌). له‌م فه‌رمووده‌یه‌دا وشه‌ی خوری سپی (الفروة البیضاء) وه‌ك عبدالرزاق له‌ (مصنف)ه‌كه‌یدا ده‌رباره‌ی گوتوویه‌تی: (قامیشی سپییه‌). به‌لأم (ابراهیم الحربی) له‌باره‌یه‌وه‌ گوتوویه‌تی: (قامیشێكی وشكه‌). (ابن الاعرابی)یش له‌باره‌یه‌وه‌ گوتوویه‌تی: (زه‌وییه‌كی سپی یه‌ كه‌ هیچ ڕووه‌كێكی تێدا نیه‌)[2].

ئه‌وه‌ی له‌م فه‌رمووده‌یه‌وه‌ به‌دیار ده‌كه‌وێت ئه‌وه‌یه‌، ئه‌م دیارده‌یه‌ی، كه‌ له‌ (خدر)وه‌ بینراوه‌و به‌هۆیه‌وه‌ ئه‌و ناوه‌ی لێنراوه‌، (موعجیزه‌یه‌كه‌) له‌و موعجیزانه‌ی خۆی، كه‌ (به‌پێی وته‌ی یه‌كلاكراوه‌ش ده‌لاله‌ته‌ له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رێتییه‌كه‌ی). هه‌روه‌ها ئه‌وه‌شی لیٚ به‌دیارده‌كه‌وێت، كه‌ له‌سه‌ر پارچه‌ زه‌وییه‌كی وشك دانیشتووه‌و قامیش‌و گژوگیای وشكی له‌ژێردابووه‌و كاتێك له‌سه‌ریان دانیشتووه‌، ژیانیان تێكه‌وتۆته‌وه‌و سه‌وز بونه‌ته‌وه‌و له‌ژێرخۆیدا له‌ریونه‌ته‌وه‌، واته‌ گژوگیای سه‌وز له‌سه‌ر ئه‌و پارچه‌ زه‌وییه‌ ڕواوه‌، بۆیه‌ش به‌ (خدر) ناوبراوه‌، كه‌ ﴿به‌زمانی عه‌ره‌بی (خضر)ه‌﴾و، ئه‌مه‌ش له‌ (خضرة)و (اخضرار)ه‌وه‌ ده‌رهاوێژراوه‌، كه‌ ماناكانی (سه‌وزایی) و(سه‌وزبوون) ده‌گه‌یه‌نن. چه‌ند شیكارو لێكدانه‌وه‌یه‌كی تریش له‌سه‌رهۆی ناوبردنی به‌ (**خضر**) هه‌یه‌، كه‌ ئێمه‌ ئاوڕیان لیٚ ناده‌ینه‌وه‌، چونكه‌ له‌ڕێی فه‌رمووده‌یه‌كی ڕاست (صحیح)ه‌وه‌ جێگیرو سه‌لمێنراو نیه‌، بۆیه‌ ته‌نها ده‌ست به‌و فه‌رمووده‌یه‌ی پێشووه‌وه‌ ده‌گرین، له‌ فه‌رمووده‌ی (صحیح)یشدا ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ نیه‌، كه‌ له‌ (ضعیف)و (موضوع)ه‌كاندا هه‌ن.

---

(١) البخاري (٦٠) كتاب الانبياء و باب (٢٧) حديث الخضر مع موسى عليهما السلام، حديث رقم (٣٤٠٢).

(٢) بڕوانه‌ (فتح الباري، ٦: ٤٣٣).

## چەند لایەنێکی نەزانراو لە ژیانی (خدر) دا.

ئەی (خدر) کێیە؟ ئێمە هیچی لەبارەوە نالێین.. بێگومان قورئانی پیرۆزیش تەنها لەبۆتەی ئەو گەشتەی لەگەڵ (مووسا)دا بۆی باس کردووین، کە لە سوورەتی (کهف)دایە. فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەریش ﷺ تەنها بڕێکی کەمی خستۆتە سەر ئەو باسەی قورئان، کە لەو گەشتەی لەگەڵ (مووسادا) هێناویەتی. دەنا هەرباس‌و شیکارێکی دی لەمەڕ ژیانیو، ڕەچەڵەکیو، کاروباری ئەو گەشتەو دوای گەشتەکەش، هیچی وایان لە سەرچاوە ڕاستەکانەوە لەبارەوە نەهاتووە. ئێمەش هیچ شتێك لەبارەی ڕەگەزو ڕەچەڵەکیەوە نازانین، هەروەها هیچ شتێکیش دەربارەی سەرەتای ژیانیو منداڵیو لاوێتیی نازانین. هەروەك هیچ زانیاری یەکیشمان دەربارەی ئەو گەلەشەوە نیە، کە لەگەڵیاندا ژیاوە، پاشان ناشزانین، کە ئاخۆ لە هۆزی (بنو اسرائیل) بووە، یان لە هۆزێکی دی. دیارە ناوی ئەو شوێن‌و وڵاتەش نازانین، کە تێیدا نیشتەجێ بووە. ئەی ئاخۆ دوای ئەو گەشتەی لەگەڵ مووسادا چیی بەسەرهاتووە؟ هیچ شتێك لەمبارەیەشەوە نازانین..

خوداش هەر خۆی دەزانێت، کە دوای ئەوەی لە (مووسا) جیابۆتەوە بۆ کوێ ڕۆشتووەو، لە کوێدا نیشتەجێ بووەو، دوای ئەوەش چەندساڵ ژیاوەو، لەکوێ مردووەو، چۆن مردووەو، لە کوێش نێژراوە؟! هەموو ئەم پرسیارانەش هیچ وەڵامێکیان لەلای ئێمە نیە، چونکە لە سەرچاوە ڕاست‌و جێ متمانەکاندا دیاری نەکراون. ڕاستە کە هەواڵزان‌و چیرۆك ناسان، دەربارەی ئەم مەسەلانە دواون‌و هەوڵی ڕوون کردنەوەیان داوەو، بیروڕای جیاوازو لێکنەچووشیان لەسەر وەڵامەکانیان هەیە.

بەڵام لەئاست هەموو وتەو بیروڕاکانیاندا هەڵوێستە دەکەین‌و گومانیشیان لێ دەکەین‌و، وتەکانیان نالێینەوە، چونکە وتەو بیروڕاکانیان لەو سەرچاوە ناڕاستانەوە

وەرگرتــووە، بەتایبــەتیش لــە دەقــە ئیــسرائیلییەکانو هــەواڵو بەســەرهاتە ئەفسانەییەکانی (بنو اسرائیل)ەوە.

بۆیە لێرەدا ئەوەندەی کە هاوەڵان (صحابە) لەم بارەیەوە پێی قایل بوون ئێمەش هەر بەوەندە قایل دەبینو ئـەو هێنـدە زانیارییانـەی کـە لـە قورئـانو سـوننەتەوە دەربـارەی هـاتوون بەسمانـەو، هـەوڵی ڕوون کردنـەوەی ئـەو لایەنـە نەزانراوانـەی بەسەرهاتی (خدر) نادەین.

## "وتەی ڕاستترین، ئەوەیە (خدر) پێغەمبەرە"

زانایـان هـاوڕا نـین لەسـەر حەقیقـەتی بەسـەرهاتی (خـدر)، کـە ئـاخۆ ئـەو پێغەمبەرێکی خودا، یان پیاو چاکێکی خودا بووە؟!

هەندێك زانا لەو بڕوایەدان، کـە پیاوچـاکێكو دەسـەڵاتدارێك بـووە، بێئـەوەی پێغەمبەر بووبێت. هەندێك کەس لە سۆفییەکانیش گوتوویانە گوایە نـاوبراو پیـاو چاکێکی خواناس بووەو، بە پڕوپاگاندەی خۆیشیان گوایـە خوانـاس لـە پێغەمبـەر باشترە، وەك یەکێك لەو سۆفیانەش لەمبارەیەوە گوتوویەتی:-

**مقام النبـوة في برزخ فويق الرسول و دون الولي**

لەم دێرە شعرەدا لای ئەوان پیاوچاكو خواناس (ولی) لـە بـەرزترین پلـە دایـەو پاشـان نێـرراوی هەواڵبـەری خـودا (نبـي)، کـە پـەیامی بـۆ نـەهاتووەو تـەنها پەیامەکانی پێش خۆی بەخەڵکی گەیاندووە، لە پلەیەکی خوارتردایەو، ئینجا هـەر بەڕای سۆفیەکان خۆیان، پێغەمبەر (رسول)یش لە نـزمترین پلـەی لای خوادایـە.. بەڕاستی خوداش زۆرزۆر بەرزو بالاترە لەوەی، کە ئەوان باسی دەکەن.. ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ الإسراء﴾، بەڵام کۆمـەڵی زانایـان تێکـرا لـە

زانایانی تەفسیرو زانایانی (اصول) و(فەرموودە)و مێژوونووسانیش وتەو ڕایان لەسەر ئەوەیە، کە (خدر) پێغەمبەر بووەو، دەڵێن "هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح) نیە لەسەر ئەوەی، کە بە ڕاشکاوی بڕیاری لەسەر پێغەمبەرێتیی دابێت" بەڵام فەزای چیرۆکەکەی لەگەڵ —مووسا) لە قورئاندا، سرووش‌و ئاماژەی پێغەمبەرێتییەکەی دەگەیەنێت.

## چەند بەڵگەیەك لەسەر پێغەمبەرێتیەكەی

ئەو بەڵگانەی کە لە ئایەتەکانی ئەم چیرۆکەوە لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی (خدر) وەردەگیرێن ئەمانەن :-

١- ئایەتی ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا... ﴿٦٥﴾ الكهف﴾ ئەو ڕەحمەتەی لەم فەرمایشتەی خوادا باسکراوە، ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتییەو، خودا بەوی بەخشیوە.. (خدر) خۆیشی جەختی لەسەر ئەو ڕەحمەتی پێغەمبەرێتییە کردووە، کە پێی بەخشراوە، ئەوەبوو لە مەسەلەی لێکدانەوەی کارەکاندا بە مووسای گوتووە: (کە ئەو کارانەی ئەو لە ڕەحمەتێکی خودای پەروەردگارتەوە بووە) ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ بەمانای هەرسێ کارەکەی خۆم بەڕەحمەتی خودای پەروەردگارتەوە کردوە، واتە هەرسێ کاری: (عەیبدارکردنی کەشتییەکە)و (کوشتنی منداڵە نەوجەوانەکە)و (ڕاستکردنەوەی دیوارەکە).

٢- فەرمایشتی خودا ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ ئەوە دەگەیەنێت، کە خودا زانیاریی لەسەر چەند مەسەلەیەکی گرنگ پێگەیاندووەو، هەواڵی لەسەر چەند شتێکی نەزانراویش پێداوە. زانیاری لای خوداش، واتە (العلم اللدنی)ی نێو ئەم

ئایەتەش ئاماژەیە بۆ پێغەمبەرایەتییەکەی.. بەڵام بەپێی تێگەیشتنی هەندێك توندڕەوی سۆفی گوایە ئەوە زانستیی ناوەکییە لە ڕای ئیلهام وەرگرتنەوە.. ئەمەش ڕاست نیەو وانیە.

٣- وتەی مووساش کە بە خدری گوتبووی (ئایا ڕێم دەدەیت لەگەڵتا بڕۆم بۆ ئەوەی چەند زانیارییەك لەوانەی دەیزانیت فێریانم کەیت ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ جا ئەگەر (خدر) پێغەمبەر نەبوایە ئەوا مووسا داوای فێربوونی زانستی لێ نەدەکردو، بەم شێوازە پڕشکۆو ڕێزەوە لەگەڵیا نەدەدواو، ئەوتکایەشی لێ نەدەکردو، بەم ڕەنگەش خۆی تەسلیم نەدەکرد، ئەوەبوو ئەم ئاخاوتنەی نێوانیان هاتەکایەوە کە خودا لە قورئاندا باسی کردون، ﴿...هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ الكهف﴾.

٤- ئەگەر (خدر) پێغەمبەر نەبوایە ئەوا پارێزراو (معصوم) نەدەبوو..ئەمەش مانای وایە لەوانەیە هەڵە لە هەندێك ڕەفتاریدا بوایە، ئیدی چۆن پێغەمبەرێکی پارێزراو شوێنی دەکەوتو زانیاریی لێوە فێردەبوو، خۆ ئەگەر لە کردارێکیش بەهەڵەدا چووایە، ئەوا چۆن پێغەمبەرە پارێزراوە، کەواتە- مووسا- دەیکردە پێشەنگو مامۆستا بۆخۆی؟ چونکە کاتێك (مووسا) شوێنی کەوتووەو زانیاریی لێ وەرگرتووەو گوێرایەڵیی کردوە، ئەوە بەڵگەبووە لەسەر عیصمەتو پارێزراویی (خدر) لە کردارەکانیدا، تەنها پێغەمبەرانیش ئەم خەسڵەتی پارێزراوییو عیصمەتەیان هەبووە.

٥- بوێریی (خدر) له کوشتنی کوڕە نەوجەوانەکەدا بەڵگەیەکە لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی، چونکە کوشتنی کەسێك تەنها بەحەق شیاوە، خۆ ئەگەر پێغەمبەرێك نەبوایە ئەوا بە کوفرو بێباوەڕیی کوڕەکەی نەدەزانی، بەتایبەتیش کە (مووسا)ی پێغەمبەری لەگەڵدایەو مووساش تا ئەوکاتە بە بێباوەڕیی کوڕەکەی نەزانیبوو، پاشن (خدر) پاساوی کوشتنی کوڕەکەی بەوە بۆ (مووسا) لێکداوەتەوە کە لەبەر حاڵەتی کافربوونەکەی کوشتوویەتی، ئەم پاساوەش دەلالەتو بەڵگەیەکی ترە لەسەرەوەی کە خودا هەواڵی کافربوونی ئەو کوڕەو فەرمانی کوشتنیشی پێ داوە.

٦- وتەی (خدر) بە مووسا (سلاویان لێ بێت) دوای تەفسیرکردنی کارەکانی: ﴿وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى﴾ بەمانای (ئەم کارە سەختانەم لەخۆمەوە نەکردووەو، بە فەرمانی شەخصیو تایبەتی خۆم نەبوە، بەڵکو خودای پاكو بێخەوش فەرمانی پێکردوون، دیارە ئەم فەرمانە خودایییەش لەڕێی سرووش (وحی)یەوە بووە.

٧- خودا گلەیی لە مووسا کردووە لەسەر ئەوەی گوتبووی (من زاناترین کەسم) بۆیەش خودا پێی فەرمووە (عەبدێکی خۆم کە لەناوچەی پێك گەیشتنی هەردوو دەریاکە دایە لەتۆ زاناترە). کەواتە (خدر) لەو مەسەلانەدا لە (مووسا) زاناترەو ناشێت کە ئەو تەنها خواناسێك بووبێتو دیارە هەرگیز خواناسان لە پێغەمبەران زاناتر نین.

٨- وتەی (خدر) بە (مووسا) کە پێی گوتووە: (من زانستم لە خوداوە پێدراوە ئەوەی کە خودا فێری کردووم، تۆ نایزانیت، دیارە تۆش زانست لە خوداوە پێدراوەو، ئەوەی کە خودا فێری کردوویت من نایزانم)[1] ئەمەش هەر بەڵگەیەکە لەسەر پێغەمبەرێتیی (خدر).

---

(١) بۆ ئەم بەڵگانە بڕوانە کتێبی (البداية والنهاية)ی (ابن كثير)، ١: ص٢٨.

## "ئەو کەسەی نکوولّی لە پێغەمبەرێتیی (خدر) بکات، کافر نیە"

کاتێك تەماشای بەلّگەکانی زانایان لەسەر پێغەمبەرێتی (خدر) دەکەین، دەبینین چەند بەلّگەیەکی کۆششکاریی (اجتهادی)ن، نەك لە دەقە شەرعییەکەی قورئانەوە، واتە قورئانی پیرۆز بەڕوونی ئاماژەی بۆ پێغەمبەرێتیی (خدر) نەکردووەو بەڕاشکاویی دەقێکی لەسەر نەهێناوە، ئەمەش مانای ئەوەنیە، کە بەلّگەکانی پێشوو ناڕاستن، بەلّکو قورئان تەنها ئاماژەی پێدەکاتو سرووشی لەسەر دەدات. بەلاّم لەبەرئەوەی ئەوبەلّگانەی، کە دەربارەی پێغەمبەرێتییەکەین چەند بەلّگەیەکی کۆششکاریو بۆ چوونکارییین، هەربۆیەش ڕای تێکڕایی زانایانی لەسەرنیەو، هەموو زانایان یەکدەنگو تەبا نیین لەسەری، بەلّکو ئەوە جێی کۆششکارییین، جاهەتا جیاوازیی بیروڕاش لەم مەسەلەیەدا هەبێت (کە مەسەلەیەکی بۆ چوونکاریی کۆششکارییە، لەبەرئەوە هەرکەسێك نکوولّی لە پێغەمبەرێتیی (خدر) بکات، بە کافرو بێباوەڕ دانانرێت، بەلّکو تەنها پێچەوانەی کۆمەلّو جمهوری زانایان دەبێت، لەوانەشە وتەی ئەو ڕاست بێت:-

ئەمەش پێچەوانەی ئەوکەسەیە، کە نکوولّی لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرێکی خودا دەکات لەوانەی، کە بە دەقی قورئان، یان فەرموودە پێغەمبەرایەتییەکەی سەلمێنراوەو، کە بێگومان ئەوکەسەی نکولّی لە پێغەمبەرێتییەکەی بکات، کافر دەبێت، وەك ئەو کەسەی، کە نکوولّی لە پێغەمبەرێتی (ئیلیاس)، یان (یونس)، یان (سلیمان) بکات سلاّوی خودایان لێ بێت.

## "مشت ومڕی ئەوانەی گوتوویانە گوایە (خدر) تائەمڕۆ لەژیان دایە"

هەندێك كەس لە موسڵمانان ڕایان وایە، كە گوایە (خدر) زیندووەو لەو (كـانیی ژیان) (عين الحيـاة)ە ئاوی خواردۆتەوە، كە هەركەسێك لێی بخواتەوە نامرێت، تەنها لە كاتی نزیك بوونەوەی (قیامەت) دانەبێت، هەروەها ڕایان وایە گوایە (خدر) بـە پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ گەیشتووەو، تا ئـەمڕۆش هـەر زینـدووەو تـا كـاتی هاتنی قیامەت بە زیندوویتی دەمێنێتەوە. بۆ سەلماندنی ئەم ڕایەشـیان، چـەندەها ڕیوایەت‌و بەسەرهات‌و قسەو قسەلۆك‌و ئەفسانە وشتی پووچەڵیان داتاشیوەو، وای لەقەڵەم دەدەن گوایە، بە پێغەمبەری خودا محمد ﷺ گەیشتووەو دیداری كـردووە، هەروەها بەشداری (ابـوبكر)و (عمـر)و (علـی)و (عمـری كـوڕی عبـدالعزيز)یـش گەیـشتووەو، چـاوی كـەوتووە بـەزۆر كەسـی تـریش لـە زاهیـدان‌و عابیـدان‌و سۆفییەیەكان، پاشان گوایـە بەهـەموو سـاراو چۆڵەوانی‌و جێگەیـەكی چۆڵكراو دەگـەڕێت‌و، خـۆی پیـشانی چـەند كەسـێكی خوانـاس دەدات‌و زانیارییـان پـێ دەگەیەنێت‌و خۆراكیان پێ دەدات‌و قسەشیان لەگەڵ دەكات.. لەنێو خەڵكیدا زیاتر سۆفییەكان ئەم قسەوقسەلۆك‌و ئەفسانەو بەسەرهاتە ناڕاستانە دەربـارەی (لـەژیان دابوونی خدر) دەگێڕنەوە. لـەو زانایـەش، كـە گوتبوویـان گوایـە (خـدر) لـەدوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ هەر لە ژیـان دابـووە " ئیمـامی (نـووی) و ئیمـام (ابـن الصلاح)و (سیهیلي)و چەند كەسێكی تریان بوون".

ئیمامی(نووي) لەم بارەیەوە گوتوویەتی : (زۆربەی زانایان گوتوویانە: (خدر) لە نێو مان دادەژی، ئەمەش بەڕای سۆفیەكان، كە هەموویان تەباو یەكڕان لەسەر ئەم وتەیە. هەروەها بەڕای چاكە خوازان‌و زانیاران، بەسەرهاتەكانی ئەوان، كە دەربارەی دیتنی (خدر)و لەگەڵیان دانیشتن‌و وەرگرتنی زانیاریی لێوەی‌و، پرسیار لێكردنـی‌و

وەڵامدانەوەی‌و، بوون‌و وجودیی لەشوێنە پیرۆزەکان‌و جێگەکانی چاکەکردندا، زۆرترن لەوەی بژمێردرێن‌و، بەناو بانگترن لەوەی باس بکرێن) هەر لەم بارەیەوە (شێخ ابو عَمرو بن الصلاح) لەفەتواکانیدا گوتوویەتی: (خدر لەلای کۆمەڵێ زانایان‌و پیاوچاکان‌و خەڵکی عەوامیان زیندووە، بەڵام هەندێك لەزانایانی فەرموودە نکوولّی لەم حاڵەتەدەکەن))[1].

بەڵام هیچ دانەیەکیان بەڕاست (صحیح)یەکلانەبۆتەوە، چونکە هەموو ئەو گێڕانەوەو ڕیوایەتانە لەنێوان لاوازو دانراو (ضعیف وموضوع)دان‌و هیچ یەکێکیشیان نەگەشتۆتە پلەی ڕاست (صحیح).

هەربۆیەش (ابن حجر) لە (ابو الخطابی کوڕی دحیه)وە، وەڵامێکی ناوبراو واتە (ابو الخطابي ) لەدژی (سهیلی) هێناوە کەڕێی لەسەر ژیانی (خدر)ە لەدوای ناردنی دوایین پێغەمبەرەیشەوە کە (ابو الخطاب) لەبەرامبەر وتەکەی (سهیلی)دا گوتوویەتی.. (ئەو ڕێگایانەی (سهیلی) ئاماژەی بۆ کردوون، هیچیان ڕاست نین‌و دیداری (خدر) لەگەڵ هیچ پێغەمبەرێکی تردا نەسەلمێنراوە، تەنها لەگەڵ (مووسا)دا نەبێت کەخودا بەسەرهاتەکەیانی لەقورئان داگێڕاوەتەوە.

هەروەها هەموو ئەو وتەو بیروڕایانەی لەسەر لەژیان دابوونی (خدر) گێڕراونەتەوە بەتێکرای بڕیاری زانایانی (نەقلّ) ڕاست‌و دروست نین، چونکە هەرکەسێك کە هەواڵێکی لەو بارەیەوە گێرابێتەوە هۆیەکەی دیاریی نەکردووە، سائیتر لەبەر ئەوەی نەیزانیوە، یان لەبەر ئەوەی لای زانایانی فەرموودە ڕۆشن بووە ئەو ڕیوایات‌و بەسەرهاتانەش کە لەلایەن شێخەکانەوە هاتوون لە دەرووی پێ سەرسام بوونەوەیە، دەناچۆن کەسێکی ژیرو عاقڵ بۆی دەشێت کەسێکی نەناسراو ببینێت وپێی بڵێت (من فلان کەسم)و ئیدی خێرا بڕوای پێ بکات)[2].

---

(١) تهذيب الاسماء والغات ١: ١٧٦-١٧٧

(٢) الزهر النضر في نبأ الخضر للامام ابن حجر العسقلاني، ضمن مجموعة الرسائل المنيرية:(٢: ٣٠٢).

ئیمام (ابن كثير)یش لەکتێبی مێژووەکەیدا، دوای ئەوەی چەند ڕیوایەتو قسەو قسەلۆکێکی لەسەر ژیانی(خدر) هێناوەتەوە، گوتوویەتی: (هەموو ئەو ڕیوایاتو وتەو بەسەرهاتانە لەو کەسانەوە هاتوون، کە کردوویانەتە پاڵپشت بۆ وتەو ڕاکانیان لەمەڕ لەژیاندا بوونی (خدر)، هەمووشیان لە فەرموودەکانی پلەی (مرضوع)ن، کە زۆر لاوازن وهیچ بەڵگەو پاساوێکیان لە دیندا بۆ هیچ مەسەلەیەك لێ دەرناهاوێژرێت. زۆربەی حیکایەتو بەسەرهاتەکانیش لە (اسناد)ێکی لاوازەوەن، بەڵام دەشێت بەپوختی بەو جۆرە (صحیح)ەش دابنرێن، کە لە کەسانی متمانە پێنەدراویشەوە گێڕرانیەوە، سائیتر ئەو کەسانە لە هاوەڵان بن، یان لە دوای هاوەڵانو کەسانی دی، ئەمەش ئەگەری هەڵەی تێدایە).

پاشان (ابن كثير) گوتوویەتی: "شیخ (ابو الفرج بن الجوزي) ـ خوا لێی خۆشبێت ـ لە کتێبەکەیدا (عجالة المنتظر في شرح حالەت الخضر) بەرپەرچی ئەو جۆرە فەرموودانەی داوەتەوە، کە لە پلەی (موضوع) دانو وای ڕوون کردوونەوە، کە لە دەسهەڵبەستەکان (موضوعات) بن، هەروەها لە ئاسەواری هاوەڵانو شوێنکەوتوان (تابعین)ی دوای ئەوانی داناون، بۆیەش لاوازیی پاڵپشتەکان (ضعف اسانید)یانی بەدەسنیشانکردنی حاڵەتو نەزانینی خاوەنەکانیشیانەوە ڕوون کردۆتەوە. لەمەشدا کارێکی جوانو بەپێزی ئەنجام داوەو ڕەخنەی چاکیشی لێیان گرتووە"[1].

---

(١) (تهذيب الاسماء واللغات (١٧٦-١٧٧).

## ڕای ڕاستتر: مردنی خدره پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ

زانایانی لێکۆڵیار ڕایان وایە، کە (خدر) ماوەی تەمەنی خۆی لەژیان دابەسەر بردووەو، پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ کۆچی دوایی کردووە.. لەو بڕوایەش دان، کە ماوەی ژیانی کەس نازانێت چەندە، تەنها خودا خۆی دەیزانێت.. هەر تەنها خوداش وەختی مردنیو چۆنیەتی مردنەکەیو شوێنەکەی دەزانێت.. بۆیەش هیچ کەسێك ئەم زانیاری یانەی لانیە، چونکە هیچ فەرموودەیکی ڕاست (صحیح)) لەوبارەیەوە نیە. هەروەها زانایانی لێکۆڵیار وتەکانی ئەوکەسانەیان ڕەت کردۆتەوە کە بەبێ لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوە دەربارەی (زۆرییو درێژخایەنی ژیانی خدر)و (بەردەوامی لەژیاندا تا هاتنی قیامەت)، دواون، چونکە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو پەسەندکراویان لەوبارەیەوە نیە.

ئەو زانایانەش کە وتەو بیروڕایان لەسەر ئەوەیە، کەوا (خدر) پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ مردوە، وەك (بخاری)و (ابراهیم الحربی)و (ابن الجوزی)و (ابن کثیر).

هەروەها (ابن حجری عسقلانی)یش لە کتێبەکەیدا(الزهر النضر في نبأ الخضر)دا مەیلی بەلای ئەم ڕایەدا هەیە. هەموو ئەم زانایانە چەند بەڵگەیەکیان لەسەر ئەو ڕایەیان هێناوەتەوە. بۆ نموونە (امام ابن کثیر) لە (البدایة والنهایة)دا پوختەی بەڵگەکانی دیاری کردووە، لەو بەڵگانەش، کە دەربارەی مردنی (خدرن- لەپێش هاتنی پێغەمبەردا- ﷺ):-

١- فەرمایشتی خودا: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ الأنبياء﴾.. واتە: " ئێمە ژیانی نەمرییمان پێش تۆ بەهیچ کەسێك نەداوە، ئایا ئەگەر تۆ بمریت ئەوان بەنەمریی دەمێننەوە (لەکاتێکدا

چاوەڕوانی مردنی تۆن)"، واتە کافران هەمیشە بەتەمای نەمانی پێغەمبەری خودا بوونو وایان دەزانی خۆیان نامرن. کەوابوو ئەم ئایەتە بڕیاری خودایە لەسەر ئەوەی کەهیچ کەسێك لەسەر زەوی بە نەمریی نامێنێتەوە (خدر)یش لەو کۆمەڵە مرۆڤانەیە کە هەردەبێت بمرن. بۆیە ئەویش لەچوار چێوەی واتاو چەمکی ئایەتەکەدایەو، هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح)یش لەئارادانیە کە (خدر)ی بەتایبەتی لە مردن جیا کردبێتەوەو بڕیاری لەسەر نەمر بوونی لەدنیادا دابێت.

٢- فەرمایشتی خودا: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ آل عمران﴾.. واتە:" ئەوە بەیاد بێننەوە کاتێك خودا پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرت لەسەر ئەوەی کە زانستو کتێبی خوداو حیکمەتمان پێگەیاندنو، لەدواییدا کە پێغەمبەرێکی بڕواپێکارو بەڕاست دانەری زانستو کتێبەکانتان هات، دەبێت باوەڕی پێبێننو ویاریدەدەرو سەرخەری بن، ئینجا پێیانی فەرموو: (ئایا بڕواتان بەوە هەیەو بڕیارتان لەسەر جێبەجێکردنی ئەوپەیمانو بڕوا پێ هێنراوەتان داوە، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ بڕواو بڕیارمان لەسەری داوە، ئیدی خوداش پێی فەرموون: دەی ئیتر ئێوە لەسەر ئەم بڕیارو پەیمانە شاهیدبنو منیش لەگەڵ ئێوەدا ئاگادارو شاهیدی ئەم حاڵەتەم).

(ابن عباس) لەبارەی مانای ئەم ئایەتەوە گوتوویەتی: (خودا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت، پەیمانیشی لێ وەرگرتووە لەسەر ئەوەی لەکاتێکدا ئەگەر (محمد)ی بە پێغەمبەر ناردو ئەویش لەژیان دابوو ئەوا دەبێت باوەڕی پێ بێنێتو یارمەتی بداتو سەرخەری بێتو، پاشان ئەو پەیمانە لەنەتەوەکەشی

وەربگرێت کەوا لەماوەی ژیانی ئەواندا خوا محمد ﷺ بە پێغەمبەر بنێرێت بۆ لایان، دەبێت باوەڕی پێ بێننو یاریدەدەرو سەرخەری بن.

جا خدریش (سائیتر ئەگەر پێغەمبەرێك یان پیاوچاکێکی خوداش بووبێت) لە هەر دوو حالەتەکەدا ئەوەی لێ خوازراوە باوەڕ بە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ بهێنرێتو جا ئایا ئەمە لە واقیعدا ڕووی داوە کە کاتێك خودا (محمد)ی بە پێغەمبەر بۆ لای خەڵکی ناردووە، (خدر) لەژیان دابووبێتو موسڵمان بووبێت لەسەر دەستی پێغەمبەرو بەیعەتی پێ دابێتو پەیڕەویی پەیامەکەی کردبێت؟!

٣- جامادام ڕێی ڕاستتر هەر ئەوەبێت کەوا (خدر) پێغەمبەر بووە، ئەوا ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەری خودا محمد ﷺ لەژیاندا بوایە جوانترین ئاکاری ئەوە دەبوو کە بهاتایە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ولەگەڵی دابوایە، بەڵام وای نەکردووە چونکە لەو سەردەمەدا (خدر) مردوویەکی ژێر خاك بووە.

٤- بەتاکە فەرموودەیەکی (صحیح)یش گەیشتنی (خدر) بەپێغەمبەری خودا ﷺ باسنەکراوە، هەروەها نەنوێژکردنی لەدوایەوەو نەجیهاد لەگەڵیدا لە جەنگەکاندا، خۆ ئەگەر (خدر) زیندووبوایە هەموو ئەو کارانەی لەگەڵدا ئەنجام دەدا.

٥- بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای جەنگی (بەدر)دا لەخودا پاڕایەوەو داوای لێکرد کە موسڵمانان سەربخات، ئەوەبوو ڕووی کردە خوداو فەرمووی: (خودایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسڵمانە لەم جەنگەدا لەنێو بەریت، ئەوا لەسەر زەوی ناپەرسترێیت ) لەگەڵ ئەو کۆمەڵە موسڵمانەش دا کەسانی وەك (ابوبکر)و (عمر)و باشترینی هاوەڵان هەموو، هەروەها فریشتەی خودا (جبریل)و باشترینی فریشتەکانی تری خودایان لەگەڵ دابوو، جائەگەر (خدر)یش زیندوو بوایە ئەوا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە کەسەدا دەبووو بەرزترین پلەو پایەی لەنێویان دا دەبوو.

٦- لەوانەیە هەندێك کەس پڕوپاگاندەی ئەوە بکات گوایە "(خدر) لەو جێگایانەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووە ﷺ، بەڵام هیچ کەسێك لە خەڵکی نەدیدوە"..

بێگومان ئەم پڕوپاگاندەیەش پووچەڵو ناپەسەندە، چونکە لەبۆتەی ئەندێشەو خەیاڵکاریو ئیددیعاکردنەوەیە، سەلماندنیشی ئاتاجی بە بەڵگەی ڕاستو دروست هەیە.

٧- حیکمەت لەخۆ حەشاردانی (خدر)و ڕۆشتنی بۆ چیاکانو بۆ نێو ئەشکەوتو پەناگەو دەشتەکان چیە؟ ئەی بۆچی لەگەڵ خەڵکیدا ناژیو، بۆچی نوێژەکانی بە جەماعەت لەگەڵیاندا ناکات؟ ئایا ئەم جۆرە ڕەفتارانە لە پێغەمبەرێکی بەڕێز دەوەشێتەوە؟.

٨- گەر (خدر) زیندووبوایە داوای ئەوەی لێدەکرا کە زانست بڵاوکاتەوەو خەڵکی فێرکاتو، فەرموودەکانی پێغەمبەری خودایان ﷺ پێبگەیەنێتو ڕاست (صحیح)ەکانی لە لاواز(ضعیف)ەکانیو چاکەکانی لە خراپە هەڵبەستراوەکانی جیا بکردایەتەوە.. هەروەها ئەوەشی لێ دەخوازرا کە فەرمان بەچاکەو ڕێگیری لە خراپە بکات. ئەمەش ئەنجام نەدراوە (چونکە لەژیان دا نیە).

٩- (مسلم) لە (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ەوە (خوایان لێ رازی بێت) ئەوەیان گێڕاوەتەوە کە شەوێکیان نوێژی (عیشا)یان لەدوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ کردووەو (ئەوەش لەکۆتایی یەکانی ژیانی پێغەمبەر دابووە) جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواوکردووەو سەلامی داوەتەوە، فەرموویەتی: **((أرايتكم ليلتكم هذه فأن على راس كل مائة سنة منها لايبقى ممن هو على ظهر الارض احد))**.. واتە: "ئەرێ ئێوە دیتان ئەم شەوەتان چۆن بەسەردا ڕادەبووریت. بێگومان هەر لەدوای سەری سەد ساڵێك ئەم خەڵکەی ئێستا لەژیان دایە کەسیان لەسەر ڕووی زەوی نامێنن".. (ابن عمر) واتە کوڕەکەی عومەر (عبدالله) یەو، فەرموودەکەی لێ بیستراوە، گوتوویەتی: (خەڵکی لەترسان بەهەڵە لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر تێگەیشتن، ئەوەبوو وەها لەبارەیەوە دەدوان کە گوایە دوای سەد ساڵ هیچ کەسێك لەسەر زەوی نامێنت،

بەڵام لەڕاستیدا پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەوەبوو کە دوای سەد ساڵ، یان دوای هەر سەدساڵێك کە هەرکەسێك لەوژیانــەدا بێــتو بیربکاتــەوە، دوای سەدســاڵ لەوکاتی بیرکردنەوەیەی خــۆی هــیچ کەســێك بەخۆیــشیەوە دوای (ســەد ســاڵ) بەلایەنی زۆرییەوە لەو کۆمەڵگەیەدا لەژیاندا نامێننو خەڵکی ترو نەوەکانی تر لەدوای ئەوان لەژیان دا دەبن، هەربۆیەش پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەدا کـە فەرمووبووی (هیچ کەسێك لەوانەی ئەمڕۆ لەژیان دان دوای سەد ســاڵ کەســیان لەژیاندا نامێننن)[1]. مەبەستی ئەوەیە کە دەبێت ئەو سەدساڵە بەسەر بــچێتو خەڵکی تر بێنە دنیاوە.

هەروەها (مسلم)یش لە (جابری کوڕی عبداللە وە) ــ خوایــان لێ ڕازی بێــت ــ گێڕاوێتیەوە کە (جابر) گوتوویەتی: (گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺ کە مانگێك پێش کۆچی دوایی دەیفەموو: ((**تسألوني عن الساعة؟ وانما علمها عنداللە، واقسم باللە ما على الأرض من نفس منفوسة تأتي عليها مائة سنة**))[2].. واتە: "ئــەرێ ئێوە دەربارەی قیامەت پرسیارم لێ دەکەن، لەکاتێکدا زانیاریو وەڵامەکــەی هــەر لەلای خودایە، سوێند بێــت بــەخودا دوای تێپــەربوونی سەدســاڵ هــیچ کەســێکی لەدایکبووی نێو ئەم ژیانەی ئەمڕۆمان لەم دنیایەدا نامێنێت" واتە خەڵکانی تر لە دایك دەبن.

جا ئەگەر دەربارەی (خدر)یش وابڵێین گوایە تاکــاتی ڕەوانــەکردنی پێغەمبــەری خودا ﷺ ژیابێتو (کە ئەم وتەیەش ڕاستی نیە) ئەوا هەردەبوو دوای سەد ســاڵێك لە مێژووی درکاندنی ئەم فەرموودەیە بمردایە..

ئیدی لەدوای هەموو ئەم بەڵگانە دان بەوەدا دەنێین کە (خدر) ئێستا لەژیانــدا نیەو، بەڵکو زەمەنێك پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ کە خــودا خــۆی دەزانێــت

---

(١) مسلم (٤٤) كتاب فضائل الصحابة (٥٣ باب قوله (٣) حديث رقم (٢٥٣٧).

(٢) مسلم – نفسى الكتاب والباب –حديث رقم (٢٥٣٨)

کەی بووە، مردووە. هەربۆیەش لەڕای ئەم بەڵگانەوە داواکارین هەموو ئەو قسەو باس‌و بەسەرهات‌و وتەو بیروڕایانەی دەربارەی (نەمریی خدر) گێراونەتەوەو کە چەندین ئەفسانەو وتەی پووچەڵ‌و ناهەق دەدەنە پاڵ(خدر)و هیچ بارێکی ڕاستەقینەشیان نیە، هەموو بەلاوەنرێن‌و پشتیان پێ نەبەسترێت.

## "مەسەلەی زانستە خودایی یەکە (العلم اللدني)"

قورئانی پیرۆز لە مەسەلەی زانستەکانی (خدر)دا ئاماژەی بۆ ئەو لایەنە کردووە کەوا لە خوداوەیەو، خودا لەلایەن خۆیەوە ئەو زانیارییەی پێداوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾، واتە: (خدر بەندەیەکمان بوو کە لە ڕەحمەتی تایبەتیی خۆمان پێ‌بەخشیبوو زانست‌و زانیاریی تایبەتیشمان لەلایەن خۆمانەوە بەئیلهام پێ بەخشیبوو).

دیارە ئەم زانستەش کەخودا بە(خدر)ی دابوو، (مووسا) ـ سڵاوی لێ بێت ـ نەیدەزانی، هەر بۆیەش هاتبوو بۆلای تاکو ئەو زانیارییانەی لێوە فێر بێت کە خۆی نەیدەزانیین کەچی هەندێك زانای موسڵمان لەبەردەم ڕستەی ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾دا هەڵوێستەیەکیان کردووەو مەسەلەی زانستی خودایی (العلم اللدنی)یان لێوە دەرهێناوەو کردوویانەتە بەڵگە بۆ چەند شتێکی سەیرو سەمەرەو، کردووشیانەتە ناونیشانێك بۆچەند وتەیەکی پووچەڵ‌و ناڕاست لەم ڕووەوە زیاتر سوفییەکان ئەم ڕستەیەی نێو ئایەتەکەیان کردۆتە بەڵگەیەك بۆ جیاکردنەوەی (زانستی شەرعی) لەزانستی خودایی‌و جیاکردنەوەی ڕواڵەت (ظاهر) لە ناواخن (باطن)و جیاکردنەوەی (شەریعەتیش لە (حەقیقەت): ئیمامی (ئالووسی) گوتوویەتی: (لەلای ئەوان واتە لای –سۆفییەکان- ڕێسایەکی بنەڕەتی بۆ سەلماندنی

زانستی خودایی هەیەو، بەڵام بەم هۆیەوە نـاوی (زانـستی حەقیقـەت) و(زانـستی ناواخن)ی لەسەر بڵاوبۆتەوە)[1] کە لە عەرەبیدا بە (علم الحقیقة) و (العلم البـاطن) ناوبراون.

تەفسیرکارانی سۆفی وتەی سەیرو سەمەرەیان دەربارەی زانستی خـودایی (العلـم اللدنی) گوتووەو حەقیقە تیان لە شەریعەتو ڕواڵەتیان لە نـاواخن جیاکردۆتـەوەو، لە تەفسیرکردنی ئـەم ئایەتانـەو هاوشـێوەکانی تریانـدا چـەندین شـتی هەڵـەو دژ بەیەکیان تێکەڵو پێکەڵ کردووە.

## "بڕگـەیەك لە تەفسـیـری (مهـایمی)"

(علی‌ی کوڕی ابراهیمی المهایمی) خـاوەنی تەفـسیری (تبـصیر الـرحمنو تیـسیر المنـان) یەکێکە لەو تەفسیرکارە سۆفییانەی، کە ئەم ئایەتەو ئایەتـە هاوشـێوەکانی تری بەپێی ڕێبازە سۆفییگەرییەکەی خۆیان لێك داوەتـەوە، لێـرەدا بڕگەیـەك لـەو تەفسیرەی دەخەینەڕوو،کەلەم باریەوە گوتوویەتی:

" فوجدا عبدا: مووساو یاوەرەکەی بەندەیەکیان بینی، کە هـەرگیز حەقیقـەتی ئەوپەڕی کەماڵو تەواوێتیی نازانرێن، چونکە (من عبادنا) لەو بەندانـەی ئێمەیـە، کە دیاردەکانی گەورەییمان (گەورەیی خودا)ی تێدایەو، ئەوەبوو ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ کەلەلایەن خۆمانەوە ڕەحمەتو سۆزو میهرەبانیمان بۆ نـارد، ئەمـەش (بەڕای مهایـمی) ڕۆشن بوونەوەیەکی شایەتی دانێتییە بۆ لەناوچـوونیو، بۆیـەش (لذلك علمناه) بەبێ میانگیریی مرۆڤێـكو فریـشتەیەك لەلایـەن خۆمانـەوە ﴿مِن

(١) روح المعاني ١٦: ٣٣٠

لَّدُنَّا﴾ زانستێکی بەنرخو بەهادارمان (علما) فێرکردووەو زۆر کەس لە پێغەمبەرانیش زانستی ئاوایان پێ نەدراوە. (مووسا)ش کە (یوشع)و هەموو پێغەمبەرانی تری (بنواسرائیل) شوێنکەوتووی بوون، لە (خدر)ی پرسیوە (ئایا شوێنت کەوم؟ ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ﴾ بەمانای ئایا لەڕووی زانستەکانتەوە شوێنت کەومو واز لە زانستەکانی خۆم بێنم بەومەرجەی ﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ﴾ فێرم بکەیت سەرەڕایی ئەوەی من لە مرۆڤێکیشەوە زانست وەرناگرم بەڵکو لە خوا، یان لە فریشتەکانیەوە فێرم بکەیت لە وزانستەی ﴿مِمَّا عُلِّمْتَ﴾ لەوەی کەلەخودای پەروەردگارتەوە ﴿رُشْدًا﴾و لە سەروو ڕێنمایی خەڵکی ڕواڵەتبینەوە فێرت کراوەو دەیزانیت وەك زانینیەکانی (حەق) لە هەندێك لەو کردارانەدا، کە بە ڕواڵەت بە ناشیرین دەردەکەون).. (قال) (خدر)یش پێی گوتووە: (بێگومان ئەم زانستە لەو زانستانە نیە، کە لایەنە باشەکەی بە وردترین دیتو تێڕوانین دەرکەوێت، بەڵکو زانستی وایان تێدایە، کە بەکردەوە لە دیمەنێکی ناشریندا دەردەکەوێتو، بەم هۆیەوەشەوە خێرا خەڵکی ڕواڵەتبین نارەزایی لەسەر دەردەبڕن، لە کاتێکدا قەدەغەیە، کە لایەنە باشو لەبارەکانی لەوەختی ڕوودانی کردارەکەدا پێیان بگوترێت، هەر بۆیەش نارەزایی دەرنەبڕین لەسەری، ئاتاجی بەهێمنیو ئارام گرتنێکی زۆر هەیە. قال ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ﴾ تۆ هەرگیز ناتوانیت، کە ئەگەرچی لەگەڵیشم دابیت (مَعِيَ)و، ئەگەر چی سەرسامیش بیت بەمن (بەڵام ئارامێك ناگریت ﴿صَبْرًا﴾ کەواتە مانای ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ بەڕای (مهایمی) ئەوەیە، کە (تۆ ئەی مووسا ئەگەرچی لەگەڵ من دا بڕۆیتو بەزانستو زانیاریم سەرسام بیت، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئارام ناگریت لەسەر ئەو کردەوانەم، کە بەپێی زانستەکانی خۆم ئەنجامیان دەدەم، کە لەبەرچاوی تۆ بەڕواڵەت ناشیرین بن. ئیدی چۆن ئارام دەگریت ﴿ وَكَيْفَ

تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا﴾ لەسەر ئەوە کردەوەیە،کە ڕواڵەتە ناشیرینەکەی هاتۆتە بەرچاو، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ هەواڵو زانیارییەکت لەسەری نیە ﴿لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا﴾ هەواڵو زانیاری یەت نیە، کە لایەنە چاکە شاراوەکەیت بۆ دەردەخاتو، لایەنەناشیرینەکەیت بۆ پێ دەشارێتەوە؟!) مووساش (قال)گوتی " من هەرچەندە لە خەڵکی ڕواڵەتبینم (لەوانەی کە هیچ ئارامی یەکیان لەسەر زانینی ناواخنی کارەکان نیەو، کە هەر تەنها ڕواڵەتی دەرەوەی کارەکان دەبینن) هەرچەندە لەوجۆرە خەڵکەش بم، بەلاّم ﴿قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا﴾: بەپشتیوانی خودا دەمبینیت ئارام دەگرم بەهۆی خۆ زاڵ کردن بەسەرئەو نەریتەم دا، کاتێك جڵەوی خۆم دەدەمە دەست تۆو شوێنت دەکەومو سەرسام دەبم پێت)، ئیدی چۆن نەفسم لەتۆیاخی دەبێت (وَ) کاتێك دوات کەوتم ﴿وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا﴾ هیچ فەرمانێکت ناشکێنمو سەرپێچی لێ ناکەم تەنانەت، گەر بەڕواڵەت واش بێت گوایە لەڕاستیدا سەرپێچی یە لە خودا ئەگەر (گوێرایەڵیی خودای تێدا ببینم، چونکە لێ ڕادیتنی ناهەمواری لە کەسێکدا کە خوا دەروونی پاکژ کردۆتەوە نارەزایی یە لە فەرمانی خوداو (پەنا بەخوا لەمە) جا کاتێك ئەم وتەیەش وەك وەلاّمدانەوە بێت لەسەر وتەی (خدر)، کە پێی گوتبوو (تۆ ئارامێك لەسەر کارەکانی من ناگریت ﴿إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ کەچی لەڕاستیشدا ئەو ئارامییەی لێ نەبینی، ئەگەرچی چاوپۆشیی حاڵەتی نائاسایی لێ کردبێت. (خدر) پێی گوتووە ﴿قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي﴾ ئەگەر لەڕووی زانستو زانیارییەکانەوە دوام دەکەویت) ئەوا ﴿ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ﴾ دەربارەی هیچ کارو مەسەلەیەك پرسیارم لێ نەکەیت، ئەمە جگە لە نکوولی لێکردنیش، چونکە ئەم جۆرە زانستەی (خدر) لە ڕێی پرسیارو وەلاّمەوە نیە، بەڵکو لەڕێی بەخشینی بەلێشاوی خوداوەیە بەسەر ئەوکەسەدا، بۆیە دەبێت ئەو کەسەش

چاوەڕوانی لێ بکات، دەبێت ئارامیشی لەسەر بگرێت.. ﴿حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ﴾ تاکو لەنێو دڵت داو تەنانەت، گەر لەڕێی ئەو گەیاندنە ڕاستەوخۆیەی خوداشەوە، یان گەر لەڕێی زمان وتنەوەش بێت ﴿مِنۡهُ ذِكۡرٗا﴾، هەواڵی کارە نائاساییەکەو مەبەستە شاراوەکەیت پێ بگەیەنم)"[1].

ئەمە پوختەی وتەی (مهایمی) بوو، کە خستمانە ڕوو بەو پێودانگەی گوزارشت لە قوتابخانەی تەفسیری سۆفیگەرییانەی قورئان دەکات و، یەکێکیشە لەوانەی باوەڕیان بە مەسەلەی زانستی خودایی هەیە (کەخودا بەلێشاو خستبێتیە دڵی هەر کەسێکەوە بەخواستی خۆی) و، پاشان یەکێکە لەوانەی جیاوازیان لەنێوان (ڕواڵەت و ناواخن)و (شەریعەت و حەقیقەت)دا کردووە. کاتێك بەوردییش سەرنج لەم وتەیەی پێشووی ناوبراو بدەین، دەبینین چۆن مانا قورئانیەکەی دوور خستۆتەوەو، تەنانەت چۆن بەشێوەیەکی دیار دەسکاریی مانا قورئانیەکەی کردووەو شێواندوویەتی و، ڕستە قورئانیەکانیشی کردوونە شاهێد بۆ تێگەیشتنە سۆفیگەرییە شارراو (باطني)یەکەی، کە دەربارەی زانستی خودایی (العلم اللدنی)و سرووشی بە لێشاو بە سەردا بەخشراو (الفیض الالهامي)یش دەری بڕیوە.

## بڕگەیەك لە تەفسیرەکەی (اسماعیل حقی)

دوای وتەی (مهایمی) دێینە سەر وتەی ڕاڤەکار (مفسر)ێکی تر لە پێشەوایانی ڕێبازی سۆفیگەری، ئەویش (اسماعیل حقی البروشوی)یە، کە کتێبێکی تەفسیری بە ناوی (ڕوح البیان)ەوە داناوە.

---

(١) تبصیر الرحمن وتیسیر المنان للمهایمي (١: ٤٥١-٤٥٢).

جا کاتێك ئایەتەکانی تایبەت بە چیرۆکی (مووساو خدر)ی تەفسیر کردووەو، گەیشتۆتە ئایەتی ﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ دەربارەی زانستی خودایی (العلم اللدنی) دواوەو، لەم ڕووەوە گوتوویەتی (خودا بۆیە فەرموویەتی ﴿مِن لَّدُنَّا﴾ لە لایەن خۆمانەوە زانستمان بە خدر دابوو) هەر چەندە هەموو زانستەکانی تریش هەر لە لایەن خوداوەن بەڵام هەندێکیان بە هۆی فێرکردنی خەڵکی ترەوەیە کە یەکتر فێر دەکەن، بۆیە بە زانستی خودایی (لدنی) ناو نابرێت.

بەڵکو زانستی خودایی ئەوەیە کە خودا ڕاستەوخۆ بە بێ میانگیری کەسێکی دی دەیخاتە دڵی ئەو کەسەوەو پێ ی دەبەخشێت، هەروەها هیچ هۆیەکی ناسراوی دەرەکیش نیە) پاشان گوتوویەتی: (بزانە هەر زانستێك کەخودا فێری بەندەکانی بکاتو، بەندەکانیش بتوانن ئەوزانستە لەغەیری خودا (واتە لەکەسانی ترەوە) فێر بن، ئەوە لەکۆمەڵەی زانستی خودایی (العلم اللدنی) نیە، چونکە دەشێت لەلایەن (لدن) کەسانی ترەوە وەرگیرێت، نەك هەر لەلایەن (لدن)ی خوداوە)(١).

هەروەها گوتوویەتی: (مانای ﴿مِن لَّدُنَّا﴾ئەوەیە واتە (لەپلەی یەکێتی ی – ذات- ی ئێمەو پایە بەرزی یەکەیەوە).. هەربۆیەش پێشەوایانی سۆفیگەریی لە زاراوەکانی خۆیاندا بێژە (لفظ)ی (العلم اللدنی) (زانستێك لەلایەن خوداوە) یان بە تایبەتی بۆ ئەوزانستە شارراوە (باطني)یە داناوە کەتەنها خودا لەلایەن خۆیەوە بەبێ میانگیریی کەسێك دەیدات بەبەندەی خۆیو، ئیدی بەم ڕەنگە دەسگیر دەبێت..

هەر بۆیەش هەندێکیان ئەم شیعرەی شاعیرێکی خۆیان دەڵێنەوە:

**تعلمناه بلا حرف و صوت ... قرأناه بلا سهو وفوت**

(١) تفسير روح البيان لإسماعيل حقي (٥: ٢٧٠).

واتای ئەم شیعرەیان ئەوەیە گوایە بەرێگای بەخشینی خودایی‌و سرووشی پەروەردگار ئەو زانستەیان پێ گەیشتووە نەك بەرێگای فێرکردنی بێژەوانی‌و وانە وتنەوەی کەسێکی دی. لەبەر ئەوەی (بەوتەی اسماعیل حقی) پلەی زانستی ڕواڵەتبینی (ظاهری)لەئاست پلەی زانستی شاراوەو ناوەکی (باطني)دا وەك پلەی نێوان دیارو نادیار وایەو، چونکە (هەر بەڕای ناوبراو) (زانستی ڕواڵەتبینی) پەیوەستە بە لایەنەدیارەکانی شەریعەت‌و شێوەو جۆرەکانیەوە، بەڵام زانستی شارراوە (باطني) لەپلەی دەرگای ماڵ دایە"[1].

## پووچەڵ کردنەوەی وتەی سۆفییەکان لەبارەی زانستی خودایی‌یەوە

زانای ئیسلام (قرطبي) لەوەلامی وتەو پڕوپاگاندەی سۆفیەکاندا لەسەر زانستی خودایی، گوتوویەتی: "زانای گەورەمان، ئیمام (ابو العباس) گوتوویەتی: (هەندێك کەس لە بێ باوەڕەکانی سەر ڕێبازی (باطنی) بیروڕایان لەسەر گرتنەبەری ڕێگەیەکە کەئەو حوکمە شەرعی یانەی لێ دادبڕێت، گوتووشیانە: (ئەم حوکمە شەرعییە گشتییانە تەنها کەسانی گەمژەو خەڵکی عەوام کاریان پێ دەکەن، دەنا پیاوچاکانو (ئەولیا)و کەسانی تایبەتمەند (اهل الخصوص) ئاتاجیان بەو دەقە شەرعییانە نیە، بەڵکو ئەوەی لێیان خوازراوە ئەوزانستەیە کە دەکەوێتە نێو دڵیانەوە ئەو حوکمەش کە بەسەریاندا دەدرێت ئەوەیە کە لە خەیاڵات‌و ئەندێشەکانیانەوە دەردەچێت) پاشان گوتوویانە: (ئەمەش بەهۆی سافی‌و بێگەردیی دڵەکانیانە لەهەر گەردو ژەنگ وژارێك‌و جگە لەخوداش غەیری تری تێدانیە، بۆیە زانستە خوداییەکان‌و حەقیقەتەکانی پەروەردگارێتییان تێدا ڕەنگ دەداتەوەو،

---

(١) روح البيان-ی- اسماعيل حقي (٥: ٢٧٢).

ئاگاداری نهێنییەکانی بوونەوەر دەبن و، حوکمی وردەکاریەکان دەزانن و، ئیدی ئاتاجیان بە حوکمی شەریعەو فەرمانە گشتییەکان نامێنێت، وەك چۆن ئەم حاڵەتە بۆ (خدر) ڕەخساوەو، ئەوەبوو ناوبراو (بەڕای سۆفیەکان (ئاتاجی بەو زانستە دیار دەرخراوانەی دنیانەبوو کە لەلای (مووسا)ش هەبوون. هەروەها لەو وتانەی، کە (سۆفییەکان) دەیگێڕنەوەو کردوویانەتە بیرباوەڕی خۆیان ئەوەیە، فەتوا لەدڵی خۆتەوە وەرگیراوە، تەنانەت گەر فەتوا وەرگرێکیش فەتوای پێ‌گەیاندیی.. بۆیەش زانامان (قرطبي) گوتوویەتی: (ئەم وتەیە کفرو بێ‌باوەڕییەکی تەواوەو، خاوەن و دەربڕی وتەکەش بێ ئەوەی داوای تۆبەو پەشیمانی لێ بکرێت دەکوژرێت، چونکە نکووڵی کردنە لە زانستی شەرع. خوداش بێگومان ڕێساو سوننەتی خۆی پیادەکردووەو حیکمەتی خۆی خستۆتەکارو بڕیاری خودایشی وابووە، کە حوکم و فەرمانەکانی، تەنها لەڕێی ئەو پێغەمبەرانەیەوە بەخەڵکی دەگەن، کە چەند سەفیرو باڵیۆزێکی نێوان خوداو بەندەکانی بوون. بۆیە بەپوختی (بەڕای هەموو زانایانیش) لەگشت حاڵەتێکدا زانستی بنەبڕ (قطعي)و، ڕاستی ڕەهای پێویستو، ڕای زانایانی پێشین و دوایین لەسەر ئەوەیە، کە تەنها لەڕێی پێغەمبەرانی خوداوە زانستو حوکمەکانی خودا دەزانرێن. جا هەر کەسێك بڵێت: (گوایە ڕێگەیەکی دی هەیە، کە فەرمانی خوداو شتە قەدەغەکراوەکانی بەبێ ڕێگەی پێغەمبەرانی دەزانرێت و، پێویستی یەك بەپێغەمبەران نابێت، ئەوا دەکوژرێت و داوای تۆبەشی لێ ناکرێتو، پێویست بەهیچ پرسیارو وەڵامێکیش لەگەڵیدا ناکرێت، پاشان ئەمە وتەی جێگیرو سەلمێنراوی چەندین پێغەمبەری تری خوداشە (سڵاویان لێ بێت) جگە، لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ.. شیکاری ئەمەش ئەوەیە هەرکەسێك بڵێت زانستو حوکم لەدڵیەوە وەردەگرێتو، هەرچی بکەوێتە دڵیەوە، ئەوەحوکمی خودایەو بەپێی ئەوە کاردەکاتو، گوایە لەگەڵ ئەوەدا پێویستی بەقورئان و بەسوونەت نیە، ئەوە بێگومان تایبەتمەندیی پێغەمبەرێتی بەخۆ داوەو، وەکو ئەو وەسفەی پێغەمبەریش ﷺ کە دەربارەی تایبەتمەندیی پێغەمبەرێتی خۆی

فەرموویەتی: ((ان روح القدس نفث في روعي))[1]، واتە (بێگومان لەگیانی پاك‌و پیرۆز کراوە بەجەستەدا).

هەروەها "ئیمامی (شنقیطي)ش لە تەفسیرەکەیدا (اضواء البیان) ئەو جۆرە وتەو ئیددیعا نابەجێیانەیانی (کە دەربارەی زانستی خودایی‌و گوایە بەلێشاوو بەسروش دەیخاتە دڵەکانیانەوە" پووچەڵ کردۆتەوەو، گوتوویەتی:

"بێگومان ئەو ڕەحمەت‌و زانستەی، کە خوا لەلایەن خۆیەوە بە(خدر)ی بەخشیبوون: پێغەمبەرێتی‌و سرووش (وحی)بوون، چونکە خدر بە (مووسا)ی گوتووە: (ومافعلته عن أمري)= (من لەخۆمەوە سەربەستانە ئەم کارانەم نەکردووە).. فەرمانی خوادش تەنها لەڕێی سرووش (وحی)یەوە دەزانرێت. هیچ ڕێگەیەکیش نیە تەنها بەسرووش نەبێت. خوداش ئەمەی لە سرووشدا بەندکردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْيِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ الأنبياء﴾، هەروەها (شنقیطي) گووتویەتی: "ئەوە لە زانستی (اصول) داهاتووە، ئەوەیە ئیلهام لە ئەولیاو پیاوچاکانەوە بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر هیچ شتێك ناشێت، چونکە هیچ (پارێزراوی‌و عیصمەت)ێکی پێغەمبەرێتییان تێدانیە.. جا ئەو ئیددیعایانەی، کە هەندێك کەسی دەربارەی شیاو بوونی کارکردن بەئیلهام بڵاوی دەکەنەوە، کە گوایە لە مافی کەسی ئیلهام پێدراوە کاربەوەی نێو دڵی بکات بەبێ دەقی شەرعی تر، شتێکی پووچەڵەو هیچ پشتی پێ نابەسترێت، چونکە بەبەڵگەیەك بەهێزنەکراوە. خەڵکی نەپارێزراو (غیر معصوم)یش، هیچ متمانەیەك بەخەیاڵی‌و ئەندێشەکانی ناکرێت، چونکە لەپیلانی شەیتان نەپارێزراوە، ڕێنموونی‌و هیدایەتیش لە شوێنکەوتنی یاسا شەرعییەکاندا مسۆگەر کراوە، نەك لە شوێنکەوتنی خەیالات‌و ئیلهامەکاندا)[2].

(١) تفسیر القرطبي (١١: ٤٠-٤١) بأختصار.
(٢) اضواء البیان (٤: ١٥٩) بأختصار.

پاشان (شنقیطي) گوتوویەتی: (بەم ڕەنگەش دەزانیت ئەو ئیددیعایانەی زۆربەی ئەوکەسە نەفامانەی کە خۆیان بە شوێنکەوتووی (تصوف/ سۆفیگەریی) ناوبردووەو کە خۆیانو شێخەکانیشیان ڕێبازێکی شاراوەی وایان گرتۆتەبەر، گوایە لەلای خودا هاوتای حەقو ڕاستییە (تەنانەت گەر پێچەوانەی ڕووکاری دەرەوەی شەرعیش بێت، وەك ئەو پێچەوانە بوونەی کردارەکەی (خدر) لەگەڵ ڕواڵەتی زانستی (مووسا)دا، بێگومان ئەم ئیددیعایانەی ئەوان کفرێکی گەورەیەو، بیانوویەکیشە بۆ لێك دابڕانی تەواو لە ئایینی ئیسلام، بەو پڕوپاگەندەیەی گوایە حەق لە چەند کارێکی شارراوەدا، پێچەوانەی چەند مەسەلەیەکی دیارو دەرخراوە)[1].

هەروەها (آلوسی)یش لە تەفسیرەکەیداو لەو جێگەیەدا، کە وەڵامی ئیددیعای زانستی خودایی دەداتەوەو بانگەشەکانی (سەرپێچیو پێچەوانەبوونی شەریعەت لەگەڵ حەقیقەتدا) پووچەڵ دەکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە چەند وتەیەکی هەندێك لە زانا چاكو ڕاستگۆکان هێناوەتەوە، واتە لەو زانایانەی، کە سۆفییەکان بەشێخو مەشایەخو زانایانی خۆیانی دادەنێ.. بۆ نموونە (ئالووسی) وتەی (عبدالقادری گەیلانی)ی هێناوەتەوە، کە گوتوویەتی: (گشت ئەولیاو پیاوچاکان تەنها لە فەرمایشتی خوداو فەرموودەی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ زانست وەردەگرنو، تەنها بەپێی لایەنە دیارەکانی ئەو فەرمایشتو فەرمودانەش کار دەکەن) واتە نەك بەلایەنی (شاروەوەو باطنیی خولقێنراوە). لە (جنید)یشەوە، کە بە (سید الطائفة) ناسراوە، ئەو وتەیەی هێناوە کە گوتوویەتی: (هەموو ڕێگاکان لە خەڵکی بەستراون تەنها لەوکەسانە نەبێت کە شوێن پێی پێغەمبەریان ﷺ هەڵگرتووە). هەروەها وتەیەکی تری (جنید)ی هێناوە، کە هەر لەمبارەیەوە گوتوویەتی: (هەرکەسێك قورئان لەبەر نەکاتو فەرموودە نەنووسێتەوە، ئەوا لەم عیلمو زانستەدا پەیڕەویی ناکرێت، چونکە زانستی ئێمە بە قورئانو سوننەتەوە بەستراوە).

---

(١) اضواء البیان (٤ :١٦).

(شنقيطي)یش گوتوویەتی: (هەرکەسێك ڕووە شاراوەکە (باطن)ی زانستێك بگرێتەبەر، کە ڕووە دیارەکە (ظاهر)ی حوکمێك پووچەڵی دەکاتەوە، ئەوا هەڵەی کردوە).

(أبو الحسيني نوری)یش گوتوویەتی: (ئەگەر دیتت کەسێك ئیدیعای حاڵەتێك دەکات، گوایە لەخواوە بۆی هاتووەو، ئەم حاڵەتەش لە سنووری زانستی شەرعی دەریکات، ئەوا لێی نزیك مەبەرەوە.. هەرکەسێکیشت بینی ئیددیعای حاڵەتێکی وا دەکات، کە زانستێکی دیارو دەرکەوتوو پشتگیری ناکات، ئەوا لەسەر ئاینەکەی تاوانباری بکە).

(ابو سعيد الخزار)یش گوتوویەتی: هەر زانستێکی شاراوە گوایە ڕاستەوخۆ لە ناخی مرۆڤدا دانرابێتو، پێچەوانەی زانستی دیارو ناسراوبێت ئەوە پووچەڵە). (ابو العباسی دینوری)یش گوتوویەتی: (ڕەوانبێژی ڕووکاری دەرەوە حوکمی ناواخن ناشارێتەوە).

(ابو حامدی غزالی)یش گوتوویەتی: (هەرکەسێك بڵێت: ناواخن پێچەوانەی ڕواڵەتە، ئەوا لە کفرو بێباوەڕی یەوە نزیکترە وەك لە ئیمانو باوەڕ)[1].

هەموو ئەو وتانەی پێشوو وتەی ئەو زانا بەڕێزانە بوون، کە سۆفییەکان بە شێخو مەشایەخی خۆیشیان داناون.. جادوای هەموو ئەم وتانەی هەندێك لە زانایانمان، ئەنجامێکی یەکلاکەرەوە بەدەست دێنین، ئەوەیە (ئەو زانستە خودایی یە " العلم اللدنی"یەی، کە ئایەتەکە ئاماژەی بۆ کردووە، کە خودا لەلایەن خۆیەوە بە(خدر)ی گەیاندووە ـ سلاوی لیٚ بێت ـ زانستی پێغەمبەرێتیو سرووشە.. بەلام ئیددیعاو بانگەشەکانی سۆفییەکان دەربارەی زانستی خودایی (بەو بۆچوونەی خۆیان) ئەوە چەند ئیددیعایەکی پووچەڵو بێ نیوەڕۆكو گومڕاکارییەو، پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامو ڕێبازی قورئانن.

(١) روح المعاني- للالوسي، ١٦ : ١٩.

ئەی ئایا بۆ لای گەلەکەی خۆی گەڕاوەتەوە؟ یان ئایا لەناوچەی پێکگەیشتنی نێوان هەردوو دەریاکەدا چاوەڕوانیی کردوون.

١٤- (خدر) لەکوێدا لە (مووسا) جیابۆتەوە؟ ئەی دوای ئەوە (خدر) بۆ کوێ چووە؟

١٥- چۆنیەتی گەڕانەوەی (مووسا) بۆ لای گەلەکەی ؟!

هەموو ئەم پرسیارانە لەلایەنە شاراوەو نەزانراوەکانی نێو ئەم چیرۆکەنو، ئێمەش خۆمان بەلێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەیانەوە ماندووناکەین، چونکە هیچ وتەو قسەو باسێك دەربارەی ڕوونکردنەوەیان، نازانستیو نامەنهەجیو نارێکنو لە هەڵەوە نزیکترن زیاتر لەوەی لەڕاستییەوە نزیکبن، بەڵکو تەنانەت زۆربەیان هەڵەو ناڕاست دەردەچن، نەك ڕاستو جێگیربن، دیارە مەحاڵە هەڵەش لەڕاستی نزیك بێت، چونکە هەر وتەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو نەزانراوانە، گریمانو ئەگەری هەڵە بەرێژەیەکی هێجگار زۆرتر لە گریمانی ڕاستی هەڵدەگرێت. بۆیە ئێمە داواکاری هێشتنەوەی ئەم لایەنە شاراوانە. بن، کە وەك خۆیان بەشاراوەیی بمێننەوەو، هەر وتەو قسەو باسێکیش گەر دەربارەی زانینیانو ڕوونکردنەوەیان هەبوونو، تەنانەت گەر لە کتێبەکانی تەفسیرو چیرۆكو مێژووشدا هاتبن، هەڵوەشێنرێنەوەو پشتیان پێ نەبەسترێت.

## "چەند ڕووداوێکی کتوپڕی لە بەسەرهاتی مووساو خدردا"

لە بەسەرهاتی مووساو خدردا چەندین تەمومژ هەیە، کە ڕووبەڕووی (مووسا) بوونەتەوە، هەروەها چەند ڕووداوێکی کتوپڕیو لە ناکاویش هەیە کە تووشی مووسا بوونو سەرسامی کردونو، لە چیرۆکەکەدا باسکراون، هەر لە چیرۆکەکەشدا هەندێك لەو تەمومژانەش ڕەوێنراونەتەوە، بەڵام هەندێکی تریشیان هەر بەشتی سەیرو لەناکاوو، بەتەمومژیش ماونەتەوە... لەو ڕووداوە لە ناکاوانەش:-

١- ده‌رچوونی ماسی یه‌ برژێنراوه‌كه‌ (به‌زیندوویی له‌ زه‌مبیله‌كه‌یانه‌وه‌ بۆ نێو ده‌ریاكه‌)، ئه‌وه‌بوو پێشتر خودا فه‌رمانی به‌ مووسا كردبوو كه‌ له‌گه‌ڵ خۆیدا ماسییه‌كی گه‌وره‌ی برژاوی سوێركراو له‌ زه‌مبیله‌یه‌كدا هه‌ڵگرێت‌و ببات، جا له‌ هه‌ر جێیه‌كدا ئه‌و ماسییه‌ی لێ ون بێت ئه‌وه‌ بێگومان (خدر) له‌وێدا ده‌بینێت (مووسا)ش خۆی‌و كوڕه‌ یاوه‌ره‌كه‌ له‌و جێیه‌دا خه‌وتن، ماسییه‌كه‌شیان له‌ زه‌مبیله‌كه‌دا بوو كه‌ سووركراوه‌و خوێكراوو برژاو (واته‌ مردوو بوو). كه‌چی دڵۆپه‌ ئاوێكی له‌كانیاوی ژیانه‌وه‌ بۆ دێت‌و ژیانی به‌به‌ردا دێته‌وه‌و، خودا گیانی بۆ ده‌گه‌ڕێنێته‌وه‌و، له‌ زه‌مبیله‌كه‌ ده‌رده‌چێت‌و ده‌چێته‌ نێو ده‌ریاكه‌وه‌ به‌ڵام چۆن ئه‌مه‌ ڕووی داوه‌؟ ماسییه‌كی خوێكراوو برژێنراوو (بێ گیان‌و مردوو) سه‌ر له‌نوێ بۆ ژیان بگه‌ڕێته‌وه‌.. به‌سه‌رهاتی ئه‌مه‌ ڕووداوێكی كت‌وپڕیی‌و سه‌رنج ڕاكێش بووه‌ بۆ مووساو كوڕه‌ یاوه‌ره‌كه‌شی، هه‌روه‌ها ڕووداوێكی كت‌وپڕی‌و سه‌رنج ڕاكێشه‌ بۆ هه‌ر خوێنه‌رێكی ئه‌م ئایه‌تانه‌ی چیرۆكه‌كه‌.

ئه‌م موعجیزه‌یه‌ی خودای په‌روه‌ردگاریش به‌هێزترین به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر توانای بێ‌سنووری خودا، چونكه‌ خودا له‌سه‌ر هه‌موو شتێك به‌توانایه‌و، هه‌ر كارێكی بوێت ده‌یكات‌و، هه‌ر خۆیشی مه‌خلوقاتی ده‌ژیه‌نێت‌و ده‌یانمرێنێت. پاشان ئه‌م موعجیزه‌یه‌ به‌ڵگه‌یه‌كی له‌سه‌ر زیندووكردنه‌وه‌ ده‌خاته‌ڕوو، جا ئه‌و خودایه‌ی كه‌ ماسییه‌ برژێنراوه‌ سوێركراوه‌كه‌ی زیندوو كردۆته‌وه‌، ده‌توانێت له‌ ڕۆژی قیامه‌تیشدا هه‌موو به‌نده‌كانی خۆی زیندوو بكاته‌وه‌.

٢- كاتێك ژیان كه‌وته‌وه‌ نێو لاشه‌ی ماسییه‌كه‌و به‌ده‌ریادا ڕۆشته‌وه‌و ﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا﴾ ماسییه‌كه‌ هه‌ڵبه‌زیبووه‌و ڕێی نێو ده‌ریای گرته‌به‌ر) مانای ئه‌م ئایه‌ته‌ ئه‌وه‌یه‌ خودا ڕۆشتنی ئاوه‌كه‌ی بۆ ماسییه‌كه‌ ڕاگرتووه‌ تاوه‌ك (سَترب)ی لێهاتووه‌، واته‌ ڕێگا (طريق) به‌مانای ئه‌م ڕێگایه‌ به‌رنراوه‌ی ماسییه‌كه‌ ڕاڕه‌وێكی ڕۆشن بووه‌ كه‌ تیایدا ئاو له‌دوای ماسییه‌كه‌وه‌

نەڕۆشتووەو، بەشێوەیەکیش بووە کە هەر کەسێك بەو ڕارەوە ڕۆشنەو بەو ڕێگا دیارەدا ڕۆشتبێت ئەوا گەیشتۆتە جێگای ماسییەکە، مووساش ئەم کردارەیان لەگەڵ کوڕە یاوەرەکەیدا گرتۆتە بەر بۆ گەیشتن بەشوێنی ماسییەکەو بەم پێەیەش بۆ دیتنی (خدر).

٣- کاتێك مووساو یاوەرەکەی گەڕانەتەوە بۆ جێگای یەکەمیان کە ماسییەکیان تیادا لێ ون بوو، تووشی ڕووداوێکی لەناکاو ببوون، ئەویش دیتنی (خدر)ە کە لەوێدا بووەو لەسەر پشت ڕاکشاوەو کراسەکەی لەخۆیەوە ئاڵاندووە. جا کە (مووسا) سڵاوی لێکردووە، (خدر)یش کراسەکەی لەسەر دەموچاوی خۆی لابردووەو وەڵامی سڵاوەکەی داوەتەوە.. بێگومان (خدر) لە جێگەیەکی نادیارو نەزانراوەوە دەرکەوتووەو، مووساش خۆیو کوڕە نەوجەوانە یاوەرەکەشیو (تەنانەت ئێمەش کە سەرقاڵی چیرۆکەکەین) نازانین (خدر) لەکوێوە هاتووەو، پێشتر لەکوێدا دەژیا. هەموو ئەو زانیارییەی لامانە، ئەوەیە ئێمەش وەك مووسا کتوپڕ بەو جێگەیە ئاشنابووین کە (خدر)ی لێ بووە.

٤- (خدر) بە وتەیەکی گرنگ (مووسا)ی خستۆتە نێو ڕووداوێکی کتوپڕی یەوەو، کاتێك (مووسا) داوای لێ کردووە هاوڕێیەتی ڕێگەی بکات تاکو زانستی لێوە فێربێت، بەڵام (خدر) بەو وتە لەناکاوە وەڵامی داوەتەوە کە: بێگومان تۆ ناتوانیت ئارام لەسەر هاوڕێیەتیو کارەکانم بگریت: ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾. ئەمەش لە چیرۆکەکەدا بەدیی هاتووە، چونکە (مووسا) نەیتوانی ئارام لەسەر کارەکانی (خدر) بگرێت لە ماوەی هاوڕێیەتیی ڕێگەکەیاندا.

٥- ڕووداوێکی تری لەناکاو کاتێك مووسا لەگەڵ خدردا بەخۆڕاییو بەبێ کرێ سواری کەشتییەکە دەبنو، کەچی (خدر) بەدەستی ئانقەست پارچەیەك تەختەی کەشتییەکە لەبنەوە لێ دەکاتەوەو کونێکی تێدەکات ئەمەش وا لە مووسا دەکات کە بەرهەڵستیو نکوولی لەوکارەی بکات.

٦- کارێکی تری لەناکاوی خدر لەبەر چاوی مووسادا (سلاّویان لیّ بێت) ئەوەبوو کاتێك منداڵێکیان لەنێو منداڵان دادی که یاریان دەکرد، (خدر) دەیکوژێت بەبیّئەوەی منداڵەکه لەوکاتەدا تاوانێکی وای کردبێت که شایانی ئەو کوشتنه بێت، مووساش دووباره نارەزایی لەسەر ئەم کارەی دەردەبڕێت.

٧- دیمەنێکی کتوپڕیو جێی سەرسوڕمانی تریش ئەوەیه، که بۆ (مووسا)و (بۆ ئێمەش) دەرکەوتووه، خەڵکی گوندەکه زۆر پیسکەو چاوچنۆك بوون لەئاست مووساو (خدر)داو میوانداریيان نەکردوون، سەرەڕایی ئەوەی، که ئەوان داوای خۆراکیشیان لێکردبوون.

٨- هەڵوێستێکی کتوپڕیانەی دیکەی (خدر) لەئاست (مووسا)دا - سلاّویان لیّ بێت - ئەوەبوو، کاتێك دیتیان لەو (گوندەدا) دیوارێك خەریکه دەڕووخێت، کەچی (خدر) ڕاستی دەکاتەوەو بنیاتی دەنێتەوه، ئەمەش وا له مووسا دەکات که بەرهەڵستیی بکاتو داواشی لیّ دەکات، که بەلایەنی کەمەوه داوای کریّیەك له خەڵکی گوندەکه بکات لەسەر ئەوکارەی، چونکه (بەڕای مووسا) دانیشتوانه چاوچنۆكو پیسکەکانی ئەوگوندە، شایستەی ئەو چاکەیەی خدر نەبوون.

٩- ئەو ڕووداوه کتوپڕه زۆر سەیرو سەمەرەیەش، که مووسای سەرسام کردووەو (تەنانەت ئێمەی سەرنجدەری قۆناغەکانی چیرۆکەکەش)ی سەرسام کردووه، ئەوه بوو لەدواییدا (خدر) پەردەی لەسەر لایەنه نەزانراوەکانی هەرسیّ کردارەکەی هەڵداوەتەوەو تەمومژی لەسەر نەهێشتوونو، دەیانکاته پاساوێك بۆیانو، بەوهۆیەشەوه ئەوه ڕوون دەکاتەوه، که هەرچییەکی کردووه: هەقو چاکەو ڕاستین، بەلاّم ڕونکردنەوەشیو کردنەوەو پەرده لەسەر لادانیشیان هەر به شتێکی سەیرو لەناکاو دادەنرێت.

١٠- کارێکی سەرنج ڕاکێشی کتوپڕیانەی تریشی، ئەوەیە هەواڵی داوە لەسەر ئەو پادشا ستەمکارو زەوتکارەی، کە چاوەڕێی هەژارەکانی دەکرد، تاکو پاپۆرەکەیان لێ بسەنێت ئەگەر (خدر) کەلەبەرێکی تێ نەکردایەو خەوشباری (واتە- عەیبداری) نەکردایە.

١١- کارێکی جێی سەرنجی تری ئەوەیە، لەناکاو هەواڵی داهاتووی ئەو کوڕە منداڵە دەدات کە کوشتوویەتی بەوەی، کە ئەگەر لەژیان دابمایەو گەورە ببوایە، ئەوا کافر دەردەچوو، خوداش ویستوویەتی کوڕێکی باشتریان پێ بدات، کە دیندارو چاکە خوازو بەڕەحمو میهرەبان بێت بۆیان.

١٢- هەواڵدانی کتوپڕیی لەسەر وجودی گەنجینەیەك لەژێر دیوارەکەی ئەو گوندەدا، کە دوو منداڵی هەتیوو خاوەنی بوون، بۆیەش (خدر) دیوارەکەی لەسەر بنیات نایەوە، تا ئەوکاتەی منداڵەکان گەورە دەبن و گەنجینەکە دەردێنن.

١٣- شتێکی تری سەرنج ڕاکێش و کتوپڕیی، ئەوەیە خدر لەدوایی دابۆ شوێنێك دەڕوات، کە نازانین بۆ کوێ چووە.. لەوانەیە (مووسا)ش ـ سڵاوی خودای لێ بێت ـ ئەوەی نەزانیبێت.. بەڕاستی (خدر) (لەژێر کاریگەریی بەهەشت و شتی لەناکاو جێی سەرسوڕمان دا (مووسا)ی بەجێ هێشتووە، ئەویش کاتێك باری ڕاستەقینەی هەرسێ کردارەکەی بۆ دەرخستووە، پاشان ڕووەو شوێنێکی نادیار بەجێی هێشتووەو ڕۆشتووە..

بێگومان (خدر) لەم چیرۆکەشدا، هەر لە شوێنێکی نادیارەوە هاتووەو دوای چیرۆکەکەش، هەربەرەو شوێنێکی نادیار ڕۆشتووە.. ئێمەش نازانین لەکوێ وە هاتووەو، بۆ کوێ ڕۆشتووە..هیچ وتەیەکیش لەمبارەیەوە نە لە قورئان و نە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ نەهاتووەو، دەربارەی (خدر) خۆیشی هەر ئەوەندە هاتووە، کە دیاریمان کردووە، کە لە قورئان و فەرموودەکان دایە.

بێگومـــان بەســـەرهاتی (خـــدر) لەگـــەڵ (مووســـا)دا بەســـەرهاتێکی نادیـــارو چیرۆکێکی تەماوییەو، داستانێکی پڕ لە ڕووداوی سەیرو لـەناکاوو، حیکایـەتێکی جێی سەرنجو سەرسوڕمانیشە.

ئێمەش هەرکاتێك ئەم چیرۆکە دەخوێنینەوە، تووشی دەهـشەتو سەرسـوڕمان دەبینو، ئەو ڕووداوە لەناکاوانەشی کارمان تێدەکەن سەرەڕای ئـەوەش، کـە پێـشتر چەند جارێکی تـریش لــە حەقیقـەتی ڕووداوەکـانو ڕازو نهێنیـی کـردارە سـەیرو کتوپڕییەکانیشیمان زانیبێت.

## "سـەفەر بۆ بەدەسـت هێنانی زانسـت"

(مووسا) چیی گوت بە کوڕە نەوجەوانەکەی یـاوەریی (یوشـعی کـوڕی نـوون)؟ پێـــی گـــوت: ﴿...لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ٦٠ الكهف﴾، واتە: (من بـەبێ وەسـتان و کۆڵـدان هـەر دەڕۆم، تـاکو دەگەمـە ناوچەی پێکگەیشتنی نێوان هەردوو دەریاکە، یان هەردەبێت بگەمە ئەنجام، یاخود ماوەیەکی زۆر دەگەڕێمو لە سەفەردا دەبم). ناوچەی پێکگەیشتنی دوو دەریاکـەش ئەو جێگەیە بووە، کە خـوا هـەواڵی بەمووسـاداوە لەسـەر ئـەوەی لـەوێ (خـدر) دەبینێـت.

خۆ ئەگەر نەگاتە ناوچەی پێکگەیشتنەوەی هەردوو دەریاکـە، ئـەوە دیـارە لـە ڕۆشتندا بـەردەوام دەبێـت، تەنانـەت گـەر ئـەم سـەفەرەی چـەندان سـاڵی درێـژو ماوەیەکی زۆریش بخایەنێت، هەر بـەڕێگاوە دەبێـت. لـەو وتەیـەی (مووسـا)دا ـ سڵاوی لێ بێت ـ ئەم مەبەستانە وەردەگرین:-

- سەفەر بۆ بەدەست هێنانی زانست.

- سوور بوون لەسەر وەرگرتنی زانست.
- پێداگرتن لەسەر تێپەڕاندنی هەموو ئەو کۆسپانەی کە دێنە سەر ڕای ئەو نیازە.

زانایانی ئیسلامیش چەندەها نموونەی بەرزو قەشەنگیان دەربارەی سەفەر بۆ بەدەستهێنانی زانست پیادەکردوەو، لەوبوارەدا بەرگەی گەلێك ناڕەحەتیو کوێرەوەرییان گرتووەو، ئارامیشیان لەسەر ئەوکۆسپو بەربەستە دژوارو سەختانە گرتووە کە ڕووبەڕوویان بوونەتەوە.

لەمبارەیەوە ئیمام (خطیبی بغدادی) لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا کتێبێکی داناوەو تیایدا ناوی بەناوبانگترینی ئەو زانایانەی تۆمار کردووە، کە ڕوویان کردۆتە وڵاتانی تری دنیا بۆ بەدەستهێنانی تاکە یەك فەرموودە لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ (ئیمامی بغدادی) ئەم کتێبەی ناوناوە (الرحلة في طلب العلم) واتە (سەفەر بۆ بەدەستهێنانی زانست) لەم دواییەشدا دکتۆر (نورالدين عنتر) بە ساغ کردنەوەو لێکۆڵینەوەوە چاپی کردەوە.

لەسەردەمی خۆشماندا (شێخ عبدالفتاح ابو غده) لە کتێبێکی نایابی خۆیدا چەند نموونەیەکی کۆکردۆتەوە دەربارەی سەفەری زانایانی موسڵمانو ئارام گرتنیان لەسەر هەر ناڕەحەتییەك لەو پێناوەدا، کتێبەکەشی ناو ناوە (صفحات من صبر العلماء على شدائد العلم والتحصيل) واتە: (چەند لاپەڕەیەك لەسەر ئارام گرتنی زانایان لەسەر بارە سەختەکانی زانستو بەدەست هێنان).

(مووساش بە کوڕەکەی یاوەری گوتبوو (کۆڵ نادەم تا دەگەمە ناوچەی پێگەیشتنی هەردوو دەریا کە، یان بۆ ماوەیەکی زۆرو زەمەنێکی درێژ لە سەفەردا دەبم): ﴿لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا﴾. لەم ئایەتەدا وشەی (حقبا/ چەند زەمەنێك) کۆ (جمع)ی (حقبه)یە. زانایانیش ڕای هەمەجۆرو

جیاوازیان لەسەر مانای (حقبە) هەیە کە دەڵێن لەنێوان (شەست ساڵ)و (هەشتا ساڵ)و (سەد ساڵ) دایە... بەڵام ڕای ڕاستتر لەسەر مانای (حقبە) ئەوەیە کە (راغبی اصفهانی) لە فەرهەنگی (مفرادات)ەکەیدا دیاریی کردووەو گوتوویەتی: (لەڕاستیدا (حقبە) ماوەیەکی نەزانراوە لەزەمان)[1]. ئەم مانایە لە وتەکەی مووساش داهاتووە کە بەکوڕە یاوەرەکەی گوتووە ﴿أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبًا﴾ کەواتە (مووسا) بە ماوەیەکی تایبەتیی و نەزانراو، وەسفی کردووەو کە هەر گەشتیارو ڕێبوار دەبێت، تاو بە(خدر) دەگات.. ئەم مانایە لە وشەیەکی هاوشێوەشیدا (احقاب)دا هاتووە، کە مانای کاتێکی نادیارو نەژمێراو دەگەیەنێت و، خودا تێیدا (لەبارەی کافرانەوە لە دۆزەخدا) فەرموویە ﴿لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابًا ٢٣﴾ النبأ ئەمەش ماوەیەکی نادیارو بێکۆتایە کە تیایداو بە نەمریی لە دۆزەخدا دەمێننەوەو، پەنابەخودا..

---

(١) المفردات، ص١٢٦.

## "نَسِيَا حُوتَهُمَا"

قورئانی پیرۆز كرداری بیرچوونه‌وه‌ (نسیان)ی خستۆته‌ پاڵ هه‌ردووكیان (واته‌/ پاڵ موساو كوڕه‌ یاوه‌ره‌كه‌ی) له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ڕاستیدا هه‌رته‌نیا كوڕه‌كه‌ (یوشعی كوڕی نون) له‌بیری چوو بۆوه‌. له‌به‌رئه‌وه‌ی (مووسا) داوای له‌كوڕه‌كه‌ی كردبوو كه‌ ماسییه‌كه‌ له‌ زه‌مبیله‌كه‌یدا هه‌ڵگرێت‌و پێشی گوتبوو (هه‌ر كاتێك ماسییه‌كه‌ت لێ ون بوو خێرا ئاگادارم بكه‌، ئیدی كاتێك پێكه‌وه‌ ده‌ڕۆن‌و ده‌گه‌نه‌ لای به‌رده‌ زله‌كه‌و زه‌مبیله‌كه‌ش به‌ ماسییه‌كه‌وه‌ له‌ نزیك ئاوه‌كه‌وه‌ داده‌نێن‌و، خه‌ویان لێ ده‌كه‌وێت چه‌ند دڵۆپه‌ ئاوێك ده‌گه‌نه‌ لای ماسییه‌كه‌و ژیانی به‌به‌ردا دێته‌وه‌و، له‌ زه‌مبیله‌كه‌ ده‌رده‌چێت‌و ڕێگه‌یه‌كی نێو ده‌ریا بۆ خۆی ده‌گرێته‌به‌ر ﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا﴾.

له‌كاتێكیشدا (مووساوكوڕه‌ یاوه‌ره‌كه‌ی) بێدار ده‌بنه‌وه‌و له‌خه‌و هه‌ڵده‌ستن ڕێگه‌ی سه‌فه‌ریان گرتۆته‌وه‌ به‌رو، هه‌ر كه‌هه‌ست به‌ماندوێتی‌و برسێتی ده‌كه‌ن، (مووسا) داوا له‌ كوڕه‌كه‌ ده‌كات كه‌خۆراكی بۆ بێنێت، ئه‌ویش خێرا ماسی یه‌كه‌ی به‌بیردا دێته‌وه‌.

كه‌وابوو ئه‌وكه‌سه‌ی له‌بیری چووه‌، كوڕه‌كه‌یه‌، نه‌ك مووسا.. ئه‌ی بۆچی قورئان ئه‌م كرداری له‌بیر چوونه‌ی خستۆته‌ پاڵ هه‌ردووكیان؟!.

وادیاره‌ له‌مه‌دا دوو حیكمه‌ت هه‌یه‌

یەکەمیان: ئەمە لە دەرووی (تغلیب)[1]ەوەیە، وەك ئەوەی بلێین: (الأبوان)، کە بۆ (اب‌و ام/ باوك‌و دایك)یش بەکاردێت، یان (العمران) کە بۆ (أبوبکر)و (عمر)یش بەکاردێت. جامادام ئەم دوو کەسەش (مووسا) و(کوڕە یاوەرەکە)ی دوو هاوڕێی یەکترین لە سەفەرەکەدا، ئەوا هاوبەشی یەکترن لە ڕێگەداو لە هەر کردارو ڕووداوێکدا، کە تووشیان دێت، لەو کردارانەش، کە هاوبەشن تیایدا (لەبیرچوونەوە)یە.

دووەمیان: بێگومان ئاکامی بیرچوونەوەکەو سەرەنجامەکەشی، بەسەر هەردووکیاندا دێت، نەك تەنیا بەسەر کوڕە نەوجەوانەکەی یاوەری (مووسا)دا.. ئەوەبوو بەهۆی بیرچوونەوەکەوە، هەردووکیان ڕێگای ڕۆشتنیان درێژتربۆوەو، ڕووداوی زیاتری ناخۆش‌و ماندوویتی‌و برسێتییان بەسەرداهات.

---

(١) (تغلیب) لەزمانی عەرەبیدا لەنێو دووبێژە (لفظ)دا بەکاردێت، کە یەکێکیان جێی هەردووکیانی پێ دەگیرێتەوە ئەگەر هۆیەکی پەیوەستکردن یان تێکەڵکردن لەنێوانیان داهەبێت. یان لەنێوان واتاو مەدلولیاندا وەك وشەی (ابوین) بۆ دایك و باوك (الام و الاب) یان (مشرقین) بۆ مشرق‌و (مغرب) یان (الاخوان)و... هتد (وەرگێر).

## " ءَاتِنَا غَدَآءَنَا "

کاتێـك (مووسـا)و (کـوڕە یاوەرەکـەی) بـەڕێوە ڕۆشـتن‌و ناوچـەی نێـوان دوو دەریاکەیان بەجێ‌هێشت، هەستیان بە ناڕەحەتی‌و ماندوێتی کرد، ئەوەبوو (مووسا) بەیاوەرەکەی گوت: (خۆراکەکەمان بۆ بێنە، چونکە بەڕاستی لەم سـەفەرەماندا زۆر شەکەت‌و ماندووبووین): ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾ کاتێـك بەوردی سەرنج لەم ئایەتە دەدەین، ئەم خالانەی لێ دەردێنین:-

١- شیاوبوونی، تەنانەت پێویستبوونی هەڵگرتنی توێـشووو خـۆراك بـۆ گەشـت‌و سەفەر، ئەمەش پێچەوانەی (پشت بەخوابەستن) نیە، بـەڵکو هـەر لـەدەروازەی پشت بەخوا بەستنەکەدایە، چونکە گرتنەبەری ئەو هۆکارانەیە کە خوا فەرمانی لەسەریان پێمان دەکات.. سەیر لەوەدایە کۆمەڵە کەسێك لە گەمژەو فریودراوان هـەن‌و، توێـشوو هـەڵناگرن، بـەبیانووی ئـەوەی گوایـە پێـچەوانەی پـشت بەخوابەستنە، خۆیشیان تەمبەڵ‌و تەوزەل‌و پەککەری ئەو هۆکارانەن کـە خـودا فەرمانی پێویست بوونی وەبەرنان‌و پابەندبوون پێوەیانی داوە.

٢- شیاو بوونی خستنە کاری کەسـانی دی‌و داواکردنـی هێنـانی خـۆراك لێیـان. ئەوەبوو (مووسا) داوای لە کوڕەیاوەرەکەی کرد، کە خۆراکی بـۆ بێنێـت ﴿آتِنَـا غَـدَاءنَا﴾ ئەمە لەگەڵ ئەوەش دا باشتروایە، کە مرۆڤی موسڵمان هیچ شتێك لە کەس داوا نەکات (سەرەڕای شیاوبوونی داواکردنەکەش).

٣- شیاوبوونی ئەوەی، کە مرۆڤ هەواڵی حاڵەتی خۆی (چ برسێتی یان ناڕەحەتی‌و ماندوێتی یەك بێت) بە کەسانی دی بگەیەنێت، ئەمەش پێچەوانەی (باوەڕداری

بەخوداو تەسلیم بوون بەفەرمانیو، پشت پێ بەستنی) نیە، چونکە ئەوە تا (مووسا) بەکورِە یاوەرە خزمەتکارەکەی گوتووە (بەراستی ئێمە لەم سەفەرەدا زۆر شەکەتو ماندوو بووین ).

٤- بێگومان (مووسا) هەستی بەبرسێتی نەکردووەو ماندوێتییشی نەدیوە تەنها دوای ئەو کاتە نەبێت کە لە ناوچەی پێکگەیشتنی هەردوو دەریاکە تێپەڕیون، کە ئەم شوێنەش ناوچەی بڕیار لەسەردراو بوو، وەك لە فەرمودەکەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتبوو کە فەرموویەتی: ((**ولم يجد موسى مسا من النصب، حتى جاوز المكان الذي امريه**)) ئەمەش وەك ئەوە وایە کە نارِەحەتیو ماندوێتییەکە نیمچە سزایەکی نەریتی لەبیرچوونەوەکە بووبێت.

# "وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ"

کاتێك (مووسا) - سلاوی لیّ بێت- داوای خۆراکی لەکوڕە یاوەرەکەی کرد، کوڕەکەش ماسییە برژێنراوە سورکراوەکەی بیرکەوتەوە کە بە زیندوویی بەنێو دەریاکەدا ڕۆشتبوو، ئەوەبوو (مووسا) پێشتر داوای لیّ کردبوو کە هەر کاتێك ماسییەکەی لیّ وون دەبێت، دەسبەجیّ هەواڵی پیّبدات. جاکاتێك لەخەو هەستانو کوڕەکەش ماسییەکەی نەبینییەوەو زانیی کەوا لێیان وون بووە، بەلاّم لەبیری چوو کە ئەو هەواڵە بە (مووسا) بگەیەنێت، هەربۆیەش هەردووکیان لەسەر ڕۆشتن بەردەوام بوونو ماوەیەکی هێند درێژیشیان بڕی کە هەستیان بە ماندوێتی دەکرد. جاکاتێك مووسا پێی گوت: (خۆراکەکەمان ـ کە ماسییە برژاوەکەیە ـ بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا تووشی نارەحەتیو برسێتیو بارگرانیەك بووین ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا﴾ کاتێك (مووسا) ئەمەی پیّگوت، کوڕە یاوەرەکەش (یوشع) لەوەلاّمدا پێی گوت: (لەبیرتە کاتێك لەلای گاشەبەردەکەوە حەواینەوە، من ماسییەکەم لەیادبووو، تەنها شەیتانیش لەبیری بردمەوەو وای لیّ کردم بەیادم نەیەتەوە ﴿... أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ... (٦٣)﴾.. کەواتە ئەوەی خستۆتە ڕوو کە بگەڕێنەوە بۆلای ئەو گاشەبەردەی کە لە پاڵیا خەوتبوونو ماسییەکەشیان لەلا وون کردبوو کە لەبیری چوو بوو مووسای لەسەر بەبیر بێنێتەوە.. دانی بەوەش دانابوو کە ماسییەکەی لەویّدا لەبیرچووەو، لەبیرچوونەکەشی خستە پاڵ شەیتان، وەك

﴿فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ﴾ لەم ڕستەیەدا لەوشەی (انسانیه)دا پیتی (هـ) هێمای (ضمه)ی لەسەره (انسانیه/ شەیتان لەبیری بردمەوە) جا داخۆ حیکمەت لەبوونی (ضمه) لەسەر پیتی (هـ) چی بێت؟! (ابن زنجله) لە کتێبی (حجه القراءات)دا گوتوویەتی: (حفصی کوڕی عاصم) ڕستەی (وما انسانیه) بە بۆر (ضمه ُ)ی سەر (هائەکە) لەسەر بنچینەی وشەکە خوێندۆتەوەو، ڕیشەکەشی (ضمّه ُ)یە، (حفص) بۆیە لەهێمای (ژێرە) واتە: (کسره)ی ژێرهایەکەوە بۆ (ضمّه) هەموار (تعدیل)ی کردووە، چونکە دیویەتی کە (کەسرە)کانی ژێر (انسانیه) کە (ڕیشەی هایەکەش (ضمّه)یە واباشترە بیکات (بە ضمّه) تاکو ئاسانو هێواش تر بێت لەسەر زمان وەك لەوەی لە ژێرەکان (کسرات)دا بەردەوام بێت. ئەو کەسەش کە (هایەکەی — بە کەسرە دانابێت) لەبەر هاوسێیەتی پیتی (ی)یە لەپێشیەوە، وەك چۆن بڵێیت (فیه)و (علیه))[1]..

وەك تێبینی دەکەین (یوشعی کوڕی نون) کرداری (بیرچوونەوەکە)ی یەکەم جاری داوەتە پاڵ خۆی، وەك گوتوویەتی: ﴿فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ﴾ پاشان هۆی لەبیربردنەوەکەشی خۆستۆتەپاڵ شەیتان وەك گوتوویەتی.. ﴿وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ﴾ لەم دووجارخستنە پاڵەشدا هیچ جیاوازیو لێك نەچوونێك نیە.

دیارە (یوشع) خۆی لەکرداری (لەبیرچوون) دانەبڕیوەو خۆیشی لێی بەریی نەکردووە، بەڵکو دانی پێ داناوەو خستوێتییە پاڵ خۆی: ﴿إِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ﴾ لێرەدا (تاء)ەکەی فەرمانی (نسیت) لە عەرەبیدا بە (تاء)ی فاعل (بکەر) دادەنرێتو بۆ (یوشع) دەگەڕێتەوە، بەمانای (انا الذي قمت بفعل النسیان، انا الذي نسیت) (من بووم کرداری بیرچوونەوەکەم لێ وەشایەوە، من بووم لەبیرم چوو)

(١)(حجه القراءان لابن زنجله: ٤٢٢).

جا دوای ئەوەی دانی بە لەبیرچوونەوەکەدا ناوەو خستویێتییە پاڵ خۆی، دیاریشی کردووە کە کێ وای لێ کردووە لەبیری بچێتو ئەی کێیش کرداری لەبیربردنەکەی بەسەردا ئەنجام داوە، دیارە ئەوە هەر شەیتان بووە، بۆیە گوتوویەتی: ﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾..

بێگومان شەیتان لێرەدا بکەر (فاعل)ەکەیە، (یوشع)یش کارلێکراو (مفعول بە)یەکەیە، پیتی (هایەکەش) بووە بە (مفعول بە)و بۆ (یوشع) دەگەڕێتەوە. لەمەدا تێبینی دەکەین، کە ئەوە دوو فەرمان (فعل)ن، نەك یەك فەرمان..

یەکەمیان: وشە سێ پیتییەکەی فەرمانی (نسي)، کە (یوشع) خستویێتییە پاڵ خۆی.

دووەمیان: وشە چوار پیتییەکەی فەرمانی (انسی)، کە خستوویێتییە پاڵ (شەیتان) (انسی)ش دەخرێتە پاڵ ئەوکەسەی، کە کاری بیربردنەوە بەسەر کەسانی تردا دێنێت، واتە وایان لێ دەکات لەبیریان بچێتەوە.

ئەمەش حەقیقەتێکەو، شەیتان بێگومان ئەوەیە، کە مرۆڤ دەخاتە نێو دۆخی لەبیرچوونەوەی چەند شتێکەوەو، هەر ئەویشە مرۆڤ بۆ بیرچوونەوە هەڵدەنێتو وای لێ دەکات شتی لەبیربچێتەوە. وای لێ دەکات خودای پەروەردگاری بیر بچێتەوەو، ئاینەکەی بیر بچێتەوە، ئەرکەکانی بیربچێتەوە، تابەم ڕەنگەش بەئاسانی بەسەریا زاڵ بێت و، دڵی داگیربکات.. بێگومان شەیتان تەنها لەکاتێکدا زەفەر بە مرۆڤ دەبات، کە وەختی بیرچوونەوەیەتی، بەڵام موسڵمانی بێدارو چاوساغو بەرچاوڕوون ئەو کەسەیە، کە شەیتان لەهیچ ڕایەکەوە ناتوانێت زەفەری پێ ببات.. خودا لەمبارەیەوە فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ الأعراف﴾.

واتە: (بێگومان ئەو ئیماندارانەی لەخواترس‌و بەتەقوا بوون، هەرکاتێك لەلایەن شەیتانەوە خورپەو خەیاڵێك بەدڵیان دابێت، دەسبەجێ خوایان بە بیردێتەوەو بێدارو بەرچاوڕوون دەبن، برا شەیتانەکانی ئەم شەیتانەش کۆمەکیان دەکەن لە گومڕاکردنیان، بەهۆی ڕازاندنەوەی گوناهەکان لەبەرچاوانیان.. پاشان کوڵ نادەن‌و درێغی ناکەن لەگومرایی کردنیاندا).

بێگومان شەیتان لەپشت هەموو لەبیرچوونەوەیەکەوەیەو هەر ئەویشە وا لە خەڵکی دەکات شتیان لەبیر بچێتەوە، تۆ کاتێك شتت لەبیردەچێت ئەوە هەر شەیتانە کەشتی لەبیر بردوویتەوە، منیش هەرشتێکم لەبیر بچێت، ئەوە شەیتانە لەبیری بردوومەتەوە ﴿فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ﴾.

# " سَرَبًا ، و عَجَبًا "

قورئانی پیرۆز بەدوو دەربڕین (تعبیر) گوزارشتی لە ڕۆشتنی ماسییەکە بە نێو دەریاکەدا کردووە. لە یەکەمیاندا: ﴿نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلْبَحْرِ سَرَبًا﴾ لەدوای ئەمەش: ﴿فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلْبَحْرِ عَجَبًا﴾ لێرەدا مانای (سربا) ئەوەیە کاتێك ماسییەکە بەدەریاکەدا ڕۆشتووە، خودا ڕێی لە یەکگرتنی ئاوەکەگرتووەو لێکی دابڕیووەو نەیهێشتووە بەدوای ماسییەکەدا بڕوات، ئیدی لەدوای ماسییەکەوە ڕێڕەوێکی بەتاڵ لەسەر ڕووی ئاوەکە هەبووە، کە ئاویشی تێدانەبووە، ئەمەش وەك تاقێك بووە، وەك پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **((وامسك الله عنه جرية الماء، حتى كان مثل الطاق))** واتە: (خودا ڕۆشتنی ئاوەکەی لیّ گرتەوە تاوەك تاقێکی لیّ هات).

مانای (عجباً)یش ئەوەیە، بێگومان ژیان بەبەرداکردنەوەی ماسییەکە (کە ماسییەکی برژێنراوی سوورکراوی دانراوی نێو زەمبیلەیەك بووە)و دەرچوونیشی لەم زەمبیلەیەو ڕۆشتنی بەنێو دەریاکەداو وەستاندنی ئاویش لەدوایەوە، هەموو ئەم موعجیزانە سەرسوڕمان (عجبا)و سەرسامبوونی مرۆڤی دەخوازن، هەربۆیەش مووساو کوڕە یاوەرەکەی لەوە سەرسام بوون.

لێرەدا ماوەتەوە ئەوەی حیکمەت لە جیاوازیی گوزارشت (تُعْبیر)ەکان لەهەمان ڕووداو ڕوون بکەینەوە، واتە بۆچی جارێکیان فەرمویەتی (سربا)و، جارێکی تریش فەرموویەتی (عجبا). وەڵامەکەش لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ بەدیی دەکرێت، کە فەرموویەتی: ((فکان للحوت سربا والموسی وفتاه عجباً)) واتە:

ڕووداوه بۆ ماسییەکەی کە (سرباً) بووه، بۆ موساو یاوەرەکەشی (مجیباً) بووه ڕازو نهێنیی جیاوازیی گوزارشتەکەش له هەردوو وشەکەدا ئەو لایەنەیە کە تەعبیرە قورئانیەکە سەرنجی لێ داوەو، ئەو گۆشەیەشە کە لەنێویەوه بۆ چیرۆکەکەی ڕوانیوه، چونکه لە جاری یەکەمدا لەگۆشەی ماسییەکەوە بۆ ڕووداوەکەی ڕوانیوەو سەرنجی لە جموجوولّی ماسییەکە لە دەریاکەدا داوەو فەرموویەتی: ﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ سَرَبًا﴾، بەڵام لەجاری دووەمدا لە گۆشەی مووساو کوڕە یاوەرەکەیەوه بۆ ڕووداوەکەی ڕوانیوەو شوێنەواری جموجوولّی ماسییەکەی لەسەر دەروونو هەستی مووساو کوڕە یاوەرەکەی بەدیی کردووە، بێگومان ئەوانیش هەردووکیان سەریان لە جموجوولّی ماسییەکە سوڕماوە، هەربۆیەش فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبًا﴾.

لێرەشدا ئاماژە دەکەین بۆ ئەو کارە سەرسوڕهێنەی کە جموجوولّی ماسییەکەو گیان بە بەرداکردنەوەی بەرپای کردووه، سەرچاوەی ئەمەش نکوولّی کردنو سەیر لێ هاتنیان نەبووه، چونکه مووساو کوڕە یاوەرەکەش باوەڕیان بەتوانای خودا لەسەر زیندووکردنەوەو بەدیی هێنانی موعجیزەکان هەبووه، بەڵام سەرچاوەی ئەمە، هێزی سەرسوڕهێناندنی ڕووداوە کتوپڕییەکەو، پێوە ئالّوودە بوونو کارلێک بوونیەتی بەو ڕووداوه.

## "ئاشتی لە کوێی ئەم زەوییەی تۆ دایە"

کاتێك (یوشع)ی یاوەری (مووسا) هەواڵی لەبیرچوونەوەی ماسییەکەی بە (موسا) ڕاگەیاندو، داوای گەڕانەوەیانی بۆ لای بەردە زلەکە لێکرد، (مووسا)ش پێی گوت: (ئا ئەوه بوو مەبەستی ئێمە/ ذلك ماكنا نبغي)..ئیدی بەڕێی خۆیاندا ڕۆشتنەوەو، ئاسەواری ڕۆشتنی پێشوویان لە گەڕانەوەدا گرتەبەرو، بەسەر شوێن

پێیەکانی خۆیاندا دەچوونەوە، ئەمەش مانای ئەم ڕاستیەیە، کە خوا فەرموویەتی: ﴿فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا﴾. دەشێت لەمەوە ئاماژەیەك بۆ گرنگیی گێڕانەوەی چیرۆك و بۆ چۆنیەتی گێڕانەوەو شیاوبوونیشی بکەین.

جا کاتێك گەیشتنە ناوچەی پێکگەیشتنی نێوان دوو دەریاکەو لایان دایە پاڵ بەردە زلەکە، بەندەیەك لە بەندەکانمان ﴿عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا﴾یان بینی، وەك پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرموویەتی: (دیتیان ئەوە خدرەو پۆشاکەکەی لەخۆی ئالاندووەو لەسەر پشت کەوتووە) (مووسا) سلاوی لێکردو، (خدر)یش کراسەکەی لەسەر ڕوخساری خۆی لاداو گوتی: (وعليك السلام).. هەروەها (خدر) سەری سوڕما لە پیاوێك، کە لەو ولاتەدا سەلامی لێ دەکات ((چونکە سەلام و سلاوکردنی ئیماندارانەکە لە بنەڕەت و ڕیشەی ئاشتی و برایەتییەوەیە) لەنێو خەڵکی ئەو ولاتەدا نەمابوو، هەر بۆیەش دوای وەڵامی سەلامەکەی بە (مووسا)ی گوت: (ئاشتی لەکوێی ئەم زەوییەت دایە)؟

ئەم پرسیارەی (خدر) ئاتاجی بە هەڵوێستەیەك هەیە، چونکە وەڵامەکەی وەك ئەوە وایە، کە (خدر) سەرسام بێت کاتێك لە کەسێك سەلام دەبیسێت. ئەمەش لەوانەیە هۆیەکەی لەبەر نەبوونی ئیمانداران بووبێت لەو جێگەیەدا.. ئیدی ئاگاداری ئەوەش نەبووە کەوا (مووسا) بەتایبەتی بۆ لای ئەم هاتبێت.

بەڵام ئێمە لەم پرسیارەی خدردا مەسەلەیەکی دوورترو بەرفراوانترو قووڵتری لێ تێدەگەین، ئەمەش وەك ئەوە وایە مەبەستی هەموو سەرزەمینی ئەو ڕۆژگارە بووبێت، بەڵکو هەر دەبێت ناکۆکی و ململانێ و بەربەرەکانی و بەرەنگاریی لەسەر ڕووی زەوی لەنێوان خەڵکیدا ببینێت، مێژووش بۆی گێڕاوینەتەوە، کە هیچ ماوەیەك لە ماوەکانی مێژوو لە جەنگ و ئاشووب بەدەرنەبووە، کە لێرەو لەوێ لەسەر زەوی ڕوویداوە. ئەم جەنگانە لەم سەردەمە تازەیەی ئێستاشماندا ڕووەو زیادبوون و توندترو بەرفراوانترە.. گشت خوێنەرێکی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش،

هەمیشه چاوی دەکەوێت بە هەواڵەکانی ناکۆکیو کوشتار، کە لە هەموو ژمارەیەکی تازەی ئەو بڵاوکراوانەدا هەیە، هەر گوێگرێکی هۆیەکانی تری ڕاگەیاندنیش، چ لە کەناڵەکانی بیستن یان بینراوەوە بەردەوام گوێی لە هەواڵی کوشتارو جەنگە خوێناوییەکانە، هەر ئەمەشە سروشی ئاماژە بۆکراوی خودا، کە لەبارەیەوە فەرمووییەتی:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ ...﴿١١٩﴾ هود﴾، واتە: ئەگەر خودای پەروەردگارت خواستی لەسەر بوایە هەموو خەڵکی سەرزەویی دەکرد بەیەك نەتەوەو کۆمەڵ، بەڵام بەردەوام (خەڵکی) دژ بەیەكو لێك جیاوازن، مەگەر ئەوانەی، کە بەهۆی ڕەحمو بەزەیی پەروەردگارتەوە ئاسوودەو سەربەرزن، خوداش هەر بۆ ئەو مەبەستی بەبەرەکانیەی نێوان هەقو ناهەق خولقاندوونی).

هەروەها خودای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿...وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ...﴿٢٥١﴾ البقرة﴾. واتە: (خۆ ئەگەر خودا هەندێك کەسی لە خەڵکی بەهەندێکی تریان لەناونەباتو جەنگو ناکۆکی لەنێوانیان دانەبێت، ئەوا زەوی بەهۆی ئەو کۆمەڵە ستەمکارانەوە دەشێواو پڕدە بوو لە خراپەو تاوانو زۆرداری). ئەم واتایانەش سروشی پرسیارکردنەکەی (خدر)ی گەیاندووە، کە بەزمانی عەرەبی وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە ((وَأَنَّى بأرضك السلام)) ئاشتیو سەلام لەکوێ ی ئەم زەوییەی تۆدایە)؟ لە زمانی عەرەبیشدا وشەی (أنّى) بۆ بەدوورگرتنە (للاستبعاد) بەمانای بەدیی هاتنی ئاشتی لەسەر ڕووی ئەم زەوی یە بەدوور دەگیرێت).

## "عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ"

قورئانی پیرۆز وەسفی (خدر)ی بە ﴿عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ﴾ بەندەیەك لە بەندەكانمان) كردووە كە لە فەرمایشتەكەی خوادا هاتووە.. دانانی وەسفی بەندایەتی لەلایەن خوداوە، مانای (لێدابڕینی پێغەمبەرێتی لە (خدر)) ناگەیەنێت، هیچ لێك نەچوونێكیش لەنێوان هەردوو وەسفی (بەندەی خودا)و (پێغەمبەری خودا) دانیە. جێی باسە پێشتریش ئەوەمان یەكلا كردەوە كە (خدر) پێغەمبەرێك بووە.

بێگومان بەندایەتی (عبودیە) بۆ خودا دیارترین ڕواڵەتو ئاكاری پێغەمبەرێتییە. پێغەمبەران زۆرترین كاری بەندایەتیو خواپەرستییان لەنێو خەڵكیدا هەبووە، چونكە ئەوان زاناترینی خەڵكی بوون لەناسینی پلەو پایەی خوداو ئەركی پێویست بەرامبەر خودا، لەنێو خەڵكییشدا لە هەموویان زیاتر سوپاسگوزارو شواكرنەبژێری خودا بوون لەسەر نیعمەتەكانی خودا. خوداش چەندین پێغەمبەری بەڕێزی خۆی بە ئاكاری بەندایەتی (عبودیة) وەسف كردووە بۆ نموونە لەبارەی (نووح)ەوە ـ سڵاوی لێ بێت ـ فەرموویەتی: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ٣﴾ الإسراء. واتە: (جگە لە (بنواسرائیل) كەنەوەی (ئیسرائیلن) نەوەی ئەو كەسانەشن كە لە كەشتییەكەدا لەگەڵ (نووح)دا هەڵمان گرتنو ڕزگارمان كردن، تاكو سوپاسگوزاری خودابن، چونكە بەڕاستی (نووح) بەندەیەكی سوپاسگوزاری خودا بووە).

لەوەسفی بەندایەتی پێغەمبەریشدا ﷺ فەرموویەتی: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ

مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ الإسراء﴾، واتە: (پاکیو بێگەردیو بێ کەموکوڕی بۆ ئەو خوایەی کەشەوڕەویی لە بەشێکی کەمدا بە(بەندە)ی خۆی کرد).

هەروەها قورئانی پیرۆز لە زۆر جێگەدا وشەی (عُباد/بەندەکان) بۆ ئەو کەسە ئیماندارانە بەکاردێنێت، کە باوەڕیان بەخودا هێناوە، وشەی (عبید/ کۆیلەکان)یش بۆ ئەو کەسە کافرانە بەکاردێنێت، کە باوەڕیان بەخودا نەهێناوە.

## " لەنێوان ڕەحمەتو عیلم دا"

قورئان ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە خودا ڕەحمەتو عیلمی لەلایەن خۆیەوە بە (خدر) بەخشیوە: ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾

لە ئاماژە جوانەکانی ئەم ڕاستیەدا ئەوەیە، کە بێگومان سۆزو بەزەیی (ڕەحمەت) لە خوداوە دەدرێت بەبەندە، ئەمەش چونکە لەو بەخشینەیە، کە ڕاستەوخۆ لە خوداوەیەو بەسەر ئەو کەسەدا دەڕژێتو وای لێدەکات لە خۆشیو بەختەوەریدا بژی.

بەڵام زانست (عیلم) بەشێوازی فێربوون لەخوداوە دەست بەندە دەکەوێت، واتە چونکە ئاتاجی بە هەوڵدانو خۆفێرکردنو بەدەستهێنانو تێکۆشان هەیە، جا ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ زانستدا کارلێك نەکاتو کاری لەسەرنەکاتو هەوڵی بەدەست هێنانی نەدات، ئەوا هیچی لێوە دەسگیر نابێت. هەروەها لە ئاماژەو پەندە شیرینەکانی ئەم ڕستەیەدا ئەوەش هەیە، کە بێگومان ڕەحمەتو بەزەییەکە لە خوداوەیە ﴿رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ بەڵام زانستە، کە (العلم) لەلای خودایە ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ لە ڕستەکەدا جیاوازیی نێوان (عِندِنا)و (مِن لَّدُنَّا) کراوە..

لەمبارەیەوە، ئیمام (راغبی اصفهانی) گوتوویەتی: ((لَّدُنَّ) له (عِندِ) تایبەتترە، چونکه مانای دەست پێکردنی کارێکه کە کۆتاییەکی هەیە، وەك ئەوەی بلێیت: (أقمت عنده من لدن طلوع الشمس الی غروبها) من له سەرەتای هەڵهاتنی خۆرەوە تائاوا بوونی لەلای ئەو کەسەبووم) لێرەشدا وشەی (لدن) لە جێگەی کۆتایی فەرمانەکەوە دادەنرێت. هەروەها (لدن) لەکاتی گێڕانەوەی هەواڵێکدا له جێگەی (عند)دا دادەنرێت، وەك ئەوەی بلێت: (اصسبت عنده مالا، ولدنه مالا) هەندێك له زانایان گوتوویانە: ئامرازی (لدن) فراوانترو تایبەتترە لە (عند)"[١].

بەپێی وتەی (راغبی اصفهانی)، ئامرازی (لدن) له (عند) تایبەتترو ڕەوان تر. ئەی بۆچی خودا به (لدن) گوزارشتی له زانست کردووە؟ لەڕووی بەراوردەوە، ئەگەر بڕوانین بۆ (ڕەحمەت)و (عیلم) دەبینین ڕەحمەت له عیلم گشتگیرترە، بۆ نموونە (ڕەحمەت) لەخوداوە بۆ سەرجەم دروستکراوانیتی.. هیچ ژیانێکیش بەبێ ڕەحمەتی خودا بۆ مەخلووقێك نیە، هەروەها ڕەحمەتی بۆ سەرجەم گرۆی ئادەمییش هەیە بە موسڵمانو کافرەوە، دەناگەر ڕەحمەتی خودا نەبوایە نەدەژیان..بەڵام زانستو عیلمو هودا نایبەخشێت لە هەموو مەخلووقێك. هەروەها بە هەموو مرۆڤێکیشی نەبەخشیوە، بەتایبەتیش گەر زانستەکە زانستێکی تایبەتیی خودایی بێت، وەك ئەو زانستەی، کە خودا فێری (خدر)ی کردووە. هەر بۆیەش بەهۆی گشتگیریی‌و شموولیەتی (ڕەحمەتی)یەوە خودا بە ئامرازی گشتیی (عند) گوزارشتی لێ کردووە. بەڵام بەهۆی تایبەتیاریی (زانست)ەوە، خودا بەئامرازی تایبەت (لدن) گوزارشتی لێ کردووە. (خوداش هەرخۆی زانایە لەم ڕووەوە) لە وەسفکردنی زانستەکەی (خدر)دا بەوەی، کە له خوداوەیە، ئاماژەیەکی سرووش بەخش بۆ (مووسا) بەدیی دەکەین لەمەڕ ئەوەی، کە بێگومان کردارەکانی (خدر) ڕاستو دروستو ڕاستپێك بوون، چونکه دەرەنجامی ئەو زانستە تایبەتییە بوون، کە لەلای خوداوە پێی دراوە.

(١) المفردات للراغب: ٤٤٩)

بـەڵام حەزدەکـەین هەڵوێـستیەك بکـەین لەئاسـت حیکمـەتی پێشخـستنی (ڕەحمەت)و دانانی لەپێش (عـیلم)دا: ﴿ءَاتَيْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَـٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾ ئەی داخۆ پەیوەندیی نێوان (ڕەحمەت) و(عیلم) چی بێتو بۆچـی ڕەحمـەت خراوەتە پێش؟ بێگومان ڕەحمەت ئەو بنچینەیەیە، کە پێش دەکەوێتو، ئەو کەش‌و ژینگە شیاوەشە بۆ سوودمەندبوونی زانـستو خێـرو بەرەکەتەکـەی.. جـا ئەگـەر ڕەحمەت لە زانست داماڵڕێتو نەکەوێتە پێش زانستەوەو، نەبێتە هـیچ دەسـتپێك‌و بناغـەیەك بۆی، ئەوا زانست دەبێتە شەڕو وێرانەو کاول بـوون. لەبـەر ئـەم واتایـە ڕەحمەت خراوەتە پێش زانست. زانستەکەی (خـدر)یـش ئاوێتـەی (ڕەحمـەت)بـوو. ڕەحمەتەکەش زەمینەیەکی گونجاو بوو بۆی‌و ڕەنگدانەوەی لەگەڵدا هەبوو، لەوێوەش گەشەی کرد، بۆیەش زانستەکەی بەسوودو چاك‌و پیرۆزو بـەپیس بـوو.. هـەر بـەو زانستەشی پاپۆڕەکەی لە زەوتکردن پاراستو بۆ هـەژارەکانی هێـشتەوە.. هەربـەو زانستەبوو کە دایك‌و باوکەکەی لە کوڕە کافرەکەیان ڕزگارکرد بەو ئومێدەی خـودا بە کوڕێکی ئیماندار بۆیان قەرەبوو بکاتـەوە.. پاشـان هـەر بـەو زانـستەشی بـوو دیواری هەردوو کوڕە هەتیوەکەی بنیات نایەوەو بەمەش گەنجینەکەی بۆ پاراسـتن. (خدر) لەکاتێکدا ئەم کارانەی ئەنجام دەدا، کە بە زانستەکەیەوە ڕەحمەتی پێدرابوو، زانستەکەشی بەو ڕەحمەتەوە لێکنرابوو.. ئەو کەسانەی، کە (خدرو مووساش) لـەو سەفەرەیاندا دیبوویانن هەر بەهرەمەندی ئەو ڕەحمەتـەی نێـو زانـستەکەی (خـدر) بوون. نموونەی ئەم ڕەحمەتە لە زانستەکانی موسڵمانانیشدا هەبووە، ئەوەبوو هەموو جۆرە زانستێکیان ئاوێتەی ڕەحمەت بووو کارلێك‌و کاردانـەوەی تێداهـەبوو.. بۆیـە سوودی بە موسڵمانان گەیاندو سوودی بەگەلانی تریش گەیاند.

بەڵام خۆ ئەگەر ڕەحمەت لـە (عـیلم) داماڵرێـتو، ڕەحمـەتی نەخرێتـە پـێش‌و کارلێك‌و ئاوێتەی نـەبێت، ئـەوا زانـستێکی زیانبـەخش وە شـەڕ خـوازو خـراپ‌و وێرانکـارو ماڵکاولکـارو پـیس دەبێـت.. بەڕاسـتی ئـەم وەسـفە بەسـەر زانـستە هاوچەرخەکانی خۆرئاواییەکاندا دەچەسپێت.

ڕاسته ئەوان زانستیان هەیەو، پێـشکەوتنی زانـستییان هەیـەو، گەیـشتونەته چەند ئاستێکی وەها، که لەوەوپێش بەخەیاڵی گەلانی پـێش خۆیانـدا نـەدەهات.. ڕاسته ئەوان چەندان لق‌و پۆیان له زانستەکانیان بـۆ تـەوەو، هەمـەڕەنگی‌و هەمـە چەشنەییشی تێکەوتووەو هیچ بوارێك لەبوارەکانی ژیانیان نەهێشتۆتەوە، که پەلی بۆ نەهاون.. بەلاّم ئـەو هـەموو زانـست‌و داهێنـراوو پیـشەسازی‌و دۆزینەوانـەیان بوونەته بەلاّ لەسەر خاوەنەکانیان‌و لەسـەر کەسـانی تـریش، چـونکه لـەبوارەکانی وێرانکردن‌و کاولکاری‌و سـتەمکاری‌و شـێواندن‌و دەسـدرێژییدا بـەکاریان دێـنن.. مرۆڤایەتیش بەهۆی ئەو زانستانەوە تووشی بەدبەختی‌و مەینەتی‌و گرفتـی ئـالۆزو نەخۆشی‌و زیانێکی زۆر بـوون. هەرکەسـێکیش گومـانی لـەم وتەیـەمان هەیـە، باپێمان بلێت، که ئایا چەکی ئەتۆمی‌و ناوکی‌و ئەلیکترۆنی بۆ سوودی جیهان، یان بۆ زیان گەیاندن به جیهان بەرهەم هێنراون؟!

ئایا بۆمبه ئەتۆمییەکان هەردوو شاری (هیرۆشیما)و (ناکازاکی)یان ڕزگـارکرد، یان وێران کرد؟! ئەی ئایا چەکه پێشکەوتووە میکرۆبییـەکان لەجـەنگی جیهانیـدا چییان کرد؟

ئەی داخۆ بۆمبەکانی (ناپالم)و بۆمبه هێشووییەکان‌و فسفۆرییەکانیش چی له قوربانیەکان دەکەن؟ ئەی چەکه کیمیاییەکان چ کارەساتێك له جەنگەکانـدا بـەرپا دەکەن؟!

ئەی داخۆ چەند کۆگای نهێنی لەلای دەوڵەتـه تاوانبارەکـان هەیـە، وەك کۆگـا (مخزن)ی چەکه کوشـندەکانی (خـۆرەیی)و (میـکرۆبـی)و (دەردەکوشـندەکانی وەك شێرپەنجەو کۆلێرا)و، لەدواییش دا ئەو دەردی ئایدزەی، که له کۆمپانیاکاندا سازو ئامادەیان کردووە تاکو بەسـەر نەیارانیانـدا بلاّویانکەنـەوە، لەکاتێکـدا جـەنگ‌و کوشـتاریان لـەدژ دەگێـڕن. بێگومـان چـەکه نوێیـه کیمیـایی‌و خـۆرەیی (جرثومی)یەکان پیسترین‌و چەپەڵترین‌و بێ‌نرخترینی ئەو نـموونانەن، کـه زانـستی

ماڵکاولکاری مرۆڤایەتی پێی گەیشتووەو، له ئاکامی ئەو زیرەکییه شەیتانیه ڕەش‌و کینه بەرانەیەوه پێی گەیشتووه که دژی ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتین. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوەیەدا پەی به لایەکی حیکمەتی دانانی (ڕەحمەت) لەپێش (عیلم)دا دەبەین که له فەرمایشتەکەی خوادا هاتبوو: ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾.

هەرلەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوەیەشدا دەرك بەگرنگیی تێکەڵکردنی زانست بەڕەحمەت‌و (زیادکردنی ڕەگەزی ڕەوشتمەندیی بۆ سەری)یشی دەکەین، تاکو ببێته زانستێکی بەسوودو پیرۆزو غەرقی ڕەحمەت.

## "ڕەفتاری جوان له خواستنی زانست دا"

کاتێك (مووسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ بەدیداری (خدر) گەیشت، خدر (سلاوی لێ بێت) پێی گووت: (تۆزانستێکی وەهات له زانستی خودا لەلایه کەخودا خۆی فێریی کردوویت‌و که من نایزانم، منیش زانستێکی وەهام له زانستی خودا لەلایەکه خودا خۆی فێریی کردووم وکه تۆ نایزانیت.. (مووسا) پێی گوت: (ئایا دەهێڵیت دوات کەوم تاکو لەو زانستەی کەفێری کراویت منیش فێرکەیت؟ ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾.

سەرەتا لەو وتەیەی (خدر)دا کەبە(مووسا)ی گوتووه ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەهیچ کەسێك هەموو زانستێکی لەلانیەو تایبەندی هەموو بوارێکی نیه. چونکه ئەوەتا (مووسا)ی پێغەمبەری بەڕێزی خودا (سلاوی خودای لێ بێت) هەندێك مەسەله نازانێت.. هەروەها (خدر)یش کەپێغەمبەرێکی بەڕێزی خودایه ـ سلاوی خودای لێ بێت ـ هەندێك مەسەلەی دی نازانێت..هەریەکه لەم دوانەش زانستێکی لەلایه که خودا فێریی کردووەو، بەلام هەمان زانستی فێری ئەوی تر نەکردووه

(خدر) یش ویستوویەتی ئەم ڕاستی یە، بە (مووسا) بگەیەنێت.. بۆیە کاتێك سواری پاپۆڕەکە دەبن، چۆلەکەیەك هاتووەو کەوتۆتە سەر لێواری دیواری پاپۆڕەکە، ئینجا بە دەنووکی خۆی جارێکیا، یان دووجار داوێتی لە ئاوی دەریاکە، (خدر)یش ئەمەی کردۆتە نموونەیەكو بە (مووسا)ی گوتووە: (ئەی مووسا ڕادەی کەمیی زانستی منو زانستی تۆ لەئاست زانستی خوادا هێندەی جێ دەنووکی ئەو چۆلەکەیەیە لەئاست ڕووبەری دەریاکەدا).

کەوابوو هەموو زانستە مرۆییەکان بە بەراورد لەگەڵ زانستی خوادا هەر زۆر کەمن بۆیەش خودا فەرموویەتی: ﴿...وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ الإسراء﴾، واتە: (ئێوە ئەی گرۆی ئادەمیی هیچ شتێکی ئەوتۆتان لە زانست پێنەدراوە تەنها شتێکی کەم نەبێت).

شاعیرێکیش گوتوویەتی:

**فقل لمن يدعي في العلم معرفة      خفظت شيئا وغابت عنك اشياء**

واتە: (بەو کەسە بڵێ کە (ئیددیعای زانیارییەك لەنێو زانستدا دەکات): تۆ شتێکت زانیوە لە کاتێکدا چەندەها شتی ترت لێ بزربووە).

بەڵام لە وتەکەی مووساشدا ﴿...هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ الكهف﴾ دوو مەسەلە وەردەگرین:-

## مەسەلەی یەکەم:

ئەدەبو ڕەفتاری جوان لەخواستنی زانستو، ئاکاری بەرز لە دەربڕینو دواندنی کەسێکی زانادا، ئەوەبوو (مووسا) بەشێوازی پرسیار بە(خدر)ی گوتبوو، "ئایا دەهێڵێت دوات کەوم/ اهل اتبعك)؟ واتە بەم شێوازە ناسکەو بەو ئەدەبی

پرسیارکردنو داوای سۆزو بەزەییە جوانە.. کەوابوو کە دەڵێت (من دوات دەکەوم) بەمانای (من شوێنکەوتووی تۆم، نەك هاوشانی تۆو نەك خۆم بەزانا بزانم لەئاست تۆدا.. کاتێك دواشت دەکەوم بۆ ئامانجێکە. هەروەها سەفەرم بۆ لای تۆو سەفەرم لەگەڵ تۆشدا هەر بۆ ئامانجێکە.. ئەوەیە لێتەوە فێربم.. زانستت لێ وەربگرم:-

﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ﴾ بۆ ئەوەی فێرمکەیت لەو زاستەی کە فێری کراویت) کاتێك زانست لەگەڵ ئەدەبدا داوا دەکرێت ئەوا باشو بەسوود دەبێت، بەڵام کاتێك زانست بەبێ‌ئەدەب داوا دەکرێت ئەوا زەرەرمەند دەبێت، چ بۆ خاوەنە داواکارەکەیو چ بۆ کەسانی تریش هەندێك لە خوێندکارانی زانست ئەدەبی فێرخوازیی لەدەست دەدەن، بۆ نموونە گەر کەسێکیان بابەتێك یان دوو بابەتی خوێند، یان فەرموودەیەك، یان دوو فەرموودەی لەبەرکرد، ئیدی خۆی بە زانایەکی کۆششکار (مجتهد) دادەنێت، کە پێویستە بە پەنجە ئاماژەی بۆ بکەن، ئینجا خۆی بەزانایەك لە سەروی زانایانەوە دادەنێتو لەسەر حسابی ئەوان دەردەکەوێتو، کار بۆ بەکەم دانانیانو سەرزەنشتکردنیان دەکات.

هەرکەسێکیش ئەدەبی خواستنو داواکاریی زانست قەدەغە بکات، ئەوە دیارە زانست قەدەغە دەکاتو، بەم پێیە هەموو خێرو چاکەیەکیش قەدەغە دەکات.

باشترین کتێبیش دەربارەی ڕەفتاری جوان لە خواستنی زانستدا کتێبی (تذكرة السامع والمتكلم في آداب العالم والمتعلم)ی (ابن جماعه)یە..

**مەسەلەی دووەم:**

مەبەست لە خواستنی زانستو فێرخوازی یەو، بەدەست هێنانی ژیریو تێگەیشتنە ﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ﴾ لە ڕستەکەدا (إعراب)ی (رشداً) بە ڕێزمانی عەرەبی (تمییز)ە، (تمییز)یش ئەوەیە، کە شتەکان لەیەك جیادەکاتەوە.

پێویستیشە ڕێزمـان (نحـو)بخەینـە گـەڕ بـۆ شـیکردنەوەی مەبەستەکەو وەك ئامرازو کەرەسەیەك بۆ دەرهێنانی هەندێك واتـاو دەلالـەتو سـەرنجی جـوان لـە پێکهاتەی ڕوانبێژیی قورئانەوە. بێگومان (مووسا) ـ سلاوی لیّ بێت ـ بـە وشـەی (رشدا) مەبەستو ئامانجی خۆی لە خواستنی زانستەکەدا دەردەخات.. واتـە ئـەو دەیـەوێت فێـری ژیـری بێـت. دەیـەوێت فێربێـت تـاکو ببێتـە کەسـێکی ژیـرو پێگەیـشتووو ئـەو زانـستە بەسـوودو ڕاسـتەش فێربێـت کـە ژیریـیو عـەقڵو تێگەیشتنی لێوە بەدیی دەکاتو، وای لیّ دەکات کە بە عەقڵ وژیری یەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دابکاتو هەر واش لەنێویان دا بژی.

هەندێك لە خوێنـدکارانی زانـست تـەنها فێربـوون دەکەنـە نیـازو هیوایـەك، دەیانەوێت فێری زانست بن تابن بەزاناو خوێندەوارو، ئیدی دروشمی (فێربوون هەربۆ فێربوونو زانست هەربۆزانست) بەرزکەنەوە.. بەلاّم بەسەرهاتەکەی (مووسـا)فێـری ئەوەیان دەکات کە خواستنی زانستو کاری فێر بوونی زانست بکەنە ئامرازێك بـۆ گەیشتنو بەنیازی پاك، ئەویش پەیداکردنی ژیریو تیّ شگەیشتن وبەدیهێنانی.

پاشان ئێمە دەبینین هەندێك لەخوازیارانی زانست ئـەو زانـستە فێـر دەبـن کـە ئاکامی خراپەو زەرەمەندیی یان هەیە، یاخود بۆمرۆڤ ئاکارە ناشیرینەکانو سیفەتە دزێوەکان هەڵدەنێت، یان هەندێك لەو فێرخوازانە فێری زانستە بیّنرخو کەم بایەخو بیّبەهاکان دەبنو برێکی زۆر لەماڵو کاتو بەهرەو وزەو تواناکانیـان تیـا بـەفیرۆ دەدەن. دەنـا توخـودا بەڕاسـتی پـێم بڵـیّ چ ژیـریو عـەقڵێك لـە فێربـوونی مۆسیقاوگۆرانیدا هەیە (واتە گۆرانیە سەیرو سەمەرەکانی ئەمڕۆ)؟ ئەی چ ژیـریو عەقڵێك لە فێربونی سەماو نیگارکێشانو پەیکەرتاشیو نواندندا هەیـە؟ زانـستی بەسوود ئەوەیە کە ژیریو بیروڕای جوان بخاتـەوەو ئەوسـاش دەبێتـە ئـەو درەختـە خۆشو پـیرۆزەی کـە بـەروبوومی خـۆشو بەسـوود دەگرێـتو، بـۆ کـاری بـاشو هەڵسوکەوتی جوان مل دەنێت.

# "لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا "

(خدر) لەوەلامی (مووسا)دا -سلاویان لێ بێت- کە داوای هاوڕێیەتی سەفەرەکەی لێکرد، پێی گوت: (ئەی مووسا تۆ لەسەر کردارەکانی من لەکاتی سەفەردا ناتوانیت ئارام بگریت) ﴿إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴾ بێگومان (خدر) هەواڵی ئەوەی بە (مووسا) داوە کە ئەو ناتوانێت ئارام لەسەر یاوەریکردنیو لەگەڵدا ڕۆیشتنی بگرێت.. ئەمەشی بە (نەتوانین) بۆ دەربڕیوە.. بێگومان جیاوازیش هەیە لەنێوان ئەوەی گەر بیگوتبایە (انك لن تصبر معی) و لە نێوان ئەوەی، کە پێی گوتووە: ﴿لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴾ دیارە لە وتەی یەکەمدا، واتە گەر بیگوتبایە: (انك لن تصبر معی) ئەم وتەیە تەنها نکوولی کردنە لە ئارامگرتن، کە بە هیچ شێوەیەك توانای تێدانیە.

لە وتەی دووەمدا، کە گوتوویەتی ﴿لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴾. ئەوەی بۆ ڕوونکردۆتەوە، کەوا (مووسا) هەوڵی زۆریش دەدات بۆ ئارامگرتن لەسەر کردەوەکانیو خۆیشی لەسەر ئارامگرتن ڕادەهێنێت، کەچی وێڕای ئەمەش ناتوانێت دان بەخۆی دابگرێتو لەسەر کردەوەکانی نەیەتە دەنگ.. بێگومان (خدر) ئەم مەسەلەیەی چەند جارێك بەچەند دووپات کردنەوەیەك بۆ (مووسا) ڕوون کردۆتەوە.. با یەکەیەکە وشەکانی ڕستەی (انك لن تصبر معی) شی بکەینەوە:-

- لە ﴿إِنَّكَ﴾دا (ان): پیتی دووپات کردنەوە حرف (توکید) و(نصب)یشە.

- ﴿لَن﴾: پیتی نکوولێکردنی ڕەهاو جەخت لەسەرکراوی هەمیشەییە، کە هەرگیز وا نابێت.

- تَسْتَطِيعَ : تواناداری (استطاعة)کەش هەر نکوولّی لێکراوە، نەك خودی ئارامگرتنەکە.

- بەمانای بێگومان مووسا، هەولّدەدات‌و خۆیشی ماندوو دەکات‌و هەرچی لە هەولّ‌و تەقەللایدایە، دوای ئارامگرتندا دەخاتە گەڕ.. کەچی لەگەلّ ئەوەشدا ناتوانێت (هەرگیز ناتوانێت).

-(مَعِيَ) دیاریکردنی ئەم وشەیەش سرووشتی ئەو ئاماژەیە دەبەخشێت کە (مووسا) دەستەوسان دەبێت لە ئارام گرتن لەگەلّیدا (لەگەلّ خدردا).. لەمەشدا (وێڕای ئەوەی بەرهەلّستی تێدایە) متمانەدان‌و دلّنیاکردنەوەیەکی بۆ (مووسا) تێدایە، کە دیارە (خدر) نایەوێت وزەو توانای (مووسا) لەسەر ئارام گرتن‌و دان بەخۆدا گران بەکەم بگرێت. بێگومان (مووسا) لەگەلّ کەسانی تری (غەیری خدردا) ئارام دەگرێت. بەلاّم شکستی‌و دەستەوساون بوونی لە مەسەلەی ئارامگرتندا، ئەوە تەنها لەگەلّ (خدر)دا وادەبێت کە ناتوانێت ئارام لەسەر کارەکانی بگرێت.

## " وَكَيْفَ تَصْبِرُ " و لێکدانەوەی دەروونناسی

وادیارە مووسا- سلاوی لیّ بێت - تووشی سەرسوڕمانو واق وڕمانێك بووە، چونکە ئاخر چۆن (خدر) بەسووربوونەوە بەرهەڵستیی دەکات لەسەر ئارام نەگرتنەکەی، بەو شتە دووپاتکراوانەش جەختی لەسەر بۆ دەکاتەوە؟! ئەی چۆن زانیویەتیو کێ هەواڵی پێداوە لەسەر ئەوەی، گوایە (مووسا) ئەوپەڕی هەوڵو کۆششی خۆی بۆ ئارامگرتن دەخاتە گەڕو، کەچی شکستیش دێنێت ..

پاساوێکی خدر لەم ڕووەوە بۆ مووسا ئەوەبوو، کە پێی گوتبوو: ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾ ئاخر تۆ چۆن ئارام لەسەر کردارێك دەگریت، کە پێشتر هیچ هەواڵو زانیاریو عیلمێکت لەسەری نەبووە)؟! لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ واهاتووە، کە (خدر) پێی گوتووە: (ئاخر تۆ چۆن ئارام لەسەر کردارێك دەگریت، کە هەواڵێکت لەسەری پێ ڕانەگەیەنراوەو، من فەرمانم بە ئیشێك پێکراوە، کە ئەنجامی بدەم، گەر تۆش ببینیت ئارامی لەسەر ناگریت (کە بێدەنگ بیتو پرسیاری لەسەر نەکەیت).

دیارە مووسا هەرگیز ئارام ناگرێت، چونکە چەند کردارو ڕەفتارێکی وەها لە (خدر) دەبینێت کە بەڕواڵەت نامۆنوئەو لە بنجو بناوانو حەقیقەتەکانیان نازانێت، هەربۆیەش نکوولّی لەو کارانەی دەکاتو ئارام لەسەر لەگەڵدا ڕۆیشتنیشی ناگرێت.

وتەکەی خدر ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾ ئاماژە بۆ سیفەیێك لەسیفەتە مرۆییەکانی دەروون دەکات. هەربۆیە پێویستە ئێمەش لەبەر ڕۆشنایی

زانستی (دەروونناسی)ی شیتەڵکاریی ڕاستیپێکدا لێی وردبینەوە، تاکو هەندێك لە ڕەهەنـدەکانی لـە دەرووی لێکدانـەوەی دەروونناسـیانەی ئـەو ئایەتانـەوە لێـك بدەینەوە، کە چەند مەودایەکی دەروونییان هەیە..

بێگومان خوداش دەروونی مرۆڤایەتیی لەسەر حەزکردن لە زانینو بەدەستهێنانی زانیاریەکان خەلق کردووە، چونکە مرۆڤـ حەز دەکات بزانێت چی لـە دەوروبەریـدا هەیەو، حەز دەکات هەموو ئەوەی دەیبینێتو دەیبیسێت، بیانزانێت. هەر بۆیـەش بڕێکی زۆر لە پرسیارو داواکاری زانین دەردەبڕێت، تاکو چەندین زانستو زانیـاریی نوێ دەستەبەر بکات. جا ئەگەر چەند شتێك ببینێتو لێیان تێنەگات ئەوا بەپەلە نکوولێکردنو بەرهەڵستی پیشان دەدات، یان بەلانی کەمەوە داوای ڕونکردنەوەیو بەدیارخستن دەکات. بەڕاستی سرووشتی مرۆڤـ ئاوا نارِوات، کە هۆشو بیری خـۆی هەڵوەشێنێتەوە، بۆیە ئارام ناگرێت لەسەر ئەوەی کە لێـی تێناگـاتو بێـدەنگیش نابێت لەوەی، کە توانای هەڵگرتنو حەوسەڵە لەسەرگرتنی نیە.

(خدر) ئا ئەمەی لە سروشـتی دەروونـی مرۆڤایـەتی زانیبـوو، لەبەرئەمـە بـە مووسای گوتووە: (من فەرمانم بە ئیشێك پێکراوەو، گـەرتۆش بینـەری ئیـشەکەم بیت ئارامی لەسەر ناگریـت.. ئـارامی بۆیـە لەسـەر ناگریـت، چـونکە ئاگـاداری حـەقیقەتو بارەی ڕاسـتەقینەکەی نـەبوویت.. عەقڵیـشـت توانـای بەئەندێـشە گرتنی نیە، چونکە تۆ هـیچ هـەواڵ زانیارییـەکت لەسـەریی پـێ نـەدراوە، ئیـدی گومانی مەسەلەیەکی وای لەسەردەبەیت، کـە نکـوولی کـردنو نـاڕەزایی لەسـەر دەربڕین، بخوازێت.

## لە ڕەفتارە جوانەكانی یاوەریی كردن و سەفەركردن

(مووسا)ـ سلاوی لێ بێت ـ پەیمانیدا بە (خدر) لەسەر ئەوەی كە لەگەڵیا بەئارام دەبێت و خۆی لە كردارەكانی هەڵناقورتێنێت: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرًا ﴿٦٩﴾ الكهف﴾ ئینجا (خدر)یش داوای لێكرد پەیڕەویی هۆكارێك بۆ بەدیی هێنانی ئم پەیمانە بكات، وەك پێی گوت: (گەر دوای من بكەویت لەم سەفەرەدا، ئەوا پرسیارم لەسەرهیچ كاروكردەوەیەكی خۆم لێ مەكە هەتا لەدواییدا خۆم هۆیەكانیت بۆ ڕوون دەكەمەوەو باری ڕاستییەكەیت تێدەگەیەنم ﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرًا ﴿٧٠﴾ الكهف﴾ بەمانای داوای لێكردووە كەلەسەر هیچ شتێك پرسیاری لێ نەكات و بەرهەڵستیی هیچ كردارێكی نەكات بەڵكو چاوەڕێی ئەوەبێت كە لەدواییدا هەواڵ و ڕوونكردنەوەو شیكاری كردارەكانی لە(خدر) خۆیەوە پێ ڕادەگەیەنرێت.

بەمەش وادیارە ڕێگە بۆ گەشتێك خۆش دەكات و ئاماژەی ئەوەش بە (مووسا) دەدات كە بێگومان چەند ڕووداوێكی لەناكاوو سەیرو سەمەرەو چەند پێشهاتێكی نائاساییش دەبینێت و، لەوانەیە (مووسا) ئەمانە بەناهەق و بێزارو (لە ڕواڵەت) دابینێت، بەلام بەرهەڵستی (خدر) بكات، بەڵكو چاوەڕوانیی ڕوونكردنەوە لە (خدر) بكات و بێئەوەی پرسیاریان لەبارەوە بكات، بائارام بگرێت و هیچ نەڵێت تا ئەو كاتەی كە (خدر) خۆی هۆیەكانی پێدەڵێت: جا لە كاتێشكیشدا سەرنجی وردو قووڵ لە ڕووداوەكانی نێوان ئەو دوو پێغەمبەرە بەڕێزە (خدرو مووسا) دەدەین، ئەوا دەبینین چەندین ڕەفتاری جوانی یاوەریكردنی نێو سەفەری تێدایەو، ئەو ڕێگا ڕاستەی سەفەرو گەشتیارییش پیشان دەدات كە هاوكاری و پێكەوە گونجان مسۆگەر دەكات و، ناكۆكی وناتەبایی نێوان گەشتیارەكانیش دوور دەخاتەوە..

چونکه (مووسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ پەیمان دەدات لەسەر ئارامگرتنو بۆ بەدی هێنانی ئەمەش پشت بەخودا دەبەستێت: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا ﴾..

ئارام گرتنیش پەیوەندییەکی بەتینی بەگەشتو سەفەرکردنەوە هەیە، چونکە هەردەبێت لە سەفەردا ئارامو ئۆقرەگرتن هەبێت. دەنا سەفەرێك بەبێ ئارامگرتن هەر ناکۆکیو ناتەبایيو بەدبەختی تێدا ڕوودەدات، هەروەها سەفەرکردن بەشێکە لە سزاو نارەحەتیو، مرۆڤی (سەفەرکار)یش نائارامو ماندوو شەکەتەوە، مێشكو دەمارەخانەی ماندووەو، زوو هەڵدەچێتو تووڕە دەبێت..هەر بۆیەش سەفەرکاری باش پەنا بەو ئارامگیرییە دەگرێت، کە بۆی دەلوێت.

مووسا گوتی: ﴿ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا ﴾. ڕەفتارێکی جوانی دیکەی یاوەریی کردن لە سەفەردا گوێڕایەڵی کردنە بۆ ئەمیری سەفەرەکە: ﴿وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرًا ﴾ لە سەفەریشدا پێویستە ئەمیرێکی فەرمانڕەوا هەبێت، تاکو گوێڕایەڵیی فەرمانی بکرێت، هەروەها پێویستە کارەکانی سەفەر ڕێكو پێك بخرێتو، ڕۆڵو کارو ئەرکەکانیش دابەش بکرێت.. هەروەك پێویستە فەرمانەکان جێبەجێ بکرێنو پێداویستی یەکان پەیدا بکرێن.. یەکێکی دی لەڕەفتارو ئادابی سەفەر ئەوەیە، کە برا گەشتیارەکان بەرهەڵستیو نکوڵی نەکەنو گرفت دروست نەکەن: ﴿ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرًا ﴾..

## "خـدر"و کەشـتـیـیەکـە

(مووسا) لەگەڵ (خدر) داـ سلاّویان لـیٚ بێـت ـ ڕێکـەوتن لەسـەر ئـەوەی کـە هاوڕێیەتیی بکات لەو سـەفەرەدا تـاکو زانیـاریی لێـوە فێربێـت، بـەو مەرجـەی پرسیاری لەسەر هیچ شتێك لـیٚنەکاتو دان بـەخۆی دابگرێـت تائـەو کاتـەی کـە (خدر) خۆی هەواڵو ڕوونکردنەوەی پیٚ ڕادەگەیـەنێت.. ئیـدی دەسـتیان کـرد بـە ڕۆشتنو هەنگاونان (فانطلقا) ئـەوان بـەڕێگای سـەر کـەنار دەریاکـەدا دەڕۆشـتنو ویستیان سواری کەشتی یەك بن، کەشتی یەکیش بەلایان داهاتو، ئەوانیش ڕایان گرتو سواری بوون، خەڵکە سەرنشینەکانی کەشتی یەکەش (خـدر)یـان دەناسـیو بەم هۆیەوە بەبیٚ کریٚ سواریان کردن، وەك لـە فەرموودەکەشـدا هـاتبوو... ﴿ئـەو خەڵکەی کە لە پاپۆرەکەدا بوون (خدر)یان دەناسی﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ناسراوی (خدر) لەلای خەڵکی ناوچەکەو، چەند پەیوەندییـەکی کۆمەلاّیەتیـشی لەگەڵیانـدا هـەبووەو کەسـانی تریـشی ناسـیوەو، بـەم پێیـەش ئـەو لێیـان دانـەبڕاوەو، لـە ئەشکەوتو چیاکان داگۆشەگیر نەبووە، لـەو وەختەشـدا کـە (خـدر وموسـا) لـە کەشتییەکەدا بوون، چۆلەکەیەك دیٚتو دڵۆپێـك لـە ئـاوی دەریاکـە بـە دەنـووکی دەخواتەوە.. (خدر)یش ویستویەتی ئەمە بکاتە مەسەلەیەکی زانستی بـۆ موسـاو بابەتەکەش لەڕێی لۆژیکی بەڵگـەداریی (المنطـق البرهـانی)یـەوەو بەبـەکارهێنانی هۆیەکانی ڕوون کردنەوەو بۆ شیی بکاتەوە. لەم ڕووەوە (خدر) بەمووسای گوتووە:

(ئەریٚ دەزانیت ئەو چۆلەکەیە بڕی چـەندێکی لـەئاوی دەریـا کـە خـواردەوە)؟ مووساش لە وەلاّمدا گوتی: (جا چەندێکی لیٚ خواردەوە تەنها یەك دڵۆپەئاوی لـیٚ هەڵگرتووە). (خدر)یش پێی دڵێت: (زانستی منو زانستی تۆش بە بەراورد لەگـەڵ زانستی خوادا تەنها وەك ئەو دڵۆ پـەئاوی نێـو دەنـووکی چـۆلەکەیەکە لـەئاوی دەریاکەوە هەڵی گرت)..

کاتێك هەردووکیشیان لە پاپۆرەکەدا بەڕێوەبوون (خدر) بەئانقەست تەختەیەك لە تەختەکانی پاپۆرەکە لێ دەکاتەوەو دەری دێنێت.. (مووسا)ش سەری لەم کارە دەسوڕمێت‌و پرسیار لەناخیدا سەر هەڵدەدات لەسەر ئەم کارەو هەر لەدەرونی خۆیشیدا کارەکە هەڵدەسەنگێنێت‌و بەو ئەنجامە دەگات کە ئەم کارە (دەرهێنانی پارچە تەختەیەك لەخوارەوەی پاپۆرەکە) هیچ مانایەکی نیە، چونکە ئەمە لەوانەیە ببێتە هۆی سەرنگووم بوونی کەشتییەکەو، سەرنشینەکانیشی هەروەها عەیبدارکردنی کەشتییەکەیەو کون تێکردنیەتی.. دیارە ئەم کردارەش شایستەی کەسانی تر نیە، ئیدی چۆن دەبێت ئەم خراپەیە دەرهەق کەسانێك بکرێت کە خاوەنانی کەشتییەکەن‌و کە ڕێزیان لە هەردووکیان (لە مووساو خدر) ناوەو بەخۆڕایی سواریان کردوون؟؟!

ئایا بەمە پاداشتی ڕێزلێنان‌و چاکەکردنیان دەدرێتەوە. لەبەر ئەمەش (موسا) ئەو پەیمانەی خۆی کە بە (خدر)ی دابوو کەوا پرسیار لەسەر کارەکانی نەکات لەبیردەچێتەوەو، بەرهەڵستیی دەکات لەسەر ئەوەو پێی دەڵێت: (ئەرێ تۆ بۆیە ئەم کەشتییەت کون کرد تاکو خاوەنەکانی سەرنگووم کەیت، بەڕاستی کارێکی ناهەمواری نەشیاوت ئەنجامدا) خدریش ئەوەی بەبیر دێنێتەوە کە ئایا من پێم نەگوتیت تۆ ئارام لەگەڵ مندا ناگریت ﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ الكهف ﴾.. (مووسا) ش داوای لێبوردن لەسەر بەرهەڵستیکردنەکەی دەکات‌و دان بەو لەبیرچوونەوەیەی دادەنێت: ﴿ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ الكهف ﴾کاتێك لەم حاڵەتەش ورد دەبینەوە چەند پەندێکی جوانی لێ وەدەردەهێنرێن: وەك:-

١- بێگومان پێغەمبەرانیش شتیان لەبیرچووەو، لەبیرچوونەوەکەشیان پێچەوانەی ئەو عیصمەت‌و پارێزراوییەیان نیە، کە خودا بۆی ڕەخساندوون لەم بارەیەوە

چەندان بەڵگە لە قورئاندا لەسەر حاڵەتی لەبیرچوونەوەی پێغەمبەران هەیە، وەك ئەوەی کە خودا بەدوایین پێغەمبەری خۆی (محمد)ی ﷺ فەرمووە: ﴿...وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ...﴾ الكهف ﴿٢٤﴾، واتە: (هەرکاتێك تووشی حاڵەتی بیرچوونەوە بوویت، خودای پەروەردگارت بەیادبێتەوە). هەروەها خودا دەربارەی یەکەم پێغەمبەریشی (ئادەم ) فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ طه﴾ (بەڕاستی ئێمە پێشتریش پەیمانمان لەئادەم وەرگرت لەسەر ئەوەی توخنی درەختەکە نەکەوێت، بەڵام ئەو پەیمانەی لەبیرچووەوەو حاڵەتی لەبیرچوونەوەکەشی وەهابوو، کە پێشتر بەتەمای ئەو سەرپێچییە نەبووە تابگاتە ڕادەی ئەوەی تاوانباری کەین).

حاڵەتی بیرچوونەوە لەلای پێغەمبەرانیش چەند ئاکارێکی مرۆیی یە، چونکە ئەوانیش مرۆڤ بوونو، نەریتی لەبیرچوونیش، نەریتێکی پێوەلکاوی ئادەمیزادەکانە.. ئەم لە بیرچوونەوەیەش لەشەیتانەوە نیە، چونکە شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی لەسەر پێغەمبەران نیە.

گەر سەرنج بدەیت لە وتەکانی (یوشعی کوڕی نون)و (مووسا) دەبینێت جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوانیاندا. (یوشع) لەسەر بیرچوونەوەکەی خۆی گوتبووی: (کە شەیتان هەواڵی ڕۆشتنی ماسییەکەی بیربردۆتەوە: ﴿فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَـٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ﴾، مووساش دەربارەی لەبیرچوونەوەی خۆی، داوا لە (خدر) دەکات، کە لێی نەگرێتو لەسەر لەبیرچوونی پەیمانەکە لێی نەپرسێتەوە: ﴿لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ﴾.. لەولاوە (یوشع) هۆی بیرچوونەوەی خۆی داوەتە پاڵ شەیتان، لەم لاشەوە (مووسا) لەبیرچوونەوەکەی خۆی خستۆتە پاڵ نەفسی خۆی.

٢- نکوولێکردنی مرۆڤی موسڵمان لەو کارەی کە بە سەرپێچیکردن لە شەرعی دادەنێت و، بێدەنگ نەبوون لێیشی، وەك چۆن (مووسا) نکوڵیی لە کارەکەی (خدر) کردوە لەسەر دەرهێنانی پارچە تەختەیەك لە کەشتییەکەو عەیبدارکردنی.

٣- دیتنی کارێك کە بە ڕواڵەتە دەرکەوتووەکەیدا لەکارێکی دزێو دەچێت، ئەو پەیمانەی لەبیرمووسا بردەوە، کە لەسەرخۆی فەرزی کردبوو، ئەمەش لە هەستەوەریی (حەساسیەتی) خۆیەوە بەرامبەر کارەکەو لە ڕەتکردنەوەی دەروونیی بۆیەوە بووە.

٤- کونکردنی کەشتییەکەش بە لێکردنەوەی پارچە تەختەکانیەتی.. زانایانیش جیاوازییان لەنێوان کونکردنو دروستکردن (خرق و خلق)دا کردووە، چونکە دروستکردن (خلق) هێنانە ئارای شتێکە لەسەر ئاقاری چاکسازیو ڕێککردنەوە، وەك چۆن خودا بەوشێوە چاکسازیو ڕێکوپێکییەوە ئاسمانەکانو زەویو مرۆڤی دروست کردووە. خودای داناو کاربەجێ لەیەك ئایەتدا کە ئایەتی ژمارە (١٠٠)ی سوورەتی (الأنعام) باسی هەردووو کرداری (خلق)و (خرق)ی پێکەوە کردووە، وەکو فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيْرِ عِلْمٍۚ ... ﴿١٠٠﴾ الأنعام﴾، واتە (جاهیلەکان جنۆکەیان کردۆتە هاوەڵو هاوبەشی خودا لەکاتێکدا، کە هەر خودا خۆی جنۆکەی دروست کردووە، هەروەها بەناهەق کوڕوکچ دەدەنە پاڵ خودا بێئەوەی هیچ زانیارییەکیشیان لەو بارانەوە هەبێت)..

پیتەکانی هەردوو وشەکەی (خلق) و(خرق) لەم ئایەتەداو هاتنیان پێکەوە لەیەك بابەتدا ئاماژەیەکەو، بۆ وجودی سێبەری نایابی هەریەکەیان، بۆ نموونەش وشەی (خلق هم) کە (خلق) لە سێ پیت پێکهاتووەو پیتی ناوەڕاستیان (لام)ە، کاتێك سەرنج لە ئەرکی (لام)ی نێو وشەکە دەدەین دەبینین ڕۆڵی چاکسازیی بینیوە، چونکە هۆیەکی گەیاندنی نێوان هەردوو پیتی (خاء)و (قاف)ەکەیە.

بەڵام وشەی (خرق) کـه ناوەڕاسـتەکەی (راء)ەو ئـەم را (راء)ەش ئامـاژە بـۆ مانای (خرق) دەکات کـه شـێواندنو لێکـدابڕینو کەلەبـەر تێکردنـه، چـونکه هەردوو پیتی (خاء) و(قاف) کەی لێکدابڕیوە.

٥- لِتُغۡرِقَ: ئەم لام-ەی سەرەتای وشەکه به (لام العاقبـة/ لامـی ئاکامـدار) نـاو دەبرێت، نەك (لامی پاساو هێن/ لام التعليل)، چونکه ئاکام (عـاقبة)و ئەنجامی کەلەبەر تێکردنی کەشتی یەکه سەرنگووم بوونی خاوەنانو سەرنشینانیەتی.

له فەرمایشی (لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا )ش دا ئاماژەیەك بۆ ڕێزلێنانی مرۆڤـو لەپێشتر دا بەتایبەتی له ئاست ماددەو ئامێردا.. چونکه مرۆڤـ بەڕێزترو شـکۆدارترە لێیـان، ئەمەش وەڵامێکه بۆ ئەو ڕێبازی کۆمۆنیستی (شیوعی)یەی، که مادده له مرۆڤــ بەچاکترو بەڕێزتر دادەنێت. هەروەها لەو فەرمایشتەی خوادا لەسـەر زاری مووسـا (لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا ) ئیشارەتێك بۆ مەترسیی گەورەی کارەکه هەیه، چونکه مل دەنێت بۆ سەرنگووم بوونی خـەڵکی سـەر کەشـتییەکە، هەربۆیـەش بەرهەڵـستی لەسـەر دەربڕیوە. بەڵام خۆ له دواییشدا (خدر) هەموو کرداره نائاساییەکانی بۆ (مووسا) لێکداوەتەوەو ئەویش بەوە دڵخۆش بووە. بۆ نموونه کاتێك ڕازو نهێنیی کـونکردنی کەشتییەکەی بۆ دەرخستووە، (مووسا) دڵشاد بوو، لەم بارەیەوە خودا لەسەر زاری (خـدر) فەرموویـەتی: ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ ﴾ واتاکەی بەکورتی: (ئەو کەشتییەی که عەیبدارم کـرد مـوڵکی چـەند هەژارێك بوو که لەدەریادا کاری بژێویی ژیانیان پێدەکرد، منیش بۆیه ویستم ئـاوا عـەیبداری بکەم چونکه لەو ناوچەیەداو لەپێشیانەوە، پادشایەکی ستەمکار هەبوو، که گشت کەشتییەکی چاكو بێعەیبی بەزۆر داگیر دەکرد)..

**لە پاساوەکەی خـدردا ئەم چەند ڕاستییە دەردێنین:-**

١- دیارە هەژارەکان خاوەنی پاپۆڕێك بوون، ئەمەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە هەژار (مسکین) خاوەنی هەندێك موڵكو ماڵ دەبێت، بەڵام بەشی پڕکردنـەوەی پێویستییەکانی ناکات. نەدار (فقیر)یش ئەوەیە کە خاوەنی هیچ نیە.

٢- وشەی (وراءهم) مانای (لەپێـشیانەوە) دەگەیـەنێت، هـەر چـەندە بەڕواڵـەت لەزمان دا مانای (لەدوایانەوە) بگەیەنێت بەمانای لـە پێـشیانەوە، کـە خـاڵی گەیشتنە، پادشایەکی ستەمکار هەبوەو، هەر پـاپۆڕێکی چـاكو بـێ خەوشـی بـەلادا تێپـەڕی بێـت بـەزۆرو سـتەم داگیرکـردووەو لـێ سـەندوونو، دەسـتی بەسەرداگرتووە.. (مووسـا)و کەسـانی تـری نێـو پاپۆرەکـەش زانیارییـان لـەو بارەیەوە نەبووە، بەڵام خودا ئەم زانیاری یەی بە (خـدر) گەیانـدووەو سرووشـی ئەوەشی پێ داوە، کە کەشتییەکە عەیبدار کات، تـاکو بـەو عەیبداربوونـە بـۆ خاوەنەکانی بمێنێتەوەو پارێزراوبێت.

٣- لەم هەڵسوکەوتەی خدردا وا تێدەگەین، کە کابرای پادشا، تەنها پاپۆڕی چاکی داگیرکردووە.

٤- ئەم کردارە نالەبارەی پادشاکەش دەلالەت لـە سـەرکارێکی سـەیرو نائاسـایی دەکات، چونکە بنچینەی ئەرکی ئەو پادشایە پاراستنی گەلەکەیەتی بەهـەموو کەسەکان و شتو مەكو ماڵو سامانیانەوە، کە دەبوایە پارێزەری ئەوان بوایـەو نەیهێشتایە، هیچ کەسێکی تریش دەسدرێژییان بکاتە سەر.. بەڵام ئەگـەر ئـەم پادشایە خۆی بووبێتە دزو ڕێگرو پلەو پایەو سـوپاکەیو، پیاوانیـشی بـۆ ئـەم کارە نالەبارە قـۆرخو پـاوان کردبێـت، ئـەوە بێگومـان کارەسـاتێکی گـەورەو نەهامەتیەکی دژوار بووە.

٥- لەکاتی خراپەوتاوانکاریی حاکماندا تەنها بانگەوازکاران‌و چاکەخوازان خـەڵکی ڕزگاردەکەن، چونکە ئەوان جێ ئومێدی خەڵکی‌و فریادڕەسن‌و بـەڕووی سـتەم‌و شێوان‌و زۆرداری دا دەوەستن وەك چۆن خدر ئاوا ڕەفتاری کردووە.

٦- ئاوڕو سەرنجێکی جوانی دیکە لەمەدا ئەوەیە: (خدر) (لـە ڕای عەیبـدارکردنی کەشتییەکەوە ئەو کەشتییەی پاراستووە..کەواتە هەندێك جار بۆ چاکسازییەکی هەمەلایەنە پێویستە بڕێکی کەم لە تێکدان‌و عەیبدارکردن هەبێت.. لەوانەشـە چاکسازی تێکەڵی هەندێك خراپکاری ببێت، جا ئەگـەر مەسـەلەکە ئاوابێـت، ئەوا بێگومان مرۆڤ هەندێك جار خۆی بەناچار لەوەدا دەبینێتـەوە، کـە دەبێـت هەندێك شتی بچووك تێك بدرێت.

بێگومان ئایینی ئیسلام، بەجێهێنانی سـزای بـۆ پاراسـتنی (نەتـەوەو ئـایین‌و ڕەوشت) پێویست کردووە، بۆ نموونەش کوشتنی بکـوژ (قاتـل)و، بـەردبارانکردنی مرۆڤی زیناکاری خاوەن هاوسەرو، بڕینی دەستی دز، هەموویان بەڕواڵـەت، کـاری ترسناك‌و خوێنڕێژیین، بەڵام زۆر پێویست‌و زەروورییشن بۆ بەدیهێنانی چاکـسازی‌و ڕێك کردنی کۆمەڵگە.

## "خـــدر" و کوشـــتنی کـــوڕە نەوجـــەوانەکـــە

(مووسا) داوای لێبوردنی لە (خدر) کرد لەسەر لەبیرچوونی بەڵێنەکەی.. دوبارە دەستیان کرد بە ڕۆیشتن (فانطلقا) لە کەشـتییەکە دەرچـووبوون‌و بەسـەر کـەناری دەریاکەدا ڕۆشتن، کۆمەڵێك منداڵ‌و مێـرد منـداڵیان دی، کـە پێکـەوە یارییـان دەکرد.. خدر سەیری نەوجەوانێکیانی کرد، کە (تازە پێدەگەیـشت) ڕووی تـێکردو سەری هەڵکەندو کوشتیی.. ئیدی منداڵەکە لەبەردەسـتی مـرد. (مووسـا)ش زۆر تێکچووو سەری سوڕما لەوەی دیتی، کـە ئـاخر چـۆن خـدری پێغەمبـەری خـودا

ڕوودەکاته نەجەوانەوانێکی بچووك كه هیچ هەڵەیەكو هیچ تـاوانێکی نـەکردووەو، دەیکوژێت. لەبەر ئەمە بەبێزاریو نکووڵی لێکردنەوە لەکارەکەی، ڕووی پرسـیاری تێدەکاتو پێی دەڵێت:﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴾، واته: (بەڕاستی سەیرە ئەوەتۆ بۆچی کەسێکی بێتاوانت کوشت بێئەوەی تاوانێکی وەهای شایستەی کوشتنەوە بێت، کردبێت؟ بێگومان کارێکی نارەواو ناهەموارت کـرد)؟! ئینجا (خدر)یش دووبارە ئەوە بەیادی (مووسـا) دێنێتـەوە کـە ئایـا پێـشتر پێـی نەگوتبوو (تۆ ئارام لەگـەڵ مـن ناگریـت): ﴿أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ بەوەش وای بۆ دەردەخات كه هـەر زووتـر پێـشبینیی بەرهەڵـستیو مـشتومڕی لێدەکرد، چونکه (مووسا) چەند شتێکی وا له (خدر) دەبینێت که بەڕواڵەت جـێی پەسەندکردن نییـن، بەتایبەتیش گەر له ڕووکاره دەرەکییەکانەوە بۆیان بڕوانرێت.

(مووسا)ش هەستی بەخۆی کرد، كه له نکووڵی لێکردندا پەلەی کردووەو خۆی لەسـەر پەیمانەکـه ڕانـەگرتوەو، شـەرمەزاریش بـوو لـەزۆریی پەلـەکردنی لـەو بەرهەڵستییانە، که بوونه هۆی گلەیی وگازاندەی (خدر) لەسەری بۆیه پێـی گـوت: (ئەگەر لەمەولا پرسیارم لەسەر هیچ شتێکی تر لێکردیـت، ئـەوا یـاوەریی کـردنم پەسەند مەکە، بەڕاستی لەلای من تۆ پاساوێکی زۆرت لەسەر لێبوردن بۆ دروسـت بووە)، ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴾.

کاتێك (خدر)یش لەدوای هەموو کارەکانی، بنجو بناوانی مەسـەلەکانی بۆشـی کردۆتەوەو، لەباسی هۆی کوشتنی منداڵەکەشدا بە (مووسـا)ی گوتـووە: ﴿ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ الكهف ﴾، واته: (ئەو کوڕە مێـرد منداڵەش (که ئاوا کوشتم) دایكو باوکێکی بـاوەڕداری هـەبوو، خۆیـشی زۆر بـه

کافرو بێباوەڕێکی خەتەرناك دەردەچوو، بۆیە ترساین لەوەی نەبادا بەوکوفرو ستەمکارییە باوكو دایکی تەواو وەڕسو بێزار بکات، بەوکارەشمان ویستمان کە خودای پەروەردگاریان لەجیاتی ئەوە کوڕێکی پاکترو بەڕەحمترو سۆزیان پێ ببەخشێتەوە.

**با هەڵوێستەیەك بکەین وچەند ڕاستییەك لەم ئایەتانەوە دەربێنین:-**

١- ڕاستە کە کوشتنی منداڵەکە لەلایەن (خدر)ەوە بەرواڵەت وەك کارێکی بەرچاو دەبێتە هۆی بێزاری دەربڕینی، هەربۆیەش (مووسا) بێزاریی لێ دەربڕیوەو، ئەم هەڵوێستەش بانگەوازێکە بۆ ئێمە دەربارەی بێزاری دەربڕین لەکاری ناهەموارو، کە ئەو بێزارییەش بەئاشکرا بێت.

٢- وتەی (مووسا) بە (خدر) ﴿قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾ ئاماژەیەکی تێدایە لەسەر بوونی کوشتنی ڕەوا بەپێی شەرع کە دەبێت نەفسێك لەسەر نەفسێکی دی بکوژرێتەوە، هەربۆیەش (موسا) نارەزایی لەسەر کوشتنی منداڵەکە دەربڕیوە، چونکە بەڕای خۆی لەبەر ئەوەی (ئەم منداڵە کەسێکی نەکوشتووە) شایستەی ئەوە نیە بکوژرێت. ئاشکراشە کە لە قورئانو سوننەتدا چەندان دەقی ڕۆشن لەسەر تۆڵە بۆ سەندنەوە (قصاص)و کوشتنەوەی نەفسێك لەسەر نەفسێك هەیە. دیارە زانیاریی (موسا)ش لەوبارەیەوە بەڵگەیەکە لەسەرئەوەی کە حوکمی خودا لە (تەوڕات)دا لەسەر (کوشتن) تۆڵە بۆکردنەوە (قصاص)ە بەهەمان کردار کە کوشتنەوەیەتی.. قورئانیش بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ ئەم حوکمە کردوە، وەك لە فەرمایشتەکەی خوادایە کە فەرموویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ...﴿٤٥﴾ المائدة﴾، واتە: (ئێمە لەسەر (بنو اسرائیل)

لە (تەورات)دا ئەوەمان لەسەریان فەرزکردووە کە بەڕاستی هەرکەسێك کەسێك بکوژێت، پێویستە بکوژرێتەوەو، هەر کەسێکیش چاوی کەسێکی تر کوێر بکات، دەبێت چاوی کوێر بکرێتەوەو، بەم ڕەنگە لووتیش لە بەرامبەر لووتداو گوێ لە بەرامبەر گوێداو، ددان لە بەرامبەر دانددا دەشکێنرێتەوەو، زامو برینەکانیش وەك خۆیان بەو ئەندازەیە تۆڵەیان بۆ دەسێنرێتەوە (لەم ئایەتەدا ڕستەی (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ) فەرزمان کرد لەسەریان، نووسیمان لەسەریان/ مەبەستی (بنو سرائیل)ە لەدوای ئەم ڕستەیەش ئامرازی (فیها/ لەناویدا) واتە لە تەوراتدا لەسەریان نووسراوە.. ئەی داخۆ چییان لەسەر نووسرابێت، تۆڵە بۆسەندنەوە (قِصَاصٌ) نووسراوە.. نەفسێك بە نەفسێك، چاوێك بەچاوێك، لووتێك بەلووتێك.. هتد. لەمەشدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ڕێکەوتنی کتێبە ئاسمانیەکان لەسەر زۆربەی حوکمو یاسا شەرعییەکان.

٣- (مووسا) لە بەرهەڵستیکردنیدا لەسەر کردارەکانی (خدر) جیاوازیی لە وەسفەکاندا داناوە، بۆ کەشتییەکە پێی گوت ﴿لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا﴾و بۆ کوشتنی منداڵەکەش پێی گوت: ﴿نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا﴾ (إمراً) (کارێکی دزێوی زەقو دیار).. (نکرا)یش واتە: (کارێکی ناپەسەندو نابەجێ)، کە هۆی بێزاری لەسەر دەربڕینە (نکرا) لە بێزاری دەربڕیندا لە (أمرا) کاریگەرترەو وەك قۆناغێکی دووەمی نارەزایی لێکردن وایەو، لە قۆناغێکی یەکەمیش توندترە. ئەمەش بۆ هەردوو کردارە ئەنجام دراوەکەیە، جا ئایا بەڕواڵەت کامیان لەو دوو کردارە لەوی تر دزێوو زەقترە؟! عەیبدارکردنی کەشتییەکە، یان کوشتنی ئەو جەوانەکە، بێگومان کوشتنی نەوجەوانەکە، کردارێکی زەقو دزێوترە، بۆیەش (بە وشەیەکی کاریگەرتری بێزاریو نارەزایی) دەربڕیوە.

٤- وشەی (نکرا) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە کردارەکە دەبێتە هۆی نارەزایی خەڵکی، چونکە بەڕووە دیارو ڕواڵەتییەکەیەوە کارێکی هەڵەو ناهەقە. بەڵام ئایا کوشتنی منداڵەکە لەڕاستیدا هەڵە بووە؟ نەخێر بەڵکو ڕاستو دروست بووە، بەتایبەتیش دوای ئەوەی (خدر) ڕازو نهێنی ئەو کارە نادیارەی بۆمان ڕوون کردۆتەوە، کە خودا خۆی هەواڵەکەی پێداوە، کەوا بێگومان ئەگەر ئەم منداڵە گەورە بێت کافرێکی بە زەبروزەنگ دەردەچێت. جیاوازیی نێوان (نُکر)و (مُنکَر)یش لە گوزارشتە قورئانیەکەدا ئەوەیە، کە: (النکر) ئەو کردارەیەکە خەڵکی بە کردارێکی پووچەڵ وناهەقی وای دەبینن، کە شایانی نکووڵی لێکردنە.. کەچی لە تەرازووی خواداو بەپێوەری حوکمی خودا هەقو ڕاست دروستە.

بەڵام (منکر) ئەو کردارە بێزاروەیە، کە لە تەرازووی خودا پووچەڵو هەڵەیە ئەگەرچی لای هەندێك کەس لە خەڵکی باشو جێی پەسەندکردن بێت. بنچینەی دانانی کرداریش بەچاك، یان بەخراپ ئەوەیە، کە ئیسلام بڕیاری لەسەر دەدات، کە لە قورئان، یان سوننەت دا ڕوون کراوەتەوە، نەك بە پێی ڕازی بوونی خەڵکی، یان ڕازی نەبونیان بێت[١].

٥- (خدر) بە (مووسا)ی گوت: (ئەرێ پێم نەگوتیت تۆ ئارام لەگەڵ من داناگریت) ﴿أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ بەڵام لەسەر بەرهەڵستی (مووسا) لەمەڕ عەیبدارکردنی کەشتییەکە پێی گوتووە (ئەرێ نەمگوت تۆ لەگەڵ من دا ئارام ناگریت ﴿أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ لەم دوو ووتەیەدا یەك جیاوازی بچووك هەیە، ئەوەیە خدر لە جاری دووەمدا (لك) (بەتۆ)ی بەکارنەهێناوە، واتە نەیگوتووە (ئەرێ پێم نەگوتیت، یان ئەرێ بەتۆم نەگوت).. ئەمەش زیاتر بۆ

---

(١) بڕوانە کتێبی (لطائف قرآنية)، کە بە پێنووسی نووسەری ئەم کتێبەیە.

جەخت لەسەرکردنەوەیە. ئەوەبوو کاتێك بەیەك گەیشتن، بۆی دوپات کردەوە کەوا ئارام ناگریت، چونکە (مووسا) بۆ دووەم جار نکوولّی کردەوەو وەك ئەوەیە (خدر) پێی بلّێت: (ئەریّ بەتۆم نەگوت..)، ئەریّ وانەبوو، من دەزانم کە تۆ ئارامم لەگەڵدا ناگریت، بەڵکو بەرهەڵستییم دەکەیت، ئیٚ خۆ پێشتر پێم‌گوتیت).

٦- هەستکردنی (مووسا) بە شەرمەزاریی لەئاست (خدر)دا بەهۆی بەربەرەکانی کردنیەوە، هەربۆیەش پێی گوتوە (گەر لەمەولا پرسیارم لەسەر هەرکردەوەیەکی تر لیٚ کردیت، ئەوا هاوڕێیەتیم مەکە ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي..﴾ لەمەشدا (مووسا) ـ سلاّوی لیٚ بێت ـ پەلەی کردوەو ئەو سزایەی لەئەستۆ ناوە، لەمبارەیەوە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ فەرموویەتی: **((رحمة الله علينا وعلى موسى، لولا انه عجل لرأى العجب، ولكن اخذته من صاحب ذمامة))** واتە: (ڕەحمەتی خودا لەسەر ئێمەو لەسەر مووساش بێت، ئەگەر پەلەی نەکردایەو بەپەلە بەرهەڵستی بەرامبەر کارەکانی (خدر) دەرنەبڕیایە ئەوا شتی زۆر گرنگو سەرسورهێنی تری دەبینی.. بەڵام لەئاست هاوڕێکەیدا کە (خدر)ە شەرم گرتوویەتیو لەئاست بەرهەڵستییەکانیدا زۆر شەرمەزار بووە..).

لەم فەرموودەیەدا بەڕوونی ئەوە باس کراوە کە بێگومان ئەگەر (مووسا) لەو سەفەرەیدا خۆی لەگەڵ خدردا بەردەوام بوایەو بەرهەڵستیی پیشان نەدایەو هێندە بەپەلەو دەم بەپرسیار نەبوایە، ئەوە دیارە شتی گرنگو سەرسوڕهێنەری تری پیشان ئێمەش دەداو زیاتر چێژو سوودمان لیٚ دەبینی، بەڵام دیارە بەهۆی بەربەرەکانی کردنیەوە شەرمەزار بووەو شەرم گرتوێتیو خۆیشی چی دی نەیتوانیوە هاوڕێیەتی بکات.

٧- (خدر) ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو هۆیەی پاڵنەری بووە بۆ کوشتنی کوڕە منداڵەکە، باوەڕو ئیمانە پتەوەکەی باوكو دایك کوڕەکە بووە، هەروەها بێباوەڕیو کفری کوڕەکەش بووە، کە ئەگەر لە ژیاندا بمایە تا گەورە دەبوو،

لەکاتێکدا خۆی کافرێکی سەرسەخت بووەو، باوكو دایکیشی دوو ئیماندار بوونو سەرەڕایی ئەمەش ئەم کوڕە بێباوەڕەیان هەیە، ئەوا بێگومان بە کفرو شیرك هەراسانو وەڕسی دەکردن.. ئەمەش دەلالەت لەوە دەکات، کە لەوانەیە پیاوچاك منداڵی خراپی هەبێتو لەوانەیە منداڵەکانی کافرو بێ ئیمانیش دەرچن، هەروەها ئەمە ئەومانایە ناگەیەنێت، گوایە باوکێکی پیاو چاك درێغیی لە پەروەردەو ئامۆژگاری کردنی منداڵەکاندا کردبێت، بێگومان پەروەردەو ڕێنمایی کردنی منداڵان، ئەرکێکی پێویستەو دەبێت بەجێی بگەیەنێتو، گەر باوکێك ئەم ئەرکە بەجێ نەگەیەنێت، یان سستیو درێغیی تێدا بکات؛ ئەوە گوناهبارە، بەڵام گەر منداڵەکانیشی بەخێو بکاتو پەروەردەو ئاڕاستەی باشیان بکاتو، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان خراپو بێئیمان دەرچنو، ڕێگەی ڕاستی باوکیان نەگرنەبەرو کافرو یاخی بنو، هەر کوڕێك ئاوا دەرچێو باوکی نەتوانێت یان دەستەوسان بێت لە پاشگەزکردنەوەی، ئەوا گوناهبار نابێتو هیچ گازاندەیەکی لەسەرنیە، بێگومان ڕاستە، کە باوك داوای لێکراوە کوڕەکەی بانگ کات بۆ سەر ڕێبازی ڕاستو ئامۆژگاریی بکات، بەڵام ئەوەی لێ داوانەکراوە، کە بتوانێت ئیمان بخاتە دڵیەوەو تێیدا جێگیر کات، چونکە توانای ئەمەی نیە، بەڵکو ئەوە تەنها بەدەستی خودا خۆیەتی.

٨- بێگومان باوکی خواناسو پیاوچاك ڕازیو قایل نیە بەوەی، کە یەکێك لە کوڕەکانی خۆی کافر، یان بەدکار، یان یاخی بێت، بەڵکو بەوە پەستو دڵتەنگو ئازاردراو دەبێت، هەر ئەمەش لە فەرمایشتی خودادا ئاماژەی بۆکراوە، کە خودا لەسەر زاری (خدر) فەرموویەتی:﴿فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴾ واتە: (ترساینو نیگەران بووین لەوەی کە ئەم کوڕە کافرە، سبەینێ باوكو دایکی بە ستەمو کوفرەکەی هەراسان بکات). بەمانای بە ستەمی لەڕادەبەدەری، کە بە (طغیان) ناو دەبرێت، هەروەها بەو کفرو بێ ئیمانیەی خۆی پەستو ماندووو بێئارامو دڵتەنگیان بکات.

ئای چەندە ئەو باوکە پەستو دڵ بریندارو نیگەران دەبێت کاتێـك کوڕەکـەی لەڕێی ڕاست لادەداتو، بانگەوازی چاکە ڕەتدەکاتەوە، لەوکاتەدا باوکە هیـوای ئەوە دەخوازێت کە هەرگیز ئەو کوڕەی نەخستایەتەوە، بەڵام ئەی چی بکات؟

ئەوا خودا بەوە تاقیی کردۆتەوەو گەربۆی شیاو بوایە دەیکوشت.. بێگومـان باوکی خواناسو پیاوچاك حەز دەکات کوڕەکەی لـەخۆی چـاکتر بێـت، لـەخۆی زیاتر چاکەو بەندایەتیی هەبێت، هەوڵیش بۆ ئەوە دەداتو، بەردەوام کوڕەکـەی بۆ ئەو ئاواتە ئاڕاستە دەکات، کـە لـەخۆی چـاکترو خواپەرسـتتر بێـت. چـەندە بەرچاوڕوونو دڵکراوەش دەبێت، کاتێك ئـەو دەبینێـت لـە بەرامبـەردا چـەندە هەست بەزیانو ڕەنجەڕۆییو ئازار چەشتن دەکاتو، چەندە هەست بـە شـەکەتیو ماندوێتی بەردەوامیش دەکات، کاتێك کوڕەکەی ئەو خواستە ڕەت دەکاتەوە.!!

٩- هەندێك جار مردنی کوڕێکی گومڕا، دەبێتە هۆی ئارامیو رزگـاری یـەك بـۆ باوكو دایکەکەی، وەك چـۆن (خـدر) گـوتی: ﴿فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ الكهف﴾، واتە: (بەکوشـتنی ئەومنداڵـە ویـستمان خودای پەروەردگارئـەو بـاوكو دایکـە منـداڵێکی پـاکترو چـاكو بـەڕەحمتریان لەجیاتی ئەم منداڵە پێ ببەخشێت، کە بەهۆی ڕەحمو سۆزو بەزەییـەوە کاتێـك گەورە دەبێت سەرفرازو ئاسوودەیان کات) جا ئەگەر ئەو کوڕە گومڕایە بـمرێت، ئەوە بێگومان دایكو باوکەکەی داوای قەرەبووکردنەوەی بەکوڕێکی تر دەکـەنو دەپاڕێنەوە، کە خودا منداڵێکی باشترو پاکترو میهرەبانتریان پێ ببەخشێت.

پەندو عیبرەتیش لە ژمارەی منداڵەکاندا نیە، بەڵکو لە پلەو ڕادەی ئەوەدایە، کە داخۆ منداڵەکان چەندە گوێڕایەڵو خواپەرستو بـاش ڕەفتـارو بـە ئـەدەبو ڕەوشتمەندنو، چەندە بە چاکی لەگەڵ باوكو دایکیاندا هەڵسوکـەوت دەکـەن.. جا ئیدی یەك منداڵ یا دوان هەبنو ئەم ڕەوشـتە بەرزانـەیان تێـدابێت، باشـترن لەوەی شەش منداڵ، یان دە منـاڵ هەبن، بەڵام ئـەم ڕەوشـتو ئاکارانـەیان تێـدا نەبێت.

١٠- ئەوەی لێرەدا بەوردی ئاماژەی بۆ دەکەین، ئەوەیە هیچ کەسێك لەئێمە بـۆی شیاو نیە کە لەم کردارەدا (واتە لە کوشتنی منداڵێکی لاسارو گومڕادا) شـوێن پێی (خدر) هەڵگرێت. هیچ کەسێك بـۆی نیـە لەخۆیـەوە کـوڕێکی نەوجـەوانو مێردمنداڵ بکوژێـت بـەبیانووی ئـەوەی گوایـە ئەگـەر گـەورە بـوو کـافرێکی سەرسەخت دەردەچێت، چونکە خودا خۆی ئەم هەواڵەی بە(خدر) دابوو وئایندەی ئەو کوڕە مێرد منداڵەی بۆ (خدر) دەرخستبوو، ئایندە کەشی هەر لـە غـەیبو نادیار دابووەو هیچ کەسێکیش نادیار نازانێـت، تـەنها خـودا نـەبێت، خـوداش بەخواستی دانایانەی خۆی هەنـدێك لـەو غـەیبو نادیارانـەی بـۆ هەنـدێك لـە پێغەمبەرانی دەرخستووە.

بەڵام کەسانی دیکە لە غەیری پێغەمبەران هیچ شتێك (لەغەیب نازانن.. ئیدی کێ هەبووە ئەو زانیاریە بەو کەسە بە(خدر) بگەیەنێت دەربارەی ئەو منداڵە، کەوا کافرەو باوكو دایکـی هەراسـان دەکـات؟ هـیچ سـرووش (وحـی)ێکـیش لـەدوای پێغەمبەری خوداوە ﷺ لەم بارەیەوە نەهاتووە.

## ( خـدر ) و ( دیوارەکـە ) و ( گـە نجینـەکـە )

(خـدر) داوای لێبوردنەکەی (مـووسا)ی پەسەند کردو، ئەم جـارەش چاوپۆشـی لێکرد، ئینجا دەستیان بەڕۆیشتن کردەوە، (فانطلقا) (مووسـا) یـەك جـاری تـری، واتە: یەك دەرفەتی تری بۆ هاوەڵێتیی (خدر) لەبەردەمدا مابوو، کە ئەگەر ئەمجارە بەرهەڵستی لەسەر هەر کردارێکی تری (خدر) بکات، ئەوا دەبێت لێی جیابێتـەوەو هیچ ڕێگەیەکی تری لێبوردنی لەبەردەم دانابێت. ئەی مەگەر پێی نەگوتووە (گـەر ئیدی لەبارەی هەرشتێکەوە پرسیارم لێکردیت، ئەوا هـەرگیز هاوڕێیـەتیم مەکـە ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَـٰحِبْنِى﴾ هەرواش بوو. ئەوەبوو بەلای گوندێکی

وەهادا تێپەڕین کەدانیشتوانەکەی پیسکەو چاوچنۆك بوونو میوانداریيان نەکردنو خۆراکیان پێ نەدان خدرو مووساش دیتیان لەو گوندەدا دیواری خانوویەك خەریکە دەرووخێتو، خدریش خێرا کاری تیاکردو بنیانی نایەوە تا نەڕووخێت ﴿ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ﴾.(مووسا) سەری سوڕما لەوکارەی خدر سوڕماو وای لەقەڵەم دابوو کە خەڵکی ئەم گوندە شایستەی ئەو کارە چاكو جوانەی (خدر)نین کە ئەو دیوارەی بۆ ڕاست کردوونەتەوە بۆیە، ئەم جارەش بەرهەڵستی پیشان دایەوەو پێی گوت: بۆچی بەخۆڕایی ئەم کارەت بۆکردن، بۆچی کرێیەکت لێیان وەرنەگرت؟ ﴿لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا﴾؟.. ئیدی (خدر) یش بەئاشکرا پێی ڕاگەیاند کە والێی جیا دەبێتەوەو چی دی هاوڕێیەتی ناکات: ﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ﴾..

کاتێك حیکمەتی بنیاتنانەوەی دیوارەکەشی بۆ ڕوون دەکاتەوە، پێی دەڵێت: ﴿وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ ...﴿٨٢﴾ الكهف﴾، واتە: (ئەو دیوارەش کە ڕاستم کردەوە، موڵکی دوو منداڵی هەتیوی نێو گوندەکە بوو کە لەژێریدا گەنجینەیەکی (زێرو زیوو)ی تێدا حەشاردرا بوو، (باوکیان بۆی هەڵگرتبوون) ئەگەر گوێمان بەو دیوارە نەدایە بارانو لافاو دەری دەخستو ئەو خەڵکە چاوچنۆکەش کە میوانداریی ئێمەیان نەکرد دەستیان دەکەوت باوکی ئەو دوو منداڵەش پیاوێکی چاك بووە، خودای پەروەردگاریشت خواستی وابوو تا ئەو کاتەی منداڵە هەتیوەکان گەورە دەبن، بۆیان بمێنێتو ئەوسا دەری بێنن، ئەم خواستەش ڕەحمەتێك بووە بەتایبەتی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆیان).

**لەم ئایەتەشـدا ئەم چەند سـەرنجە بەدیی دەکەین:**

١- خـەڵکی گوندەکـە ڕەزیـلو چاوچـنۆك بـوونو لـەم ڕووەوە زۆر تێپەڕیبـوون، ئەوەبوو دووپیاوی نامۆی وەك (خدرو مووسا) دەچنە لایانو هیچ خۆراکێکیـان پێ نیەو، نەریتی ڕەسەنیش ئەوەیـە خـەڵکی گوندەکـە بـە پێـشکەشـکردنی خۆراك بۆیان ڕێزیان لێبگرن بێئەوەی پێشتر ئەمان داوای خۆراك بکـەن کەچـی ئەو نەریتە نانوێننو خۆراکیان پێ نادەن بۆیـە بەناچـاری خۆیـان واتـە (خـدرو مووسا) داوای خۆراکیان لـێ دەکەنو باسـی برسـێتیی خۆیـان دەکـەن کەچـی بەهۆی زۆریی چاوچنۆکیو پیـسکەیی یانـەوە ئـەو داوایـەیان ڕەت دەکەنـەوەو میوانداریێتییشیان ناکەن.

٢- هەردووکیان (مووساو خدر) دیوارێکیان دیوە کـە خەریکـە دەڕووخێـت، واتـە درزی گەورەی تێبووەو لەئانو ساتی دارمان دابوو. ئەو گوزارشتە ناوازەیەش کە لە دەستەواژە قورئانیەکە دایە، ئەوەیە خواست (ئیرادە)ی داوەتەپاڵ دیوارەکە.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (ئەم مەسـەلەیە لـەڕووی مەجازیەوەیـە لـە قورئاندا، دەنا دیوارەکە (کەبێ گیانێکی بکـەرە) هـیچ خواسـتو ئیرادەیـەکی نیە، چونکە ئیرادە لە سیفەتەکانی زیندووانە..وتەی ڕاستریش ئەوەیە کە نـەك لە دەرووی مەجازە وەنیە بەڵکو لـە دەرووی حەقیقەتیـشەوەیە، چـونکە گـشت مەخلووقێك ئیرادەی هەیە تەنانەت گەر ڕووەکێك یان بێگیانێکیش بێت. بـەڵام بێگومـان ئـەم ئیرادەیـەش هـەرگیز وەك ئـیرادەی مـرۆڤ یـان وەك ئـیرادەی زیندەوەرانی تر نیە.

پاشان کێ گوتوویەتی: (ئەم دیوارە مـردووە)؟ بێگومـان ژیـانێکی شایـستە بەخۆی تێدایە کـە لـە پلـەو ئاسـتی خـۆی دایـە. بـەڵام هـەرگیز وەك ژیـانی زیندووەکان نیە.. ژیانێکی وای تێدایە کە وەك ژیـانی زینـدووان نیـە، پاشـان

ئیرادەیەکی هەیە، کە وەك ئیرادەی زیندووان نیە.. دیارە لەو دەستەواژەیەی قورئاندا ﴿جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾، واتە (دیوارێك دەیویست بڕووخێت) ئەم ویستو ئیرادەیەی دیوارەکە لە ڕووخان، کە لەم دەستەواژە قورئانیەدا وەسف کراوە وێناندنێکی جوانی هونەرییانەیەو، دەسنیشان کردنو بە شەخصانی کردن (تشخیص)ی دیوارەکەیە، کە سیفەتێك لە سیفەتەکانی زیندووان (کە ئیرادە)یە بۆی دانراوە. کاتێك ئێمەش سەرنج لەم وێنەیە دەدەین، وای دەبینین، کە خەریکە دیوارەکە دەڕووخێتو، وەختە بکەوێت، ئەگەر (خدر) چاکی نەکردبایەوە.

٣-(خدر) کاتێك بەبێ ئەوەی کەس ڕای بسپێرێت، دیوارەکەی ڕاست کردۆتەوە، یان بەبێ ئەوەی لەگەڵ کەسێکدا بەکرێ ڕێکەوتبێت، کە بۆی چاك بکاتەوە، ئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی، کە مرۆڤی موسڵمان حەزی لەکاری خێرو چاکەیەو، سوورە لەسەر چاکەکردن لەگەڵ کەسانی دیدا تەنانەت، گەر ڕاشیان سپاردبێت، بێگومان مرۆڤی موسڵمان خێرەومەندو چاکەکارو بەخشندەو چالاکێکی بواری کۆمەڵایەتییە. هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە کاری خێر ئاتاجی بەمۆڵەت وەرگرتن نیە، جا مادام لەبەردەم موسڵماندا دەرفەتێك بۆ خێرو یارمەتیدان هەبێت، با بیقۆزێتەوەو بەجێی بگەیەنێت.

هەمدیسان (ئەم کارەی خدر) بەڵگەیەکە لەسەر کاری خێری خۆبەخشانە بەبێ ڕێکەوتنێكو بەبێ کرێ یەك، یان بەبێ چاوەڕوانکردنی پاداشتێك لە خەڵکی، هەربۆیەش پێویستە مرۆڤی موسڵمان خۆی لەسەر ئەمە ڕابهێنێتو، لەگەڵ کەسانی تردا بەئەمەكو چاکەکار بێتو، بەسوودیش بێت بۆیان.

٤- (خدر) لەکاری چاك کردنەوەی دیوارەکەو بنیاتنانەوەیدا لەسەر هەق بووە، چونکە خودا ئاگاداری کردۆتەوە لەسەر بوونی گەنجینە لەژێر دیوارەکەدا، خۆ ئەگەر دیوارەکە بڕووخایەو خەڵکی گوندەکەش، کە (چاوچنۆكو پیسکە بوون) ئەو گەنجینەیەیان بدیبایە، ئەوا دەستیان بەسەردا دەگرت.

٥- گەنجینەکە مولّکی دوو مێردمندالّی هەتیوی ئەو شارۆچکەیە بووەو، ئەمانیش دوو کەسی بچووك بوون، خۆ ئەگەر گەنجینەکە پێ بزانرایە، ئەوا نەیاندەتوانی خۆیان هەلّیگرن، یاخود لە خەلّکی ئاوەدانیەکەی بسێننەوە، هەربۆیەش (خدر) دیوارەکەی بۆبنیات ناونەوە، هەتا گەورە دەبنو خۆیان ئەوکاتە بە فەرمانی خودا دەریدەهێننو لەدنیادا سوودی لێ دەبینن.

٦- فەرمایشتەکەی خودا لەسەرزاری (خدر)، کە گوتوویەتی: ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا﴾ (باوکی ئەو دوو مندالّە هەتیوەش پیاوێکی خواناسو چاك بووە) ئەم وتەیە بەلّگەیە لەسەرئەوەی: بێگومان چاکیی باوکان کاریی لەسەر پاراستنو چاکبوونی مندالّەکانیان هەیە.. بۆیە بەهۆی چاکبوونی باوکەکەوە، خوا (خدر)ی بەیدەست (تسخیر) کردووە بۆ ئەوەی دیوارەکە کە بۆ هەردوو مندالّەکە بنیات بنێتەوە.

قورئانیش سرووشی ئەم بەلّگەیەی لە سوورەتێکی تردا بەخشیوە، وەك لە ئایەتی(٩)ی سوورەتی(نساء)دا خوا فەرموویەتی: ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا﴾ واتە: (دەبا ئەو کەسانەی لەپاش خۆیان مندالانی ساواو بێدەستەلات بەجێدێلّن، با لە وەسیەت کرندنێدا، ترسی خوایان لەدلّدا بێو شتێکی وا لە پاشەخۆیان ڕاسپێرن، هیچ ناهەقی تێدا نەبێ).

٧- ئەو پیاوە خواناسەش (واتە باوکی مندالّەکان)، کە لەوەوپێش مالّو سامانەکەی لەژێر دیوارەکەدا حەشاردابوو، دەلالەتە لەسەر شیاوبوونی هەلّگرتنی مالّو سامانو پاشەکەوتکردنیو هێشتنەوەی بۆکاتی پێویستی، تەنانەت باشتروایە مرۆڤی موسلّمان هەندێك لەمالّو سامانی بۆکاتی ڕووداوێکی کتو پڕی لەناکاو هەلّگرێت، ئەمەش پێچەوانەی (پشت بە خودابەستن) نیە.

# "رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ"

دوای ئەوەی (خدر) ڕازونهێنیی هەرسێ کردارەکەی بۆ (مووسا) دەرخستووەو حەقیقەتیانیشی بۆ ڕوون کردۆتەوە، ئەوسا (مووسا) بۆی دەرکەوتووە، کە خدر لە کردارەکانیدا لەسەر هەق بووەو، هەروەها بە تەواوەتی دڵنیاش بووە لەوەی، کە (بەرژەوەندیی) لەو کارانەدا بووە، کە ئەنجامی داون.. هەمدیسان (خدر) ئەوەشی پێڕاگەیاندووە، کە بێگومان ئەم سێ کردارە لەڕاستیدا لەخۆیەوەو بەخواستی خۆی نەبووە، بەڵکو بە فەرمانی خوا بوون پاشان (خدر) ئەم کردارانەی واوەسف کردون، کە ڕەحمەتێك بوون لە خوداوە، هەر بۆیەش بە(مووسا)ی گوتووە: ﴿رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ﴾.

باسکردنی (ڕەحمەتی پەروەردگار)یش لێرەدا ئاماژەو واتای خۆی هەیە، وەك چۆن بە سەرەتای چیرۆکەکەشەوە پەیوەستە لەکاتێکدا، کە خودا خۆی باسی ڕەحمەتی لەبارەی (خدر)ەوە کردووەو فەرموویەتی: ﴿ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا﴾.. هەرسێ کردارەکەی (خدر)یش هەر بەپێشینەی ڕەحمەتێکی خوداوە پەیوەستە ﴿رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا﴾ تا لەدواییدا بەڕەحمەتە ڕەببانیەکەوە ﴿رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ﴾ەوە کۆتایی پێ هێنراوە.

ئەمەش مانای وایە، کە بێگومان ئەمە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕەحمەتی خودا. بۆ نمونە (عەیبدارکردنی کەشتیەکە) ڕەحمەتێکی خودابوو بەوهەژارانەی کەشتییەکە، تاکو (بەو کونتێکردنو خەوشبارکردنەی کەشتییەکەیان) لەدەستی

پادشا ستەمکارەکە بپارێزێتو دەستی بەسەردا نەگرێت، بۆیە گەر کون نەکرابایـە، دەستی بەسەردا دەگیرا.

- (کوشتنی منداڵەکەش) هەر ڕەحمەتێك بوو لەخوداوە بە باوكو دایك منداڵەکە کە دوایی کوڕێکی باشتر یان پێدەداتو گەر خدر ئەم منداڵەی بۆنە کوشـتنایە ئەوا لەکاتی گەورەبوونیدا بە کوفرو ستەمو زۆرداری تەنگی پێ هەڵدەچنین.

- (بنیاتنانەوەی دیوارەکەش) هەر بەڕەحمەتی خودابـووە، چـونکە بـەو ڕەحمەتـە گەنجینەی هەردوو منداڵە هەتیوەکە لەو شارۆچـکەیە داپـارێزراوە، جـا ئەگـەر دیوارەکـەی ڕاسـت نەکردبایـەوە ئـەوا گەنجینەکـەش دەردەکـەوتو مرۆڤـە چاوچنۆكو ڕەزیلەکانی ئەو گوندە دەستیان بەسەردا دەگرت.

گرنگ ئەوەیە ئەم ڕەحمەتە خودایی یە لە هەر سێ ڕەفتارەکەی (خدر)دا لـەلای کەسانی چاودێری ڕووداوەکان دیارنین، واتە ئەو چاودێرو بینەرانەی کە لە ڕووکـاری دەرەوە بۆ کردارەکان دەڕوانن.. تەنانەت ئـەو هەڵسوکەوتانـەی کـە بـە ئـەنجامی گەیاندوون لە یەکەمین ساتی سـەرنج لـێ دانانیانـەوە جـێی نـارەزایین وەك چـۆن (مووسا) نارەزایی لەسەر هەڵسوکەوتەکانی (خدر) دەربڕیبوو.

ئەمەش مانای وایە کە ئەم ڕەحمەتە لە دیمەنی بەرچـاوی خەڵکیـدا وێنەیـەکی پێچەوانەی وێنەبینراوەکەیانو پێچەوانەی پێشبینی بۆ چوونیان پیشان بدات.

هەر بەم بۆنەیەشەوە دان بەوە دانێین کـە هەرچـی خـودا بـە مرۆڤـی بـڕواداری دەکاتو بەسەریدا دێنێت هەر ڕەحمەتێکن لەخودا خۆیەوە..بێگومان خودا کاتێـك نیعمەت بە مرۆڤی ئیماندار دەدات ئەوە ڕەحمی پێکردووە، کاتێـك بـە ناخۆشـیو نارەحەتییش تاقی دەکاتەوە، ئەوە ڕەحمەتێکە لەخوداوە کەواتە مرۆڤی باوەڕدار لـە هـەر دوو کـاتی خۆشـیو ناخۆشـیدا هـەر لەبـەر ڕەحمـەتی خوادایـە.. لەهـەر کارەساتێکدا کە تووشی دەبێتو لە هەر قەدەرێکدا کە خـودا بەسـەریا دەهێنێـت

هەر لەبەر ڕەحمەتی خوادایە بەو مەرجەی ئەم ڕاستییە بزانێت‌و (ڕەحمەتی خودایی)ی نێو هەر ڕووداوێکی خۆی تێدا بەدی بکات.

لە بەسەرهاتی (خدر)یش دا- سلاوی خودای لیّ بێت - ڕەحمەتی یەکەم ئەوەبوو کە خودا فەرمووی ﴿رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾ ئەمەش لەدەرووی پێناسەکردنیەوە.. لەکاتێکدا ڕەحمەتی دووەم ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ لەدەرووی لێکدانەوەی هۆکارەکانی ئەو کردارانەی (خدر)ەوەیە یان بلێیین: (ڕەحمەتی دووەم لێکدانەوەیەکی کردەیی‌و، پەیڕەو کردنێکی واقیعیانەو، ڕووکارێکی دەرەکیی ڕەحمەتی یەکەمە).

## "وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي"

(خـدر) لای (مـووسـا) دانـی بـەو حەقیقەتـە دانـا کـە ئـەو سـێ کردەوەیـەی لەبەرچاوی (مووسا) ئەنجامی دان، لەخۆوەو بەخواستو ئیجتیهادی خـۆی نـەبووە، بەڵکو بە فەرمانی خودا بوون ﴿وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي﴾.. لەم دەستەواژەیەدا بەڵگەو دەلالەتێك لەسەر پێغەمبەرێتیی (خدر) - سڵاوی لیێ بێت - دەردێنین، چونکە ئـەو کردەوانـە بەخواسـتو هـەوڵی کۆشـشکاریی (اجتهـاد)ی خـۆی نـەبوون، بـەڵکو بەفەرمانی خوداو سرووشی خودا بۆ (خـدر) خـۆی بـوون. دەشـێت بـەراوردێکیش بکەین لەنێوان کارەکەی (خدر)و ئەو فەرمایشتەی خوادا ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ چونکە هەر سێ کردارەکە ڕواڵەتێکی دەرەکیی زانـستە خوداییەکـەنی بـوون، کـە خودا فێری (خدر)ی کردبوو، لە دیمەنـەکانی زانـستی خـوداش، کـە بـە (خـدر)ی گەیاندبوو، ئەوەیە حەقیقەتی ڕووداوە بینراوەکـانی بـەردەمی پیێناسـاندبوو، ئـەم حەقیقەتـەش پێـچەوانەی دیمەنـە بینـراوە دەرەکییەکـەی بـووە.. لەمەشـدا بەرژەوەندییەکە خۆی حەشار داوە، ئەمەش وەك ئەوە وایە، کە (خدر) داوامـان لیێ بکات ڕوانینمان بـۆ (ئـەو ڕواڵـەتو دیمەنانـەی لەبەردەمانـدا دەیـانبینین)و (ئـەو ڕووداوو هەڵسوکەوتانەی لەبەرچـاومان) ئـەنجام دەدرێـت، ڕێـكو ڕاسـتکەینەوە، چونکە هەندێك کەس لە ئێمە ڕووانینێکی کەمو کورتبینانەیان هەیەو، تـەنها ئـەو ڕووداوە دیارو دەرکەوتوانەی بەرچاویان دەبینن‌و، وای دادەنێن، کە ئیـدی هـەموو شتێك لەوانە دایە.

بەڵام ئێمە ئەوەمان لێ خوازراوە کە ڕووانینمان بۆ ئەو ڕووداوانە قوولترو ڕاستترو وردتر بێتو، تەنها وێنە ڕواڵەتییە دیارە کە فریومان نەداتو نەهێڵێتو هەوڵی گەیشتن بە کرۆکی شتەکانو حەقیقەتیان بدەین.

بەڕاستی دیاردە فریودەرەکان زۆرنو، زۆرجاریش بە ڕووپۆشی ساختەکاریو نەخشو نیگارو چەواشەکاریی داپۆشراون، زۆر کەسیش پێیان دەخەڵەتێن. بەڵام مرۆڤی ئیماندار سەرنجی قووڵی هەیەو، بەڕاستگۆیانە لێکیان دەداتەوەو بەڕاستیش هەڵیان دەسەنگێنێت.

## "لێکدانەوە لە چیرۆکەکەدا"

لێرەدا هەڵوێستەیەك لەبەردەم شێوازی لێکدانەوەی نێو چیرۆکی (مووساو خدر)دا دەکەین.. ئەوەبوو کاتێك (خدر) جیابوونەوەی خۆی بۆ (مووسا) ڕاگەیاند، پێی گوت: ﴿ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾ (من تاوێکی تر ئەو کارانەی خۆمت بۆ لێکدەدەمەوە کە نەتتوانی ئارام لەسەریان بگریتو قسەی تیانەکەیت). بەمانای (هەواڵی باری ڕاستیو حەقیقەتی ئەو هەڵسوکەوتو کردارانەمت پێدەگەیەنم کە دیوە ڕواڵەتییەکانیانت بینی).. کاتێك ئەو هەولانەشی پێ دەگەیەنێتو پەردە لەسەر حەقیقەتیان لادەبات، پێی دەڵێت: ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾.. ئەمەش هانمان دەدات بۆ زانینی مانای (تأویل/ لێکدانەوە) لە زاراوە قورئانییەکەدا.. لەم ڕووەوە ئیمام (راغبی اصفهانی) گوتوویەتی: (وشەی (تأویل) لە (أول)ەوەیە، واتە گەڕانەوە بۆ ڕەگو ڕیشەکەی.. وەك ئەوەی کە (موئل) بەمانای ئەو جێگەیە (موضع)ەی کە دەگەڕێنەوە بۆ لای.. ئەوەش

گەڕاندنەوەی شتەکەیە بۆ ئەو مەبەستە خوازراوەی کە بەزانست (علم)، یان بە کردەوە (فعل) خوازراوە)[1].

وشەی (لێکدانەوەش) لە هەموو بەکارهێنراوێکی نێودەستەواژە قورئانیەکاندا لەم مانایە تێناپەڕێت کە لە حەڤدە شوێنی قورئاندا هاتووەو هەشت جاریان لە سوورەتی (یوسف)دا هاتووە.. حیکمەت لە هاتنی نێو سوورەتی یوسفیشدا بەم هەشت جارە ئەوەیە کە بڕبڕەی سوورەتەکەو تاکە بابەتیشی دەربارەی لێکدانەوە (تأویل)ە. بۆ نموونەش هەر سەرەتای سوورەتەکە بە باسکردنی خەونەکەی (یوسف) ـ سڵاوی لێ بێت ـ لەکاتی منداڵیدا دەست پێ دەکات.. (یەعقووب)ی باوکیشی ـ سڵاوی لێ بێت ـ ئەوەی پێ ڕادەگەیەنێت کە خودا خۆی فێری لێکدانەوەی خەونەکانی دەکات: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ... ﴿٦﴾ يوسف﴾، واتە: (خودای پەروەردگارت بەم رەنگە تۆ هەڵدەبژێرێت و دەپاڵێوێت بۆ کاری (پێغەمبەریتی)و فێری لێکدانەوەی هەندێك لەخەونەکانت دەکات). جا دوایش لەکاتێکدا کە خەونەکەی (یوسف) بەڕاستی بەدیی هاتووەو بەواقیعیش لێکدراوەتەوەو باوكو دایكو براکانی چوونەتەوە بۆ لای (یوسف) بەباوکی گوتووە: ﴿...هَٰذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا ...﴿١٠٠﴾ يوسف﴾، واتە: (بابە ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەی ئەو کاتەی سەردەمی منداڵیمە کە بێگومان خودای پەروەردگارم بەڕاستیو بەهەق بەدیی هێنا).

لێکدانەوە (تأویل): ڕوونکردنەوەی سەرچاوەو حەقیقەتی شتەکانەو، بەعەمەلیکردنی هەواڵ بۆ واقیعو تیۆر (نظرية) بۆ جێبەجێکردنو، وێنە بۆ شتێکی ماددیی، بۆیە خەونەکەی (یوسف) هەرچەندە خەونێکی کاتی نووستن بوو،

---

(١) المفردات في غريب القرآن: ص(٣١).

بەڵام لە جیهانی واقیعدا بووە بە لێکدانەوەیەك، لێکدانەوەکەشی (واتە: بەدی هاتنو ڕوودانەکەی) بوو، بەهەمان شێوەش ئەوەی لە چیرۆکی (مووسا)و (خدر)دا بەدیی دەکەین، لێکدانەوەیەکە.. (خدر) بە (مووسا)ی گوت: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾.. واتە (لێکدانەوەی حەقیقەتی ئەو ڕووداوانەت دەخەمە بەرچاو، کە بینیتن.. حەقیقەتی ئەو کردارانەمت پێ دەڵێم، کە نکوولێت لەسەریان دەکرد، تاکو بزانیت کە هەقو ڕاستی لەوەدایە کردم).. کاتێك شتەکانیشی بۆ تەفسیر کردو، ئەوەی دیبووی بۆی لێکدایەوەو ئەو حەقیقەتەی لێی پەنهان بوو، بۆی ڕوون کردەوە، پێی گوت: ﴿ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ بەمانای ئا ئەوە حەقیەتی ئەو ڕووداوانەیە کە بینیتن.. کەوابوو لێکدانەوە (تأویل) ڕوون کردنەوەی حەقیقەتو چاوگو چارەنووسو کۆتاییە.. یان با بڵێین: (ڕوودانی ئەو کارو مەسەلەیەیە، کە هەواڵی لەسەر دراوەو، ڕووکارە ڕواڵەتیو دەرەکی یە کردەییەکەی دەرکەوتووەو، خەبەرو هەواڵەکە بووە بەواقیعو، بیرۆکەو تیۆرەکەش چۆتە خانەی جێبەجێکردنەوە.

# " تَسْتَطِع " و " تَسْطِع "

لە بڕگە جوانو دانسقەکانی نێو ئەم چیرۆکەدا، جێگیرکردنی پیتی (تا)یە، یەکەم جار لەوشەی (تستطع)داو، پاشان لابردنی لەهەمان وشەدا بۆ جاری دووەم (تسطع). ئەوەبوو(خدر) بە (مووسا)ی گوت: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ ئەمەش پێش ئەوەی ئەو ڕووداوانەی کە (مووسا) بینیبوونی، بۆی لێکداوەتەوە. کاتێك بۆیشی لێك دایەوەو هەواڵی باری ڕاستەقینەی ڕووداوەکانی پێدا، ئەم پیتی (تا)یەی لەوشەکەدا نەهێشت، بۆیە پێی گوت: ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾. داخۆ بۆچی ئەو (تاء)ەی لەوشەی دووەم دا لابردووە؟:

دەشێت ئەم (تاء)ە لابراوە لە عەرەبیدا بە (تاء الخُفة)- تای سووککراو-، ناوبنێینو سەرنج لە حیکمەتی لابردنیشی لەدەرووی تەفسیری سایکۆلۆژیانەی ئایەتەکانەوەیە، یاخود تەفسیرکردنیان بەگوێرەی ڕاستی یەکانی زانستی شیکاری دەروونی (علم النفس التحليلي).

جێگیرکردنی پیتی (تاء) لە یەکەم جاردا لەگەڵ ئەو حاڵەتە دەروونیەی مووسادا گونجاوە، کە تیایدا دەژیا، چونکە هەر سێ کردەوەی (خدر) لە دەروونی ئەمدا بەقورس دادەنرانو حیکمەتەکەیانی نەدەزانی.. هەر بۆیەش (تاء)ەکە لابراوە، تاکو وشەکە قورستر بێتو هاوکێشی قورساییەکەی نێودەروونی (مووسا) بێت. کاتێك حەقیقەتی ڕووداوەکانیشی زانیوە، ئەو قورساییە دەرونیەی لەسەر نەماوەو بارە دەروونیەکەشی سووك بۆتەوە، ئیدی پیتی (تاء)ش وەك سووککاری یەك لابراوەو، بۆ ئەوەی سووککردنی وشەکەش لەگەڵ ئەو سووك بوونو خامۆش بوونە دەروونیەی مووساشدا بگونجێت، کە دوای لێکدانەوەی کردەوەکان تیایدا ژیاوە.. خوداش خۆی زانایە لەم ڕووەوە.

## "اردت.. اردنا.. اراد ربّك"

لەو دەستەواژە ناسكو دانسقانەی قورئـان کـه لەسـەر ئـەم چیرۆکە هـاتووە، وتەکانی (خدر)ن لەکاتی شیکردنەوەی ئەو کردارانەیدا کە ئـەنجامی دان، ئـەوەبوو لەم ڕووەوە لە سێ حاڵەتدا گوزارشتی لە ویست (ارادە) کردووە.

١- دەربارەی ویستی خۆی لە کونکردنی کەشتییەکەدا گوتی: (ویـستم عەیبـداری بکەم/ فأردت أن أعيبها).

٢- دەربارەی کوشتنی کوڕە منداڵەکـەو حـەزکردنی لـەهاتنی کـوڕێکی چـاك لـە جێگەیدا، ویستێکی بەکۆمـەڵی دەربڕیـوەو گوتوویـەتی: ﴿فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا﴾ واتە (ئێمە بەکوشتنی ئەم منداڵە ویستمان خـودای پـەروەردگاری بـاوكو دایکـی کـوڕێکی چـاکترو دینـدارو بـەرەحمو میهرەبانیان لەجیاتی ئەم منداڵە لاسارە پێ ببەخشێت).

٣- دەربارەی بنیات نانەوەی دیوارەکەش بۆ پاراستنی گەنجینەکە تـا ئـەو کاتـەی هەردوو منداڵە هەتیوەکە پێدەگەنو گەورە دەبن، گـوتی: ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾، واتــە: (خــودای پەروەرگاریــشت ویــستی (ئیرادەی) وابوو تا ئەم دوو کوڕە پێدەگەنو گەورە دەبنو، ئەوسا گەنجینەکـەیان دەربێننو سوودی لێ ببینن).

کەواتە ویست (ارادە) لەم سێ دیمەنـەدا هـاتووە: (اردت، اردنـا، اراد ربّـك).. (ویستم.. ویستمان.. پەروەردگارت ویستی..)، لەم سێ حاڵەتەشـدا، یەکـەم جـار فەرمانی ڕابردوو (الفعل الماضي) دراوەتە پاڵ (خدر) — (اردت).. هەمان فرمان لە

جاری دووەمدا دراوەتە پاڵ خوداو پاڵ خدریش (فاردنا).. لە جاری سێیەمیشدا هەمان فرمانی ڕابردوو تەنها دراوەتە پاڵ خودا خۆی (فاراد ربك)..

**ئەگەر هەوڵیش بدەین کە حیکمەتی بەدییکراو لەمەدا دەربێنین، ئەوا دەڵێین:**

١- لە هەر سێ جارەکەدا پلەبەندیی (تدرج) هەیە، چونکە لەهەر جارێکدا دیمەنەکە بۆ یەکێکی دی باڵاتر دەبێت، بۆ نموونە لە دیمەنی یەکەمدا ویستو ئیرادەکەی خستۆتە پاڵ خۆی (فاردت).. پاشان لە دیمەنی دووەم دا داوێتییە پاڵ خۆیو پاڵ خودا (فأردنا)، لە دواییشدا تەنها داوێتییە پاڵ خودا (فاراد ربك).

٢- لێك نەچوون لە خستنە پاڵەکاندا بەپێی ئەو حاڵەتەیە کە دەربارەی دواوەو، لەگەڵ نواندنی ڕێزو ئەدەبیش بەرامبەر خوادا گونجاوەو، هەروەها لەگەڵ ئاماژەو بڕیارەکانی ئیمانداریتیشدا گونجاوە.

لە یەکەم جاردا بۆیە ئیرادەکەی داوەتە پاڵ خۆی، چونکە کونکردنی کەشتییەکە بە کارێکی ناپەسەند بینراوەو (بەپێی بۆچوونی ڕواڵەتیانە) ئەوە کارێکی تێکدەرانەیە، لەوانەیە لەبەر ئەم واتایە پێی وابووە کە کارێکی شایستە نیە گەر ئەم ئیرادەیە بخاتە پاڵ خودا. هەمدیسان سەرنج بدە لەوەی کە کارە ویستراوەکە چییە؟ (اردت ان اعیبها/ ویستم عەیبداری بکەم)، لێرەدا ویستو ئیرادەکە عەیبدارکردنی کەشتییەکەیە.. عەیبدارکردنەکەشی بەهۆی تێکدانیەتی بەوەی کونی تێ بکاتو پارچە تەختەیەکی لێ هەڵکێشێت. هەر بۆیەش شایستەی ئەوە نییە ئەم ئیرادەیە بدرێتە پاڵ خوداو، نەشیاوەکە بیگوتبایە (اراد ربك ان یعیبها/ خودای پەروەردگارت ویستی کەشتییەکە عەیبدار بکات).

هاوشێوەیەکی ئەم ڕێزو ئەدەبە بەرامبەر بە خودا لە بەسەرهاتی (ئیبراهیم)دا بەدیی دەکەین کە ئەدەبی لە باسکردنی خوادا نواندووە، کاتێك وەسفی کارەکانی خودای کردووەو کە خوداش لەسەر زاری ئەو فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِی خَلَقَنِی فَهُوَ یَهۡدِینِ

﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى
يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ الشعراء﴾، واتە: (ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنمایی کردوومو، هەر خۆیشی خۆراكو خواردنەوەم پێ دەدات، ئەگەر نەخۆشیش کەوتم هەر ئەو چارەسەرو شیفام بۆ دەرەخسێنێت، هەروەها ئەویش دەمرێنێتو پاشان لەڕۆژی قیامەتدا زیندووم دەکاتەوە).. لەم وتانەدا (ئیبراهیم) هەموو کارەکانی داوەتە پاڵ خودا، تەنها نەخۆشکەوتنەکە نەبێت کە داوێتی یە پاڵ خۆیو بۆ خۆی گەڕاندۆتەوە.

لە بەسەرهاتی (خدرو مووسا)شدا لەجاری دووەمدا ئەوەی کە گونجاوترین پێودانگ بێت ئەوەیە کە ئیرادەکە خراوەتە پاڵ خوداو پاڵ خدریش. کە دراوەتە پاڵ خدر بەو پێودانگەیە کە خدر خۆی هۆکارو ئامرازی کوشتنی کوڕە منداڵەکەیەو ئەو کەسەشە کە ئەرکی کوشتنی منداڵەکەی لەئەستۆ ناوە، ئەی بۆچی کوشتوویەتی؟ چونکە ویستوویەتی کەخودا بەکوڕێکی لەوە چاکتر قەرەبوویان بۆ بکاتەوە.. کەواتە (خدر)یش لەمەدا ئیرادەیەکی لەو قەرەبوو کردنەوەیەدا هەیە.. بەڵام ئایا (خدر) خۆی توانای بەدی هێنانی ئەم ئیرادەیەی هەیە؟

وەڵام: نەخێر، چونکە بەدی هێنانەکە بەدەستی خودای تاكو تەنهایە.

تەنانەت باوكو دایکیشی کە ئیرادەی منالبوونو خستنەوەی منداڵیان هەیە، توانای بەدی هێنانی ئەو ئیرادەیەیان لەجیهانی واقیع دا نیە.. بۆیە تەنها ئەوەیان لەسەرە کە دەست بەهۆکارەکانەوە بگرنو یەکبگرنو پێکەوە بژین، دەنا توانای بەدی هێنانی منالو ژیانی منالەکەش تەنها بەدەست خودا خۆیەتی.

بەپێی ئەم مانایەش ئیرادەکە لێرەداو لە ڕەهەندی دووەمیدا خراوەتە پاڵ خودا بەو پێودانگەی کە بێگومان خودا هەر خۆی بەتوانایە لەبەدیی هێنانی ئەوەداو لە هێنانە ئارایی منداڵی (بەوەلەد بوو) بۆ جیهانی بوونو، ژیان دا، لەهەمان کات دا

(کە جاری دووەمە)و کە ئیرادەکە دراوەتە پاڵ خدریش هەر بەو پێودانگەیە کە خراوەتە پاڵ خوداش.. بەڵام لە جاری سێهەمدا کە ئیرادەکە بەتەنها دراوەتە پاڵ خودا خۆیو، لەبۆتە (سیاق)ەکەیدا ئەوەی دیاریی کردووە کە تەنها دەدرێتە پاڵ خودا، چونکە هیچ کەسێك توانای بەدیهێنانی ئیرادەی نێو مەسەلەکەی نیە تەنها خودای تاكو تەنیا خۆی نەبێت.. ڕاستە ئەو دوو منالە دوو منداڵی بچووکی هەتیو بوون، بەڵام کێ ئەوەیان بۆ مسۆگەر دەکات کە بژین تاکو گەورە دەبنو پێدەگەن تاکو گەنجینەکەیان دەربێنن؟ بێگومان هیچ کەسێك توانای ئەوەی نیەو بۆیشی مسۆگەر ناکرێت.. چونکە داهاتوو تەنها بەدەستی خودایەو، تەمەنیش هەر بەدەستی خودایە، هەر بۆیەش (خدر) گوتوویەتی: (پەروەردگارت ویستیو ئیرادەی وابووە کە تا ئەو دوو منداڵە پێدەگەنو لەدواییدا ئەو گەنجینەیەیان دەربێنن ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾ جا مادام خودا ئەم ئیرادەیەی هەیەو دەخوازێت، ئەوا بێگومان هەر دەبێت، چونکە هەر شتێك خوا بیەوێت هەر دەبێت ببێت.. واللە أعلم.

# چیـرۆكی چـواره‌م

## چیـرۆكـی ((ذو القـــرنیـن))

ئه‌م چیرۆكه‌ له‌ ده‌قی پیشاندراوی قورئاندا له‌م ئایه‌تانه‌دا هـاتووه‌، كـه‌ خـودای په‌روه‌ردگار تیایاندا فه‌رموویه‌تی:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ
فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ
وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن
تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا
نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾
ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن
دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ
بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ
يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾
قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ
ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ

عَلَيۡهِ قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ الكهف ﴾ .

واتای ئایەتەکان بە کورتی:

(ئەی پێغەمبەر! پرسیارت دەربارەی (ذو القرنين) لێ دەکەن.. بڵێ هەندێك لە سەربوردەی ئەوتان بۆ باس دەکەم.. ئێمە دەسەڵاتمان لەسەر زەویدا بۆ ڕەخساندو هەموو هۆکارێکی پێویستی ئەو زەمانەشمان بۆ دابین کرد. ئەویش دوای هۆکارەکان کەوتو سوودی لێیان بینی.. خۆیو سوپاکەی کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشتنە شوێنی خۆر ئاوابوون لە ناوچەیەکداو، وا دەهاتە بەرچاو، کە گۆمێکی قوڕو لیتاوی بێت، لەوێدا ڕۆژ ئاوا دەبێتو ڕێیان دەکەوێتە گەلێکی بێباوەڕ.. لەو شوێنەدا ئێمەش پێمان گوت: (ئەی ذو القرنين یان بە سزا لەناویان بەرە (گەر بەدەم بانگەوازەوە نەیەن) یان چاکەیان لەگەڵدا بکە، (ئەگەر بەدەم بانگەوازی باوەڕو خواناسییەوە هاتن). (ذو القرنين)یش گوتی: (بێگومان ئەوەی ستەمکار بێت، سزای دەدەین و، دواییش کاتێك بۆ لای خودای پەروەردگاری دەگەڕێنرێتەوە، خودا سزایەکی سەختو گەورەی دەدات. هەر کەسێکیش لەوان بەدەم بانگەوازی باوەڕەوە بێتو ئیمان بهێنێتو کاری چاك بکات، ئەوا پاداشتی چاکی هەیەو ئێمەش لەمەولا بە وتەی خۆشو ئەرکی سووکی ئاڕاستە دەکەین. دوای ئەوە (ذو القرنين) گەشتی دووەمی بەرەو خۆرهەڵات دەست پێکردو بە شوێن هۆکاردا ڕۆشتەوە، هەتاکو گەیشتە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دوورو، لەوێشەوە هەر سەرقاڵی گرتنەبەری هۆکارەکان بووو بەدوایاندا دەگەڕا..

تاکو لە کاتێکدا گەیشتە نێوان هەردوو بەربەستەکە، کە دوو چیای بەرز بوونو کە لە نێوانیاندا گەلێکی ناحاڵیو دواکەوتوو دەژیان، کە هیچ تێگەیشتنو پەی بردنێکیان نەبوو (مەگەر بە کەمیو بە دەگمەن).. جا کە ئەوان توانای (ذو

القرنين) یان زانی، داواکاریه‌کیان لێی هه‌بوو، که‌ پێیان گوت: (ئه‌ی ـ ذو القرنين ـ دوو هۆزی دڕنده‌ی وه‌ك (یه‌ئجووج)و (مه‌ئجوج) به‌دکارو تێکده‌رن له‌سه‌ر زه‌وی‌و (بۆ ئێمه‌ش ترسناکن) بۆیه‌ داوات لێ ده‌که‌ین به‌ربه‌ستێکی پته‌و له‌نێوان ئێمه‌و ئه‌واندا دروستکه‌یت، که‌ ئێمه‌ش پاداشتێکی داراییت له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌و کاره‌تدا پێبده‌ین).. (ذو القرنين)یش له‌ وه‌ڵامیاندا گوتی: (ئه‌و توانای زانسته‌ی، که‌ خودای په‌روه‌ردگارم بۆی ڕه‌خساندووم زۆر له‌و (سامانه‌) چاکتره‌، که‌ به‌ پاداشت ده‌یده‌ن به‌من، به‌ڵام من داواکه‌تان بۆ به‌جێ دێنم، بۆ ئه‌م کاره‌ش ئێوه‌ به‌ هێزو بازووه‌کانی خۆتان یارمه‌تیده‌رو هاوکارم بن، تاکو به‌ربه‌ستێکی تۆکمه‌و پته‌وتان له‌ نێوان ئێوه‌و ئه‌و دوو هۆزه‌ ترسناکه‌دا بۆ دروست بکه‌م.. بۆ ئه‌م کاره‌ش پارچه‌ ئاسنی گه‌وره‌م بۆ بهێنن‌و له‌سه‌ر یه‌ك داینێن، تاکو ئه‌مسه‌رو ئه‌و سه‌ری کێوه‌که‌ دابگرێت‌و هه‌ردوو لوتکه‌که‌شیان داپۆشێت). ئینجا فه‌رمانی پێدان به‌ (موشه‌ده‌مه‌) فوو بکه‌ن له‌و ئاگره‌ی، که‌ له‌ژێر ئاسنه‌که‌دا هه‌ڵی گیرساند بوو، تا ڕاده‌یه‌کی وا، که‌ هه‌مووی کرده‌ ئاگر، پاشان (ذو القرنين) پێی گوتن: (مسی تواوه‌م بۆ بهێنن، تا بیکه‌م به‌سه‌ر پارچه‌ ئاسنه‌کان دا و(ئیدی گه‌ر مس‌و ئاسنیش تێکه‌ڵ بکرێن ئاوێته‌یه‌کی پته‌وی لێ دروست ده‌بێت).. ئینجا هه‌ردوو هۆزه‌که‌ی (یه‌ئجوج)و (مه‌ئجوج)یش، نه‌یانتوانی سه‌رکه‌ون به‌سه‌ر به‌ربه‌سته‌کانداو نه‌یانتوانی لێی ببڕن‌و که‌له‌به‌رو کونی تێبخه‌ن، دوای ئه‌مه‌ش (ذو القرنين) گوتی: (به‌ڕاستی بنیات نانی ئه‌م به‌ربه‌سته‌ ڕه‌حمه‌تێکه‌ له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارمه‌وه‌ بۆ ئێوه‌، که‌ به‌ فه‌رمانی خۆی (یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج)ی لێ شاردنه‌وه‌، خۆ هه‌ر کاتێك خواستی خودا وابێت که‌ ئه‌م به‌ربه‌سته‌ تێك بدات، ئه‌وا که‌له‌به‌ری گه‌وره‌ی تێده‌خات‌و دیڕووخێنێت‌و وردوخاشی ده‌کات‌و له‌گه‌ڵ زه‌وی ته‌ختی ده‌کاته‌وه‌.. بێگومان به‌ڵێنی په‌روه‌ردگاریشم ڕاست‌و حه‌قه‌).

## (ته‌فسیری چه‌ند وشه‌یه‌كی نێو ئایه‌ته‌كان)

﴿سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا﴾:- ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ به‌ چه‌ند ئایه‌تێكی قورئان هه‌واڵتان پێده‌ده‌م.

﴿مَكَّنَّا لَهُۥ﴾:- ده‌سه‌ڵاتێكی گه‌وره‌مان پێدابوو.

﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا﴾:- چه‌ند هۆكارو ئامرازێكی حوكمرانیو فه‌تحكردنمان بۆ ساناو به‌یده‌ست كردبوو.

﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾:- سوودی له‌و هۆكارانه‌ وه‌رگرتو ڕێگه‌یه‌كی وای گرته‌به‌ر، كه‌ به‌ره‌و خۆرئاوای ده‌برد.

﴿تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾:- وه‌ك چۆن بینه‌رێك له‌ دووره‌وه‌ بۆ ناوچه‌كه‌ بڕوانێت به‌ (عَيْنٍ حَمِئَةٍ / واته‌ به‌ كانیه‌كی لیلی تێكه‌ڵ به‌ قوڕی ڕه‌شی) ده‌هاته‌ به‌رچاو..

﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾:- گوتمان (ئه‌ی ذو القرنین) ئه‌مه‌یان به‌ سرووشو ئیلهامێك له‌ خوداوه‌ بووه‌، یان له‌ ڕێی پێغه‌مبه‌رێكه‌وه‌ بووه‌، كه‌ له‌ سوپاكه‌شیدا له‌گه‌ڵیا بووه‌.. ڕای یه‌كه‌م (كه‌ به‌ سرووشێك خودا پێی فه‌رمووه‌) ڕاستره‌..

﴿مَن ظَلَمَ﴾:- كه‌ (مانای هه‌ر كه‌س سته‌م بكات).. سته‌م (ظلم) لێره‌دا واتای كوفرو بێباوه‌ڕی ده‌گه‌یه‌نێت.

﴿عَذَابًا نُّكْرًا﴾:- سزایه‌كی سه‌ختو دژواری وا كه‌ له‌به‌رچاوی خه‌ڵكی دیاره‌.

﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾:- گه‌شتی دووه‌می به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات ده‌ست پێكرد.

﴿لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرًا ﴾:- هیچ بەربەستێکی وەك گردێـك، یـان چـیایەك، یان شتێکی ترمان بۆ دانەنابون کە بیانپارێزێت.

﴿أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرًا ﴾:-لە زانستو زانیاریەکمان ئاگادار کردبوو.

﴿ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴾:- پاشان گەشتی سێیەمی بەرەو لای باکوور ئەنجام دا.

﴿بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ ﴾:- لە نێوان هەردوو چیا بەرزەکەدا.

﴿لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلًا ﴾:- لەبەر دواکەوتوویيان تێگەیشتنو تێگەیاندنیان کارێکی قورس بوو.

﴿يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ ﴾:- دوو ناوی - دوو هۆزن، کە لە ناوچەکانی ناوەڕاستی ئاسـیادا نیشتەجێ بوون.

﴿نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا ﴾:- پارەو ماڵێکی دیاریکراوت پێ بدەین.

﴿بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدًّا ﴾:- بەربەستێکی پتەو لەنێوان ئێمەو ئەوان تاکو نەگەنە سەرمان.

﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ ﴾:- بە دەستەکانی خۆتانو بەهێزی بازووەکانتان یارمەتیم بدەن.

﴿بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴾:- بەربەستێکی، یان دیوارێکی تۆکمەو دارێژراوی پتەو.

﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ ﴾:- پارچە ئاسنی گەورەم بۆ بێنن.

﴿سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ ﴾:- بە ئاسـن هـەتا لووتکـەی هـەردوو چـیاکەی پڕکـردەوەو تەختی کرد.

﴿قَالَ ٱنفُخُواْۖ ﴾:- ئاگر لەژێر ئاسنەکەدا بکەنەوەو فووی پێداکەن.

﴿أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾:- مسی تواوه‌ به‌سه‌ر ئاسنه‌ سووركراوه‌كه‌دا ده‌كه‌م تاكو تێكه‌ڵی بێت‌و هه‌ردوو كانزاكه‌ یه‌كگرن.

﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ﴾:- نه‌یانتوانی به‌سه‌ر ڕووی به‌ربه‌سته‌كه‌دا سه‌ركه‌ون.

﴿وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾:- ده‌سته‌وسان بوون له‌ بڕین‌و كون‌و كه‌له‌به‌ر تێكردنی.

﴿هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ﴾:- خودا به‌ڕه‌حمه‌تی خۆی‌و به‌فه‌رمانی خۆی ئه‌م دوو هۆزه‌تان لێی به‌ند ده‌كات.

﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي﴾:- هه‌ر كاتێك خواستی خودا هاته‌ سه‌ر وێرانكردنی به‌ربه‌سته‌كه‌، ئه‌وا:

﴿جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ﴾:- تێكی ده‌دات‌و وردو خاشی ده‌كات‌و له‌گه‌ڵ زه‌ویدا ته‌ختی ده‌كات.

## چه‌نـد ته‌گـه‌ره‌یه‌ك له‌ چیـرۆكی (ذو القرنین) دا

چه‌ند ته‌گه‌ره‌و ئاسته‌نگێك له‌سه‌ر به‌سه‌رهاته‌كه‌ی (ذو القرنین)و سه‌فه‌ره‌كانی و، ئـه‌و به‌ربه‌سـتـه‌ی بنیـاتی نـاوه‌، ((یـه‌ئجووج‌و مـه‌ئجووج)) لـه‌ ئـارادان‌و ده‌وروورژێنرێن..

ئه‌م ته‌گه‌رانه‌ش له‌ بۆته‌ی شیكارو لێكدانه‌وه‌ی ڕووداوه‌كانی چیرۆكه‌كه‌ دایـه‌و، له‌ لایه‌نه‌ نادیارو شاراوه‌كانیشی ده‌كۆڵێته‌وه‌، وه‌ك:-

١- ((ذو القرنین)) كێیه‌و، كه‌سێتییه‌كی چۆنی هـه‌بووه‌و، ماهییـه‌تی ژیـانی چـی بووه‌؟

٢- ئه‌و زه‌مه‌نه‌ی تێیدا ژیاوه‌، ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ی حوكمرانی كردوه‌و، ئـه‌و جه‌نگانـه‌ی به‌ڕێوه‌ی بردون‌و، ئه‌و وڵاتانه‌ی فه‌تحی كردوون..

٣- گه‌شـتی یه‌كـه‌می بـه‌ره‌و خۆرئـاوا و ده‌ستنیـشانكردنی ئـه‌و ناوچـه‌یه‌ی پێـی گه‌یشتووه‌و، دیاریكردنی جێگه‌ی ئه‌و كانیه‌ی كه‌ به‌ (عین حمئه‌/ كانیه‌كی لیڵی تێكه‌ڵ به‌ قوڕی ڕه‌ش) هاتۆته‌ به‌رچاوو چۆن خۆریشی دیوه‌ تیایدا ئاوا ده‌بێت..

٤- سه‌فه‌ری دووه‌می به‌ره‌و خۆرهه‌ڵات‌و ئه‌و وڵاتانه‌ی پیایاندا گـوزه‌ری كـردووه‌و، ئه‌و شوێنه‌ی كه‌ پێی گه‌یـشتووه‌، چـۆن دیـوێتی ڕۆژ لێیـان هه‌ڵـدێت‌و هـیچ به‌ربه‌ستێكی پارێزگاری وه‌ك گردێك یان قه‌ڵایه‌كیشیان بۆ دانه‌نرابوو.

٥- ئه‌و ناوچه‌یه‌ی كه‌ لـه‌ گه‌شـتی سـێیه‌میدا بـه‌ره‌و بـاكوور پێـی گه‌یـشتووه‌و، ده‌ستنیشانكردنی (ناوچه‌ی نێوان دوو به‌ربه‌سـته‌كه‌) بـه‌ وردی‌و، دیـاریكردنی ڕه‌گه‌زی خه‌ڵكه‌ دواكه‌وتووه‌كه‌ی.

٦- ڕه‌چه‌ڵه‌كی ((یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج))و مێژوویان‌و ناوچه‌كانی دانیـشتن‌و ژیـان‌و نیشته‌جێ بوونیان به‌ ووردی‌و به‌ ته‌واوه‌تی.

٧- شیکارو وردەکاریی چۆنیەتی بنیاتنانی بەربەستەکەو، پاشان درێژیو پانیو بەرزییەکەی چەند بوو!!

٨- ئایا بەربەستەکە وێران کراوەو، یەئجووجو مەئجووج لێی دەرچوون، یان هێشتا ماوەو، هەرگیز درزو کەلەبەری تێناکرێتو، هەتا ماوەیەکی کەمی پێش هاتنی قیامەت لێیەوە دەرناچن..؟!

٩- مانای وتەکەی ذو القرنین ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ﴾ هەرکاتێك خواستی خودا هاتەسەر ئەوەی کە بەربەستەکە وێران بکات ئەوا تێکی دەداتو وردوخاشی دەکاتو لەگەڵ زەویدا تەختی دەکات) ئاخۆ واتای واقیعی ئەم وتەیە چۆن بێت؟!

١٠- ئایا پەیدابوونی ((جەنگیزخان))و ((هۆلاکۆ)) ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی دەرچوونی ((یەئجووجو مەئجووج))؟

جگە لە چەندین پرسیارو لایەنی تری شاراوەی نێو چیرۆکەکە، کە ئەم تەگەرەو ئاستەنگانە دەیانورووژێنێت.

## شیکارو وردەکاری یەکانی چیرۆکی ((ذو القرنین)) مەتەڵێکی ئاڵۆزە

مێژوونووسانو ڕاڤەکاران هەموویان هەڵوێستیان لەبەردەم چیرۆکی (ذو القرنین)دا کردووەو زۆر کەسیشیان هەوڵی ڕوونکردنەوەی ڕووە نادیارەکانیان داوەو ویستوویانە چەند ووردەکاری یەکی مێژوویيو واقیعی لێ دەربێنن.. لەم بارەیەوە گەلێك ووتەو بیروڕایان هێناوە کە زۆربەشیان لە دەقە ئیسرائیلییەکانو بەسەرهاتەکانی (ئەهلی کیتاب/ واتە لە شوێنکەوتوانی کتێبەکانی وەك تەوراتو ئینجیلەوە) وەرگیراونو چەندین شتی ناهەموارو پووچەڵو ئەفسانەو قسەو قسەلۆکی بێنیوەڕۆکیان لەخۆ گرتووە.

لە ئاسەوارو دەرەنجامی ئەمەش لق‌و پۆ هاویشتنی لێکۆڵینەوەکان بۆ درێژەو شیکاری چیرۆکەکەو، جیاوازی‌و ناتەبایی توند لە نێوان مێژوونووسان‌و ڕاڤەکاران (مفسرین) لەسەر ئەم مەسەلەیەو، دەمە تەقێ‌و مشت‌ومڕی زۆریان لەبارەیەوە.

هەندێك لە نووسەرانیش چەند کتێبکی سەربەخۆیان داناوە، بەتایبەتیش بۆ لێکدانەوەی شیکاری چیرۆکەکەو، دەسنیشانکردنی شوێن‌و کات‌و ڕووداوو پاڵەوانەکان‌و داستانەکانیان. هەندێك لە کتێبەکانیان ئەمانەن:-

١- (ذو القرنين و سد الصين) -ذو القرنين- و بەربەستی چین-ی ((محمد راغب الطباغ)) مامۆستای (مێژوو)و (فەرموودە) لە کۆلێژی شەرعی (حەلەب) کە ساڵی (١٩٤٩. ز) چاپ کراوە.

٢- کتێبی (يسألونك عن ذي القرنين)ی (ابو الكلام ازاد. کە یەکەم وەزیری (مەعاریف)ی هیندستان بووە دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی. (شێخ احمد حسن الباقوری) پێشەکیەکی دوورو درێژی وشك‌و وەڕسکەری بۆ ئەم کتێبە نووسیوە، کتێبەکەش لە دەزگای (دارالشعب) لە —قاهیرە-ساڵی (١٩٧٢. ز) دەرچووە.

٣- کتێبی (مفاهيم جغرافية في القصص القرآني: قصة ذى القرنين)- (چەند چەمکێکی جوگرافیایی لە چیرۆکە قورئانیەکاندا: چیرۆکی (ذو القرنين)- نووسینی دکتۆر (عبدالعليم عبدالرحمن خضر) چاپی دەزگای (دار الشروق) ساڵی (١٩٨١. ز).

٤- (ذو القرنين: القائد الفاتح والحاكم الصالح)/ (ذو القرنين) سەرکردەی فەتحکردنی وڵاتان‌و، فەرمانڕەوای چاك) نووسینی (محمد خير رمضان) چاپی دەزگای (دار القلم) ساڵی (١٤٠٦ك /١٩٨٦. ز) ئەم کتێبەش تازەترینی ئەو کتێبانەیەو لە هەموویان زیاتر سەرچاوەو زانیاری تیادا کۆکراوەتەوەو لە هەمووشیان زیاتر ساغ کراوەتەوە. لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەی (محمد خير يوسف)دا زیاتر دڵنیا دەبین لەوەی کە بەڕاستی چیرۆکی (ذو القرنين) مەتەڵێکی ئاڵۆزە.

لە پێشەکی ئەم کتێبەدا نووسەر باسی ئەوەی کردووە، کەوا کاتێك بیری لە لێکدانەوەی چیرۆکی (ذو القرنین) کردۆتەوە، پرس و ڕای بەزانایەکی زیرەك و جێی بڕواو متمانە کردووەو لێی پرسیوە:- ((مامۆستا ڕات چییە لەوەی کە من لێکۆڵینەوەیەك لەسەر (ذو القرنین) بنووسم؟ ئەویش پێی گوتووە (کاری وا مەکە)، نووسەریش سەری سووڕماوەو لێی پرسیوە: (بۆچی)؟ زاناکەش وەڵامی داوەتەوەو پێی گوتووە:- (چونکە تۆ بە ئەنجامێك ناگەیت)[1].

بەڵام نووسەر لەسەر لێکۆڵینەوەکەی بەردەوام بووەو، سەرچاوەو زانیاریی بۆ کۆکردۆتەوەو شیکارو موناقەشاتی خۆی تێدا نووسیوەو، کتێبێکی گەورەی لێ پێکهێناوە.. بەڵام نەیتوانیوە کەسێتی (شخصیة)ی (ذو القرنین) دەستنیشان کات کە ئەمە ناواخن و کرۆکی لێکۆڵینەوەکەیە، ئیدی پێ دەچێت، کە بە ئەنجامێکی پەسندی وەها نەگەیشتبێت کە بتوانێت وەك لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و مەنهەجی و بابەتیانە بیگونجێنێت..

بەڕاستی و بێگومان چیرۆکی (ذو القرنین) مەتەڵە.

## (ذو القرنین) لە فەرمووودە ڕاستەکاندا..)

جا لەبەرئەوەی چیرۆکەکەی -ذو القرنین- وەك مەتەڵێکی ئاڵۆزو سەرسامکەر وایە، بۆیە پێویستە لەسەرمان لە سەرچاوە ڕاست و متمانە پێکراوەکانەوە لێی بکۆڵینەوە، کە هیچ گومان و دەسکارییەکیان تێدا بەدی ناکرێت، ئەوەی جێی بڕواو متمانە پێکردن بێت، تەنها هەردوو سەرچاوە بنچینەییەکەی ئیسلامن، کە قورئان و سوننەتن.. سەبارەت بە قورئانی پیرۆزیش، تەنها سوورەتی (کهف)و لەم چەند ئایەتەی سوورەتەکەدا باسێکی لێکراوە، کە ئێمەش دەربارەیان دەدوێین، کە

---

١) کتێبی -ذو القرنین-ی ((محمد خیر یوسف))، لاپەرە (٩).

شیکارو وردەکارییەکیان لەسەر نیەو، وەلامەکانی ئەم پرسیارانەشی تێدا نیە، کە دەربارەی چەند لایەنێکی تری چیرۆکەکەن.. لە سەرچاوەی دووەمیش (واتە لە سوننەت)دا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ نەگێڕراونەتەوە، کە دەربارەی چیرۆکی (ذو القرنین) بن، یان دەربارەی هەرسێ سەفەرەکەی، یان دەربارەی دیاریکردنی ناوەکەی، یاخود دیاریکردنی سەردەمەکەی..

جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو سەرچاوە بنەڕەتییە بەدرێژی دەربارەی چیرۆکەکە نەدواون، ئیدی چۆن ئێمە شیکارو درێژەی ژیانەکەی دەزانین.. داخۆ کێ بێت ئەو کەسەی لە خۆیەوە بتوانێت شتێك لەسەر ڕووداوەکانی ڕابردووو لەسەر کەسانی پێشین بلێت کە بوونەتە بەشێك لە غەیبو نادیاری ڕابردوو و، کە قسەکردنیش لە بارەیانەوە لە دەرووی قسەکردن لەسەر غەیبدا دادەنرێت؟ کێ هەیە بتوانێت دەربارەی ئەو نادیارانە بدوێت کە قورئانی پیرۆزو فەرموودە ڕاستەکان و، هاوەڵە بەڕێزەکانیش لێی بێدەنگ بوون؟! لەبەر ئەوە ئێمە لەڕوانگەی خۆمانەوە ئەوەمان لێ خوازراوە، کە تەنها لەگەڵ سرووشو ئاماژەکانی ئەو ئایەتانەی قورئاندا بمێنینەوەو، لە ئاست دەلالەتو واتای فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەردا ﷺ بووەستینو بێدەنگ بین لەو مەسەلانەی، کە لێیان بێدەنگ بوون.. هەرچەندە دەڵێین، فەرموودە ڕاستەکان هیچیان دەربارەی ئەم چیرۆکە تێدانیە، بەلام (ئیمامی بوخاری) ئاماژەی بۆ ئەو ئایەتانە کردووە، کە لە بەندی (کتاب الانبیاء)داو پێش لێدوانی لە چیرۆکی (ئیبراهیم)دا ـ سلاوی خوای لێ بێت ـ باسی لێوە کردوون. بەندە (صحیح)ەکەشی، واتە بەندی (احادیث الانبیاء)ی لە (جامع الصحیح)ەکەیدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە ڕێك خستووەو، ڕیزکردووە:-

١- بەندی (وەدیهێنانی –ئادەم–و کوڕو نەوەکانی) (باب خلق آدم و ذریته).

٢- بەندی (گیانەکان چەند سەربازێکی تەرخان کراون) (باب الأرواح جنود مجنده).

٣- بەندی فەرمایشتەکەی خودا ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾.

٤- بەندی ﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾.

٥- بەندی باسی (ئیدریس) سلاّوی لیٚ بیٚت.

٦- بەندی فەرمایشتەکەی خودا ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾.

٧- بەندی چیرۆکی (یەئجووجو مەئجووج).

٨- بەندی فەرمایشتەکەی خودا ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴾[1].

هەتا کۆتایی دوایین بەنـــدی کتیٚبەکە.

## (ابن حجر) و لیٚکدانەوەی شیٚوە ڕیزکردنەکەی ((بخاري))

ئیمام (ئیبنو حەجەر) لەو شیٚوە ڕیزکردنـەی (بوخـاری)دا وا تیٚگەیشتووە کـە (بخاري) ڕای وایە (ذو القرنین) لە پیٚش (ئیبراهیم)دا بووە یاخود هاوزەمانی بـووە.. لـەم ڕووەوە (ابـن حجـر) لـە کتیٚبـی (فـتح البـاري)دا گوتوویـەتی:- (پۆلیٚنکـار (مصنف) واتە (بخاري) کە چیرۆكو کەسـەکانی ڕیزکـردووەو باسـی (ذو القـرنين)ی خستۆتە پیٚش (ئیبراهیم)ەوە، بەمە وتەی ئەو کەسانەی بە کەمو بیٚبایـەخ دانـاوە، کـە گوتوویانـە گوایـە ئەمـە (ئەسـکەندەری یۆنانیـە)، چـونکە ئەسـکەندەر لـە سەردەمیٚکی نزیك سەردەمی (عیسا) داـ سلاّوی لیٚ بیٚت ـ ژیاوە.. دیارە مـاوەی نیٚوان سەردەمەکانی (ئیبراهیم)و (عیسا)ش پتر لە دوو هەزار ساڵە)[2].

---

١) بڕوانە کتیٚبی (صحیح البخاري) طبعة محمد علي صبيح، بەرگی (٢) لاپەرە (١٥٩-١٦٩).
٢) فتح الباري/٦: ص٨٢

ڕاستەکە (ئەسکەندەر) ئەم پیاوە (ذو القرنين) نییە، بەڵام بەڵگەیەکی ڕاستیش لە ئارادانیە لەسەرئەوەی کە (ذو القرنين) لە پێش (ئیبراهیم)دا بووە، یان هاوچەرخی بووە.

شێوە ڕیزکردنەکەی (بخاري)یش‌و دانانی (ذو القرنين) لە لیستی پێش ئیبراهیمدا ڕێکخستنێکی براوەو هەرە ڕاست نیە، بەڵکو کارێکی کۆششکاری (اجتهادی)ی خۆیەتی‌و، بەپێی بیروڕای تەقەللا بۆ دراوی خۆیەتی، نەك بەو ڕەنگە بێت، کە فەرموودەیەکی ڕاست (صحيح)ی لەسەر هاتبێت.. هەر بۆیەش ئێمە ناچارین، کە پشتی پێ نەبەستین‌و نەیلێینەوە، چونکە لەدەرەوەی وتنەوەی مەسەلە نادیارو غەیبەکانی ڕابردووە، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، لەبەرئەوە ئیجتهادەکەی (بوخاری) لەو شێوە ڕیزکردنەیدا ڕەت دەکەینەوە، لەگەڵ ئەوەدا کە ڕێزو حورمەتێکی زۆرمان بۆی هەیەو، دان بە فەزڵ‌و چاکەو زانستە نایابەکەشیدا دەنێین ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ.

(ئیمام ئیبنو حەجەر)یش دوای ئەم ئیجتهادەی (بخاري) کەوتووەو بیروڕای وایە، گوایە (ذو القرنين) لەگەڵ (ئیبراهیم)دا بووە، وەك دەڵێت: (لە ڕاستیدا ئەو کەسەی، کە خودا لە قورئاندا بەسەر هاتەکەی گێڕاوەتەوە، ئەو لەپێش ئەو سەردەمەدا ژیاوە).. پاشان بۆ بەڕاستتر دانان‌و یەکلاکردنەوەی ئەم بیروڕایەش وتەی چەند کەسێکی کردۆتە بەڵگە، وەك ئەم وتانە:-

- وتەی (عبیدی کوڕی عمیری تابعی) کە گوتوویەتی: ((ذو القرنين)بە پیادە حەجی کردووەو، ئیبراهیمیش هەواڵی بیستووەو پێی گەیشتووە).
- وتەی (ابن عباس) کە گوتوویەتی ((ذو القرنين) چووەتە (مسجد الحرام)ەوە ئیبراهیمیش سڵاوی لێ‌کردووەو تەوقەشی لەگەڵدا کردووە).
- وتەی (عثمانی کوڕی ساج) کە گوتوویەتی: ((ذو القرنين) داوای لە (ئیبراهیم) کردووە کە نزای بۆ بکات، (ئیبراهیم)یش پێی گوتووە:- (چۆن نزات بۆ بکەم

لە کاتێکدا ئێوە بیرەکەمتان تێك داوە؟) (ذو القرنین)یش لە وەڵامدا پێی گوتووە: (ئەوە بە فەرمانی خۆم نەبووە).

- وتەی (ابن هشام) کە گوتوویەتی:- ((ئیبراهیم) لە مەسەلەیەکدا(ذو القرنین)ی کردووە بە دادوەر، ئەویش حوکمی دادوەرانەی خۆی بۆ داوە)[1].

جا کاتێك سەرنج لە بەڵگەکانی ئیمام (ابن حجر) دەدەین وا نایەنە بەرچاومان کە یەکێکیان پابەندی سوود لێ وەرگرتنیمان بکات، بەڵکو ئێمە ناچارین کە هەموویان ڕەتکەینەوەو دانیان پێدا نەنێین، چونکە هیچ یەکێکیان نەبراوەتەوە بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئێمەش لە چیرۆکی پێشینەکاندا تەنها پشت بە فەرموودەی ڕاستو (صحیح) کە براوەتەوە پاڵ خودی پێغەمبەر ﷺ دەبەستین.

## ((بەربەستەکەی (ذو القرنین) لە فەرموودە ڕاستەکان دا ))

(ذو القرنین) لە کاتی فەتحی وڵاتانیدا بەربەستێکی لە ناوچەی باکوور بنیات ناوە، وەك ئایەتەکانیش بەڕوونی ئاماژەیان بۆ کردووە، بەربەستەکەش بە ناوی (بەربەستی (ذو القرنین))ەوە ناسێنراوە، چونکە ئەو خۆی بنیاتی ناوە، هەروەها بە بەربەستی (یەئجووجو مەئجووج)یش ناو براوە، چونکە ڕێگری شاڵاوەکانیان بووە بۆ سەر دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، هەروەها بە دیوارە پتەوەکەی (یەئجووجو مەئجووج)یش ناو براوە.

هەر سەبارەت بە بەربەستەکەی (ذو القرنین) چەندین بەسەرهاتی لەسەر هاتووە کە زۆربەیان لە دەقە ئیسرائیلییەکانو ئەفسانەکانەوە وەرگیراون.

---

١) (فتح الباري/٦: ٣٨٢).

**لێرەشدا چەند فەرموودەیەکی ڕاست دەربارەی ئەو بەربەستە دێنینەوە..**

١- لە گرنگترینی ئەو فەرموودانەو بەناوبانگترینیشیان ئەوەیە کە لە پلەی (متفق علیه) دایە (واتە: بخاری‌و مسلم) لە (زهری)یەوەو ئەویش لە (عروەی کوڕی زبیر)و ئەویش (لە زەینەبی کچی جحش)ەوە (خودا لێی ڕازی بێت) گێراویانەتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ بە ڕوخسارێکی ترساوەوە چۆتە لای (زەینەب)ی هاوسەری‌و، فەرموویەتی:- ((**لا اله الا الله ویل للعرب من شرّ قد اقترب، فتح الیوم من ردم یأجوج و مأجوج مثل هذه، و حلق بأصبعه الابهام و التي تلیها، فقالت زینب بنت جحش: یارسول الله انهلك و فینا الصالحون؟ قال: نعم، إذا كثر الخبث**))[1]...واتە:- (پێغەمبەر) ڕۆژێکیان لە خەمبارییەکی زۆردا فەرمووی(لا اله الا الله) وەیل‌و تیاچوون بۆ عەرەب لە دەست شەڕو خراپەیەك کە نزیك بۆتەوە.. ئەمڕۆ بەقەد ئەمەندە (لەو کاتەدا ئاماژەی بۆ پەنجە گەورەو پەنجەی تەنیشتی (دۆشاومژە) کرد کە (پێکەوە وەك کەوانەیەك پیشانی دان‌و) فەرمووی هێندەی ئەمە لە دیوارە پتەوەکەی (یەئجووج‌و مەئجووج) کراوەتەوە) (زەینەبی کچی جەحش)یش لێی پرسی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئێمەی موسڵمانان لەو ڕۆژەدا هەموومان تێکڕا لەنێودەچین هەر چەندە پیاوچاکانیشمان تێدا بێت؟) فەرمووی: (بەڵێ هەموان تیادەچن کاتێك خراپەو پیسی‌و چەپەڵی لە کردارەکاندا زۆر بوو بێت).

٢- هەر لەمبارەیەوە (بخاري‌و مسلم) لە (ابو هریرة)وە ـ خودای لێی ڕازی بێت ـو ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوێتیەوە کە فەرموویەتی:-

---

١) (بخاري –٦٠- كتاب الانبياء (٧) باب یأجوج و مأجوج –حدیث رقم (٣٣٤٦)، هەروەها بڕوانە (مسلم (٥٢) كتاب الفتن وأشراط الساعة ﴿١٩ باب الفتن وفتح ردم یأجوج ومأجوج –حدیث رقم (٢٨٨٠)﴾.

**((فتح اليوم من ردم يـأجوج ومـأجوج مثـل هـذه، وعقـد بيـده تـسعين))**[1]، واتە:- (ئەمڕۆ هێندەی ئەمە لـە دیـواری (یـەئجووج و مـەئجووج) کراوەتـەوە ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا ژمارە (٩٠) یان (نـۆ)ی بەدەسـتی گرێـدا کـە بەهێندەی ئەو هێمایە لە دیوارەکە کون بووە.

٣- هەروەها (بخاري) لە پێشەکی بەندی (چیرۆکی یەئجووج و مەئجووج) لە بەشـی (كتاب الانبياء)دا بە پلـەی ڕاگـیراو (تعليـق) فەرموودەیـەکی هێنـاوە کـەوا پیاوێـك بـە پێغەمبـەری ﷺ گوتـووە (رأيـت الـسد مثـل الـبرد المحـبر/مـن بەربەستەکەم لە خەونـدا وەك کەوایـەکی خـەت خـەت بینیـوە (واتـە بـەدرزو کەلەبەرەوە بینیومە) پێغەمبەریش ﷺ پێـی فـەرمووە ((**قـد رأيتـه**[2]، واتـە هەروایەو بەڕاست بینیوتە)..

## (( لە واتـا و ئامـاژەکانی ئەم فەرمـوودانە ))

١- لە فەرموودەی یەکەمدا کە (زەینەبی کچی جەحش) گێڕاوێتیەوە دەلالـەتێکی جوانو نایابی لە دەلالەتو واتاو بەڵگەکانی پشت پێبەسـتن (إسـناد) تێدایـە، وەك زانا (نووی) لە لێکدانەوە (شرح)یدا لەسەر فـەرموودەکانی لای (مـسلم)دا گوتوویەتی:- (لەم پلەی (اسناد)ەی فەرموودەکەدا چوار ئافرەتی هـاوەڵ (اربـع صحابيات) بەشدارن، دوانیان لە هاوسەرانی پێغەمبـەرنو دوانیـشیان لـە دوو هاوسەری (واتە زڕکچی بـوونو هەنـدێکی لـە نـەوەی یـەکتریش بـوون، هـیچ فەرموودەیەکی تریش ئاوا نەزانراوە کە چوار ئافرەتی هاوەڵو لە نـەوەی یـەکتر بنو پێکەوە لە گێڕانەوەیدا کۆببنەوەو بەشدار بن[3]..

---

١) البخاري، حديث (٣٣٤٧) ومسلم حديث (٢٨٨١).
٢) البخاري، مقدمة باب (٧) قصة يأجوج ومأجوج.
٣) مسلم بشرح النووي (١٧:٢).

هەردوو هاوسەرەکەی پێغەمبەری خوداش ﷺ:- (زینبی کچی جحش)و (أم حبیبەی کچی ابوسفیان) بوون، هەردوو زڕ کچەکەشی (واتە کچانی هەردوو هاوسەرەکەش) (حبیبەی کچی أم حبیبة)و (زینبی کچی أم سلمة) بوون.. دوو کەسیش لە شوێنکەوتوان (تابعین) گێراویانەتەوە کە (عروەی کوڕی زبیر)و (محمدی کوڕی شهاب الزهري) بوون.

٢- ترسی پێغەمبەری خودا ﷺ لە (شەڕو خراپە هاتووەکە)، کە بە ڕوخسارێکی ترساوەوە چۆتە لای (زەینەب)، لە ڕیوایەتەکەی (بخاري)و (مسلم)دا واهاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی لەخەو هەستاندا بەترسەوە بێدار بۆتەوە.. لە ڕیوایەتێکی سێهەمیشدا کە هەر (بخاريو مسلم) گێراویانەتەوە واهاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان بەترسەوە لە ماڵی دەرچووەو ڕوخساریشی سوور هەڵگەڕاوە.

**دەشێت لە کۆی هەر سێ گێڕانەوە (ڕیوایەتەکان) بگەینە ئەو دەرەنجامەی کەوا:-**

١- بێگومان پێغەمبەری خودا ﷺ لەلای هاوسەرەکەی خۆی (زەینەبی کچی جەحش) ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ نووستووەو لەکاتی نووستنەکەدا خەونێکی بینیوە کە ترساندوویەتی (دیارە خەونی پێغەمبەرانیش ڕاستو واقیعییە) بۆیە بەترسەوە لە خەونەکەی بێدار بۆتەوەو لەو ژوورەی تێیدا نووستووە، چۆتە دەرەوەو دەموچاویشی سوور هەڵگەڕاوەو چۆتە لای (زەینەبی) خێزانیو ئاسەواری ترسو بیم بە ڕوخساریەوە دیاربووەو، ئەو قسەو باسەی پێگەیاندووە کە لە فەرموودەکەدا هاتبوو.

٢- هۆکاری ترسانەکەشی ئەوەیە کە لە خەونەکەیدا دیویەتی (یان خودا لە خەونەکەدا پیشانی داوە) کە بەربەستەکەی بەردەم (یەئجووجو مەئجووج) کەلەبەرێکی تێکەوتووە، دیتنی ئەم بەربەستەش لە خەونی نووستندا بووە نەك لە دیتنی کاتی بێداریدا.

٣- خەونەکەی پێغەمبەر ﷺ کە دیویەتی کەلەبەر کراوەتە بەربەستەکە، بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە (یەئجووج‌و مەئجووج) دەستیان بە ڕووخاندنی بەربەستەکە کردووەو لە سەرەتاوەش کارەکەیان سەری گرتووە، ئەمەش سرووشی ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ڕووخاندن‌و کردنەوەی بەربەستەکەو پیایدا تێپەڕبوونی، لە پێش هاتنی قیامەتدا دەبێت، ئیدی مەرج نییە بەربەستەکە بەرێکی وەك خۆی تا کاتی دەرچوونی (یەئجووج‌و مەئجووج) لە پێش هاتنی قیامەتدا، بمێنێت.

٤- لە فەرموودەکاندا مانای دیارو دەرکەوتوو لە (کرانەوەی دیوارە پتەوەکەی (یەئجووج‌و مەئجووج) کرانەوەی ئەو بەربەستەیە کە لەوێدا دروست کراوە، مەبەست لەو شەڕو خراپەیەی کە نزیکیش بۆتەوە، دەرچوونی هۆزی (یەئجووج‌و مەئجووج)ە کە لەوێوە دەردەچن‌و شاڵاو دێننە سەر وڵاتانی موسڵمانان.

هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن گوایە مەبەست لەم فەرموودەیە ڕوودانی فیتنەو ئاژاوەیەو، کرانەوەی بەربەستەکەش لەم فەرموودەیەدا گوزارشتێکە لە کرانەوەی دەرگای فیتنەو پشێوی لەسەر موسڵمانان.. بۆ نموونە (ابن حجر) لەم بارەیەوە گووتوویەتی:- (پێغەمبەر بۆیە (عەرەب)ی بەتایبەتی وریا کردۆتەوە، چونکە لەو سەردەمەدا گەلی عەرەب زۆربەیان موسڵمان ببوون، مەبەست لە شەڕو خراپەکەش ئەو ئاژاوەیە بوو، کە لەدوای خۆی بەهۆی کوژرانی (عثمان)ەوە ڕوویداو تا لە ئاکام عەرەب لە نێو نەتەوەکاندا وەك تەشتێکی گەورەو پڕ لە خۆراکی بەردەمی بخۆانی لێهات)(١).

٥- مانایەکی ئاماژە بۆکراوی تری فەرموودەکە ئەوەیە کە سزای خودا لە دنیادا سزایەکی گشتییەو هەموو کۆمەڵ دەگرێتەوە، سوننەت‌و ڕێبازی خوداش وایە

---

١) (فتح الباري: ١٣/١٠٧).

کە لەکاتی بڵاوبوونەوەی بەدکاریو سەرپێچیو خراپەدا هەموو نەتەوەی پێ لەناوبەرێت تەنانەت گەر کەسانی چاكو خواپەرستیشیان تێدا مابێت: (انهلكو فینا الصالحون)، واتە وەك (زەینەب) لە پێغەمبەری پرسیوە: (ئایا ئێمە بەسزای خودا لەناو دەچین تەنانەت گەر پیاوچاکانیشمان تێدا مابێت)؟

لە وەڵامدا فەرموویەتی: (بەڵێ ئەگەر گەندەڵیو بەدڕەفتاری زۆر ببێت/ **نعم اذا کثر الخبث**).

## (هەواڵی دەرچوونی (یەئجووج) و (مەئجووج) لە فەرموودە ڕاستەکان دا)

فەرموودە ڕاستەکان بە هیچ زانیاریەکی ئەوتۆ ئاماژەیان بۆ ڕەچەڵەكو بنجو بناوانی (یەئجوجو مەئجووج)و مێژوویانو جێگەو وڵاتو ڕەنگو ڕوخساریانو تایبەتمەندیو وردەکاریەکانی تری ژیانیان، نەکردووە هەروەها دانی بە دەرچوونیان (لەپێش دەرچوونی دوایی) دانەناوەو نکوڵیشی لێ نەکردوون، بەڵکو لە ئاست هەموو ئەمانەدا بێ دەنگن. بەڵام ئەم فەرموودە ڕاستانە (الاحادیث الصحیحة) ئاماژە بۆ دوایین دەرچوونیان لە ماوەیەکی کەمی پێشهاتنی قیامەتدا دەکەن..

ئەم دەرچوونەش بە یەکێك لە نیشانە گەورەکانی هاتنی قیامەت دادەنێن.

دەرچوونەکەشیان لە دوای هاتنە خوارەوەی (عیسا)یە ـ سڵاوی خوای لێ بێت ـ کە لە ئاسمان دێتە خوارەوەو کابرای جادووگەر لە مەوقیعی (باب الله)دا دەکوژێت.

لێرەشدا ئەو فەرموودە جوانو نایابو درێژەی پێغەمبەر ﷺ دێنینەوە کە دەربارەی جادووگەرەکە (الدجال)و دەربارەی (عیسای کوڕی مەریەم)و، دەربارەی (یەئجووجو مەئجووج) دەدوێت.. (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا لە (نواسی کوڕی سمعان)ەوە ـ خودا لێی رازی بێت ـ گێڕاویەتییەوە، کە گوتوویەتی:-

**ذكر رسول الله ﷺ الدجال ذات غداة فخفض فيه ورفع حتى ظنناه في طائفة النخل، فلما رحنا اليه عرف ذلك فينا فقال: ما شأنكم؟ قلنا يارسول الله ذكرت الدجال ذات غداة.**

واته:- پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێکیان لەکاتی چێشتەنگاودا باسی کابرای جادووگەرەکەی بۆ کردین، کە لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبێت، بە شێوەکیش باسی دەکرد، کە دەنگی تێدا نزمو بەرز دەکردەوەو چرپەچرپیشی تێ دەخست، بۆیە وا گومانمان برد، کە لە نێوان ڕیزی دارخورماکاندا خۆی حەشار دابێت، جا کاتێك بەم شێوەیە گوێمان لێگرتبووو چووینە قووڵایی فەرموودەکانیەوە، هەستی پێکردین، کە هێندە ئاڵوودەی باسەکەی بووین.. بۆیە لێمانی پرسی:

(ئەوە چیتانە؟) گوتمان (ئەی پێغەمبەری خوا لەکاتی چێشتەنگاودا باسی جادووگەرمان بە شێوەیەك بۆ دەکەیتو دەنگی خۆتی تێدا بەرزو نزم دەکەیتەوە، تا وای لێهات وامان دەزانی، کە هەر ئێستا کابرای جادووگەر پەیدا بووەو، لە نێو دار خورماکان دایە).. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:- (من لە غەیری جادووگەرەکە مەترسی تر لەسەر ئێوە شك دەبەم. خۆ ئەگەر کابرای جادووگەر لە سەردەمێکدا پەیدا بێت، کە من لە نێوتاندا مابم ئەوا من بەبێ ئێوەش بەرەنگاری دەبمەوەو دوژمنایەتی دەکەم. خۆ ئەگەر لە سەردەمێکدا پەیدا ببێتو من لە ناوتاندا نەمابم، ئەوا هەر کەسەو بە تواناو بەرگری خۆی بەرەنگاری دەبێتەوە، خوداش جێنشینی پشت پێبەستراوی منە لە هەر حاڵەتێکدا بۆ ئێوە، کە پارێزگاریتان لێ دەکات، ئەگەر ئێوە لەسەر باوەڕو عەقیدەکەتان مابنەوە.

کابرای جادووگەرەکەش لە هەرەتی لاوێتیو گەنجی دایەو، چاوی بە قووڵدا چووەو لەبەر چاوی من لە (عبدالعزی ی کوڕی رقطن) دەچێت، (واتە لەو پیاوەی کە هەموو هاوەڵان دەیانناسین)، جا هەر کەسێك لە ئێوە لەو زەمانەدا پێی گەیشت، با سەرەتاکانی سوورەتی (کهف)ی لە بەرامبەردا بخوێنێت. هەروەها ئەم

پیاوە جادووگەرە لە کۆمەڵە هاوڕێیەکی جیابۆتەوە کە لە ناوچەی شامو عێراقدا دەژیان، ئیدی بە ڕاستو چەپدا خراپەو تاوانو فەسادی بڵاودەکاتەوە.. دەئەی بەندەکانی خودا ئێوەش لەو ڕۆژەدا جێگیرو دامەزراو بن لەسەر ئیمانو باوەڕەکەتان).. ئێمەش گوتمان (ئەی پێغەمبەری خودا ئایا جادووگەرەکە چەندە لەسەر زەوی دەمێنێتەوە)؟ فەرمووی (چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، بەڵام ڕۆژێك لەو چل ڕۆژە لە ماوەی ساڵێك دایەو، ڕۆژێکی تریشیان لە ماوەی مانگێك دایەو، ڕۆژێکی سێ هەمیش لە ماوەی هەفتەیەك دایەو، ئیدی پاشماوەی ڕۆژەکانی تری کە (٣٧) ڕۆژە وەك ماوەی ڕۆژەکانی ئێوە وایە، واتە (هەر چل ڕۆژەکەی جادووگەرەکە لە ماوەی ساڵێكو مانگێكو حەفتەیەكو سیو حەوت ڕۆژی ئێوەدا وایە).. ئێمەش گوتمان (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەو ڕۆژەی کە لە ماوەی ساڵێکی ئێمەدایە بەقەد ماوەی ڕۆژێکی خۆمان نوێژی تێدا بکەین؟) فەرمووی (نەخێر، بەڵکو بەقەد ماوەکەی ئەو زەمانە هەقی خۆی پێ بدەنو نوێژەکان لە کاتە ڕاستەقینەکانی خۆیان دا بکەن).. پاشان گوتمان (ئەی پێغەمبەری خودا خێرایی ڕۆیشتنو گەرانی جادووگەرەکە بەنێو خەڵکیدا چۆنە؟) لەوەڵامدا فەرمووی: (خێراییەکەی ڕۆشتنی وەك ئەو بارانەیە کە (با)ی بەدوا دادێتو بە باوە دەبارێت.. ئینجا بەناو خەڵکەکەدا دەگەڕێتو بانگەوازیان بۆ ڕێی خۆی دەکات.. خەڵکەکەش باوەڕی پێ دێننو بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچن، هەروەها کابرایی جادووگەر فەرمان بە ئاسمان دەکاتو ئاسمانیش (بێگومان بەخواستی خودا) باران دەبارێنێتو، ئیدی ئاژەڵەکانیان هێندە تێراوو تێر لەوەڕ دەخۆن کە شیرێکی هێجگار زۆریان دەبێتو، گوانەکانیشیان پڕپڕ دەبێتو تەنیشتو ئەملاولاکانی جەستەیان قەڵەو دەبێت.. پاشان کابرایی جادووگەر دێتە لای کۆمەڵێکی تر کە ئیماندارنو بەرپەرچی وتەکانی دەدەنەوە.. ئەویش لێیان زویر دەبێتو وەك کۆمەڵەکەی تر لە پێناویاندا فەرمان بە ئاسمان ناکات کە بارانیان بۆ ببارێنێتو بەو شێوەیەش مەڕو ماڵاتیان تێراوو قەڵەوو شیردەربن.. بۆیە ئەمە کۆمەڵە هەژارو نەدار دەبنو هیچ شتێکی

وایان لە ماڵو سامان بەدەستەوە نامێنێت.. پاشان کابرای جادووگەر بەلای کەلاوەیەکدا تێپەڕ دەبێتو پێی دەڵێت:-

گەنجینە حەشاردراوەکانتم بۆ دەرکە..گەنجینەکانیش هێندە زۆرن کە وەك شانەکانی هەنگ دێنە دەرەوە. لەدواییدا کابرایی جادووگەر پیاوێکی گەنجی ڕێكو پێك دێنێتو شمشێرێکی لێ دەداتو دەیکات بە دوو کەرتەوەو، وەك ئەوە وایە کە نیشانێکی بەوردی پێ کابێت.. پاشان بانگی دەکاتو زیندوو دەبێتەوەو ڕووی تێ دەکاتو بە ڕووی گەشیو شادییەوە ڕووی تێدەکاتو پێدەکەنێت.. جا کاتێك جادووگەرەکە ئاواو لەم حاڵەتەدایە، خودای مەزن (عیسای کوڕی مەریەم) دەنێرێتە خوارەوە، (عیسا)ش لە خۆرهەڵاتی شاری (دیمەشق) لەلای منارە سپییەکە (المنارة البیضاء)ەوەو لە نێوان هەردوو ساختمانەکەوە دادەبەزێتە خوارەوەو هەردوو قۆڵیشی خستۆتە سەر باڵەکانی دوو مەلائیکەتو کاتێك سەری دەلەقێنێت ئاوی لێ دەتکێت (کە دیارە دەسنوێژی گرتووە) کاتێك سەریشی بەرزدەکاتەوە وەك بەردە درەوشاوو مرواریيەکان وایە ئیدی لەوکاتەدا بۆ هیچ کافرێك ڕەوانیە کە هەناسەی تیامابێتو نەمرێت، بەڵکو دەبێت بمرنو چاو لێکنێن..

ئنجا (عیسا) بەدوای جادووگەرەکەدا دەگەڕێتو لەلای مەوقیعی (باب اللە) دەیبینێتو دەیکوژێت، پاشان (عیسا)ی کوڕی (مەریەم) دەگاتە لای کۆمەڵێك کە ئیماندارنو خودا لە جادووگەرەکەی پاراستوونو، دەست بە دەموچاویان دادێنێتو هەواڵی پلەو پایەکانی نێو بەهەشتیان پێ ڕادەگەیەنێت.

جاکاتێك لەو حاڵەتەدان خودا سرووشی دەنگو باسێکی تر بە (عیسا) دەگەیەنێت کەوا:

(ئەی (عیسا) وا من چەند بەندەیەکی سەرکەشم هێناوەتە ئاراوەو هیچ کەسێك توانای جەنگو کوشتاریانی نیە، جا تۆش بەندە بڕوادارەکانم بۆ کێوی (طور) ببەو

لەدەست ئەو بەندە دڕندانە ڕزگاریان بکە).. ئیدی خودا (یەئجووج‌و مەئجووج) دەنێرێت‌و ئەوانیش لە هەموو گۆشەو کەنارێکەوە دێن‌و ڕیزە سەرەتاییەکانیان بەسەر دەریاچەی (طبرية)دا دەڕۆن‌و هەرچی ئاوی دەریاچەکەیە هەمووی دەخۆنەوەو چۆڕ بڕی دەکەن، پاشان ڕیزەکانی تریان پیایدا تێدەپەڕن‌و دەڵێن: (لەمەوپێش لێرەدا ئاو هەبووە)، ئینجا (عیسا)و هاوەڵە ئیماندارەکانی لە تەنگانەیەکدا دەبن کە هیچ خۆراك‌و کەرەسەیەکی ژیانیان پێ نیە، بۆیە تەنها سەرەگایەك بۆ کەسێکیان لە سەد هەزار دیناری ئەمڕۆی کەسێکی ئێوە باشترە لە لایان.. لەوکاتەدا پێغەمبەری خودا (عیسا)و هاوەڵەکانیشی لە خودا دەپاڕێنەوە کە دەروویەکی ڕەحمەتیان لێ بکاتەوەو بەسەر ئەو دوژمنە زۆرو دڕندانەدا سەریان خات. نزاکەیان گیرادەکات‌و چەندەها تیر دەگەیەنێتە سەرکێش‌و دڕندانە (واتە یەئجووج‌و مەئجووج) تاوایان لێ دێت هەموویان دەمرن‌و بەیەك جار وەك مردنیەك تاکە کەس دەمرن.

پاشان پێغەمبەری خودا واتە: (عیسا)و هاوەڵەکانی لە چیای (طور) دادەبەزنە خوارەوەو دێنەوە سەر زەوی جاران. بەڵام دەبینن ئەوا سەر زەویش یەکپارچە پڕ بووە لە لاشەی ئەوان‌و لە هەر تاکە بستێکی سەر زەوییەکەشەوە بۆ گەن‌و بۆنی جەستە مردارەوەبووەکانیان دێت‌و ئەو هەموو بۆگەنە بڵاوبۆتەوە، بۆیە پێغەمبەری خودا (عیسا)و هاوەڵەکانی داوا لە خودا دەکەن‌و لێی دەپاڕێنەوە کە ئەو حاڵەتە نا سازەیان بۆ بگۆڕێت.. خوداش داواکەیان پەسند دەکات‌و بۆ ئەم مەبەستە جۆرە باڵندەیەکی درێژ دەنێرێت کە لە (ملی پێشەوەی کەشتی دەچن)و ئەم باڵندانە یەکە یەکە هەموو لاشە مردارەبووەکانی (یەئجووج‌و مەئجووج) هەڵدەگرن‌و لە شوێنێکدا بەخواستی خودا فڕێیان دەدەن کە چیدی خەڵکی وەڕس نەکات.

پاشان دوای ئەمە خودای پەروەردگار بارانێکی وەهایان بۆ دەبارێنێت، کە هەموو شارو گوندو خێوەتگایەك دەگرێتەوەو زەوی دەشواتەوەو پاكو تەمیزو نزیکی دەکاتەوە.

ئینجا فەرمان بە زەوی دەکرێت، کە: (بەروبوومت دەرکەو خێرو بەرەکەتەکانت بگەڕێنەرەوە) تاوای لێ دێت بەروبوومو بەرەکەتەکانی هێندە دەبێت، کە کۆمەڵە کەسێك هەموویان لەیەك هەنار دەخۆنو ئەو تاکە هەنارە بەشیان دەکات، هەروەها لە ژێر سێبەری هەنارەکاندا دەحەسێنەوە.. پاشان خێرو بەرەکەت دەکەوێتەوە نێو باو بارانەوەو وای لێ‌دێت، کە تەنها بەچکە حوشترێك بەهۆی باو بارانو ئاوو هەواوە بەشی چەند تیرەیەك لە خەڵکی بکاتو، گوێرەکەی مانگایەکیش بەشی تیرەیەك لە خەڵکیو، بەرخی مەڕێکیش بەشی هۆزێك لە خەڵکی بکات.

جا لە کاتێکدا ئەو ئیماندارانە لەو بارودۆخە خۆشەدان، خودا بایەکی خۆش دەنێرێتو ژێر باڵی هەموویان دەگرێتەوەو گیانی گشت باوەڕدارو موسڵمانێك دەکێشێت. ئیدی تەنها خەڵکی خراپو بەدکار لەسەر زەوی دەمێننەوە کە سەرگەرمی هەراوهوریاو بەزمو ڕەزمی نێو خۆیان دەبنو، لەم حاڵەتەشدا قیامەت بەدی دێت)[1].

هەروەها (مسلم) لە شێوە گێڕانەوەیەکی تردا، بڕگەیەکی تری بۆ ئەم فەرموودەیە بەم جۆرەی لای خوارەوە، زیاد کردووە:-

**((ثم يسيرون (يعني يأجوج ومأجوج) حتى ينتهوا الى جبل (الخمر) وهو جبل بيت المقدس، فيقولون لقد قتلنا من في الأرض، هلم فلنقتل من في السماء، فيرمون بنشابهم الى السماء، فيرد الله عليهم نشابهم مخضوبة دما))**.. واتە:-

---

١) (مسلم) ئەم فەرموودەیە لە ژمارە (٥٢)ی بەشی (كتاب الفتن واشراط الساعة) (٢٠) (باب ذكر الدجال) —حديث-٢١٣٧-، گێڕاوەتەوە.

(پاشان ئەوان واتە (یەئجووجو مەئجووج) هەر دەڕۆن تا دەگەنە چیای (خەمور) لە (بيت المقدس)و دەڵێن: (ئەوا هەموو خەڵكی سەر زەویمان كوشت، دەبا بچین ئەوانە بكوژین كە لە ئاسمان دان.. بۆیە تیرەكانیان دەگرنە ئاسمانو، ئەو كاتە خوداش تیرەكانیان بۆ خوێناوی دەكاتو بۆیان هەڵدەداتەوە تاكو دڵیان بەوە خۆش بێت گوایە خەڵكی ئاسمانیشیان كوشتووە)..

بێگومان گەلی (یەئجووجو مەئجووج) زۆرترین ژمارەی نەتەوەكانی تر پێك دەهێننو، هەر ئەوانیش زۆرترین كافرانی دۆزەخنو بەو ژمارە هەرە زۆرەی خۆیان ژمارەی كافرانی نێو دۆزەخ لە قیامەتدا زۆر دەكەن. لەم بارەیەوە (بخاري) لە (ابو سعیدی خدری)یەوە ـ خودای لێی ڕازی بێت ـو ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوێتیەوە كە فەرموویەتی:-

**((يقول الله تعالى: يا أدم، فيقول: لبيك و سعديك و الخير في يديك، فيقول: أخرج بعث النار، قال وما بعث النار؟ قال: من كل الف، تسعمائة وتسعة وتسعون، فعندئذٍ يشيب الصغير، وتضع كل ذات حمل حملها، وترى الناس سكارى وماهم بسكارى، ولكن عذاب الله شديد، قالوا يارسوا الله وأينا ذلك الواحد. قال: أبشروا فإن منكم رجلاً، ومن يأجوج ومأجوج ألف. ثم قال، والذي نفسي بيده إني أرجو ان تكونوا ربع أهل الجنّة. فكبرنا. فقال: أرجوا ان تكونوا ثلث اهل الجنّة. فكبرنا. فقال: أرجوا أن تكونوا نصف اهل الجنّة. فكبرنا. فقال: ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود))**[1]...

واتە:- (خودا بە ئادەم دەفەرموێت (ئەی ئادەم) ئەویش دەڵێت: (بەڵێ خودایە گوێڕایەڵو ئامادەی هەموو فەرمانێكتمو هەموو خێرو چاكەیەك هەر لەدەست خۆت دایە).. خودا پێی دەفەرموێت:-

١) البخاري (٦٠) كتاب الانبياء (٧) باب (يأجوج و مأجوج)، حديث رقم (٣٣٤٨).

(ئەی ئادەم کەسانی ئەهلی دۆزەخ بێنە دەرەوە) ئادەم دەڵێت: (ئەهلی دۆزەخ کێن)؟

خودا لە وەڵامدا دەفەرموێت: (لە هەر هەزار کەس، نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەس لە دۆزەخ دان).. ئیدی لەو ڕۆژەدا منداڵ پیر دەبێتو هەموو کەسێكو گیانەوەرێکی دووگیانیش ئەوەی لە سکی دایە دای دەنێت.. هەروەها دەبینێت خەڵکی هەموویان سەرخۆشن، لە کاتێکدا سەرخۆشی ڕاستەقینەی مەیو شەڕابیش نین، بەڵام بێگومان سزای خودا زۆر توندوتیژە). گوتیان: (ئەی پێغەمبەری خودا ئەو تەنیاکەسەی، کە لە هەر هەزار کەسێك دەمێنێتەوەو لە دۆزەخدا نیە کامانەو لە چ نەتەوەیەکە؟ پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی:-

(مژدەتان لێ بێت تەنها کەسێك لە ئێوەو هەزار کەس لە (یەئجووجو مەئجووج) لە دۆزەخ دان. (پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دەسا بەو خودایەی، کە گیانی منی بەدەستە من تکاکارم، کە ئێوەی موسڵمان چارەکێکی خەڵکی بەهەشت بن). ئێمەش تەکبیر (الله اكبر)مان ووتو خودامان بە گەورە گرت. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هیوادارم ئێوە سێیەکی خەڵکی نێو بەهەشت پێکبێنن). ئێمەش بەدوایدا (الله اكبر)مان ووتەوەو، خودامان بە گەورە گرت.. لە دواییدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:-

(ئێوە ژمارەتان لە دۆزەخدا هێندە کەمە، کە لە نێو خەڵکی دۆزەخییەکاندا، وەك تاڵە موویەکی ڕەشی نێو پێستی گایەکی سپین، یاخود وەك تاڵە موویەکی سپیی نێو پێستی گایەکی ڕەشن).

## (ذو القرنين) کێ یە؟

زانایـانی تەفـسیرو مێژوونووسـان بـە درێـژی لـە کەسـێتی (شخـصیە)ی (ذوالقرنین)یـان کۆڵێوەتەوەو هەوڵیان داوە دەسنیشانی بکەنو ئەو کاتو شـوێنەش دیاری بکەن کە تیایدا ژیاوەو، ئەو کارانەشی ڕوونکەنەوە کە بـە ئـەنجامی داون.. زانایان لەم ڕووەوە ناتەبایی یەکی زۆرو دیاریان لە بـیروڕادا لـە نێـوان دا هەیـەو، وتەو بیروڕاکانیـان لێـك جـوداو دژ بەیـەك بـوون و، بەڵگەکانیـشیان پێـچەوانەی یەکدییە.. لەو کارەشیاندا زۆرجار پشتیان بەدەقە ئیسرائیلییەکانو درۆو دەلەسەو ئەفـسانەکانیانو ڕیوایەتـە بـڕوا پێ نـەکراوەکانو بەسـەرهاتە نەسـەلمێنراوەکان، بەستووە. خاوەنانی بەسەرهاتو ئەفـسانەچییەکان جڵـەویان بـۆ خـەیاڵیان بـەرەڵا کردووە کە لە فەزای خـەوو خەیاڵـدا بگـەڕێتو وێنەیـەکی ئەفـسانەیی خـەیاڵیی سەیرو سەمەرەیان بۆ (ذوالقرنین) کێـشاوەو، چـەندەها کاروبـارو جـەنگو فـەتحی وڵاتانو داستانی تریان بەخەیاڵ بۆ داناوە.

## ئایـا کەسـێتییـەکەی بەوردی دیـاری دەکرێت؟!

گەر ئەم پرسیارە بخەینە ڕوو کە: ئایـا دەشـێت بـەوردی کەسـێتی (ذوالقـرنین) دیاری بکرێت؟ ئەوا بێگومان وەڵامەکەشی بە (نەخێر) دەبێت.. چونکە بۆ کەسێك کە ڕێز لە زانستو بیروڕایی خـۆی بگرێـت، ناشـێت کـەوا کەسـێتی (شخـصیة)ی (ذوالقرنین) دیاری بکات، یان ئەو سێ گەشـتەی کـە لـە قورئانـدا ئاماژەیـان بـۆ کراوەی، دیاری بکات، یاخود شوێنی ئەو بەربەستەی کە لـە زەوی بنیـاتی نـاوە.. بۆیە ئەمەش ناشێت، چونکە سەرچاوە هەرە ڕاستو دروستە متمانـە پێکراوەکـان (واتە قورئانو سوننەت) لەم وردە کارییانە بێدەنگ بـوونو بەدرێـژی باسـی ئـەم لایەنانەیان نەکردووە. جا لەبەر ئەوەی لێی بێدەنگ بوون، ئەوا هـیچ بەڵگەیـەکی هەرە ڕاستو متمانە پێکراویشیان لەسەر نیە.

لەبەرئەوە وتەی زانایان لەم ڕووەوە، تەنها لە دەرووی بۆچوون دایە، نەك لە دەرووی وردبینیو لێ دڵنیا بوونەوە.. بۆ نموونە زانایەك هاتووەو هەندێك زانیاری لەوەو پێشی لەسەر (ذوالقرنين) خوێندۆتەوەو سەرنجی لەو بەڵگانە داوە، کە خاوەنەکانیان بەڕای خۆی خستوونیە ڕوو، ئینجا چاوی پێداخشاندوونو لێی کۆڵیونەتەوە، پاشان لەگەڵ ئەو بەڵگانەی کەسانی تردا بەراوردی کردوونو، ئیدی لەوانەیە لەمەوە ئەنجامێکی دەرهێنابێتو، لەو ئەنجامەدا وتەیەك لە وتەکانی زانایانی تری بەڕاستتر دانابێتو، چەند بەڵگەیەکیشی لەنێو بەڵگەکاندا پەسند کردبێت..

بەڵام بۆچوونو بەڕاستتر دانانی بەڵگەو وتەکانی زانایانی، تەنها لە دەوری گومان بردنو ئەگەر دانانو یەکلاکارییەوەیە، نەك لەدەوری وردکردنەوەو جەخت لەسەرکردنو لێ دڵنیابوونو متمانە پێ کردنەوە بێت..

## -ڕای (سید قطب) لەم بارەیەوە-

کاملترینو باشترین بیروڕا بۆ دەستنیشانکردنی کەسێتی (ذوالقرنين) و کارەکانی بیروڕایی پێشەوا (سید قطب)ە - رەحمەتی خودای لێ بێت - لەم بارەیەوە گوتویەتی:- (دەق (نص)ی قورئان هیچ شتێکی لەسەر کەسێتی (ذوالقرنين) دیاری نەکردووە، ئەمەش شێوازێکی ڕێك خراوی قورئانە لە چیرۆکەکاندا، چونکە تۆماری مێژوویی بەمەبەست نەگیراوە، بەڵکو ئەوەی جێی مەبەستە، پەندی سوود لێ بینراوە لە چیرۆکەکەدا)، دیارە پەندو عیبرەتیش بەبێ پێویست بوون بە دەسنیشان کردنی کاتو شوێن، لە زۆرجاردا بەدیی دەهێنرێت. مێژووی تۆمارکراویش پادشایەکی ناساندووە کە ناوی (ئەسکەندەری-ذوالقرنين-) بووە، بەڵام بە بەڵگەی سەلمێنراوەوە ئەو (ذوالقرنين)ە نیە، کە لە قورئاندا ناوی هاتوە، چونکە (ئەسکەندەری ئەگریکی) بتپەرست بووەو، ئەم پیاوەش کە خودا لە قورئاندا ناوی هێناوە باوەڕی

بە خودا هەبووەو، لەم بارەیەوە (ابو الريحان البيروني المنجم) لە کتێبی (الاثار الباقية عن القرون الخالية)دا گوتوویەتی:-

(ئەو (ذوالقرنين)ەی کە لە قورئاندا ناوبراوە لە هۆزی (حیمیەر) بووە، ئەمەش بەبەڵگەی پیتەکانی ناوەکەی، چونکە لەپێش ناوەکانی (حیمیرەکانەوە) نازناوی (ذو) هەبووە یان (ذی) وەك (ذی نواس) و (ذی یزن)، ناویشی (ابوبکری کوڕی ئەفەریقش) بووەو بەسوپاو لەشکرەکانیەوە بەرەو کەناری (دەریای سپی ی ناوەڕاست) ڕۆشتووەو بەولاّتانی (تونس)و (مەراکیش)و ولاّتانی تردا تێپەڕیوەو شارێکی بەناوی (ئەفریقیە) دروست کردووەو، ئیدی هەموو کیشوەر (قارە)ی ئەفریقیا بەم ناوەوە ناونراوە، خۆیشی بۆیە بە (ذوالقرنين) ناو براوە، چونکە بەهەردوو مەوقیعی ڕۆژ (واتە بەرۆژهەلاّتو ڕۆژئاوا)ی زەوی گەیشتووە). لەوانەیە ئەم وتەیەی (ابوالريحان البيروني) ڕاست بێت، بەلاّم ئێمە هۆو ئامرازەکانی ساغکردنەوەو سەلماندنی ئەم وتەیەمان نیە، چونکە ناتوانین لەو هێندە مێژووە تۆمارکراوەی دەربارەی (ذوالقرنين)ە وکە لە قورئاندا بەشێکی کەم لە ژیاننامەکەی گێڕراوەتەوە، بۆ ئەو ئامرازانە بگەڕێین، ئەمەش وەك چەندین چیرۆکی تری نێو قورئان کە بەشێکی کەمو سنوردار لە بارەی ژیانو بەسەرهاتیان گێڕراوەتەوە، وەك چیرۆکەکانی گەلانی (نوحو هودو صالح)و ئەوانی تر. مێژووش تازە هاتۆتە ئاراوەو بەبەراورد لەگەڵ تەمەنی مرۆڤایەتیدا دیاردەیەکی نوێیە.. بێگومان پێش ئەم مێژووە نووسراوو تۆمارکراوەش چەندەها ڕووداوی تر هەبوونو هیچ شتێکیان لەبارەوە نەزانراوە، ئیدی مێژوو ئەوەنیە کە پرسیارو داوای هەموو زانیاری یەکی لێ بکرێت. خۆ ئەگەر کتێبێکی ئاسمانیی وەك (تەوڕات) لە (شێواندنو دەسکاریو بۆزیادکردن) بپارێزرایە، ئەوا دەبووە سەرچاوەیەکی وا کە لە هەندێك لەو ڕووداوانە پشتی پێ ببەسترایە.. بەلاّم (تەوڕات) پڕکرا لەو چیرۆکە ئەفسانەییانەی کە هیچ گومانێك لە (ئەفسانەیی بوونیان) ناکرێت، هەروەها پڕکرا لەو ڕیوایەتانەی کە

هیچ گومانێکیان لەسەر نیە لەوەدا کە زیادەنو زیادکراون بۆ سەر دەقە بنەڕەتییـە بـە سـرووش نێردراوەکـەی خـودا، بۆیـە (تـەوڕات) وەك سەرچـاوەیەکی ڕاسـتو متمانەپێ کراو نەمایەوە بـەهۆی ئـەو چـیرۆکە مێژوویانـەی کـە بـە نـاڕەواو بـە شێوەیەکی ناڕاستو ئەفسانەکاری تێی خنران.

کەوابوو هیچ کتێبێکی ڕاست نەمایەوە تەنها (قورئـان) نـەبێت کـە بێگومـان خودا لە هەموو دەسکاری کردنو ئالْ و گۆڕتێداکردنێکی بەشەریی پاراسـتوێتی و، کە تاکە سەرچاوەیە بۆ ئەو چیرۆکە مێژووییانەی تێیـدا هـاتوون.. شـتێکی حاشـا هەڵنەگرو بەڵگە نەویستیشە کە ناشێت حوکمی قورئانی پـیرۆز بەمێـژوو بـدەین، ئەمەش لەبەر دوو هۆی ڕۆشن:-

یەکەم: بێگومـان مێژوو دیاردەیەکی تازەیەو چەندین ڕووداوی لەکیس چووە کە لـە مێـژووی مرۆڤایەتیـدا زۆرو بێ‌شـومارنو هـیچ شـتێکی لـەبارەوە نـەزانیوە، قورئانیش هەندێك لەو ڕووداوانەی گێڕاوەتـەوە کـە مێـژوو هـیچ زانیارییـەکی لەبارەیانەوە نیە.

دووەم: جا مێژوو، تەنانەت گەر ئاگاداری هەندێك لـەو ڕووداوانـەش بێـت، بـەڵام کارێکە لەکارە پڕ کەمو‌کووڕییەکانی مرۆڤـو وەك هـەرکارێکی تـری (مرۆیـی) هەڵەو کەم تەرخەمیو دەسکاری تێدەکەوێت.

ئێمەش لەم سـەردەمەمان کـە (هۆیـەکانی پەیوەنـدیو ئامرازەکـانی پـشکنین مەیـسەر بـوون) دەبیـنین کـە هـەواڵێك یـان ڕووداوێـك بەچـەند ڕوویەکـدا لێـك دەدرێتەوەو دەبینرێتو، لە چەندین گۆشەنیگای هەمەجۆریشەوە بۆی دەڕوانرێـتو بەچەند شێوەیەکی لێك جوداو دژبەیەك تەفسیر دەکرێت.. ئیدی لەم هەموو ڕووداو بیروڕاو لێکدانەوە کەڵەکەبوانەش مێژوو دروسـت دەکرێـتو، وێڕایـی ئـەوەش کـە دواییدا هەروتەیەك بۆ ساغکردنەوەو وردکردنەوە گوترابێت. بۆیـە گـەر تـەنها بـە وتەش پرسیارو داوای ڕوون کردنەوە لە مێژوو بکرێت دەربارەی ئەوەی کـە قورئـان

لە چیرۆکەکاندا هێناویێتی، ئەوە بێگومان پێچەوانەی بنەما زانستیو بڕیار لەسەردراوو دان پێ دانراوەکانی مرۆڤایەتیشە پێش ئەوەی ئەو بیروباوەڕەبێت، کە قورئانی بە (وتەی بڕیاردەرو جیاکەرەوە داناوە) واتە بەتاکە سەرچاوەی یەکلاکەرەوەو جێگیری مەسەلەکان داناوە.. جا بۆیە هەر وتەیەك بۆ (پرسیار لە مێژووو پشت بەستن بە مێژوو) لە کەسێکەوە نادرکێنرێت کە باوەڕی بە قورئان هەبێت، تەنانەت لە کەسێکیشەوە نیە، کە باوەڕی بە ئامرازەکانی توێژینەوە هەبێت، بەڵکو ئەوە وڕێنەکردنو لەهۆش خۆ چوونە)[١].

## ناسراوترین وتە دەربارەی دەسنیشانکردنی کەسێتی (ذوالقرنین)

لەنێو وتەی زانایاندا ناسراوترینی هەموویان دەربارەی دەسنیشانکردنی کەسێتی (شخصیە)ی (ذوالقرنین) چوار ووتە هەیە، کە گوتراوە (گوایە هاوچەرخی ئیبراهیم) بووە، یان (گوایە ئەسکەندەری مەکدۆنی بووە)، یان (گوایە لە هۆزی حیمیەر بووە) یاخود بەڕایی ڕاسترینیان (کۆرشی فارس) بووە، کە ئەمە وتەی (مولانا ابوالکلام ازاد)ە..

١- وتەی یەکەم (گوایە هاوچەرخی ئیبراهیم) بووە ـ سڵاوی خودای لێ بێت ـ :-

لە وتەی یەکەمدا ناوی دیاری نەکراوە، بەڵام ئەو سەردەمە دیاری کراوە کە تیایدا ژیاوەو کە گوایە هاوچەرخی (ئیبراهیم) بووەو گوایە لە (فەلەستین) پێی گەیشتووەو، هەروەها لەماڵی خوداش (بیت الله الحرام) لە ـ مەککەـ دا بەدیداری گەیشتووەو، لەو زانایانەی کە ئەم وتەیە بەڕاستتر دەزانن، مامۆستا (محمد خیر رمضان یوسف)ە کە لە کتێبەکەی خۆی: (ذوالقرنین القائد الفاتح والحاکم الصالح)دا ئاماژەی پێ داوە، هەر بۆیەش لەو کتێبەدا گوتوویەتی:-

---

١) (في ظلال القران،/٤: ٢٢٨٩-٢٢٩٠).

(ئەمــە پیــاوێکی تــرەو لــە ســەردەمەکانی ڕابــردوودا و لــەپێش (توببــەع)و (ئەسکەندەر)و (کۆرش)یشدا پیاوە، بێگومان ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خـودا (ئیبراهیم خلیل)دا ـ سڵاوی خوای لێی بێت ـ بـووە، وەك مێژوونووسـە دەسـپاكو متمانە پێکراوەکانیش دیارییان کردووەو بەڕاستیان داناوە)[1].

جا ئەگەر ئێمەش ئەم بەڕاستتر دانانەی وتەکەی (محمد خير يوسف) لێکدەینـەوە ئەوا فەرموودەیەکی ڕاست (صحيح) بەدی ناکەین کەوای دیاریی بکات گوایـە لـە سەردەمی (ئیبراهیم)دا بووە. سەبارەت بە (مێژوونووسە متمانە پێکراوەکان)یـش، کە ناوبراو پشتی بەبیروڕایان بەستووە گوایە ئەوان ئەم بۆ چوونە بەڕاسـت دادەنـێن کەوا لە سەردەمی (ئیبراهیم)دا ژیا بێت، ئەوا ئێمە لەڕاسـتیدا بـەو مێژوونووسـە متمانە پێ‌کراوانەیان دانانێین تەنانەت گەر بە پێوەری (محمد خير يوسـف) خۆیـشی وابێت، چونکە ئەو مێژوو نووسانە بەڵگەیەکی ڕاستو دروستی وەهایان نەخستۆتە ڕوو، کە لە فەرموودەیەکی ڕاست (صحيح)ەوە لەسەر وتەو بۆچـوونیان سەرچـاوەی گرتبێت. ئەو مێژوونووسە متمانە پێکراوانەش، کە پشتی بە وتەکانیان بەستووە:

(ابوحیانی مفسر) خاوەنی کتێبی (البحر المحيط) و (قرطبـيـی مفـسر) خـاوەنی کتێبی (الجـامع لأحكـام القـران) و، (شـێخی ايجـی)ی خـاوەنی تەفـسیری (جـامع البيــان)و (زەمەخـشەری)ی خــاوەنی تەفــسیری (الكــشاف)و (نفـسي)ی خــاوەنی تەفسیری (مدارك التنزيل)و (سليمان الجمل)و (احمد الصاوی)، کە پــەراوێزەکانیان لە تەفسیری (جلالـين)دا نووسـیوەو، (ئالووسـی)ی خـاوەنی (روح المعـانی).. وەك زانراویشە هەموو ئەمانە زانای بواری تەفـسیرن نـەك مێـژوونووس، بۆیـە ووتـەی ئــەمان لەســەر مێــژووو بەســەرهاتە مێــژوویی یــەکان ئاتــاجی بەســاغکردنەوەو سەلماندنو یەکلاکردنەوەو ڕاستپێکانە.

ئەو مێژوونووسە متمانە پێکراوانەی تـریش، کـە پـشتی پـێ بەسـتوونو، کـە لەڕاستیدا بە مێژوونووس ناسراون (ازرقی)و (ابن اياس)ی خاوەنی مێژووی (بـدائع

---

١) (ذوالقرنين القائد الفاتح و الحاكم الصالح) ص(٢٤٨).

الزهور في وقائع الدهور)و (علی دوك)ی خاوەنی (محاضرة الاوائل)ن، بەڵام ئایا ئەم سیٚ کەسەش لە مێژوونووسە متمانە پێکراوەکانن؟! چەندە هیواداریش بووم، کە خۆزگە مامۆستا (محمد خیر رمضان یوسف) چەند بەڵگەیەکی زانستیانەی ڕاستو دروستی لەسەر بیروڕاکەی بهێنایەتەوە، ئەم بەڵگەیەش تەنها لە قورئانی پیرۆزو فەرمودە ڕاستەکانەوە دەردەهێنرێن، بەڵام پشت بەستنی بەوتەی چەند مێژوونووسو تەفسیر نووسێك هیچ بەڵگەیەکی لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانەوە لەسەر نییە، ئەمەش لە توێژینەوەی زانستیانەو مەنهەجیانەی ڕاستو دروستدا پەسند ناکرێت.

لەبەرئەوە ئێمە ناچارین دان بەو وتەیەی (محمد خیر یوسف)دا نەنێین، کە ئەو ڕایەی لەسەر (ژیانی (ذو القرنین) لە سەردەمی (ئیبراهیم)دا ـ سڵاوی خوای لێ بێت) بەڕاستتر داناوە هەروەك ناچاریشین هەموو ئەو وتانەی نێو کتێبە ناوبراوەکانی مێژووو تەفسیرەکانیش پشتگوێ خەین، کە گوتوویانە گوایە (ذوالقرنین) لە (فەلەستین) یان لە (حیجاز) بە (ئیبراهیم) گەیشتووە، لەبەر ئەوەی لەیەك فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا باسی لێنەکراوە تاکو مرۆڤ پشتی پیٚ ببەستێتو لێی دڵنیابێت... ـ خوداش هەر خۆی زانایە ـ (والله اعلم)..

٢- گوایە (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووە:-

ووتەی دووەم لەمەڕ ئەوەی، کە گوایە (ذوالقرنین)، (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووەو ئەو کابرایەیە، کە لە (مەکدۆنیا) ساڵی (٥٦پێش زایین) لەدایك بوویێتو باوکیشی (فیلیپ)ی پادشای مەکدۆنیا بووەو، گوایە (ئەسکەندەر)ی کوڕی، لەلای فەیلەسووفی ناوداری یۆنانی (ئەرەستۆ) ئیمانی هێناوەو، (ئەرەستۆ)ش لەسەر لۆژیك (منطق)ی فەلسەفەی یۆنانی پەروەردەی کردووە، ئینجا باوکی مردووەو ئەویش لەوکاتەدا لە تەمەنی بیست ساڵیدا بووەو، لەدوای باوکی پادشایەتیی لە ساڵی (٣٣٦.پ.ز)دا گرتۆتە دەستو دوای دوو ساڵ بەرەو جەنگی فارسەکان کەوتۆتە ڕێو لەو جەنگەدا سەرکەوتووەو بەسەر پادشای فارس (دارا)دا لە ساڵی

(۳۳۳.پ.ز)دا زاڵ بووە، ئینجا فەتحی وڵاتی (شام)و (عێراق)ی تەواو کردووە، پاشان بەرەو فەتحی وڵاتی هیندستانیش ڕۆشتووە. ئیدی لە نزیکەی دەساڵ دا زۆربەی وڵاتە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی فەتح کردووە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ (یۆنان)و لەڕێگادا بەشاری (بابل)ی (عێراق)دا تێپەڕیوە تاکو نەختێك بحەوێتەوە، بەڵام لەوێدا تووشی نەخۆشیەکی توندو کاریگەر بووەو بۆ ماوەی یازدە ڕۆژ لەرزوتای قورسی گرتووەو، هەر لەوێ لە ساڵی (۳۲۳.ز)دا مردووە، تەمەنیشی کەمتر لە سیو سێ ساڵ بووە)[۱].

بۆیەش نازناوی (ذوالقرنین)ی پێدراوە چونکە دەوڵەتی فارسەکانی فەتح کردوەو، وەك ئەوە وابووە کە هەردوو کیشوەری ئەو زەمانەی (یۆنانی)و (فارسی)ی پێکەوە بەستبێتەوە کە بێگومان دوو دەوڵەتی گەورەی ئەو سەردەمە بوون.

جا ئەوانەی کە ڕایان وایە گوایە ئەو (ذوالقرنین)ەی لە قورئاندا ناوی هاتووە (ئەسکەندەری مەکدۆنی)یە، چەند کەسێك لە جمهورو کۆمەڵی زانایانی تەفسیرو مێژوونووسەکانن، وەك: (مسعودی)و (مقریزی)و (ثعلبي) و (إدریسي) و (رازي) و (أبوحیان) و (نسفي) و (ابو مسعود) و (ألوسي) و (قاسمي) و (محمد فرید وجدي)[۲].. ئەمەش سەرەڕایی شکۆمەندیو زانستی خاوەنانی، (بیروڕایەکی ناڕاستە)، چونکە وەك زانایانی فەرمووده لەسەری کۆكو هاوڕان (ئەسکەندەری مەکدۆنی) کابرایەکی بێئیمانو کافر بووەو شەریکی بۆ خودا داناوەو لەو بتپەرستانە بووە، کە خواوەندەکانی یۆنانیان پەرستووە، هەروەها لە گوناهە گەورەکانی وەك بەدڕەفتاریو ئارەزووپەرستیو مەی خواردنەوەی ئەنجام داوەو زیادەڕەویشی تێدا کردون، تەنانەت دوای شەوێك مردووە، کە بە (مەی خواردنەوەو سەرخۆشیو بە ئازاردانی سەرخۆشانەی کەسانی ترەوە) بەسەر بردووە.. بەڵام بێگومان (ذوالقرنین) وەك

---

۱) کتێبی (ذوالقرنین..)ی (محمد خیر)، ص (۹۱-۹۵) (بەکورتی)..

۲) هەمان سەرچاوە، ل- (۸٤-۹۰).

قورئانیش پێی ناساندووین، پیاوێکی (ئیماندارو دادپەروەرو چاکە خواز بووە)[1].

۳ - گوایە لە هــۆزی (حیمیەر) بووە:-

وتەی سـێیەم ئەوەیە گوایە (ذوالقرنین) پادشایەکی عەرەب بووە لە پادشـاکانی (حیمیەر)و ناوە قورسەکەشی (ذي مراثد بن الحارث بن الرائش) بووەو، گوتراویـشە ئەو پادشای حیمیەر (ابوبکر یاخود ابوبکری عمـیر بــن افـریقش الحمـیری) بــووەو ماوەی پادشایەتی یەکەی لەنێوان سالآنی (۳۰۰-۳۲۰)ی زایینی دابووە، لەوانـەی ئەم وتەیەیان دەربڕیوە: (وهبی کـوڕی منبــه) لــه (تـابعین)و (کعـب الاحبـار)ەو، هەروەها لە زانا هاوچەرخەکانیش (محمد راغب الطبـاخ)ە کە لەم بارەیەوە کتێبێکی داناوە[2]. ئەم وتەیەش هیچ بەڵگەیەکی لەسـەر نیـەو تـەنها لەبۆتـەی عاطیفـە و هاوسۆزیو دەمارگیریی بۆ عـەرەبەوەیە..

٤- ڕای ڕاستترین ئەوەیە، کە (کۆرشی فارس) بوو بێت:-

وتەی چوارەم: ئەوەیە گوایە (ذوالقـرنین) پادشـای فـارس (کـۆرش) بێـت، کـە هەردوو مەملەکەتی (لیـدیا)و (میـدیا)ی یەکخـستووەو کردوونــی بەیــەك، هــەر بۆیەش نازناوی (ذوالقرنین)ی بۆ دانراوە، (۳۰) سی ساڵیش حوکمی تێدا کردووە لە ماوەی نێوان سالآنی (٥٥٩-٥٢٩/ پ.ز).

لەوانەی ئەم ڕایـەیان هەیـە مامۆسـتا (ابـوالکلام ازاد)ە، کــە لــە کتێبــی (و یسألونك عن ذي القـرنين)دا ئامـاژەی بــۆ کـردووە. هــەروەها دکتــۆر (عبـدالعليم عبدالرحمن خضر)یشە کە لە کتێبی (قصة ذي القرنين)دا ئاماژەی بۆ کـردووە، ئــەم دوو زانایەش بەڵگەی زۆریان لەوبارەیەوە خستۆتە ڕوو، کە یەکلای دەکەنەوە کـەوا (کۆرشی فارس) ئەم (ذوالقرنین)ەیە..

---

۱) هەمان سەرچاوە، ل- (١٤٨-١٦٢).

۲) هەمان سەرچاوە، ل- (١٦٥-٢٠٧).

## بەڵگـەکانی (ابو الکـلام ازاد) لەسـەر ئەوەی، کە (کۆرشـی فارس) بووە

(مولانا —ابو الكلام ازاد) لە زانا پێشەواو دیارەکانی موسڵمانانی نیمچە دورگەی هیندەو، لە سەرەتای سەدەی بیستەمی زایینیدا موسڵمانانی هیندستانی هانـدەدا بۆ شۆڕش لە دژی (بەریتانیا)ی داگیرکەرو وتاری پڕ جۆش‌و خرۆشی بۆ دەدان.

بەریتانیاش لە ساڵی (١٩٢٢)دا ئەم پیاوەی لەسەر شۆڕشگێڕی‌و بانگـەواز بـۆ بەرەنگاری‌و مانگرتنی مەدەنیانە دادگایی کـرد، کاتێـك برایـە بـەردەم دادگـاش وتارێکی هێندە بەجۆشی لەبـەردەم ئامـادەبوان‌و پـارێزەران‌و شـاهیدان‌و دادوەران خوێندەوە لە لوتکەی ڕەوانبێژی‌و دانایی‌و ژیربێژیی (منطق)دا بوو[١].

کاتێك لە هندستانیـشدا دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ دامـەزرێنرا، نـاوبراو وەزیـری (مەعاریف) بوو تێیدا، ساڵی (١٩٥٥. ز)یش کۆچی دوایی کردووە.

(ابوالكلام ازاد) بیریارێکی ئیسلامی‌و تەفسیر نووسێکی قورئان‌و لە پێشەنگانی نووسەرە ئیسلامیەکانی هیندستان بووە، وەك توێژەرەوەیەکیش لە ژیانی (ذوالقرنين)ی کۆڵیوەتەوەو، بۆ ئەم مەبەستە چووە بۆ ئێران‌و ناوچەی بەربەسـتەکەی (یـەئجووج‌و مەئجووج)ی بینیوەو، پاشان پوختەی گەشـتەکەی‌و توێژینەوەکەشـی لـە گۆڤـاری (ترجمان القرآن)دا نووسیوە، کە (ابو اعلای مودودی) لە هیندسـتان دەری دەکـردو دواتریش لە پاکستان. ساڵی (١٣٩٢.ك/١٩٧٢.ز)یش شێخ (احمد حسن الباقوری) ئەو توێژینەوەیەی مامۆستا (ازاد)ی لەو گۆڤارەوە هێناوەو پێشەکییەکی درێژی بۆ نووسیوە، کە بەشێکی زۆری تەرخان کردووە بۆ لێدوان دەربارەی خودی (مامۆسـتا ئـازاد)و پەیوەنـدی بـە (جمـال عبدالناصـر)ەوەو، سـەردانی پاکـستان‌و هینـدو

---

١) بڕوانە چەند بڕگەیەکی ئەو وتارە لـە پێـشەکی کتێبەکـەی (بـاقوری)دا، لاپـەرە(٣٦-٦٨)، واتـە کتێبی (ويسألونك عن ذي القرنين).

ئەندۆنیسیاو چینی کردووە. کتێبەکەشی لە دەزگای (دارالشعب) لە (میسر) بەناونیشانی (ویسألونك عن ذي القرنين) دەرچووە.

بەڕاستی ووتەو بیروڕایی مامۆستا (ابو آزاد) لەو کتێبەدا زۆر بەپێزو چاكو بەنرخە لایەنە باشەکەی ئەو وتانەی ئەوەیە، کە چەندین بەڵگەی لەسەر بیروڕایی خۆی هێناوەتەوەو بەڵگە هەمەجۆرو لێك جوداکانیشی پێکەوە بەستوونەتەوەو چەندین زانیاری بەڵگەکاری لە مێژووو جوگرافیاو ئاسەوارە دەرخراوەکانەوە خستۆتە ڕوو. لێرەشدا پوختەی بەڵگەکان لەو کتێبە بەهادارو بەپێزەوە دیاری دەکەین:

کورتکردنەوەی وتەکانی ئەو ساتەی، کە دەربارەی دیاریکردنی کەسێتی (ذوالقرنين) درکاندویەتی (ابوا لكلام ازاد) سەرەتا، کە بەو سیفەتانە (ذوالقرنين) دەستی پێکردوە، کە لە قورئان دیاری کراون، کە هەشت سیفەتن، پاشان هەندێك وتەی نوسەرانی تەفسیری لەسەر دەستنیشانکردنی کەسێتیی (ذوالقرنين) هێناوەو بەم جۆرە:

هەندێك گوتوویانە: (وشەی (قرن) بەمەبەستی شتێکی دیارنیە، بەڵکو گوزارشت لە زەمانو، بۆیەش بە (ذوالقرنين) ناوبراوە، چونکە لە حوکمەکەی داودو سەردەمی گەورەی خایاندوە).

هەندێکی تریشیان گوتوویانە: (ئەو هاوچەرخی ئیبراهیم بووە) ــ سڵاوی لێ بێت ـ هەروەها هەندێك لە نوسەرانی تری تەفسیر گوتوویانە: ئەو پادشایەك بووە لە پادشاکانی حیمیەر).

هەندێکی تریشیان گوتوویانە : ئەو (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووە.

پاشان هەموو ئەو ووتانەی ڕەتکردنەوە بە پوچەڵیشی داناون، ئەمەش بەپێوەری ئەوەی کە ئەو سیفەتانەی لە قورئاندا لەسەری هاتوونو ئەو کارانەشی باسی لێ کراون، لەگەڵ هیچ وتەیەکی ئەو کەسانەدا ناگونجێت.

## (ذوالقرنین) هەر ئەو (کۆرشی فارس)ەیە

(ابو الکلام ی زاد) ڕایی وایە کە (ذوالقرنین ) هەر ئەو (کۆرشی فارس)ەیە کە باسی لێوەدەکات، ناوبراو لەمبارەیەوە گوتویەتی: ئەم پیاوە فارسەکان بە (کۆرش) ناویان بردوە، جولەکەکانیش بە (خورش) ناویان بردووە.. عەرەبەکانیش بە (قورش) یان (کەیخوسرەو) ناویان بردووە.. هەروەها یۆنانییەکانیش ناوی (سائیرس)یان لێ ناوە.

(کۆرش) لە یەکەمین دەورانی مێژووی ئێرانیو فارسدا، حوکمی (وڵاتی فارس)ی کردووە، ئەمەش لەو دەورانەی پێش سەردەمی هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ سەر وڵاتی فارسدا بووە، کە (دارا)ی پادشایانی کوشتووە.

ئێرانیش لە پێش حوکمی (کۆرش)دا، بۆ دوو مەملەکەت دابەش کرا بوو، یەکێکیان (مەملەکەتی فارس)و، دووەمیان (مەملەکەتی میدیا) لە باکوور.

لە ساڵی (٥٥٩)دا (کۆرش) حوکمی ئێرانی گرتۆتە دەستو هەردوو مەملەکەتی (فارسو میدیا)ی لەیەك دەوڵەتدا یەکخستووەو، هەموو میرو کاربەدەستەکانی ئەو سەردەمە، لە حوکمەکەی ڕازی بوونو گەلیش پەیڕەوی و گوێڕایەڵیی کردووە.

(کۆرش) سوپایەکی لە فارسەکان پێك هێناوەو، جەنگو کوشتاری مەملەکەتو دەوڵەتانی تری پێ کردووەو، فەتحی کردوونو خستوونیە ژێر حوکمی خۆیەوە.

مەبەستی فەتحی ئەو وڵاتانەش بۆ چەسپاندنی دادپەروەریو یەکسانیو یارمەتیدانی ستەم لێ کراوان بووە، سێ جەنگی بەناوبانگیشی هەبووە، کە لەنێو هەموو جەنگەکانی تریدا دیار بوون..

## جەنگی یەکەمی (کۆرش) لەگەڵ ڕۆمەکان دا

(یۆنان) مەملەکەتێکی هەبوو کە هاوسێ ی مەملەکەتی فارسەکان بووو، ناوی مەملەکەتی (لیدیا) بووو دەکەوێتە بەشی سەرووی ئاسیای بچووکەوە، واتە بەرزایی یەکانی (ئەنادۆڵ) هەتا دەگاتە (دەریای ڕەش)و (دەریای ئێجە).

جەنگەکانیش لە نێوان مەملەکەتی (لیدیای یۆنانی)و (میدیای فارس)دا بەردەوام هەبوو، لە زەمانی (کۆرش)دا پادشایەکی (یۆنانی) حوکمی (لیدیا)ی دەکرد کە ناوی (کرۆسیس) بوو.. جا کاتێك (کۆرش) حوکمی گرتەدەست، (کرۆسیس) جەنگێکی لەدژ ڕاگەیاندو هەر خۆیشی دەستی بەهێرشو دوژمنکاری کرد، دیارە (کۆرش)یش هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەبوو تەنها بەربەرەکانیکردنی نەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتیی سوپایەکی فارسەکانی کردو بەرەو (لیدیا) لە خۆرئاوادا ڕۆیشتو ڕووی کردە پایتەختی (لیدیا)و دوو جەنگی دژواری کتوپڕیی لە نێوان هەردوو لادا ڕوویدا، کە بە جەنگەکانی (بتریا)و (ساردیز) ناسراون، ئیدی حوکمی (کرۆسیس)ی ڕووخاندو (ساردیز)ی پایتەختی مەملەکەتەکەیانی داگیر کردو، (کرۆسیس)یش بەدیلی گرتو بەرەو وڵاتی (فارس)ی بردو، دەوڵەتی (لیدیا)ش کەوتە ژێر ڕکێفیەوە.

(کۆرش) بەوپەڕی دادپەروەریو سۆزو ویژدانەوە مامەڵەی لەگەڵ یۆنانیە بەزیوەکاندا دەکرد، تەنانەت لەوەدا زیادە ڕۆییشی کردووە، بۆ نموونە پادشا دیلەکە (کرۆسیس)ی هێناوەو داوای کردووە، کە پڕ باوەشێکی گەورە لە تەختەی بۆ بێننو ئەو پادشا دیلەی لەسەر دابنیشێننو، ئینجا ئاگر بەدارو تەختەکەی ژێریەوە بنێن. ئەوانیش ئەو فەرمانەیان جێبەجێ کردووە، کەچی (کۆرش) ئەو پادشا دیلە (واتە کرۆسیس)وا دەبینێت، کە نەدەترسێتو نەدەشڵەژێت، بۆیە خێرا فەرمانەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو لێی خۆش بووەو، ئیدی تەواوی ڕۆژو ساڵانی تری بەسەر بەرزیو

ڕێز لێگیرێی یەوە لەلای (کۆرش) بەسەر بردووە، ئەمەش ئـەو گەشـتەی یەکەمـە، کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووەو، کە ئەوەیە (کۆرش) ڕۆیشتووە تا گەیشتۆتە بەشی خۆرئاوای زەوی‌و لە کاتێکدا بووە، کە پایتەختی (لیدیا)ی فەتح کردووە، کە شاری (ساردیز) بووەو کەوتۆتە سەر دەریای (ئێجە) لە نزیك مـەوقیعی ئێـستای شـاری (ئیزمیر)ی تورکیا.

ئەم ناوچەیەش کە بەشێکە لە دەریای (ئێجە) گرژی‌و نائارامی زۆر تێدا بووە.

دکتۆر (عـبدالعلیم خـضر)یش سروشتی خاکەکەو جوگرافیای ئەم ناوچـەیەی لـە کتێبەکەیدا ڕوون کردۆتەوە، واتە لە کتێبی (مفاهیم جغرافیة في القصص القرآنیـة: قصة ذي القرنین) هەروەها ڕوونیشی کردۆتەوە کە چۆن خـۆر لـەوێوە دەرکـەوتووەو وەکو ئـەوە بـووە، کـە لـە کانیـاوێکی تێکـەڵ لـە قـوڕی ڕەشـدا ئـاوا بووبێـت، لەمبارەیەوە گوتوویەتی:-

(کاتێك کۆرش لەسەر کەنارەکانی دەریای (ئێجە) ڕاوەستاوە (کـە بەشـێکە لـە سنووری دەریایی تورکیا لەسەر دەریای ناوەڕاست) کەنارەکانی وەهـا بینیـوە، کـە ڕێچکەی ئاوی زۆر تێدایە، واتە بەزۆری تووڵەڕێ یەکانی دەریا تێکـەڵی وشـکانی دەبن، یەکێك لە نموونەکانی ئەم تووڵەڕێ یە دەریایی یانەش کەنـداوی (هـرمس)و (مندرێسی گەورە)و (مندریسی بچووك)ە..

کەنداوی (ئیزمیر)یـش بـەقووڵایی سەدوبیـست (١٢٠) کیلۆمـەتر چـۆتە نێـو دەریاکەوەو ئەم چیایانەش لە خۆرئاواو خۆرهەڵاتەوە دەورەیـان لێ داوە، ڕووبـاری (غدیس)یش دەڕژێتە ناوی کە ئاوێکی لێڵ‌و تێکەڵ لە قوڕی گڕکان‌و خۆڵی سووری هەیەو لەسەر بـەرزایی ئەنادۆڵـەوە دەڕژێنـە نێـو ئـەم دەریایـەوە، بەرزایەکەشـی لێژاییەکی درێژو هێواشی بەرەو خۆرئاوا هەیە پێش ئەوەی بگاتە بەشی خۆرئاوا.. هەر بۆیەش خێرایی ڕۆیشتنی ئـاوی ڕووبـاری (غـدیس)بـە ڕێـرەوی دەشـتە پـچڕ پچرەکەی کەناردا بە شێوەی چەندین جۆرە لـەرزین‌و پیچاوپێـچی دابـەزیوو کـاتی

تاریکیشدا لە زیادبوون دایە تا دەگاتە ئاستی بنکەی دەریای (ئێجە)و لەوێشەوە دەڕژێتە کەنداوی (ئیزمیر)ەوە ئەم کەنداوەش لە نێوانی لوتکەی چیاکانی چواردەوریدا نغرۆ بووە، کە بەرزایی لوتکەکانیشی لە نێوان (١٠٠٠-٢٠٠٠) مەتر دایە.

جا کاتێك کۆرش (واتە ذوالقرنین) لەبەردەم چەقی قووڵایی (ساردیز) لە نزیك (ئیزمیر)دا وەستاوە سەرنجی لە گۆی بازنەیی خۆر داوە کە لەکاتی خۆرئاوابووندا دەکەوێتە نێو ئەم کەنداوەوە کە بەتەواوەتی لە چاو دەچێت‌و سوورایی تارمایی یە سوورەکەش تێکەڵی ئەو قوڕە ڕەشە بووە کە ڕووباری (غدیس) هەڵی دەداتە نێو چەقی (چاو)ی کەنداوی ئیزمیرەوە، هەر بۆیەش بە پێی ڕاوبۆچوونی ڕاست‌و دەرهاوێژراو پێ‌دەچێت ئەم دیاردەیەی (العین الحمئة/ کانیاوی تێکەڵ لەو قوڕی ڕەشە) بێت کە قورئانیش باسی لێ کردووە[١].

## کاری سەربازی (کۆرش) لە بەشی خۆرهەڵات دا

لە خۆرهەلاتی وڵاتی (فارس)دا چەند تیرەیەکی نەفام‌و بێ سەروبەرەی کۆچەری نێو بیابان دەژیان‌و جاروبار هەڵیان دەکوتایە سەر سنووری وڵاتی فارس‌و فەسادو پشێویان تێدا دەنایەوە.. جا دوای ئەوەی (کۆرش) لەبەشی خۆرئاوای زەویدا بەسەر یۆنانیەکاندا سەرکەوت، ڕووی کردە بەشی خۆرهەڵات تا ئەو تیرە دڕندانەش تەمێ بکات، ئیدی بەنێو وڵاتەکانی خۆرهەڵات داڕۆیشت‌و وڵات بە وڵات فەتحی دەکردن تا گەیشتە ڕووباری (سند)و هەرێمەکانی (اصفهان)و (جوزجان)و (خوراسان)ی بڕی‌و بە هەموو ڕووبارەکانی (زیندە)و (گورگان)و (قاروون)و (کووخە)و (قوم)دا

---

١) (ذوالقرنین)ی (محمد خیر یوسف) ص (٢١٨-٢١٩) کە لە کتێبەکەی دکتۆر (عبدالعلیم خضر)ەوە هێنراوە.

تێپەڕیو لە ناوچەکانی فتوحاتیدا گەیشتە (بەلخ)و ناوچەی (موکران)و (بلووجستان) دیارە ئەم هۆزو تیرانەش کۆچەری بوونو نیشتەجێی نێو ماڵو تەنانەت نێو شارەکانیش بوون، هەر بۆیەش ماڵێك، یان خانوویەکی وایان نەبوو، کە لە تیشکی خۆر بیانپارێزێت لە کاتێکدا هەتاویان دەچێتە سەر یان لەکاتی تاوسەندنی گەرمادا[1].

## کاری سەربازی (کۆرش) لە بەشی باکووردا و، بنیاتنانی بەربەستەکەی بەردەم (یەئجووج و مەئجووج)

دوای ئەوەی (کۆرش) هەر یەکە لەبەرەی ڕۆژئاوا، بەرەی ڕۆژهەڵاتو، بەرەی باشووریشی هێمنو ئارام کردوەوەو، لە کاتێکیشدا مەملەکەتی (بابل)ی فەتح کرد، ڕووی کردە بەری باکوور تاکو ئەوێش لە مەملەکەتەکەیدا هێمنو ئارام بکاتەوەو خراپکارانی تێدا نەهێڵێت. ناوچە باووڕی یەکانی ئەو مەملەکەتەیشی لە (ئازەربایجان)و (گورجستان)و (ئەرمەنستان) پێك هاتبوون کە دەکەونە باشووری چیاکانی (قەفقاز)ەوە. سنووری بەرەی باکووریش بە بەربەستێکی سرووشتیو ئاسایی لەبەردەم ئەو هۆزە شەڕانگێزەو دڕندانەدا، دەنرێت کە لەو دیو بەربەستەکەوە دەژیان، هەروەها ئەم بەربەستە سرووشتییە لە دەریای (قەزوین)ەوە یان لە دەریای (خزر)ەوە لە ڕۆژهەڵاتدا دەست پێدەکاتو شاری (دەربەند)ی دەکەوێتە سەرو پاشان تا چیای (قەفقاز) لە ناوەڕاستداو، ئینجا دەریای ڕەش لە ڕۆژهەڵاتدا کەشاری (سوخوم)ی دەکەوێتە سەر.

لەم بەربەستە سرووشتییەشدا کە بەربەستێکی (دەریاییو شاخاویشە) ڕاڕەوێك (مەمر)ێك لە باکوورەوە تا باشوور بەدی ناکرێت تەنها ئەو ڕارەوە تەنگەبەرە نەبێت

١) (ویسألونك عن ذي القرنين): ص(١٣١-١٣٢) و، (ذوالقرنین)ی ـیوسف/ ص(٢٢٠).

که له ناوەڕاستی چیاکانی (قەفقاز)ەوەیەو بەتەنگەبەری (داریال) ناوبراوە، له باشووری چیاکانی قەفقازیشەوە هۆزەکانی (کوشیا) نیشتەجێ بوون، له باکووری چیاکانیشەوە چەند هۆزێکی شەڕانگێزی (مەغۆلی) هەبوون کە بەهۆزەکانی (ماساجیت) ناوبراون، یان وەك له قورئاندا باسکراون بە هۆزەکانی (یەئجووج)و (مەئجووج) ناوبراونو ئەمانەش بەتەنگەبەری (داریال)و بەنێوە ڕاستی چیاکانی قەفقازدا دەپەڕینەوە تاکو خراپەو شێوانو فەسادی لەسەر زەوی بلاوکەنەوە.

جا کاتێك (کۆرش) گەیشتۆتە لای هۆزەکانی (کۆشیا)و کە ئەو گەلە بوون لە قورئاندا وا ناوبراون کەوا بەهۆی دواکەوتەییو نەفامییانەوە هیچ ژیریو تێگەیشتنێکیان نەبووە (لا یکادون یفقهون قولا) ئیتر هەر ئەمان سکالای مەینەتیو گرفتاریی خۆیان لەدەست هێرشەکانی (یەئجووجو مەئجووج) لەلای (کۆرش) کردووە، (کۆرش)یش خوازیاری ئەوەبووە نەهێڵێت (یەئجووجو مەئجووج) بگەنە ئەو ناوچانە، بۆیە نۆساڵ لەو هەرێمەدا ماوەتەوەو تەنگە (مضیق)ی (داریال)ی داخستووە کە (یەئجووجو مەئجووج) بەکاریان دەهێناو، هەر لەسەر ئەم تەنگەیەش ئەو بەربەستەی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووە، بنیات ناوە(١).

١) (و یسألونك عن ذي القرنين): (ص١٣٢-١٣٤)و، (ذوالقرنين)ی (محمد خير) ص (٢٢٢-٢٢٣).

# هەر بەربەستەکەی (ذوالقرنین)ە
# کە لەسەر تەنگەی (داریال) بنیات نراوە

ئەو بەربەستەی کە (ذوالقرنین) واتە (کۆرش) بنیاتی ناوە هەر ئەوەیە کە لەسەر تەنگەی (داریال) لە ناوەڕاستی چیاکانی (قەفقاز)دا دروست کراوەو ڕاگیراوە.

(قاسمی) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی ئەو بەربەستە، گوتوویەتی:

(ڕای ڕاست ئەوەیە ئەم بەربەستە لە هەرێمی (داغستان)ی سەر بە وڵاتی ڕووسیاو، لە نێوان هەردوو شاری (دەربەند)و (خوزار)دا بێت، چونکە لە دێر زەمانەوە تەنگەیەکی بەناوبانگ لە نێوانیاندا هەبووەو، لەلای زۆربەی نەتەوە دێرێنو تازەکانیش بە (بەربەست) ناوبراوەو، جێگەیەکی بەناوی (دەرگای ئاسن)ەوە تیادایەو، ئەمەش شوێنەواری بەربەستێکی کۆنی نێوان دوو چیا لە چیاکانی (قەفقاز)ە، کە لەلای عەرەبەکان بە (کێوی قاف) ناسراوەو ئەمانیش وەك گەلانی تر گوتوویانە بەربەستێکی تێدایەو، لەو بڕوایەشدابوون، کە لە کۆتایی سەرزەوییە ئەمەش بەپێی ئەو زانیارییەی، کە پێیان گەیشتووەو، کە لەپشت ئەو ناوچەیەوە هەردوو هۆزی (یەئجووجو مەئجووج) هەیە)[1].

هەروەها دکتۆر (عبدالعلیم خضر) سرووشتی چیاکانی (قەفقاز)ی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، کە بەربەستەکەی لەسەر بنیات نراوەو، لەم ڕووەوە گووتوویەتی:

(چیاکانی قەفقاز چەند زنجیرە شاخێکی درێژبۆوەی گەورەنو، زۆر بەرزنو، بە سەختی —مرۆڤ پیایان دا دەڕوات-و هیچ ڕاڕەوێکیان نییە، تەنها یەك ڕاڕەو نەبێت، کە ئەویش (تەنگەی داریال)ە، لە ناوەڕاستداو هەر بەو ڕاڕەوەشدا لقێك لە

---

١) (ذوالقرنین)ی (محمد خیر یوسف) —ص- (٣٣٣ ، کە ئەویش لە تەفسیری (القاسمي) لە بەرگی (١١) لاپەرە (٤١١٣-٤١١٤)ەوە هێناویەتیی.

لقەکانی ڕووبارە بەرزەکەی (ترك) دەڕوات، شاخەکانیش هێندە درێژ دەبنەوە، تا دەگەنە ئەوەی خەریکە بەر شەپۆلەکانی دەریای (قەزوێن) لە ڕۆژهەلاتدا بکەونو، لە خۆرئاواشدا بەر ئاوی (دەریای ڕەش) کەوتوون، ماوەی درێژبوونەوەکەشیان دەگاتە (١٢٠٠)کم. هەربۆیەش بە بەرزترینی هەموو چیاکانی ئەوروپا لەکەرتی خۆرهەلاتەوە دادەنرێن، بەهیچ شێوەیەك تێپەڕبوونیش پیایاندا مسۆگەر نیە، تەنها لە ڕاڕەوەی (داریال)ەوە نەبێت)[١].

## هەبوونی کانزا لەو ناوچەیەدا

قورئان ئاماژەی بۆ ئەو مادەیەش کردووە، کە بەربەستەکەی لێ دروست کراوە، کەوا (ذوالقرنین) بێگومان ئەم بەربەستەی لە چەند پارچەیەکی ئاسنی تواوە بنیات ناوەو، لە هەمان کاتدا مسی تواوەشی بەسەردا کردووەو، ئیدی ئاسنو مسەکە هێندە بەرزبوونەتەوە تا گەیشتوونەتە ئاستی بەرزایی نێوان هەردوو لووتکەی چیاکان..

داخۆ -(ذوالقرنین)/ کۆرش) ئەم بڕە هەرە زۆرو گەورەیەی لە ئاسنو لە مس لەکوێ بووبێت؟ (دکتۆر/عبدالعلیم خضر) لەبارەی ئەو ناوچەیەوە گووتویەتی:-

(کەرەسەی خاوی ئاسن لەو ناوچەیەدا هەیەو، زەویو زاری (ئازەربایجان)یش بڕێکی هێجگار زۆرو گەورەی لە ئاسنو کانزا ئاسنیەکانی تێدایە. بەڵگەی ئەوەش پەیدابوونی پیشەسازی ئاسنو پۆلایە لەمڕۆدا لە شاری (باکۆ)ی پایتەختی کۆماری (ئازەربایجان)، جا ئەگەر ئەمڕۆ ئەم هەرێمە بە ئاسن دەوڵەمەند بێت، ئەوە بێ هیچ گومانێك لە ڕابردوودا دەوڵەمەندتر بووە.

---

١) -ذوالقرنین-ی (محمد خیر یوسف)- ص(٣٣٤)، کە لە لاپەرە (٢٩٦)ی کتێبی (مفاهیم جغرافیة)ی -عبدالعلیم خضر-ەوە هێناویێتی.

(ئەرمەنستان)یش بە کانزاکانیەوە دەوڵەمەندەو، بەتایبەتیو بەبڕێکی زۆر کەرەسەی خاوی ئاسنو مسو ڕەساسو زەرنیخو بەردی (زاخ)و گۆگردو ئاڵتونی تێدایە. لەم بارەیەوە مێژوونووسی ئەرمەنی (لیۆنتیۆس) ئەوەی بەدیارخستووە کەوا چەند نیشانەو هێمایەکی خاکەکەیان بەڵگە دەدەن لەسەر ئەوەی چەندین ناوچەی هەڵکەندراو لە چیاکاندا هەبوونو، ئاماژە بۆ ئەو حاڵەتەی دانیشتوانە کۆنەکان دەکەن کە لەبەر ئەوەی بڕێکی زۆریان لە ئاسنو کانزاکانی دەشتەکان بەبێ ماندووبوونێکی زۆر دەرهێناوەو هیچیان تێدا نەهێشتووە، ئینجا پەنایان بردۆتە بەر قەدپاڵی چیاکانو دۆزینەوەی کانزاکان تیایداو چاڵی گەورە گەورەیان لێ هەڵکەندوون، پێکهاتە جیۆلۆجی (زەمین ناسی)یەکانیش ئاماژە بۆ ناوچەکانی (بابرت ئەرغەنی) دەکەن کە بەکەرەسەی خاوی ئاسن دەوڵەمەندەو بڕێکی زۆریشی تێدایە، هەروەك لە (گورجستان)یش بڕێکی فرە لە ئاسن هەیە، تورکیاش لە سنووری ناوچەیەکی هاوسێی ئەرمەنستانەوە هەرێمێکی بەناوبانگی ئاسنی هەیە کە بڕی یەدەك (احتیاطی)ەکەشی بە نزیکەی بیستو پێنج ملیۆن تەن مەزەندە دەکرێت. سەبارەت بەبوونی ئەو خەڵووزو تەختەیەش کە بۆ تواندنەوەی ئاسن پێویستن ناوچەی (کلاکنیت)ی ئەرمەنستان بڕێکی یەدەکی گەورەی تێدایە، لە کەنارەکانی (دەریای ڕەش)یشدا کانەکانی (زونهەڵداك) بە ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندی کەرەسەی خاوی خەڵووز دادەنرێت.

سەبارەت بە تەختەش (ابن حوقل) لەمبارەیەوە باسی ئەوەی کردووە کەوا هەرێمی (ئەردەبیل) باخو بێستانو ڕووبارو ئاوێکی زۆرو داروتەختو میوەیەکی هێجگار زۆرو فرەی هەیە. لەڕووی زانستیو مێژووییشەوە سەلمێنراوە کەوا کەرەسە خاوەکانی (مس) لەو هەرێمەدا زۆرە، لەم بارەیەوە توێژینەوە زەمینناسییە نوێیەکان سەلماندوویانە کە (مس) بەشێوەیەکی زۆرو فرە لە پێکهاتە خاکی یەکانی (زنجان)و (ئاناراك)و (باکووری ئەسفەهان)دا هەیەو لە (باشووری ئازەربایجان)دا بەبڕێکی هێجگار زۆر هەیە..

له (ئەرمەنستان)یشدا هەر لەدێر زەمانەوەکانە گەورەکانی مس زانراون‌و بووەته بەڵگەو شاهید لەسەر ئەوەی کەوا دانیشتوانه کۆنەکانیشی دەریان هێناوە، له ڕووی بوونی ژمارەی پێویست له ئاژەڵانی جووت‌و بارهەڵگرەوە، ئەوە دیارە کە هەرێمەکە دەوڵەمەندە به سامانی لەوەڕگاو ئاژەڵ، چونکه ئەم هەرێمە لە نێوان هەرێمی دەریای ناوەڕاست له ڕۆژئاواوەو، هەرێمی چین له ڕۆژهەڵاتەوە، بەندە.

هەروەها حوشتریش لەوێ هەبووەو لەجۆری دوو (سەنام/ لووتکە)ی لیٚ بووەو ئاژەڵی (ئیلیاك)یشی هەیە کە دانیشتوان لە گواستنەوەدا بەکاریان هێناوەو، بەتەواوەتی وەك گوێدرێژ (کەر) بووەو، بەڵام جیاوازیی لەگەڵ کەردا لەوەدایە کە چەند نینۆکێك له هەردوو پێی هەیەو ئەمەش یارمەتیدەریەتی بۆ سەرکەوتن بەسەر بەرزاییەکانداو بۆهات‌و چۆ بەبارەکانی سەرپشتیەوە تیایاندا.. هەروەها لەدێر زەمانەوە دەیان هەزار ئەسپی (سیسی)ی تێدا بووە کە ناسراون بەوەی توانایەکی زۆریان له هەڵگرتنی قورسایی‌و له ڕاکێشانی عەرەبانەدا هەیە.

له ڕووی هەبوونی ئازووخەش بۆ خزمەت‌و بەکاربردنی کرێکاران‌و ئەندازیاران چەندان جۆر خۆراك‌و خواردنی شلەمەنی یان هەبووە، چونکه ئەم هەرێمە لە دەیان هەزار ساڵ لەوەو بەرەوە هەموو جۆرە دانەوێڵەیەکی هەبووەو ناسیوە وەك لە سەرچاوەی جوگرافیای مێژوودا هاتووەو لەنێو ئاسەوارە کۆنەکاندا دۆزراونەتەوە، هەروەها چەندین دەفری شووشەیی ی پڕ لەدانەوێڵەو کەرەسەی تر دۆزراوەتەوە.. پاشان (ئەرمەنستان) بە (بەپیتترین موڵکی خەلافەتی عەبباسی) دادەنرا.. باسی ئەوەش کراوە کە ناوبانگی ئەم هەرێمە بە ماسییەوە (وەك داهاتێکی خۆراکی) بۆ دانیشتوانەکەی‌و بۆ هەناردەکردنیشی (تصدیر) بیٚ وێنە بووە.

دۆڵەکانی ئەم هەرێمە گەورەیەش بە دارستانی درەختە بەردارەکانی، قەرەباڵغ بووە. (داغستان)یش بەپلەی یەکەم لە چاخە کۆنەکانەوە تا ئەمڕۆ وڵاتێکی کشت‌و

کاڵی بووە.. ئاووهەوای (گورجستان)یش لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە بۆ چاندنی دانەوێڵە گونجاو بووە)[1].

بەم ڕەنگە بۆمان دەردەکەوێت، کە ناوچەی بەربەستەکە بۆ بنیات نانی ئەو بەربەستە لەسەری شیاوو گونجاو بووەو، توانراویشە، کە هەر لەو ناوچەیەدا هەموو جۆرە پێداویسی یەکی خۆراكو خواردنەوەو هۆیەکانی گواستنەوەو، کەرەسەی خاوی پێویست لە تەختەو خەڵوزو مسو ئاسنو کانزاکانی تر بۆ ئەو کەسانە دابین بکرێت، کە بەربەستەکەیان دروست کردووە. هەروەها بۆمان دەردەکەوێت، کە تەنگەی (داریال)یش شوێنێکی گونجاو بووە بۆ بنیاتنانی بەربەستەکە لەسەری، ئەمەش لەبەر تەنگییەکەیو بەندبوونی لە نێوان دوو چیاداو بەرزایی هەردوو چیاکانیش لەسەر هەردوو لایەکەی. هەر بۆیەش زۆربەی زانا پێشینەکان ڕای یەکلاکراوو هەرەڕاستیان ئەوەیە، کە (ذوالقرنین) بەربەستەکەی لەسەر تەنگەی (داریال) لە چیاکانی (قەفقاز)دا بنیات ناوە.

## ئاسەواری پەیکەرێکی (کۆرش)

(مولانا-ابوالکلام ازاد)و لەگەڵیشیدا، دکتۆر (عبدالعلیم عبدالرحمن خضر) ڕای یەکلاکراوەیان لەسەر ئەوەیە، کەوا (کۆرشی فارس) ئەو (ذوالقرنین)ە نێوبراوەی قورئانەو، ئەو بەربەستەش، کە لەسەر تەنگەی (داریال) بنیاتی ناوە، هەر ئەو بەربەستە باسکراوەی نێو قورئانە. هەر ئەم دوو زانا لێکۆڵەروساغکەرەوەیەش لەو بڕوایەدان، کە سیفەتەکانی (کۆرش) وەك ئەو سیفەتانەیە، کە قورئان دەربارەی (ذوالقرنین) هێناویەتی، تەنانەت لەو بڕوایەدان، کە هەر ئەو وەسفەی قورئان بۆ (ذوالقرنین) لە خودی (کۆرش)دا بەدی هاتووە.

---

١) کتێبی (ذوالقرنین)ی -محمد خیر یوسف- ص (٣٣٦-٣٣٨)، کە لە کتێبی (مفاهیم جغرافیة)ی (عبدالعلیم خضر)ەوە هێنراوە..

(ابوالکلام ازاد) بەڵگەی خۆی لەسەر ئەم بۆچوونە ئەوەیە: کە (کۆرش) بە نازناوی (ذوالقرنین) ناو براوە، چونکە هەردوو مەملەکەتی (میدیا)و (فارس)ی لەیەك وڵات دا کردووە بەیەكو هەریەکەشیان بە وڵاتێك شوبهێنراون، جا کاتێك هەردوو مەملەکەتی یەکخستووە، نازناوی (ذوالقرنین)ی بۆ دانراوە، بەمانای (خاوەنی دوو وڵات)، گرنگترین بەڵگەی (ابوالکلام) لەم بارەیەوە ئەو پەیکەرەیە، کە زانایانی ئاسەوار دۆزیویانەتەوەو بە پەیکەرێك بۆ (کۆرش- فارس)ی لەقەڵەم دەدەن، لەم ڕووەوە (ابوالکلام ازاد) گوتوویەتی: (ئەم کەرەسە دۆزراوە گرنگەی ئاسەوار، پەیکەرێکی بەردینی خودی (غۆرش)ەو لە شوێنێکدا دۆزیویانەتەوە، کە نزیکەی پەنجا میل لە پایتەختی کۆنی ئێران (ئیستە خەر)ەوە دوورەو لەسەر ڕۆخی ڕووباری (میرغاب) دانراوەو، پێشتر (جیمس مۆریر) دۆزی یەوەو هەواڵی وجودی ئەو پەیکەرەی بەخەڵکی گەیاندو، چەند ساڵێك لەدوای ئەویش (سێر ڕابرت کەیر پۆرتر) هاتو شوێنەکەی پێواو بەوردی پشکنیو، وێنەیەکی پەیکەرەکەی بە قەڵەمی (ڕەساس) کێشا، ئەمەش لەبۆتەی کتێبی گەشتنامەکەیدا بۆ ئێرانو جۆرجیا، پاشان (قەشە/ فۆرستەر) لە ساڵی (١٨٥١)دا دەربارەی ئەو پەیکەرە وتەی خۆی دەربڕیوەو کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر دەقەکانی تەورات، هەروەها وێنەیەکی پەیکەرەکەشی کە (لەوێنەی یەکەم جار) ڕوونتر بووە، بڵاوکردۆتەوە، هەرچەندە تا ئەو کاتەش بەتەواوەتی پەردە لەسەر هێڵی بزماری لانەبرابوو، کەچی بڕیار لەسەر ئەوە درا گوایە ئەوە پەیکەری (سائیرس)ە. واتە هی (غورش)ە، نەك یەکێکی دی، توێژینەوە نوێ یەکانی ئەم دوایی یەش بەجۆرێك پشتگیری ئەم بڕیارەیان کردووە، کە هیچ بوارێکی بۆ گومان لێ کردن تێدا نەماوەتەوە.

پاشان کاتێك نووسەری بەناوبانگی فەڕەنسا (دی لافوای) کتێبەکەی خۆی دەربارەی ئاسەوارە کۆنەکانی ئێران نووسیو بڵاوکردەوە، وێنەیەکی فۆتۆگرافیی ئەو پەیکەرەشی تیا دانا بوو، ئیتر خەڵکیش بەتەواوەتی ئەو وێنەیان ناسی یەوە، کە پێشتر بەدەست کێشرا بوو. هەروەها (ابو الکلام ازاد) وەسفێکی بۆ پەیکەرەکە

تۆمار کردووەو، گوتوویەتی: (ئەوە پەیکەرێکە لەسەر شێوەی جەستەی مرۆڤ و، تیایدا -غۆرش- دەرکەوتووەو، لەسەر هەردوو لای جەستەشی دووباڵ وەك هەردوو باڵی هەڵۆ هەیەو لەسەر سەریشی دوو شاخی وەك هەردوو شاخی بەران هەیەو، دەستی ڕاستیشی درێژکراوەتەوەو ئاماژەی بۆ پێشەوە پێکردووەو، بەرگو پۆشاکیشی هەمان ئەو بەرگە زانراوەیە کە لەوێنەی پادشاکانی (بابل)و (ئێران)دا دیومانن. ئەم پەیکەرەش بێگومان ئەوە دەسەلمێنێت کەوا وێناندنی (ذوالقرنین) لەسەر (غورش)یش دروست بووە، هەر بۆیەش پادشاکە لەو پەیکەرەدا بە دوو شاخی سەرهەردوو لای سەرتاییەوە دەرخراوە.

کەی پەیکەرەکە دروست کراوە؟ ئەی کێ دروستی کردووە:- لەم ڕووەوە (ئازاد) دەڵێت: (بەڵام ئاخۆ کەی پەیکەرەکە دروست کرابێت؟ ئەوە هەر بەفەرمانی (غورش) لەژیانیدا یان بەفەرمانی جێنشینێك لە جێنشینەکانی دوای خۆی، کە بەئاسانی ڕوون ناکرێتەوە، دروست کراوە.. پایتەختی (عیلامییەکان)و (فارسەکان)یش شاری (سوسان) بووە کە ئەمڕۆ بە (ئەهواز) ناودەبرێتو، ئەم شارەش کەوتۆتە باشووری وڵاتی ئێرانەوە. پایتەختی (مادا) واتە (میدیا)ش شاری (هیغ متانا) بووە، کە عەرەبەکان دەسکاریی ئەم ناوەیان کردووەو بە (همذان)-یان (هەمەدان).

هەروەها دەڵێت: (وا دەردەکەوێت، کە پەیکەرەکەی (غورش) لە سەردەمی (شا ئەردەشێر)دا دانرابێت، چونکە سەکۆیەکی بەردین ماوەتەوەو پەیکەرەکەیان لەسەر ڕاگیر کردووە)[1].

---

١) کتێبەکەی (ابوالکلام ازاد) بەناوی (ویسألونك عن ذي القرنین)، ل(١٠١-١٠٣)، هەروەها بڕوانە وێنەی پەیکەرەکە لە لاپەرە (١٠٤)ی ئەو کتێبەدا.

## كۆتـايی ژيانی (كۆرش) و ئیمـپراتۆرێتیـیەكەی

(كۆرش) لە ساڵی (٥٥٩پ.ز)دا حوكمی گرتۆتە دەستو لـە هـەر سـێ بـەرەی ((خۆرئاواو خۆرهـەڵاتو بـاكوورەوە)) فتوحـاتو ڕزگـاركردنی وڵاتـانی بەئـەنجام گەیاندووە. هەروەها حوكمی وڵاتەكانی (فارسو شـامو میـسرو عێـراقو ئاسـیای بچووكو خۆرهەڵاتی فارسی) لەماوەی سی سـاڵدا كـردووە، حـوكمی پادشـایی ی خۆیشی لەڕادەیەك دا بووە كە هیچ حاكمێكی تری وەك خۆی هێندە لەو زەمانـەدا حاكم نەبووە، ئـەو وڵاتانـەش كـە بـەپێی (پۆلێنكـاری هاوچـەرخ) حـوكمی تێـدا كردوون" (فەلەستینو ئـەردەنو لوبنـانو سـوریاو توركیـاو ئێـرانو ئەرمەنـستانو توركستان بووە.. وادیارە هـەر لەبـەر ئەمـەش بـە (ذوالقـرنین) نـاوبراوە. پاشـان (كۆرش) لە ساڵی (٥٢٩ پ.ز) كۆچی دوایی كردووە.

لەدوای كۆچی دواییشی، كوڕەكەی خۆی بەناوی (كەمبۆشیا) یان (قـەمبیز) - بەزمانی عەرەبەكان- جڵەوی حوكمی گرتۆتە دەستو ڕووی كردۆتە (میـسر)و، لـە سـاڵی (٥٢٥.پ.ز)و دا فـەتحی كـردووە. بـەڵام شۆڕشـێك لـە دژی بـەرپا بـووەو دانیشتوانی مەملەكەتی (میدیا)ش بەسەركردایەتی (غۆماتا) لێی هەڵگەڕاونەتەوە. بۆیە (قەمبیز) لە (میـسر)ەوە گەڕاوەتـەوە بـۆ ئـەوێ تـاكو ئـەو شۆڕشـەی تێـدا سەركوت كات، بـەڵام لـەكاتی وجودیـدا لـە (شـام) كۆچـی دوایـی كـردووە. جـا لەبەرئەوەش كەوا (كۆرش) كوڕی تری جگە لەمە نەبووە، خەڵكی وڵاتـی (فـارس) ئامۆزاكەی ئەو (واتە/ دارایۆس)، یان (داریوس)، یان كردۆتە پادشای خۆیان. دوای مردنی (داریوس)یش، (ئەردەشیر) جڵەوی حوكمی گرتۆتە دەسـت، ئـەمیش واتـە: (ئەردەشیر) ئەو پادشایەیە كە (ئەسكەندەری مەكدۆنی) هێرشـی كردۆتـە سـەریو كوشتوویەتی، ئیدی دەستی بەسـەر ئـەو ئیمپراتۆرێتییـەدا گرتـووە كـە (كـۆرش) دایمەزراندبوو)[1].

---

١) (و يسألونك عن ذي القرنين) ص(١٢١-١٢٤).

## ڕەوشتەکانی (کۆرش) و ڕەوشتەکانی (ذوالقرنین)

قورئان ئاماژەی بۆ ڕەوشتەکانی (ذوالقرنین) کردووە، (ابوالکلام ازاد)یش ڕوونی کردۆتەوە کەوا ئەم وەسفانە لە (کۆرش)و حوکمەکەیدا هەبوون، وەك دەڵێت:

((ذوالقرنین) پیاوێکی دادپەروەر بووە لەنێوان خەڵکیدا، هەر بۆیەش خودا کردوویەتی بە دادوەر (حەکەم) لە نێوانیاندا کە بەخواستی خۆی هەرچی یەکیان لێ دەکات، بیکات: (اما ان تعذبهم، واما ان تتخذ فیهم حسنا).. بێگومان، (کۆرش) ڕێگەیەکی پڕ لەدادو عەدالەتو چاکەو ڕەحمەتی لەمامەڵەدا لەگەڵ وڵاتە فەتح کراوەکاندا گرتبووەبەر، وەك لە فەتحو ئازادکردنی مەملەکەتی (لیدیا-ی یۆنان)و، مامەڵەی لەگەڵ پادشاکە یان (کرۆسیس)دا کە عەفوویشی کردو بەڕەحمو چاوپۆشی یەوە هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ دا کرد.

مێژوونووسەکانیش، چ ئەوانەی کە دۆستی (کۆرش) بوون یان دوژمنی بوون، ستایشی دادگەریو لەخۆبوردوویی ئەم پادشایەیان کردووە کە چۆن مامەڵەی جوانی لەگەڵ دوژمنە یۆنانییەکانیدا کردووە.. بۆ نموونە مێژوونووسی یۆنانی (هیرۆدۆتیس) گووتویەتی:- ((غورش) پیاوێکی بەخشندەو چاکە خواز بووەو زۆر لێبوردووش بووە، وەك پادشایانی تر خوازیاری کۆکردنەوەی ماڵو سامان نەبووە، بەڵکو زیاتر لەسەر بەخشندەیی وڕێزلێنان سوور بووەو، دادو عەدالەتی بۆ مەزلوومان دابین کردووەو هەرچی خێرو چاکەیە بۆ مرۆڤی خواستووە). هەر لەم ڕووەوە مێژوونووسێکی تری یۆنانی کە (زینۆفن)ە گوتوویەتی: (ئەو، پادشایەکی ژیرو میهرەبان بووەو وێڕای ئەوەی ڕەوشتە جوانەکانی پادشایانی تێدا بووە، سیفەتە بەرزەکانی دانایانیشی تێدا کۆبۆتەوە، وەك ئەوەی کە لە ورەو هیمەتیدا گەورەیی زیاتری دەرکەوتووەو، لە چاکەو پیاوەتیدا بەسەر شکۆی پادشایەتی دڵ زاڵ بووەو، خزمەتی مرۆڤایەتیش بووەتە دروشمێکی و، بەکارهێنانی دادگەریو

عەدالەتیش بۆ ستەم لێکراوان نەریتی دیاری بووە، ئیدی ئەو لەخۆبوردوویی‌و چاوپۆشی یەشی، جێی خۆ بەگەورەدانان‌و بەخۆنازینی بۆ گرتۆتەوە)[1].

بەڕاستی دادپەروەریی‌و لێبوردەیی (كۆرش) هەردوو مێژوونووسە دوژمن‌و ناحەزە یۆنانییەکە (هێرۆدۆتیس)و (زینۆفن)یشی هێناوەتە قسەو، شاهیدیی ئەو نەریتە بەرزانەیان بۆ داون.. هەر بۆیەش شاعیرەکە ڕاستی پێکاوە کە گوتوویەتی:-

ومليحة شـهدت بها ضـراتها ‌ ‌ ‌ ‌ والفضل ما شهدت به الاعداء

## (كۆرش) ئیمانی بەخودا هەبووە

قورئانی پیرۆز بەڕاشکاوی‌و بەڕوونی ئەو ڕاستییەی بەدیار خستووە کەوا بێگومان (ذوالقرنین) ئیمانی بەخودا هەبووەو، دەم بەزیکرو یادی خودا بووەو، سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی بووەو، دانی بە فەزڵ‌و چاکەی خوادانـاوە. (ابـوالکلام ازاد)یش هەڵوێستەی لە ئاست بیروباوەڕی (كۆرش)دا کردووەو ڕوونیشی کردۆتەوە کە ئەو خواناس‌و خوا بەیەك گر بووەو، پەرستیارو عابیدێکی تەواوی خوداو، دڵسۆزێکی دیاری ئاینەکەی بووە، (كۆرش) لەسەر ئاینی (زەردەشت) بووەو، زەردەشتیش لەسەر دینی خوا بەیەك دانان‌و (تەوحید) بووە، هەروەها (كۆرش) پێشتر ئاینەکۆنەکەی مەملەکەتی (میدیا)ی پشتگوێ خستووە، چونکە ئاینی ئاگرپەرستی (مجوسی) بووە.. کاتێك (كۆرش) کۆچی دواییشی کردووە، ئاگر پەرستەکان شۆڕشێکیان لەدژی دینەکەی (زەردەشت) بەرپاکردووەو، بەڵام (داریۆش) شۆڕشەکەیانی لەناوبردووە، (زەردەشتی یەکان) لەسەردەمی ژیان‌و حوکمرانی (كۆرش)دا ئیمانیان بەخودا هێناوەو خواناس‌و خوا بەیەکگربوون.. بەڵام دوای ئەو سەردەمە برێکی زۆر لە دینی ئاگرپەرستیی تێکەوتووەو دزەیان بۆ نێو

---

١) (و يسألونك عن ذي القرنين) –ص(١٣٩).

دینه ڕەسەنەکەیان کردووەو، ڕێبازی خوا بەیەك دانانەکە (توحید)یان تێکەڵی شیرك‌و کوفر (هاوەڵ بۆ خوا دانان‌و بێ باوەڕی) کردووە.

ئیدی بەناوی (مجوس/ واتە ئاگرپەرستەکان)ەوە ناسراون‌و، موسڵمانانیش بنچینە ڕاست‌و دروستەکەی ئەم ئایینە ئاسمانی‌و پەیامە زەردەشتییەکەشیان (یان ئاگر پەرستە تازەکانیان) بیر نەچۆتەوەو زانیاریان هەبووەو بەڵام دواتر شێواندوویانە، وەك پێغەمبەری خوداش ﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ((**سنوا بهم سنة اهل الکتاب**)).. واتە مەماڵەتان لەگەڵ زەردەشتی یەکانیش دا وەك مامەڵەتان لەگەڵ ئەهلی کیتاب (جوولەکەو دیانەکان)دا بێت.. هەر بۆیەش موسڵمانان سەرانە (جزیە)یان لێیان وەردەگرت، وەك چۆن لە ئەهلی کیتاب (واتە جوولەکەو دیانەکانیان) وەردەگرت.

ئەمەش مانای وایە ئیسلام دان دەنێت بەوەدا کە ئایینی (زەردەشتی)یش ڕیشەیەکی ئاسمانی ی هەیە، وەك ئایینی جوولەکەو مەسیحی، بەڵام ئیسلام دان بە پەیڕەوکردنیان دانانێت، چونکە دەسکاری‌و ساختەکاریی یەکی زۆریان بەسەردا هێنراوەو، کفرو شیرك‌و هاوەڵ بۆ خوا دانانیان تێکەوتووە.

بێگومان (ابوالکلام ازاد) لەو بڕوایە دایە کەوا (زەردەشت) پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرانی فارسەکان‌و، (کۆرش)یش لەسەر دینەکەی (زەردەشت) بووە بەر لەوەی ئەو دینە بکەوێتە بەر دەسکاریی‌و شێواندنی فارسەکان لەدواییدا)[1].

---

١) -ابوالکلام ازاد- (ویسألونك عن ذي القرنین). ص(١٤٢-١٦١).

## یەئجـووج و مەئجـووج

دوای ئەوەی ڕای ڕاستترو یەکلاکەرەوەمان هێنا لەسەر ئەوەی، کەوا (ذوالقرنین) ئەو (کۆرشی فارسە) بووەو، کەوا بەربەستی (یەئجووج‌و مـەئجووج)یـش، کـە لـە قورئاندا باسکراوە، ئەوەیە کەوا (کۆرش) لەسەر تەنگـەی (داریـال) لـە چـیاکانی (قەفقاز)داو لەنێوان دەریای (قەزوێن)و (دەریای ڕەش)دا بنیـاتی نـاوە، جـا دوای ئەو باسە دێینە سەر باسی (یەئجووج‌و مەئجووج)و شـوێنەکەیان‌و، دەرچـوونیان‌و ئـەو گۆڕانکارییـەش، کـە بەسـەر بەربەسـتەکەدا (لـەدوای ئـەوەی (کـۆرش) لەبەردەمیاندا دروستی کردبوو) هاتووە..

## ((یەئجـووج و مەئجـووج)) لە قورئـان دا..

(یەئجووج‌و مەئجووج) دوجار لە قورئانداو (لە دوو شوێنی قورئاندا) ناوبراون.

یەکەمیان: لە سوورەتی (کهف)داو لەو ئایەتانەدا کە ئێمە لـەم باسـەدا سـەرقاڵی شـیکارو تەفـسیرکردنیانین:- ﴿قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ الكهف﴾.

دووەمیش: لـە سـوورەتی (الانبیـاء)داو لـەم فەرمایـشتەی خـوادا: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ الأنبياء﴾.

واتە:- (هەتا ئەو کاتەی، کە بەربەستەکەی (ذوالقـرنین) لەبـەردەم (یـەئجووج‌و مەئجووج)دا دەکرێتەوەو (کە ئەمەش نیـشانەیەکە لـە نیـشانەکانی هـاتنی ڕۆژی

دوایی)و ئەوانیش واتە: (یەئجووجو مەئجووج) لە هەموو کونو کەلەبەرێکەوە بەشێوەیەکی زۆرو بێشومار پەیدا دەبنو دێنە دەرەوە، ئیدی بەڵێنی ڕاستو هەقی خوداش نزیك دەبێتەوەو سزاو لێپرسینەوەی خودا دەست پێدەکات). ئایەتەکانی سووڕەتی (کهف)یش کە لەم بڕگانەی پێشوودا دیاری کراون، دەربارەی -یەئجووجو مەئجووج- هاتوونو هەواڵی خراپەو شێواندنیان لە زەویدا بە ئێمە دەگەیەننو، باسی دروستکردنی بەربەستەکە لەبەردەمیاندا لەلایەن (ذوالقرنين)ەوە دەکەن کە لە سەردەمی ئەوداو چەند سەردەمێکی دوای ئەویشدا نەیانتوانیوە لە بەربەستەکەوە بێنە دەرەوە یان کونی تێ بکەن. بەڵام ئەم ئایەتانەی سوورەتی (انبياء): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ .. ﴾ دەربارەی بەسەرهاتی (یەئجووجو مەئجووج)ن لە ئایندەدا کە پێش هاتنی قیامەت بەشێوەیەکی زۆرو بە کۆمەڵێکی گەورە دەردەچن، هەواڵی نێو ئەو ئایەتانەش بە وشەی (اذا)یە کە ئاوەڵناوی لەمەودوای زەمانەو (وەك مامۆستایانی ڕێزمانو ڕەوانبێژی)یش گووتوویانە (شرطێکی هێواشکراوی بە جوابێکی (فەتحە لەسەر دانراو) تێدایە. هەروەها ئایەتەکانی سووڕەتی (انبياء) هەواڵی کردنەوەی ڕێگە بۆ (یەئجووجو مەئجووج)، دەگەیەنێت، هەندێك لەزانایانیش ئەو کرانەوەی بەربەستەکەو کردنەوەی ڕێگەکە بەشێوازێکی ماددیو واقیعیانەی هەست پێکراو دادەنێن کە گوایە ئەوان (واتە یەئجووجو مەئجووج) بەربەستەکەی (ذوالقرنين) دەبەزێننو لێوەی دەردەچن، ئەو زانایانە دان بەوە دادەنێن کە ئەمە تەنها لەکاتی پێش هاتنی قیامەتدا دەبێتو، بەربەستەکەش تا ئەمڕۆ هەیەو لەئارادایە، بەڵام ئێمە لێرەدا ڕامان وایە کە ئەم ڕێگا کرانەوەیە بۆ (یەئجووجو مەئجووج) کرانەوەیەکی مەوعنەوییە، نەك ماددیو بەرچاو کەوا بەربەستەکە بەفیعلی ببەزێنرێتو کونی تێ بکرێت.. واتە کاتێك خودا ڕێی دەرچوونیان لە شوێنی خۆیانەوە پێ دەداتو، کە ئەوانیش دێنو هەموو سەر زەویو وڵاتەکان داگیر دەکەن، ئەوە بەدەرچوونە دیارو گەورەکەیان لە پێش

هاتنی قیامەتدا دادەنێن. (خوداش هەر خۆی زاناو ئاگادارە). هەر ئەو ئایەتەش ئاماژەی بۆ هێزی دەرچوونیانو زۆرێتیو زەبەللاحیی سوپاو زۆریی ژمارەیانو شالاوی توندوتیژیان کردووە: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾.. وشەی (حدب) بەهەر بەرزایی یەك دەوترێت کە لەسەر ڕووی زەوی یەوە وەك گردو گردۆلکەو چیا بەرزو بڵند بوویبێتەوە..

وشەی (ینسلون)یش واتە: لە ڕۆیشتن دا زۆر خێراو بەپەلە دەڕۆنو بەدوای یەکتردا دێنو نزیك دەبنەوەو ژمارەشیان هێندە زۆرە، کە هەموو ڕووی ئەو خاکەی داگیر دەکەن، دادەپۆشن. فەرموودە ڕاستەکان (صحیح)یش ئاماژەیان بۆ زۆریی ئەو گەلەو توندو تیژیو هێزی داگیرکاریو ترسو بیمی دەرچوونیان کردووە، ئەوەبوو لە سەرەتای ئەم باسەدا ئەو فەرموودانەمان دەربارەی ئەم بەسەرهاتە دیاری کردو، ئیدی هیچ ئاتاجێك بەدووبارەکردنەوەیان لێرەدا نیە.. هەروەها ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الانبیاء) ئاماژە بۆ ئەو هەواڵەش دەکات، کەوا بێگومان ئەو دەرچوونە گەورەو توندوتیژوماڵکاولکەرەی (یەئجووجو مەئجووج) دوایین دەرچوونو شالاویانەو لەپێش هاتنی ڕۆژی قیامەت دایە، وەکو خوداش هەر دوای ئەمە لەئایەتەکەدا هەواڵەکەی گەیاندووەو فەرموویەتی: ﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ ئەم وەعدو بەڵێنە هەقەش هاتنی قیامەتە، واتە قیامەت بەدەرچوونی ئەمان نزیك بۆتەوەو ماوەیەکی کەم دوای دەرچونیان قیامەت دێت (وەك لە فەرموودە ڕاستەکانیش دا هەواڵی لەسەر دراوە).

## ڕەگ و ڕیشەی هەردوو وشەی (یەئجووج) و (مەئجووج)

زانایانی زمان بیروڕایی لێك جوداو هەمە جۆریان دەربارەی وشەکانی (یەئجووج)و (مەئجووج) هەیە کە ئایا دەرهاوێژراوی وشەو چاوگێکن، یان دوو ناوی بیانین (واتە غەیری عەرەبین)؟! کۆمەڵێك لە زاناکان ڕایان وایە کە دەرهاوێژراون، وەك (ابن منظور)یش لە (لسان العرب)دا ڕاکانیانی هێناوەو، گووتوویەتی: (وشەی یەئجووج، وەك وشە عەرەبی یەکانی تر لە زمانی عەرەبدا دەرهاویژراوەو لە (اجت النار)و (الماء الاجاج)ەوە واتە (پەرەسەندنی ئاگرەکە)و (ئاوێکی سوێرەوە) وەرگیراوە کە سوێری ئاوەکە لەڕادەیەکی وەها توندا بێت کە خەریکە شت بسووتێنێت، وشەی (یەئجووج)یش لەسەر کێشی (وزن)ی (یفعول)ەو، وشەی (مەئجووج)یش: (مفعول)ەو وەك ئەوەی لەتین سەندنی کڵپەی ئاگرەوە بێت، دەشێت کە وشەی (یەئجوج) بکەر (فاعل) بێت هەروەها دەشێت (مەئجووج)یش هەر وابێت.. ئەمە ئەگەر هەردوو ناوەکە (عەرەبی) بن ئەوا دەرهاویشتنو وردکردنەوەیان ئاوا دەبێت، دەنا گەر ناوی بیانیی غەیرە عەرەبی بن، ئەوا لە زمانی عەرەبی دەرناهاوێژرێنو ڕەگو ڕیشەی زمانەوانییان بۆ دانانرێت)[1].

(راغبی اصفهانی)یش دەربارەی وشەی (أج) گوتوویەتی: (بۆ نموونە ((ملح اجاج)) واتە خوێ یەك کە زۆر سوێرو گەرم بێت، ئەمەش وەك لە وتەی عەرەبدا هاتووە: (اجیج النار،واجتها، وقد اجت،وائتج النهار) کە هەموویان مانای پەرەسەندنو تینو گوڕی ئاگرو گەرما دەگەیەنن، وشەی (یأجوجو مأجوج)یش لەو مانایانەوە کە بە (ئاگری هەڵگیرساوو پەرەسەندوو)و (ئاوی شەپۆڵی توند) شوبهێنراون، ئەوەش بەهۆی زۆریی جم وجووڵو لاسارییانەوە)[2].

---

١) (لسان العرب)ی (ابن منظور) بەرگی (٢)، ل(٢٠٧)..
٢) (المفردات)ی (راغب) ص-١٠-.

کۆمەڵێکی تر لەزانایان ڕایان وایە کە ئەم دوو ووشەیە: (یەئجووج)و (مەئجووج) دەرهاوێژراوی چاوگی عەرەبی نین، بەڵکو دوو وشەی بیانینو لە ڕێزمانی عەرەبیدا (ممنوع من الصرف)ن، چونکە لە ناوی عەلەمو وشتە بیانیەکان دان، هەر ئەمەش ڕای ڕاسترو پەسند ترە، چونکە ئەو دوو هۆزەی (یەئجووجو مەئجووج) لە پێش گەلی عەرەبەوە هەبوونو، لە پێش دانانی ڕێزمانی عەرەبیو (مفردات‌و تصریفات‌و اشتقاقات)ی زمانی عەرەبیشەوە لەئارادابوون، ئیدی (هەواو ئارەزووی زمانەوانی) لە زانا عەرەبەکان ناوەشێتەوە، کە بێن‌و ناوە دێرینەکانی پێش زمانی عەرەبی بۆ ڕەگو ڕیشەی ئەو وشە عەرەبییانە ببیننەوە، کە لەپێش خودی زمانی عەرەبیدا هەبوون، بۆ نموونەش ناوەکانی (ئیبلیس)و (ئادەم)و (حەوا)و (مووسا)و (هارون)و (تەوڕات)و (ئینجیل)و لە نێو هەمووشیاندا ناوەکانی (یەئجووج‌و مەئجووج) ناشێت بۆ زمانی عەرەبی بەرنەوە. (خوداش خۆی زاناترە).

مامۆستا (ابوالکلام ازاد)یش ئاماژەی بۆ ئەو ڕایە کردووە، کەوا بێگومان ئەو دوو وشەیە بیانین، نەك عەرەبی.. لەم ڕووەوە گووتوویەتی: (هەردوو وشەی (یەئجووج)و (مەئجووج) وا دەردەکەون، کە (عیبری)بن، بەڵام لە ڕەگو ڕیشەیانەوە (عیبری) نین، بەڵکو دوو وشەی بیانی (اعجمی)ین‌و شێوەو فۆرمی زمانی عیبریان پێوە دیارە، چونکە لەو شێوازەوە نزیکن.. بەڵام بەیۆنانی بەدوو وشەی (غاغ -یان ((گاگ)-GAG )و (ماغاغ-یان (ماگاگ: Magag)) دەردەبڕێن.. لە تەرجەمەی حەفتا هەمینی تەوڕاتیشدا بەم فۆرمە دەربڕاون، ئیدی بە سەرجەم زمانە ئەوروپاییەکانیشەوە بەهەمان فۆرم‌و شێوە دەربڕاون)[1].

١) ابو الكلام ازاد، (ويسألونك عن ذي القرنين)، ص(١٦٣)..

## -مه‌نگۆلیا- نیشتمانی (یه‌ئجووج) و (مه‌ئجووج)ه‌

زانایان ڕای لێك جوداو هه‌مه‌جۆریان له‌سه‌ر شوێنی نیشته‌جێی بنه‌ڕه‌تیی (یه‌ئجووج)و (مه‌ئجووج)و ئه‌و هه‌رێمه‌ی، که‌ یه‌که‌م نیشتگه‌یان بووه‌، هه‌یه‌. زانا لێکۆڵیارو ساغکه‌ره‌وه‌کانیش ڕای یه‌کلاکه‌ره‌وه‌ی خۆیان هاتۆته‌ سه‌ر ئه‌وه‌ی، که‌ شوێنی نیشته‌جێ بوونیان ئه‌و به‌شه‌ی باکووری خۆرهه‌ڵاتی زه‌وی (مه‌نگۆلیا)یه‌و هۆزوتیره‌و کۆچه‌رییه‌کانیشی (مه‌نگۆل) بوون. له‌ سه‌رچاوه‌ چینیه‌کانیشدا واباسکراوه‌، که‌ ڕیشه‌ی وشه‌ی (مه‌نگۆل-مه‌غۆل-) مه‌نکۆکه‌، واته‌ پیتی (کاف)ی فارسی له‌دوای (نون)ه‌که‌وه‌، یان به‌(جیم)ی فارسی (مه‌نجۆکه‌) له‌ هه‌ردوو حاڵه‌ته‌که‌شدا وشه‌که‌ له‌ ده‌ربڕینی عیبری (ماکۆك) به‌ هه‌ردوو پیتی (کاف)ی فارسییه‌وه‌ نزیکه‌و له‌ ده‌ربڕینی (یۆنانی)یش (میکاك) به‌و دوو (کاف)ه‌ فارسییه‌وه‌ نزیکه‌.

مێژووی (چین)یش هه‌واڵی وجودی تیره‌یه‌کی ترمان له‌و هه‌رێمه‌دا پێده‌دات، که‌ به‌ناوی (یواشی) هه‌بوون‌و، ئه‌وه‌ی دیارو ڕوونه‌ له‌م باره‌یه‌وه‌ ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئه‌م وشه‌یه‌ (یواشی) به‌رده‌وام پشت له‌دوای پشتی نه‌ته‌وه‌کان ده‌سکاریو گۆرانکاریی تێدا کراوه‌، تاکو بووه‌ به‌ (یه‌ئجووج) له‌ زمانی (عیبری)[1]دا. که‌وابوو وه‌ك یه‌کلابۆته‌وه‌، وڵاتی (مه‌نگۆلیا)، یان (مه‌نغۆلیا) نیشتمانی ((یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج))ه‌، ته‌نانه‌ت ناوی (مه‌نغۆلیا)و (مه‌نغۆل) به‌ وشه‌ی (یه‌ئجووج)ه‌وه‌ په‌یوه‌ستن‌و، په‌یوه‌ندییه‌کی ڕاسته‌وخۆشیان پێوه‌ی هه‌یه‌، هه‌روه‌ها هه‌ندێك جار (یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج) به‌ناوی (مه‌غۆله‌کان) ناسراون‌و، هه‌ندێك جاری تریش به‌ناوی (ته‌تار) ناسراون.

---

١) (و يسألونك عن ذي القرنين)، ص(١٦٤-١٦٥).

## حـەوت سـوورەکەی دەرچوونی (یەئجووج و مەئجووج)

ئـەوەمان بـۆ یـەکلاو ڕوونبـووەوە کـەوا (یـەئجووج‌و مـەئجووج) لەناوچـەی (مەنگۆلیا)و (تورکستان)ی سەر بەچین‌و ڕووسیاشدا نیشتەجێ ببـوون، بـەڵام ئایـا پێشتر دەرچوون؟ یان هەتا کاتی هاتنی قیامـەت هـەر دەرناچـن؟! کۆمـەڵێك لـە زانایان ڕایان وایە کە ئەوان تـەنها یـەك جـار دەردەچـن، ئـەوەش لـەپێش هـاتنی قیامەتدا، بەڵام زانا لێکۆڵیارو توێژەرەوەکان ڕای ڕاسـتترو یـەکلاکراوەیان لەسـەر ئەوەیە، کەوا ئەوان واتە: (یەئجووج‌و مەئجووج) چـەندین جـار دەردەچـن، دوایـین جاریش ئەو دەرچوونە گەورەو ماڵکاولکەریان لە پـێش هـاتنی قیامـەتـدا وەك لـە فەرموودە ڕاستەکاندا دیاری کراوە، هەر ئـەم زانـا لێکۆڵیارانـەش ئاماژەیـان بـۆ حەوت سووری دەرچوونی لەمەوبەریان (بەدرێژایی مێژوو) کردووە، کە (ابو الکـلام ازاد) لە کتێبەکەیدا (ویسألونك عن ذي القرنين) هێناویەتی‌و، بەم جۆرە بووە:-

<u>سووری یەکەم</u>: پێش چاخە مێژوویی یەکە بووە، واتە نزیکـەی پێـنج هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر، کـە شـاڵاویان دەبـردە سـەر دەشـتەکانی چین‌و هەڕەشـەیان لـە شارستانێتییە دێرینەکەی دەکرد بەوەی، کەوا لە بیابانی (جوبی)یەوە هێرشـیان دەکردنە سەر.

<u>سووری دووەم</u>: لـە بەرەبـەیانی مێـژوودا، واتـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی (١٠٠٠-١٥٠٠)ی پێش زاییندا، کە لەو ماوەیەدا شەپۆلی هێرشەکانی مەغۆلییەکان لە باکووری خۆرهەڵاتەوە بەخەستی دەستی پێ دەکرد، تا دەشتایی یـەکانی چین‌و بەرزایی یەکانی نێوان ئاسیاو مەنگۆلیاو تورکستان، پاشان حەزیان لە ئارامی‌و هێمنی دەکردو سەرقاڵی کاروباری کشتوکاڵی دەبوون.

سووڕی سـێیەم: ئەم سووڕو دەورانەش لـە دەوروبـەری سـاڵی (۱۰۰۰/ پ .ز)ەوە دەستی پێکردووە، کە هەر ئەم هۆزانە شاڵاویان بردۆتە سەر ناوچەی (قەزوێن)و (دەریای ڕەش) و(باکووری قەفقاز)و (حەوزی نێوان هەردوو ڕووباری (دانووب)و فۆلگام). چەند هۆزو تیرەیەك لە (یـەئجووج‌و مـەئجووج) کـە یۆنانیـەکان بـە (تیرەکانی ((سی تیهین)) ناویان بردووە، لە تەنگـەی ((داریـال)) لـە چیاکانی (قەفقاز)ەوە پەڕیونەتەوە تاکو هێرش بکەنە سـەر شارسـتانێتی (نەینـەوا) لـە دەوروبـەری سـاڵی (۷۰۰/پ. ز)دا، ئـەم هێرشـانەی مەغۆلییـەکان بۆسـەر (نەینـــەوا) کاریگەرییـــەکی ڕاســـتەوخۆیان لـــە ڕووخـــانی شارســـتانێتی (ئاشوورییەکان)دا هەبووە، وەك مێژوونووس (هیرۆدۆتس) کە بە(باوکی مێژووی یۆنان)دا دەنرێت، ئاماژەی بۆ کردووە.

سووڕی چوارەم: لە دەوروبەری سـاڵی (۵۰۰/ پ.ز)دا بـووە کـەوا تیرەکـانی (سـی تیهین) پەلاماری ناوچەکانی خۆرئاوای ئاسیایان لەڕێ ی تەنگـەی (داریـال)ەوە دەدا، ئینجا (ذوالقرنین)یش: واتە: (کۆرشی فارس) بەربەسـتەکەی لەسـەر ئـەو تەنگەیە بنیات ناوە، هەر بۆیەش ڕێ ی لە پەلامارو هێرشـەکانی (یـەئجووج‌و مەئجووج) گرتووەو تاماوەیەکی دیاری زەمان ئەو وڵاتانەی ئاسوودە کردۆتەوە.

سووڕی پێنجەم: تیرەکانی (یەئجووج و مـەئجووج) بـەرەو خۆرهـەڵات ڕۆشـتوون‌و هێرشیان کردۆتە سەر ئیمپراتۆریەتی (چین)، مێژوونووسانی (چین) ئەم تیرانەیان بە (هیۆنگ هۆ) ناو بردووە.. هەر لەوماوەیـەش دا ئیمپراتـۆری (چـین): (شـین هوانگ تی) شوورا گەورەکەی چـینی بنیـات نـاوە تـاکو بـەر بەهێرشـەکانیان بگرێت، ساڵی (۲٦٤/پ.ز)یش دەستی بە بنیات نانی بەربەستەکەیان کردووەو لەماوەی دە ساڵدا تەواوی کردووەو، ئیدی توانیویەتی بەرەنگاری هێرشـەکانیان بۆ سەر چین ببێتەوە، لەنێو خەڵکیش دا ئەو دەنگۆیە (شائعە) بڵاوبووەوە کـە گوایە (شوورەی چین) بەربەستەکەی (ذوالقرنین)ە.. ئەمەش هەڵەیەکـە، چـونکە

بەربەستەکەی (ذوالقـرنین) لەسەر تەنگەی (داریال) بنیات نـراوەو بـۆ بـەرگرتن لەهێرشی پێنجەمیان بووە، واش دیارە ئیمپراتۆری (چین) سوودی لـە ئـامرازی (کۆرش) وەرگرتووە تاکو هێرشـەکانی (یـەئجووجو مـەئجووج) بووەسـتێنێت، بۆیە شوورەی چینی دروست کردووە.

سوورِی شەشەم: لەسەدەی چوارەمی زایینی دا بووە، کە ڕوویان کردۆتە ئەوروپا بـە سەرکردایەتی پێشەواکەیان (ئەتتیلا)و توانویانە هێرش بکەنـە سـەر دەوڵـەتی (ڕۆمانی)و بچنە نێو پایتەختەکەیان (ڕۆما)وە وکاولیشی بکەن، بەم شێوەیەش ئەو شارستانێتییە ڕۆمانیەی، کە چەندین سەدەی خایاند بوو، لەناوبردووە.

سـووری حەوتـەم: لەسـەدەی دوازدەهـەمی زایینـدا بـووە کـە ڕێکـەوتی سـەدەی حەوتەمی کۆچی یەو کە لەشکرەکانیان بەسـەرکردایەتی (جـەنگیزخان) بـەرەو میرنشینیو مەملەکەتە ئیسلامییەکان لەبەشی خۆرئاوادا چـوونو بەسـەریاندا زاڵ بوونو، وێرانیان کردوون، پاشان نەوەی (جـەنگیزخان) کـە (هۆلاکـۆ) بـووە توانیویەتی لـە سـاڵی (٦٥٦ ك)دا بـچێتە نێـو شـاری (بەغـدا)ی پایتـەختی خەلافەتەوەو، وێرانیشی بکات.

ئەمەی پێشوو بەشێکی پوختو کورتکراوەی هەر حەوت سوورِەکەی دەرچـوونو شاڵاوەکانی (یەئجووجو مەئجووج) بوو، کە (ابو الکـلام ازاد) هێنـاویێتیو دکتـۆر (عبدالعلیم خضر)یش لێوەی وەرگرتووە[1].

---

١) کتێبی (ویسألونك عن ذي القرنیـن)، ص(١٦٦-١٦٨)، هـەروەها کتێبـی (ذوالقرنیـن)ی –محمـد خیـر یوسف، ص(٣١٠-٣١١)..

## -( جـەنگیزخان ) و ( هـۆلاکۆ ) لە ( یەئجـووج و مەئجـووج )-

کۆمەڵێك لە مێژوونووس‌و زانایانی تەفسیر ڕایان وایـە کـە (مەغۆلـەکان)یـان (تەتەرەکان) لە (یەئجووج‌و مەئجووج)ن‌و لە سووڕێك لە سووڕەکانی دەرچـوونیاندا بوون، دەرچوونی (جـەنگیزخان)و پاشـان (هۆلاکـۆ)ش بـۆ هێـرش‌و پـەلاماردانی گەلانی تر بەسووڕی حەوتەمی سووڕەکانی دەرچـوونیان دادەنـێن، ئـەم بیروڕایـەش دەشێت ڕاست‌و جێگیر بێت نەك ڕەتکراوەو سەیرو نامۆ بێـت، چـونکە دەرچـوونی (مەغۆل) یان (تەتەر) یاخود (یەئجووج‌و مـەئجووج) بەشـێوەیەکی زۆرو گـەورەو دڕندانە بووەو، بەسوپایەکی گەورەو وێرانکەریشەوە ولاّتـانی موسـڵمانانیان داگـیر کردووەو، شوێنەواری شالاّوو وێرانکاریشیان زۆر دیارو ئاشکرابووە..

## مێـژوونـووس ( ابن الاثیـر ) لەو سـەردەمەدا

مێژوونووس (ابن الاثـیر) لەو سەردەمەدا ژیاوە کە سەرەتای دەرچوون‌و هێرشـی ئەو شـەڕانگێزانە بـووە بـۆ سـەر ولاّتـی موسـڵمانان و، کـاولکردنی مەملەکەتـە ئیسلامیەکانی خۆرهەلاّت، نـاوبراو چـەندین کـاری وەحـشیانەو بـەدکارییانی لـە کتێبەکەیدا (الکامل فی التأریخ) نووسیوەتەوەو تێکەڵی ڕستەو بڕگەی خەمناکی‌و ئەسەف‌و نائومێدی کردووەو، بەهەست‌و سۆزو ڕەنگدانەوەیـەکی عاطیفیانـەوە کـە ئەوپەڕی (بەزەیی‌و ئاڵوودەیی ی خۆی لەسەر ئایندەی ئیسلام‌و موسڵمانان) پیـشان داوە، دایڕشتوونەتەوە، بەلاّم (ابن الاثیر) پێش هێرشی (هۆلاکۆ) بۆ سەر (بەغـدا)، لەساڵی شەش سەدو سی (٦٣٠)ی کۆچیدا. کۆچی دوایی کردووە.

ناشزانین ئاخۆ (ابن الاثیر) تا کاتی (داگیرکردنـی بەغـداو وێرانبـوونی) ئەگـەر لەژیاندا بوایە، چۆن ئەو کارەساتە پشت شکێنەی لە مێژووەکەیدا تۆمـار دەکـردو

بەچ شێوازێکی دارشتن دەینووسییەوە لەکاتێکدا جگە لەوەی (مێژوونووس بـووە)، ئەدیبێکی هەست ناسـكو بەسـۆزیش بـووە، کتێبـی مێژووەکەشـی (الکامـل فی التأریخ) بەسەرچاوەیەکی بنەڕەتی دادەنرێـت کـە دەربـارەی سـەرەتای دەرچـوونی (جەنگیزخان)ەو بەتایبەتیش لەدەسالّی هەوەڵینی ئەو دەرچـوونو پـەلامارەیان دا. لایەنێکی باشی نێو وتەکانی (ابن الاثیر) ئەوەیە تـەنها وەك گێڕانـەوەو ڕیوایـەتی مێژوونووسێك نیین، بەڵکو خرۆشاوە بەو ڕووداوانەو کاری تێکردوون، بۆیە مێژووی ئاوێتەی هەستو سۆزو کارلێـكو کاردانـەوەکان کـردووەو، ئیـدی مێژووەکـەی وا دیارە کە خوێنەر وا دەزانێت پیاوێکی لەبەردەم دایەو لە هەموو خەمو حەسـرەتو مەینەتیو ئازارەکاندا تواوەتەوەو خەمبارو ڕەنگ هەڵبزرکاو بووە تیایاندا.

هەروەها (ابن الاثیر) هەڵوێستە لەبەردەم ڕووداوەکانیش دا کردووە تاکو پەنـدو وانەو ئامۆژگاریی (لەوەی دەینووسێتو دەیکـات بەمێـژوو) دەربێنێـتو بیانخاتـە ڕووو ئەو سوننەتە کۆمەڵایەتی یە (خودایی) یەش بخاتـە بـەر چـاوی خوێنـەر کـە هەمیشە ڕەوتی ڕووداوەکانی مێژوو بەڕێوە دەبات، ئیـدی ڕووداوەکـانی مێـژووش ڕەنگدەرەوەی ئەو سوننەتەو تەرجەمەو کاردانەوەیـەکی کردەیـی (عەمـەلی)یـشی دەبن.. پاشان (ابن الاثیر) سەرچاوەکانو هەواڵەکانی ئەو مێژووەی، لە کەسـانێکی زیندووی ژیـاوی نێـو ئـەو سـەردەمەوە هێنـاوەو کـە پێیـان خرۆشـاونو ڕووداوە دڵتەزێنەکانیان دیوەو کاریان تێکراوە.. هەر بۆیە سەرچاوەی نووسینی (ابن الاثیر) بوون بەچاوگێکی زیندووی وا دادەنرێت کە لە مەیـدانی سـەربازییەوە وەرگـیراوەو، ئەوانەش کە بەسەرهاتو ڕووداوەکانیان بۆ گێڕاوەتـەوە وەك (چـەند پـەیامنێرێکی جەنگیو چەند ڕۆژنامە نووسێکی نێو مەیدان) شـوبهێنراون. بەهـەر حـاڵ ئـەوەی ئەرکی ئێمەیە ئەوەیـە نامانـەوێت کـە لـە بابـەتی (لێـدوانمان لـە (ابـن الاثـیر)و تایبەتمەندییەکانی) دەرچین.

# سەرەتای هاتنە سەرکاری (جەنگیزخان) و هێرشیی بۆ سەر موسڵمانان

سەرەتای دەرچوونی (یەئجووج و مەئجووج) لە سووری حەوتەمدا لە ساڵی (١٦١٦ك)دا بووەو لەوکاتەدا ئەوان نیشتەجێی ناوچەی (مەنگۆلیا) بوون بەتایبەتیش لەنێو چیاکانی (طمغاج)[1]داو، پادشایەکیان بەناوی (ئۆزبیك خان) هەبووە، لەنێو فەرماندە گەورەکانیشیدا لاوێك بەناوی (تیموجینی) هەبووە، کە ناحەزە حەسوودەکانی لەلای پادشا قسەیان بۆ هەڵبەستووەو بێزراندوویانە تا ئەویش ڕقی لێ هەڵگرتووەو بۆ ناوچەیەکی دوورە دەستی وڵاتەکەی دوور خستۆتەوە، (تیموجینی)یش لەپادشا، کە هەڵگەڕاوەتەوە، واتە لە (ئۆزبێك خان)و سوپایەکی پێك هێناوەو جەنگی لەدژ ڕاگەیاندووەو، توانیویەتی بەسەریدا زاڵ بێت و، کوشتوویەتی، ئینجا خۆی بۆتە پادشا لەجێگەکەیدا وناوی خۆیشی لە (تیموجینی)یەوە بۆ (جەنگیز خان) گۆڕیوە.. ئیدی (جەنگیز خان) لەساڵی (٥٥٩.ك)دا بۆتە پادشاو هەموو ناوچەکەش ملکەچی حوکمی بوون و، لەوێوە بەرەو بەشی خۆرئاوا هاتووە، کە ناوچەیەکی ئیسلامی بووەو، دەسبەجێ پادشای موسڵمانان (خوارزم شاه) لە وڵاتی خۆرهەڵات لەساڵی (٦١٦.ك)دا ڕووبەڕووی بووەتەوەو بەڵام (جەنگیز خان) ئەم پادشایەی بەزاندووەو پادشاکەش لەساڵی (٦١٧.ك)دا مردووە، پاشان (جەنگیز خان) بەسوپایەکی گەورەوە وڵاتانی موسڵمانان یەك لەدوای یەك داگیر کردوە، لەم داگیرکارییەی مەملەکەتە

---

١) الكامل لإبن أثير (١٢:٣٦١).

ئیسلامییەکاندا هەر بەردەوام بـووه لەسـەر خوێنڕێـژیو کاولکـاریی تـا لەسـاڵی (٦٢٤.ك)دا کۆچی دوایی کردووه[١].

پاشان جەنگەکانی نێـوان تەتـەرەکانو موسـڵمانان لـەدوای مردنـی (جـەنگیز خان)یش بەردەوام بووه تا نەوەی (جەنگیز) که (هۆلاکۆ)بووه حوکمی پادشـایەتیی کەوتۆته دەستو ئەویش جەنگو شەڕخوازی بۆ سەر موسڵمانان زیاتر کردووه.. تا لەدواییدا (هۆلاکۆ) سوپایەکی له تەتەرەکان (یـەئجووجو مـەئجووج) ڕێکخـستو ژمارەشیان دووسەد هەزار جەنگاوەر بـوو، سـوپای موسـڵمانانیش لـه (بەغـدا)دا کەمتر له دەهەزار جەنگاوەر بوو.

## ((گیـرانی بەغـدا و کـوژرانی خەلیفـە))

هۆلاکۆو سوپاکەی گەیشتنه بەغـداو لـه ڕۆژی (١٢ی مـانگی محرمـی سـاڵی (٦٥٦/ك)دا گەمارۆیدا، هەریەکه له (وەزیری رافضی، ابن العلقمی) که ـ سـەرۆك وەزیرانی خەلیفه- بـوو و، ڕاوێـژکاره بـەدکاره (ئیـسماعیلی)یەکەشـی کـه نـاوی (نـصیرالدین الطوسـي) بـوو ڕۆلێکـی زۆر نالـەباریان لـه لاوازکردنـی سـوپای موسڵماناندا هەبوو و، هـەروەك ڕۆڵیـان هـەبوو لـه هـەڵنانی هۆلاکـۆ بـۆ چـوونه بەغداوەو له گۆڕینەوەی نامـه نهێنیـەکان لەگەڵیـداو جـوانکردنی مەسـەلەکەش لەبەرچاوی.

ئیدی (یەئجووجو مەئجووج) گەمارۆی بەغدایانداو، پاشان لـەکۆتایی یـەکانی مانگی (محرم)ی ساڵی (٦٥٦/ك)دا چوونه نێو بەغداوەو، لـەو کاتانەشـدا هۆلاکـۆ فەرمانی بۆ سوپاکەی دەرکـرد کـه هـەموو خـەڵکی دانیـشتووی بەغـدا بکـوژن. سوپاکەشی بۆ ماوەی چل ڕۆژ شمشێریان لەسەر خـەڵکی بەغـدا بـەردەوام بـووەو،

---

١) (البداية والنهاية)- (١٣: ١١٨).

ژمارەی کوژراوانی موسڵمانانیش تەنها له شاری بەغدادا هێندە زۆر بووە، کە بیروڕای جیاوازی مەزەندەکاریی تیادا هاتووە، بۆ نموونەش گوتراوە: ژمارەیان سێ سەد هەزار کەس بووە، گوتراویشە یەك ملیۆن و هەشت هەزار کەسی تیادا کوژراوە، پاشان گوتراوە: دوو ملیۆن کەسی کوژراوە.

هەروەها (هۆلاکۆ)ش خەلیفەی موسڵمانان (المعتصم بالله)ی لە مانگی سەفەری ساڵی (٦٥٦.ك)دا کوشتووە[(١)].

## (عین جالوت) و زاڵ بوون بەسەر (یەئجووج و مەئجووج) دا

(هۆلاکۆ) له بەغداوە بەسوپای مەغۆلەوە بەرەو وڵاتی شام کەوتە ڕێ و، شاری (حەڵەب)ی داگیر کردو وێرانی کردو دانیشتوانەکەشی کوشت، لەبارەگای حوکمڕانیی مەغۆلەکانیش لە بەشی خۆرهەڵاتدا چەند ناکۆکییەك لەنێوان فەرماندەکان و لێپرسراوانیاندا ڕووی دابوو، بۆیە (هۆلاکۆ) ڕووی کردە ئەوێ و، فەرماندەی مەغۆلی (کەتبغا)ی کردە سەرکردەی سوپا لە (شام)دا. موسڵمانانیش خۆیان بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی (کەتبغا)و سوپاکەی سازو ئامادە کردو سەرکردەکەشیان (المظفر قطز)و (الظاهر بیبرس) بوو، هەردوو سوپاکەش لە (عین جالوت) پێك گەیشتن و جەنگێکی سەخت و دژوار، کە هەر بەناوی جەنگی (عین جالوت)ەوە ناسراوە، لە ڕۆژی هەینیی (٢٥)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٨.ك)دا له (دوای دوو ساڵ له گیرانی بەغداو وێران بوونی) له نێوان هەردوو لادا بەرپا بوو.

شەڕو کوشتار لەنێوان سوپای (یەئجووج و مەئجووج) بەسەرکردایەتی (کەتبغا)و، سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی (قطز)دا خەستترو توندتر

---

١) بڕوانە وتەی (ابن کثیر) دەربارەی ئەو مەینەتییە، بەرگی (١٣)، لاپەرە (٢٠٠-٢٠٦).

دەبووەوەو بەتوندترینو دژوارترینی جەنگەکانو بەهێز ترینیشیان دادەنراو، تیایدا (قطز) بەسەدای سەرکەوتنی (وا اسلاما/هۆ ئیسلام)ەوە هاواری کرد. خوداش فەتحو سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان مسۆگەر کردو، مەغۆلەکانیشی بەزاند، هەروەها (ئەمیر: جمال الدین ئاغوش) گەیشتە ناوجەرگەی سەرکردایەتیی مەغۆلەکانو توانی (کەتبغا)ی سەرکردەشیان بکوژێت[1]. ئیدی سوپای مەغۆلەکان بەزیو تێکشکا، ئەمەش یەکەمین بەزینی گەورەیان بوو کە بەسەریان دابێت، (عین جالوت)یش سەرەتای کۆتایی هاتنی سووڕی حەوتەم بوو له سووڕەکانی دەرچوونی ((یەئجووجو مەئجووج))، دوای ئەوەش هیچ ڕۆڵو کاریگەریان نەماو، هیچ بالاّ دەستیو ڕکێفێکیشیان بۆ نەمایەوە.

چەند تیرەیەکیشیان لە ناوچە تازەکاندا مانەوەو هەندێك دەوڵەتۆکەو میرنشینیان لە وڵاتانی هیندستانو خوراسانو تورکستانو چەند وڵاتێکی دیدا بۆ خۆیان دامەزراند، ئاینی ئیسلامیش کاری کردە سەر هێندێکیانو کاردانەوەی لە دڵو دەروونیاندا هەبوو، بۆیە موسڵمان بوونو هاتنە نێو ئاینی ئیسلامەوە، یەکەم کەسیش کە لێیان موسڵمان بوو (شا بەرەکەت خان)ی نەوەی (جەنگیز خان) بوو کە لە هەمان کاتدا ئامۆزای (هۆلاکۆ)ی خوێنڕێژیش بووە، بۆیە چەند جەنگێك لە نێوان (شا بەرەکەت)و (هۆلاکۆ)دا بەخەستی ڕووی داو، لەدواییدا (بەرەکەت خانی موسڵمان) بەسەر ئامۆزا کافرەکەیدا سەرکەوتووە[2]. (واتە بەسەر هۆلاکۆ)دا.

---

١) بڕوانە (البداية والنهاية)، بەرگی (١٣)، لاپەرە(٢٢٠-٢٢٢).

٢) هەمان سەرچاوە، (١٣: ٢٣٨-٢٤٠).

# (( لاواندنەوەی ( ابن الاثیر ) بۆ ئیسلام و موسڵمانان لە ترسناکی شاڵاوەکان دا ))

مێژوونووسە موسڵمانەکان هەموویان یەکدەنگ‌و یەکران لەسەر ئەوەی کە بێگومان مەترسیی مەغۆلەکان لە ترسناکترینی هەموو ئەو مەترسییانەی تر بووە کە بەرەو ڕووی موسڵمانان بۆتەوە، زیان‌و قوربانییەکانیشیان لە ئاکامی شاڵاوی مەغۆلدا لە هەموو ئەو زیان‌و قوربانیانەی (نەتەوەی ئیسلام بەدرێژایی مێژووی موسڵمانان) زیاتر بووە، ئەو مێژوونووسانەش لە ئاکامی ئەو کارەساتانەدا بۆ ئیسلام‌و موسڵمانان نیگەران بوون‌و وایان پێشبینی کردووە کە دەوڵەتێك بۆ ئیسلام دروست نەبێتەوە، بۆیە ئەو نیگەرانی‌و خەم‌و پەژارانەیان لە کتێبەکانیاندا نووسیوەتەوە، لێرەشدا هەردەگەڕێینەوە بۆ لای مێژوونووسی شاعیری هەست ناسك (ابن الاثیر) تاکو پارچە پەخشانێکی خەمناکی مێژوویی بۆ تۆمار بکەین کە تیایدا ئیسلام‌و موسڵمانان دەلاوێنێتەوە.. وەك لە سەرەتای کتێبی مێژووەکەیدا باسی دەرچوونی تەتەرەکان بۆ خاکی ئیسلام دەکات لە ساڵی (٦١٧.ك)دا، کە نووسیویەو دەڵێت:-

(چەندین ساڵە دانم بەخۆدا گرتووەو خۆم لەباسی ئەم ڕووداوە لادەدەم، ئەمەش بە مەبەستی بەگەورەگرتنی و، ڕق لێبوونەوەش لە باسکردنی، چونکە من لە باس کردنیدا دوو دڵ بووم‌و پێ یەکم ناوەتە سەر کارەکەو، پێ‌یەکیشم دواخستووە، ئاخر کێ بەلایەوە ئاسانە کە پرسەو لاواندنەوە بۆ ئیسلام‌و موسڵمانان بنووسێت؟ ئەی کێ باسی ئەو ڕووداوە ناخۆشەی بۆ ئاسان دەبێت‌و بەلایەوە ئاسایی یە؟ خۆزگە دایکم منی لێ نەبوایە، خۆزگە پێش ڕوودانیشی دەمردم‌و شتێکی لەبیرچووو بیرکراوە دەبووم، بەڵام من کۆمەڵێك لە هاوڕێ یانم زۆر هانیاندام لەسەر نووسینەوەی ئەم ڕووداوانەو، لە کاتێکدا دەستەوسان وەستا بووم، پاشان بۆم

ده‌ركه‌وت، كه‌ پشتگوێ خستنی ئه‌م كاره‌ (كاری نووسینه‌وه‌كه‌) هیچ سوودێكی نابێت، بۆیه‌ ده‌ڵێین (ئه‌م كاره‌ باسی گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و ڕووداوه‌ گه‌وره‌یه‌و ئه‌و كاره‌ساته‌ مه‌زنه‌یه‌ كه‌ له‌ هیچ ڕۆژگارو شه‌وگارێكی تری زه‌مان دا وێنه‌ی نه‌بووه‌و، كه‌ هه‌موو خه‌لقی خودا به‌گشتی‌و موسڵمانانیشی به‌ تایبه‌تی گرتۆته‌وه‌، خۆ ئه‌گه‌ر بگۆ (قائل)ێك بڵێت: (جیهان هه‌رگیز له‌و ڕۆژه‌وه‌ی (خودا ئاده‌می خه‌لق كردووه‌ تا ئه‌مڕۆ) كاره‌ساتی له‌م جۆره‌ی به‌خۆیه‌وه‌ نه‌دیوه‌) ئه‌وه‌ كه‌سێكی ڕاستگۆیه‌و وته‌كه‌ی ڕاسته‌، چونكه‌ هه‌موو قۆناغه‌كانی مێژوو ڕووداوێكی وای تۆمار نه‌كردووه‌ كه‌ نزیك‌و لێك چووی ئه‌م چه‌شنه‌ ڕووداوانه‌ بێت، له‌و ڕووداوه‌ گه‌ورانه‌ش كه‌ پێشتر گێڕراونه‌ته‌وه‌ ئه‌و كاره‌ساتی كوشت‌و بڕو وێرانكاری یه‌یه‌ كه‌ (به‌ختنه‌سر) به‌سه‌ر (به‌نوئیسرائیلی)ی دا هێناوه‌ كه‌ خه‌ڵكێكی زۆری لێ كوشتوون‌و (بيت المقدس)یشی وێران كردووه‌. (بيت المقدس)یش به‌به‌راورد له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو كاری تێكدان‌و وێرانكردنه‌ی نه‌فره‌ت لێكراوانی مه‌غۆل‌و ته‌ته‌ردا، كه‌ هه‌ر شارێك له‌شاره‌ تێكدراوه‌كان چه‌ندان هێنده‌ی بارستایی‌و قه‌باره‌ی ناوچه‌كه‌ی بوون گه‌لێك كه‌متر دیاره‌، چونكه‌ ژماره‌ی كوژراوانی (بنو اسرائيل)یش به‌ده‌ستی (به‌ختنه‌سر) زۆر زۆر كه‌متره‌ له‌ دانیشتوانی هه‌ر شارێك كه‌ به‌ده‌ستی مه‌غۆله‌كان كوژراون، له‌وانه‌شه‌ خه‌ڵكی تا ڕۆژی به‌قرِدا چوونی دنیا نموونه‌ی له‌م كاره‌ساته‌ نه‌بینن، مه‌گه‌ر ته‌نها كاره‌ساتی دواییینی (یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج) نه‌بێت، كابرای جادووگه‌ریش (الدجال) ئه‌و كه‌سانه‌ ده‌هێڵێته‌وه‌و نایانكوژێت، كه‌ په‌یڕه‌وی ده‌كه‌ن‌و باوه‌ڕی پێ دێنن، به‌ڵام ئه‌م مه‌غۆلانه‌ هه‌موو جۆره‌ كه‌سێكیان كوشتووه‌و ته‌نانه‌ت ئافره‌تان‌و پیاوه‌ پیره‌كان‌و منداڵانیشیان كوشتووه‌، سكی ئافره‌تی دووگیانیشیان هه‌ڵدڕیوه‌و كۆرپه‌له‌كانی نێو سكیان كوشتوون، ئێمه‌ش له‌ ئاست كاره‌سات‌و قه‌ده‌ری ئاوادا هه‌ر ده‌ڵێین -انا لله وانا اليه راجعون، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم-..

جا ئه‌م كاره‌ساته‌ی، كه‌ پڕیشكی شه‌ڕانگێزی به‌ هه‌موو لایه‌كدا په‌ڕیوه‌و، زیان‌و زه‌ره‌ریشی هه‌موو لایه‌كی گرتۆته‌وه‌و به‌نێو وڵاتاندا وه‌ك هه‌ورێك، كه‌ بای

بەدواوەیە تێپەڕیوە، لەوەدا بووە کە گەلێك لە دەوروبەری ولاتی چینەوە دەرچوونو ڕوویان کردۆتە ولاتانی تورکستان وەك (کاشغەر)و (بلاساغون) پاشان لەوێوە بەرەو ولاتانی پشت ڕووبار هاتوون، وەك (سەمەرقەند)و (بوخارا)و ولاتانی تری ئەو ناوچەیەو، بەسەریاندا زاڵ بوونو (ئەو جۆرە کارەساتەی بەسەر ئێمەدا هێنایان) بەسەر ئەوانیشدا هێناویانە.

ئینجا کۆمەڵێك لەوان بۆ (خوراسان) پەڕیونەتەوەو هەموو سامانو موڵکێکیان بەتالان بردووەو ولاتەکەیان وێرانو خاپوور کردووەو هەموو شتێکیان زەوت کردووەو دانیشتوانەکانیشیان کوشتوون، پاشان پەڕیونەتەوە بۆ شارەکانی (ڕەی)و (هەمەدان)و (بلد الجبل)و ولاتانی دی تا سنووری عێراق، ئینجا ڕوویان کردۆتە ولاتی (ئازەربایجان)و (ئێران)و کاولیان کردووەو دانیشتوانەکەشیان کوشتوون، هیچ کەسێکیش لەدەستیان دەرنەچووە مەگەر هەڵاتوویەکی ئاوارە لەماوەی کەمتر لە ساڵێکدا ئەگەر هەواڵی هەمان کارەساتی نەبیستبێتەوە)[1].

هەروەها (ابن الاثیر) بەردەوام بووە لەسەر لاواندنەوەکەی بۆ موسڵمانان و، گوتوویەتی:-

(ئیدی ئێمە هەر بەندەی خوداینو هەر بۆ لای خوداش دەگەڕێینەوە (فإنا لله و إنا الیه راجعون) داوا لە خوداش دەکەین کە لەلای خۆیەوە سەرکەوتنێك بۆ ئیسلامو موسڵمانان مەیسەر کات، چونکە جگە لە خودا هیچ سەرخەرو پشتیوانو بەرگریکارێك لە ئیسلام نیە، وەك خوداش دەفەرموێت: ﴿...وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ الرعد﴾، تەتەرەکانیش ئەو دۆخەیان بۆ لواوە، چونکە هیچ بەرگریکارێك نەبووە)[2].

---

١) (الكامل لإبن أثير، ١٢: ٣٥٨-٣٥٩).

٢) (هەمان سەرچاوە ١٢: ٣٦١).

(ابن الاثیـر) مەغۆلەکانی بەگەورەترین مەترسـی دانـاوە، کـە بێگومـان ئـەو مەترسییەی لەوانەوە کەوتۆتەوە لە غەیری ئەوانەوە نـەبینراوەو، هـەموو کەسـێك یەك ڕاوو یەکدەنگ بوون لەسەر گەورەیی مەترسییەکەیان، جـا ئـەو یەکـدەنگی‌و هاوبیروڕایی یەی، کە لەسەر مەترسی‌و دڕندەیی مەغۆل هەبووە لەسەر هیچ گـەل‌و هـۆزو تایەفەیـەکی تـری شـەڕانگێز نـەبووە، بۆیـە (ابـن الاثـیر) ئامـاژەی بـۆ سەرسـوڕمانی کەسـانی دوای خۆیـشی دەکـات، لەوانـەی کـە ئـەم هـەواڵ‌و بەسـەرهاتانەی مـەغۆل‌و تەتـەر دەخوێنێتـەوەو دەبیـستن‌و سـەریان لێـی سـوڕ دەمێنێت.. لەمبارەیەوە (ابن الاثیـر) گوتوویەتی: (ئەو کارە دڕندانەیەی، کە لـەو تەتەرانەوە بینراوە، هیچ کەسێك لەدێر زەمان‌و لـەو سەردەمانەشـدا نەیبیـستووە، کۆمەڵێك (تایەفەیەك) لە سنووری وڵاتی (چـین)ەوە دەرچـن‌و هێـشتا ساڵێکیـشی نەخایاندبێت کەچـی هەنـدێکیان بگەنـە وڵاتـی ئـەرمینیا لـەو قۆڵـەوەو، وڵاتـی عێراقیش لە قۆڵی (هەمەدان)ەوە تێپەڕێنن.. دەسا بەخوا بەبێ‌گومان هەر کەسێك لەدوای ئەوان‌و دوای سەردەمێکی تر بێت‌و ئـەم ڕووداوەش بـە مێـژووی نووسـراو ببینێت، ئەوا نکوولّی لێ دەکات‌و بەدووری دەگیرێت کە کاری دڕندانەی ئاوا ڕووی دابێت، دیارە هەقیشیەتی، چونکە کەی ئەوە بەدوور دەگرێت، با هەریەکـە لـەوان (کەسانی دوای ئێمە)، کە ئەم دێرانە دەنووسـنەوەو، هـەموو ئەوانـەش (کـە لـەم سەردەمەی ئێمەدا) مێژوویان نووسـیوەتەوە، بـا بۆسـەردەمێك بـڕوانن، کـە تـاك بەتاکی خەڵکی ئاگاداری ئەم ڕووداوەیـەو بـەهۆی دیـاری‌و ناوبـانگی گـەورەیی‌و مەترسی ڕووداوەکانەوە زاناو نەزان وەك یەك تیایدا ئاگادارن. خوداش ئەو کەسـانە بۆ ئیسلام‌و موسـڵمانان سـەرخات، کـە پـارێزەرو بـەرگریکاری ئیـسلام بـوون‌و، بەڕاستی لە دوژمنەوە بەرەو ڕووی کارەسـاتی گـەورە بوونـەوەو بـەرەو ڕووی ئـەو پادشایانەی موسڵمانانیش بوونەوە لەوانەی، کە ورەو غیرەتیان لە سك‌و عەورەتیان تێ ناپەڕێت (واتە کە تەنها ئارەزوویان لە خـۆراك‌و ڕابواردنـە) موسـڵمانانیش لـە

ڕۆژی هاتنی پێغەمبەری خوداوە ﷺ تا ئەم کاتە ئازارو نارەحەتیی لەم چەشنەیان نەچەشتووە. دوژمنێکی تریش، کە (فەرەنگەکان) بوون لەوپەڕی ولاتی ڕۆمەوە دەرکەوتوونو لەنێوان خۆرئاواو باکوورەوە هاتوونو گەیشتوونەتە ولاتی (میسر)و شاری (دمیاط)یان زەوت کردووەو تیایدا نیشتەجێبوون، موسڵمانانیش نەیانتوانیوە لەو شارەدا تەنگیان پێ هەڵچنن یان دەریانپەڕێنن، ئیدی تەواوی ناوچەکانی تری (میصر) لەو مەترسییەدا بووە.. بۆیە هەر دەڵێین: (انا لله وانا الیه راجعون. ولاحول ولا قوة الا بالله العلي العظيم)[1].

## ڕای (سید قطب) دەربارەی (جەنگیزخان) و (هۆلاکۆ)

(سید قطب) -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- ڕایەکی دەربارەی (دەرچوونی (مەغۆلەکان) لەسەردەمی (جەنگیز خانو هۆلاکۆ)دا) هەیەو حەز دەکات بەسوورێك لە سوورەکانی (دەرچوون یەئجووجو مەئجووج)یان دابنێت، لەم بارەیەوە گوتوویەتی: (ئەی دوای ئەمە ئاخۆ (یەئجووجو مەئجووج) کێ بن؟ ئەی ئێستا لەکوێ بن؟ ئەی کاروباریان چۆن چی بووە؟ ئەی لەمەولا چۆن دەبێت؟ وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە لەسەر ئاقاری (گەیشتن بە ڕاستی) قورسن، چونکە ئێمە هیچیان لێ نازانین تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە قورئان داو، لەهەندێك فەرموودەو سەرچاوەی ڕاستەوە هاتووە، قورئانیش لەوبەشەی سوورەتەکەدا ئەو وتەیەی (ذوالقرنین) خۆیی هێناوە. کە گوتوویەتی:﴿... فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ الكهف﴾.. ئەم دەقەش سەردەمێك دیاری ناکات، مانای ئایەتەکەش (ئەگەر بەڵێنی خودا لەسەر کاتی وێران کردنی بەربەستەکە هات، ئەوا درزو کەلەبەری تێدەخاتو دەیڕمێنێت تاکو لەگەڵ زەویدا تەختی دەکات،

1) (الکامل لإبن أثیر،/١٢: ٣٧٥-٣٧٦).

بێگومان بەڵێنی خوداش هەر ڕاستو بەجێگەیەنراو بووە).. ئەم دەقە زەمەنێك دیاری ناکاتو، بەڵێنی خوداش بەمانای بەڵێنیەتی لەسەر ڕووخاندنو تەخت کردنی بەربەستەکە، لەوانەشە لەوەوە هاتبێت لەو ڕۆژەوەی کە تەتەرەکان هێرشیان هێنابێتو زەوییان هەمووی داگیر کردبێتو هەموو مەملەکەتو میرنشییەکانیان وێران کردبێت، لەجێگەیەکی تری سوورەتی (الانبیاء)یشدا هاتووە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ الأنبياء﴾، واتە: (هەر کاتێك بەربەستەکەی (یەئجووجو مەئجووج) دەکرێتەوەو کە لە هەموو گردو دۆڵو بەرزاییەکەوە بەپەلە دێنو هورووژم دێنن بۆ سەرخەڵکیو وەك ئەوە وایە کە هەموو ڕووبەری سەر زەوییە داگیرکراوەکانیان داپۆشیبێت). ئەم دەقەش (وەك ئەوەی پێشوو) سەردەمێکی تایبەتی بۆ دەرچوونی (یەئجووجو مەئجووج) دەسنیشان ناکات، چونکە نزیك بوونەوەی بەڵێنی حەق بەمانای نزیك بوونەوەی کاتی قیامەتە، ئەم نزیکبوونەوەیەش لەکاتی پێغەمبەریشدا ﷺ باسکراوە، وەك لە قورئاندا خودا فەرموویەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ القمر﴾، زەمانیش لەحسابی خودادا وەك حسابی نێو مرۆڤەکان نیە، چونکە پێدەچێت لەنێوان کاتی نزیك بوونەوەی قیامەتو کاتی هاتنیدا ملیۆنەها ساڵ یان ملیۆنەها سەدە تێپەڕبێتو، مرۆڤ بەدرێژو دووریان دابنێتو کەچی لەلای خوداش ماوەیەکی هێجگار کورت بێت.

کەوابوو ئەوەی شیاوە ئەوەیە کە بەربەستەکە لە ماوەیەکی نێوان نزیك بوونەوەی قیامەتو ڕۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەدا کرابێتەوەو، شاڵاوەکانی مەغۆلو تەتەریش کە بەشی ڕۆژهەڵاتی زەویی گرتۆتەوە ئەو دەرچوونە بەربڵاوەی (یەئجووجو مەئجووج) بوو بێت، جا دوای ئەوەش کە (سید قطب) فەرموودەکەی پێغەمبەری دەربارەی خەونەکەی پێغەمبەری خۆی ﷺ هێناوەتەوە کە دەربارەی دیوارە پتەوەکەی (یەئجووجو مەئجووج)ە، گوتوویەتی: (ئەم خەونە پتر لە سیازدە

سەدەو نیو لەمەوبەر پێغەمبەر ﷺ بینیویەتی، دوای ئەوەش شالآوەکانی تەتەر رووی داوەو هەموو مەملەکەتەکانی عەرەبی ویران کردووە، تا ویرانکردنی (خەلافەتی عەبباسی)یش لەسەر دەستی (هۆلاکۆ) لە زەمانی جێنشینیی (مستعصم)ی دوایین پادشای عەبباسیدا بووە، لەوانەشە ئەمە لیکدانەوەیەکی خەونەکەی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ.. زانستو عیلمی ئەمەش هەر لای خودایە، هەموو ئەوەی دەیشیلێین، یەکلاکردنو بەڕاست دانانی ڕایەکەیە، نەك ڕاستی یەکی تەواوی جێ متمانە)[1].

## (( یەئجووج و مەئجووج )) ڕەگەزە ڕەنگ زەردەکان

ئەو بیروڕایەی لەم بوارەدا بەڕاستتری بزانین، (یەئجووجو مەئجووج) توانیویانە کەلەبەر بخەنە بەربەستەکەی (ذوالقرنین)ەوەو لێوەی دەرچنو، بەزەویدا بلاوببنەوەو ولاتان بشێوێننو، شاران ویرانکەن، هەروەها ڕایەکی ڕاستتریش ئەوەیە دەرچوونی مەغۆلەکان بەسەرکردایەتیی (جەنگیزخانو هۆلاکۆ) بە یەکێك لەو حەوت سووڕەی دەرچوونی (یەئجووجو مەئجووج) دادەنرێت (کە پێشتر باسمان کرد).

هەروەك ئەو ڕایەی بەڕاستتری دادەنێین کەوا (یەئجووجو مەئجووج) ئەو مەغۆلانە، یان ئەو تەتەرانەن کە ئێستا لە ناوچەی مەنگۆلیاو تورکستانو (سینگیانگ)ی چیندا نیشتەجێن، هەمدیسان ئەو ڕایەش بەڕاست دادەنێین کەوا ((یەئجووجو مەئجووج)) ئەو ڕەگەزە (ڕەنگ زەردە)ی نیشتەجێی ئاسیان.

(یەئجووجو مەئجووج) خەلکانی (چینو کۆریاو مەنگۆلیاو تیبتو تورکستانو ولاتانی هاوشێوەیانن). بەڕاستی هەر بەتەنها ولاتی (چین) بە مەترسیەکی ڕاستەوخۆی سەر ئەوروپاو ئەمەریکاو عەرەبو گەلانی تر دادەنرێت، واتە بە

---

١) (سید قطب، في ظلال القران/٤: ٢٢٩٣-٢٢٩٤).

مەترسییەكی ئاینده لەڕووی زۆریی ژمارەی دانیشتوانەكەیانەوە، چونكه تەنها دانیشتوانی چین چارەكێكی خەڵكی دنیان، ژمارەی دانیشتوانی دنیاش نەختێك لە چوار ملیار كەس زیاترن، دانیشتوانی چینیش پتر لە یەك ملیار كەسە، ڕێژەی زۆر بوونی چینی یەكانیش ڕێژەیەكی زۆر خێرایە، داخۆ لە ئایندەدا لەم گەلە زۆرەوە چی دروست ببێتو، ئەی داخۆ ژمارەیان بگاتە چەندەی تر، ئەی داخۆ چی لەدنیادا بكەن كاتێك بەنێو ولاّتانی تردا بلاّودەبنەوە، یان كاتێك وەك تەقینەوەیەكی زۆربوونی دانیشتوان بەڕێژەیەكی هێجگار زۆرو توند بلاّودەبنەوەو دەتەقنەوەو، لە چەندین شەپۆلّی بەشەریی یەك لەدوای یەكەوە دێنو دەردەچنو سەراپای دنیاش دەتەننو دادەپۆشن..؟!

بێگومان جیهان ئەم ڕاستییە دەزانێتو، خۆی لە مەترسیی ئایندەی چین وریا دەكاتەوە. لەم ڕووەوە (هلیۆم)ی ئیمپراتۆری (ئەلّمانیا) وتەیەكی سەیری دەربڕیوەو، گوتوویەتی: (قوڕ بەسەر ئەوروپا لەدەست چین) هەروەها ناوبراو (چین)ی بە (مەترسییە زەردەكە) ناوبردووە[1].

هەندێك لەزانایانیش ڕایان وایە كە مەبەست لە (یەئجووجو مەئجووج) گەلێكی تایبەتیو دیاریكراو نیە، بەلّكو ئەوە وەسفێكی گشتییەو بۆ هەر گەلێكی تێكدەرو وێرانكەر دەشێت، لەم بارەیەوە (محمد خیر رمضان) دەلّێت: (وای بۆ دەچم كەوا (یەئجووجو مەئجووج) مانای گەلێكی دیاری كراوو ڕەگەزێكی تایبەتی مرۆڤ، ناگەیەنێت، بەلّكو ئەوە وشەیەكەو بۆ هەموو گەلێكی دڕندەو هاروهاج دەشێت كە نەریتی خراپەو شێواندنیان لەسەر زەویدا هەبێت، لە زەمانی (ذوالقرنین)یشدا ئەم جۆرە گەلە هەبوونو، (ڕێی تێكدانی ژیانیان لە كەسانی تر) لێگیراوەو، سنوورێك بۆ شالاّوەكانیان بەهۆی بنیاتنانی بەربەستەكەوە بۆ دانراوە)[2].

١) (ذوالقرنين: ٣٢٧).

٢) هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٣٩).

بەڵام ئێمە هاوڕای (محمد خیر رمضان)نین لەم بارەیەوە، بەڵکو لەو بڕوایەداین کە ئەو ناوە مانای چەند گەلو کۆمەڵێکی دیاری کراو دەگەیەنێتو، ڕای ڕاستتر لەلامان ئەوەیە، کە ئەوان، واتە (یەئجووجو مەئجووج) لە ڕەگەزی مرۆڤە ڕەنگ زەردەکانن.. خوداش هەرخۆی زانایە..

## ( پێش هاتنی قیامەت دەردەچن )

یەکلاکردنەوەی ڕایی ڕاستترمان لەسەر ئەوەی، کە (یەئجووجو مەئجووج) چەندین جار لە مێژووی سەردەمانی ڕابردوودا دەرچوون، مانای ئەوە ناگەیەنێت، کە ئیدی ئەو نەتەوەیە لە داهاتوودا دەرناچن، چونکە گەلی (یەئجووجو مەئجووج) چەندین جاری تریان هەیە تیای دادەربچنو شەڕو شۆڕ بنێنەوە، چونکە پێش ئەمرۆش پتر لە حەوت جاری دی دەرچوونو، تیایدا توانیویانە بەربەستەکەی (ذو القرنین) بشکێننو وێرانی بکەن.

خوداش هەر خۆی دەزانێت ئایا پێش دەرچوونە گەورەو ترسناکەکەی چەند ساتێك پێش هاتنی قیامەت دەردەچنەوە یان نا، ئەی داخۆ دەرچوونیان چۆن بێت؟!

بەڵام ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە، کە ئەوان بەر لە هاتنی قیامەت بەو شێوە دەرچوونە گەورەو دیارەوە پەیدا دەبنو دنیا وێران دەکەن، ئێمە باوەڕو قەناعەتمان بەوە هەیە، چونکە لە قورئانو فەرموودەی ڕاستدا بەئاشکرا دەقیان لەسەر هاتووە.. ئەوە بوو لە سووڕەتی (الانبیاء)دا باسی دوایین دەرچوونیان کراوە، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ ... ﴿٩٧﴾ الأنبياء﴾. هەروەها باسی دەرچوونیان بەڕوونی لەو فەرموودە ڕاست (صحیح)انەشدا هاتووە کە پێشتر دیاریمان کردنو کەدەری دەخەن ئەوان لە ڕووی خۆرهەڵاتەوەو بەژمارەیەکی هێجگار زۆرو چڕی

بەشەریی یەوە دەردەچن‌و هیچ کەسێکیش جگە لە خودا ژمارەیان نازانێت، ئەوە بوو وەك بەڕوونی لەو فەرموودانەدا هاتبوو کە (یەئجووج‌و مەئجووج) کاتێك دەردەچن سەرەتای کاروانەکەیان لەدەریاچەی (طبرية)وەیەو هەرچی ئاوی دەریاچەکەیە دەیخۆنەوەو چۆڕی لێ دەبڕن‌و، دوایین بەشیشیان بەدەریاچەکەدا دێن‌و هیچ ئاوی تێدا بەدی ناکەن‌و دەڵێن (جارێکیان لێرەدا ئاو هەبووە)، ئینجا وەك لەو فەرموودانەدا هاتبوو گەمارۆی (عیسی ی پێغەمبەری خودا)و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیان، لەسەر چیای (طور)دا دەدەن لە بیابانی (سینا)دا، گەمارۆکەش لەسەر باوەڕداران توند تر دەبێت، پاشان کۆمەکی بەفریاهاتنی ڕزگارییان لەخوداوە بۆ دێت کە کرمێکی زۆر بەسەر گەردنەکانی (یەئجووج‌و مەئجووج)دا دەبارێنێت‌و هەموویان لەچەند چرکە ساتێك دا دەمرن، ئیدی خوداش باران دەبارێنێت‌و دۆڵەکانی سینا ئاویان پیادا دەڕوات‌و هەموو لاشە بۆگەن کردووەکانی (یەئجووج‌و مەئجووج) ڕادەماڵێت‌و بەرەو دەریاکەیان دەبەن، بەم ڕەنگەش بەشێوەیەکی ڕاستەقینە (یەئجووج‌و مەئجووج) کۆتاییان پێ‌دێت‌و، بەشێوەیەکی یەکسەری‌و بۆ دواجار دەست بەسەر خراپەو شێوانکارییاندا دەگیرێت. بەڵام ئەمە تەنها لەکاتی هاتنی قیامەتدا ڕوو دەدات، کەوابوو نکووڵی لە هەواڵی دەرچوونیان لە ئایندەدا ناکرێت، چونکە ئەوان پێشتر دەرکەوتوون‌و دەریش دەکەونەوە، ئەوان دەرچوون‌و دەریش دەچنەوە، سوورەتی (کهف)یش ئاماژەی بۆ دەرچوونی زەمانی ڕابردوویان کردووە، هەروەها سوورەتی (أنبیاء)یش ئاماژەی بۆ دەرچوونی داهاتوویان کردووە، ئەو دەرچوونە گەورەو ترسناکەی، کە نیشانەیەك لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەتە.

## دەنگـۆ و ئەفسانەکانی (یەئجـووج و مەئجـووج)

هەندێك لە مێژوونووسانو خاوەنانی تەفسیر چەندین هەواڵو بەسەرهاتی سەیرو سەمەرەیان دەربارەی (یەئجووجو مەئجووج) هێناوەو تیایانـدا دەربـارەی ڕەگـەزو ڕەچەڵەكو ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان دواونو، باسی ڕەنگو ڕوخسارو سیفەتو کاروبارو شتەکانی تریان کردوون.. هەموو ئەو هەواڵو بەسەرهاتو ڕیوایەتەشـیان لە دەقە هەڵبەستراوە ئیسرائیلییەکانەوە وەرگرتووە بۆیە ووتەو ڕاڤەی ئـەو مێـژوو نووسو خاوەن تەفسیرانە لە ئەفسانەو خەیاڵاتو دەنگۆو پڕوپاگەندە بەدەرنین.

گرنگ ئەوەیە لە سەرچاوەیەکی ڕاستو دروسـتو پەسـندکراوەوە وەرنـەگیراون، چـونکە لـە پێغەمبـەری خـوداوە ﷺ نەگێڕراونەتـەوە، ئێمـەش هـیچ هـەواڵو بەسەرهاتێكو، هیچ وتەیەك پەسند ناکەین ئەگەر لە پێغەمبەری خـوداوە ﷺ بـە ئێمە نەگەیەنرابێت لێرەشدا کورتەی ئەو وتە پووچەڵانەیان دیاری دەکەین[1]:-

١- یەکێك لەو (اشـاعة)و وتـە پووچـەڵو ئەفـسانەیی یانـەش، ئەوەیـە هەنـدێك کەسـیان لـە مێژوونووسـانو خـاوەن تەفـسیرەکان وای لەقەڵـەم دەدەن گوایـە (یەئجووجو مەئجووج) لەوەچەی ئادەمن بەڵام نەك لە (حـەوا)وە، بۆیـە دەبنـە برایانی منداڵەکانی ئادەم لەباوکەوە، هەروەها وای باس دەکەن گوایـە (ئـادەم) ژنێکی تری جگە لە (حەوا) هەبووە.

٢- هـەر لـەو پڕوپاگانـدەو وتـە پووچـەڵانەی تریـان ئەوەیـە گوایـە (یـەئجووجو مەئجووج) لە تۆوی ئادەمنو کاتێك ئادەم لەسـەر خۆڵەکـە خـەوتووە، خـەوی جنسی (احتلام)ی بینیوەو ئاوی هاتۆتەوەو، ئاوی تۆوەکـەی تێکـەڵی خۆڵەکـە

---

١) نووسەری ئەم کتێبە، وتە پووچەکانو ئەفسانەکانی بەژمارە دانـەنابوو، بـەڵام مـن لـە تەرجەمـە کوردییەکەدا حەزم کرد بۆ پاراستنی سیمای دەقە کوردییەکە بەژمارە پۆلێنیانکەم -وەرگێڕ-.

بووەو، ئیدی (یەئجووج‌و مەئجووج)یش لەو ئاوی (منی)یەی کە تێکەڵی خۆڵەکە بووە دروست بوون.

٣- هەندێکی تریان وای لەقەڵەم دەدەن گوایە ئەوان واتە (یەئجووج‌و مەئجووج) کوڕانی (یافث)ی کوڕی (نوح) بوون کە دوای لافاوەکە بەرەو خۆرهەڵات ڕۆیشتووە.

٤- هەندێکی تریان وای دادەنێن گوایە (یەئجووج‌و مەئجووج) بیست‌و دوو تیرە بوون‌و کاتێك (ذوالقرنین)یش بەربەستەکەی بنیات ناوە لەدوای خۆیەوە بیست‌و یەك تیرەی داناوەو، تەنها یەك تیرەی لێ جیاکردۆتەوە کە کاروباری داونەتە دەست خۆیان‌و، ئەوانیش بە (تورك) ناوبراون، چونکە لەدەرەوەی بەربەستەکە تەرك کراون، واتە (فەرامۆش کراون)و (ذوالقرنین) بەتەنیا خستوونییە ئەولاوە.

٥- هەندێکی تر لەو مێژوونووس‌و تەفسیرنووسانە هەر تیرەیەك لەو تیرانەی بە چوارسەد هەزار کەس داناوەو، گوایە هەرپیاوێك لەوان لە ژیانیدا هەزار کەسی لە منداڵانی خۆی بینیوە کە هەموویان چەکیان هەڵگرتووە.

٦- هەندێکی تریان وای بۆ دەچن گوایە مرۆڤەکانی (یەئجووج‌و مەئجووج) لە درێژی باڵاو کورتە باڵاییدا جیاواز بوون، تیایاندا بووە کە باڵای بەقەد دارخورمایەك بەرزبووەو، کەسی واشیان هەبووە کە باڵای بەقەد سنەوبەرێك لە سنەوبەرەکانی لوبنان بووە، هەندێکیشیان باڵای بەقەد چوار باڵ بووە، هەندێکی تریشیان درێژیی باڵای سێ بست بووە، گوایە تیاشیان دابووە کە باڵای بستێك بووە، هەندێکیشیان بەقەد کەوانەی نێوان دوو پەنجەی مرۆڤ بوون، یان گوایە هەندێکیان دووگوێچکەی درێژی وەك دووگوێچکەی فیلیان هەبووە کە گوێچکەی یەکەمی لەژێر خۆیدا ڕاخستووەو گوێچکەی دووەمیشی لەسەرەوە بەخۆی داداوەو لەخۆی ئاڵاندووە.

٧- هەندێك مێژوونووس‌و تەفسیرنووسی تریش دەنگۆو دیعایـەی وەهایـان لەسـەر کاری تێکدەرانەو شێواندنی (یەئجووج‌و مەئجووج) بڵاوکردۆتـەوە، کـە گوایـە ئەوەندە بەدکارو تێکدەر بوون بەلای هەرگیاندارێکی وەك فیل، یان دڕندەیـەك، یان حوشترێك، یان بەرازێکدا ڕۆیشتبن، خێرا خواردوویانـەو، هـەر کەسـێکیش لەخۆیان مردبێت خواردوویانە.

٨- هەندێکی تریـان ئیـددیعای ئـەوەیان بـۆ کـردوون گوایـە چـڕنووکیان لەسـەر نینۆکەکانیان هەبووەو، کەڵبەکانیشیان وەك کەڵبـەی ئاژەڵـە دڕنـدەکان بـووە، قژێکی هێندە درێژیـشیان هـەبووە کـە سـەراپای جەسـتەیانی داپۆشـیوەو لـە گەرماو سەرما پاراستوونی. هەروەها گوایە لەنێو بەڕەلاییـەکی بـڵاوو بـاوی جنسیدا ژیاون‌و، وەك ئاژەڵان لەو کارانەدا خـەریکی یـەکتر بـوون‌و، ئافرەتیـان ڕێگەی لە هیچ پیاوێك نەگرتووە کە نیازی داوێن پیسی لەگەڵیدا هەبوو بێـت، هیچ پیاوێکیشیان تاکە ئافرەتێکی دیاری کراوی نەبووە.

٩- هەندێکی تر لەو تەفسیرنووس‌و مێژوونووسانە وای لەقەڵەم دەدەن گوایە لـەنێو خەڵکی (یەئجووج‌و مەئجووج)دا کەسانی واهەبوون کە ڕۆشتنیان وەك ڕۆشتنی گورگ بووەو، هەندێك کەسـی تریـشیان ڕۆشـتنی بـەبازدان بـووەو، هەنـدێکی دیکەیان تەنها بە ورتەورت قسەی کردووە، یان گوایە هەندێکیان چوار چـاویان هەبووەو، هەنـدێکی تریـان یـەك قاچـیان هـەبووەو، هەنـدێکی تریـشیان لـە شلەمەنیدا تەنها خوێنیان خواردۆتەوە.

جگە لە چەندەها دەنگۆو شتی پووچ‌و ناڕاست‌و ئەفسانە[١].

---

١) سەبارەت بەم دەنگۆو شتە پووچەڵ‌و ئەفسانانە بڕوانە کتێبی (الدر المنثور)ی (سیوطی) بەرگی (٥) ل (٤٥٤- ٤٦٤)، هەروەها کتێبی (البداية والنهاية)ی (ابـن الكـثير) بـەرگی (٢)، ل(١٠٩-١١٣) هەروەها کتێبی (ذوالقرنيـن)ی (محمد خير يوسف) لاپەرە (٢٩٤-٣٠٨).

دیارە ئێمە هیچ هەواڵو بەسەرهاتو وتەیەك لەوانە پەسند ناکەین‌و، ڕێگە بە کەسیش نادەین کە لە ئێمەوە ئەو جۆرە شتانە وەرگرێت، یان لە کەسانی ترەوە، چونکە ئێمە بۆیە دیارییان دەکەین تاکو خەڵکی لیٚ ئاگادار بکەینەوەو، هەتا هیچ کەسێکیش لە کتێبە کۆنەکانەوە نەیانخوێنێتەوەو، بڕوای پیٚ نەکات.

بێگومان (یەئجووج‌و مەئجووج) لەنەوەکانی ئادەمن، واتە مرۆڤ‌و ئادەمیزادی ئاسایی‌و خولقێنراوی وەك ئێمە بوون، تەنەکانی لاشەیان‌و ڕوخسارو شێوەیان لە جەستەو ڕوخسارو ڕەنگی ئێمە چووەو لەهیچ شتێکدا لیٚمان جودانیین تەنها بەم ژمارە زۆرو گەورەیەو، بەو بڵاوبوونەوە بەربڵاوەو بەو داگیرکارییە هەمەلایەنەو، بەو شێواندن‌و کاولکاری‌و وێرانکارییە نەبێت.

## (یەئجووج و مەئجووج) لە ڕوانگەی (بەهائی یەکان)ەوە

(بەهائی یەکان) تاقمێکی بیٚباوەڕو گومراو هەڵگەراوەو لادەرن‌و، وایشی ڕادەگەیەنن گوایە ئەوان موسڵمانن. بەڵام لەڕاستیدا لە ئیسلام دەرچوون‌و دوای کابرایەکی گومڕایی کافر کەوتوون کە ناوی (عبدالبهاء)ەو ئەو پڕوپاگاندەیەی بۆ خۆی کردووە گوایە (مەهدی)یەو، پاشان خۆی بە پێغەمبەرێك لەقەڵەم داوە کە گوایە سرووش (وەحی)ی لە خوداوە بۆ دێت.

بەهائی یەکان لێکدانەوەیەکی تایبەتیان لەسەر (یەئجووج‌و مەئجووج) هەیە کە پێچەوانەی لێکدانەوەو تێگەیشتنی هەموو خەڵکییە بە موسڵمانان‌و ئەهلی کیتاب‌و خواناسەکانیشەوە.. تێگەیشتن‌و بۆچوونی ئەوان لەسەر (یەئجووج‌و مەئجووج) لە نامۆترین‌و سەیرو سەمەرەترینی بۆچوونەکانی هەموو نەتەوەکانەو لە هەمووشیان زیاترو زۆرتر گومرایی‌و درۆو بوختان‌و نغرۆبوون لە ئەفسانەو شتە پووچەڵەکانی تێدایە.

من (نووسەری ئەم کتێبە) گوێم لە شریتێکی کاسێتی یەکێك لە بانگەشەچییە بەهائی‌یەکان گرتووە کە بۆ باسی (یەئجووج‌و مەئجووج) تەرخانی کردووەو، تیایدا بە زمانێکی ڕەوانی عەرەبی‌و، بە ئەدایەکی ڕوون‌و، بەشێوازێکی دیارو تێگەیەنەری وتاردانەوە، دەدوێت. بۆیە من زۆر سەرم سوڕماو تووشی سەرسامی‌و حاڵەتی نامۆیی بووم کاتێك ئەو هەموو چاوبەستی‌و سەر لێ‌تێکدان‌و درۆو دەلەسەو قسە هەڵبەستن‌و بوختانانەم لەو شریتەوە بیست‌و گوێم لێ‌بوو.

## (دەقی شریتی بەهائی یەکان)

جا لەدەرووی ڕادێرانی گوێچکەی خوێنەران‌و، ئاگادارکردنیان لە وتارێکی خەیاڵیی سەرنج ڕاکێش کە (هەمووی پووچەڵ‌و درۆو بوختان‌و قسە هەڵبەستنە).

ئەوا من لێرەدا ئەو وتانەی لەو شریتەدا هاتوون، تۆماری دەکەم وەك چۆن وتاربێژەکە دەری بڕیون‌و کە بەم جۆرەیە:-

((بسم الله الرحمن الرحيم))

الحمد لله رب العالمين، لا اله الا الله الملك الحق المبين، محمد رسول الله الصادق الوعد الامين.

خوێندنەوەیەك لە کتێبی ڕووناکیی تیشك پژێنەوە..

ڕاستی‌و حەقیقەتی هەواڵی (یەئجووج‌و مەئجووج).

بێگومان خودای بەرزو بێ‌هاوتا قورئانە پیرۆزەکەی کردۆتە سۆنگەی خواستی خۆی بۆ بەندەکانی‌و بەپێی ئەو حیکمەتە زۆرەی‌و ئەو زانستە باڵایەی.. بۆیەش خوا هەموو پێداویستییەکانی بەندەکانی لەوشتانەی کە لەژیانی دنیاو ئاخیرەتیاندا پێویستیان پێی دەبێت لەو قورئانەدا کۆکردۆتەوە، سا ئیتر ئەو پێداویستیانە بن کە بەزەوییەوە دەیانبەستێتەوە، یان ئەوانەی بە ئاسمانیان دەگەیەنێت.

خودای مەزن لەو قورئانەدا هەواڵی هەموو بارودۆخو جۆرو شێوازێکی ژیانی نەتەوەکانی پێشووی بە نەتەوەی شوێنکەوتووی قورئان گەیاندووەو، ئیدی هەموو بنەماو شتێکی تری جێی خواستی بەندەکانی تێدا دەرکەوتووە.. خودا فەرموویەتی: ﴿ ...مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ...﴿٣٨﴾ الأنعام ﴾.

جا لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز فەرمایشتو یاسای خودای میهرەبانە، بەم هۆیەوە ڕاسترینو ڕۆشنترین بەڵگەنامەو پاڵپشتێکە کە پشتی پێ دەبەسترێت کە لە هیچ ڕوویەکەوە شتی ناڕاستو پووچەڵی تێ ناکەوێت، چونکە لەلایەن خودایەکی داناو سوپاسکراوەوە هاتۆتە خوارەوە.

لێرەشداو لەپێگەی ڕاستگۆییو هەقبێژیی یەوە، ڕاستییەك لە ڕاستییەکانی ئەم قورئانەو، بەسەرهاتێك لەبەسەرهاتەکانی دیاری دەکەین کە خودای داناو شارەزا هێناویێتییەوەو، ئیدی کێشو، وتەی ڕاستتری لە فەرمایشتی خودا هەیە؟! ئەم ڕاستییەو ئەم بەسەرهاتەش، چیرۆکی (یەئجووجو مەئجووج)ە کە خودا لەدوو جێگەی کتێبە بەهادارەکەیدا باسی لێوەکردوون:-

جێگەی یەکەم: لە سوورەتی (کهف)دا کە دەفەرموێت: ﴿ قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ الكهف ﴾.

جێگەی دووەمیش: لە سوورەتی (الأنبیاء)و لەو فەرمایشتەی دایە، کە فەرموویەتی:- ﴿ حَتَّىٰ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ الأنبياء ﴾.

بێگومان لەم بەسەرهاتەدا زۆر کەس لەزانایان لەم ڕووەوە کەوتوونەتە نێو چەند تەمومژێکەوە، واتە لەو چیرۆکەدا کە تەنها خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە

حەقیقەتەکەی دەزانن‌و پاشان بەتایبەتی ئەو کەسانەش دەیزانن کە خودا ڕێنمایی کردوون‌و بەرچاویی ڕۆشن کردوونەتەوە.. تەنانەت هەندێك لەو زانایانە چەند چیرۆکێکی هەمە جۆری وایان لەدەوری ئەم ڕاستییە هۆنیوەتەوە کە هەمووی لە دەسکردی خەیاڵ دان‌و هیچ پەیوەندییەکی بە ڕاستگۆیی یەوە نیە.

تەنانەت هەندێکی تریان ئەو باسانەی کە خودا لەکتێبە سەنگینەکەی دا (قورئان) دیاریی کردوون، بە (مەجازو مانای وەرگێراوو تێپەڕێنراو) دادەنێن، هەندێك زانای تریشیان وایان لەقەڵەم داوە کە گوایە مەبەست لە (یەئجووج‌و مەئجووج) (چینیەکان) بن، بەتایبەتیش کە لەم سەردەمەماندا بەشێوەیەکی هێجگار زۆر ژمارەیان زیاد بووەو، تا گەیشتۆتە پتر لە هەزار ملیۆن کەس.

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێشکەوتن‌و زانستیانەیەی کە لە هەموو بوارەکان دا لەم سەردەمەماندا بەدی هاتووە، هەموو ڕووی زەویش لەڕووی جوگرافیایی یەوە پێوراوە، سا ئیتر بەمانگە دەسکردەکان بێت یاخود بە فڕۆکەکانی سیخوڕی‌و دیدەوانی بێت، جگە لە تیمەکانی شارەزایانی گەڕیدەی زەوی کە بەهەموو ئامرازو هۆکارە هەمە چەشنە زانستی یەکانەوە لە زەویدا دەگەڕێن‌و شت دەدۆزنەوە. بەتایبەتیش ئەمڕۆ جێگەیەك نەماوە کە بنکەی سەربازی، یان زانستی تیا دانەمەزرا بێت.

بۆیە بەڵگەیەك دەرنەکەوتووە لەسەر بوونی ئەم جۆرە گەل‌و خەڵکانە لەسەر ڕووی زەوی، ئەمەش لەبنەڕەتدا گومانی زیاتری لەسەر وجودیان دروست کردووە.

بەڵام ئەوەی کە خودای گەورەو، پێغەمبەرەکەشی ﷺ باسیان کردووەو هەواڵ‌و بەسەرهاتیان دیاری کردوون، هەردەبێت لە ئارادابن‌و هیچ گومانێکی لەسەر وجودیان تێدا نیە، جا بۆ ئەوەی تەم‌و مژ لەسەر بیروهۆشەکان نەمێنێت‌و ڕاستیش لە چەمکەکاندا ڕوون بێتەوە، مەسەلەکە بۆ ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەگێڕینەوە کە قورئانی بۆ هاتۆتە خوارەوە، ئەمەش هەمان فەرمانڕەوایی‌و پێغەمبەرێتییە کە لە

دوایین سوورڕو دەورانیدا لە (عبدالله المهدی)دا دەردەکەوێت، وەك پێشتریش لە زانستی دەوراندا باسی لێوەکرا، چونکە لە چوارچێوەی هەموو زانستە پوختەو تێکڕاییەکانی خودای مەزن دان، زانستی خوداش تەواوێتیو جوانکاری تێدایە.. جوانکاریی لە کورتەی شیکاری زۆریی زانستە زۆرو کۆنەکەدا، ئەمەش ئەو چرا ڕۆشنەیە، کە خودا کردوێتی بەمایەی ڕەحمەتو بەزەیی بۆ خەڵکی دنیا، ئیدی زانستی هەقخوازی (العلم الحقی) کە لەبەردەمیدا هەموو پەردەکانی وەهم دەکرێنەوەو، بەربەستی خەیاڵو سەرسامیش نامێنێت، ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بێگومان وجودی (یەئجووجو مەئجووج) ڕاستییەکی جێگیرەو، ئەوان هەنو لەپشت بەربەستەکەیانەوەن وەك چۆن خودا هەواڵی لەسەر داوە تا نزیك بوونەوەی بەڵێنی هەق دەربارەی هاتنی ڕۆژی گەورەی قیامەت. بۆیە هیچ کەسێك بۆی ناشێت بەڕای خۆی لە بۆتەی وەهمیدا دانێت، یان دوای ئەم ڕاستییە مانای مەجازو تێپەڕێنراویان بۆ لەقەڵەم دات، پێغەمبەریش ﷺ بەو پێیەی، کە کۆتایی پێهێنەری دەورانە زانستییەکەی ئەم بەسەرهاتەیە، هەواڵی ئەوانی پێداوینو فەرموویەتی: ئەوان - یەئجووجو مەئجووج - پۆلێکن لە ئادەمیزاد و، بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنیان هەیە، کە پێش ئەوەی (نوح)ی پێغەمبەری خودا — سڵاوی لێ بێت- کۆچی دوایی بکات ڕوویداوە، ئەوە بوو خودا ژیانی (نووح)ی لە دوای لافاوەکە درێژ کردەوە، تا ئەو کاتەی نەوەی سێیەم لە کوڕو وەچەکانی بەسەر ڕووی زەویدا بڵاوکردەوەو بەفەرمانی خوداو بەپێی ئەو نەخشەیە بوو کە خودا بۆی کێشا بوو. ڕەگو ڕەچەڵەکی (یەئجووجو مەئجووج)یش بۆ ئەو حاڵەتە دەگەڕێتەوە کە (باناثی کوڕی یافثی کوڕی نوح) ــ سڵاوی خودایان لێ بێت - دوانەیەکی نێرینەیان ببوو، کە دوو منداڵ بووو زۆر ناشیرین بوون، تەنانەت وێنەی فیل بەڕەنگو ڕوخساریانەوە نیشتبوو، پێ یەکانو مەچەکەکانی دەستیشیان شێوەی هێواشیی فیلیان وەرگرتبوو، هەروەها دەمی هەردووکیان نەختێك لە سەرو سەکوتی لووتی فیلیان پیشان دەدا، گوێچکەکانیشیان لە گوێچکەی فیل دەچوون.

لەو دوو کوڕە منداڵە، یەکێکیان قەبارەو بارستایەکی گەورەی هەبوو، بەڵام ئەوی تریان هێندە بچووكو لاواز بوو بەو ئەندازەیەی گوایە کاتێك لەدایك بووە بە سکی براکەیەوە نووسابێت، وەك ئەوەی جانەوەرێك بووبێت بەسکیەوە.

پێغەمبەرەکەی خوداش (نووح) ـ سەلامی خودای لێ بێت ـ فەرمانی کرد کە یەکەمیان واتە ئەوەی خاوەنی جەستە گەورەکەیە ناوی (یەئجووج)ی لێ بنرێت، ئەوی تریشیان کە جەستەی بچووكو لاوازبوو، ناوی (مەئجووج)ی لێ بنرێت.

هەریەکە لەم دوو ناوەش لە زمانی سریانیی پێغەمبەرەکەی خودا (نوح)دا - سەلامی لێ بێت- مانایەکی تایبەتیی هەبووە، چونکە دوو ناوی لێکدراون (مرکب)، بۆ نموونە وشەی (یەء) بە مانای (بخور)ە، وشەی (یەء)یش بەمانای (بخۆرەوە-شارب)ە، وشەی (جوج)یش کە بۆ هەریەکە لەو دوو وشەیە زیادکراوە، واتای (درۆ) دەگەیەنێت. لەسەر ئەم وشەی (یەئجووج) بەو دوو وشە لێکدراوەی (یەء-و-جووج)ەوە مانای (بخۆری درۆ-یاخود درۆخۆر) دەگەیەنێت، کاتێك لەسەر ماناو مەفهوومی ئەم دوو وشەیەش پرسیار لە (نوحی پێغەمبەری خودا- سەلامی لێ بێت) کرا، لە وەڵامدا گوتوویەتی:-

(ئەو مرۆڤانە کارو حاڵەتێکی تایبەتیان هەیە کە بەخواستی خودای خالقیانە).

پاشان (ئارات)ی کوڕی (یافث)ی کوڕی (نوح) ـ سەلامی لێ بێت ـ دوانەیەکی مێیینەی لە خێزانەکەی بووە کە دوو کچی منداڵ بەهەمان قەبارەو بارستایی ئەو دوانە نێرینەیە بووە. (نوحی پێغەمبەری خوداش ـ سەلامی لێ بێت) فەرمانی کردووە کە کچە گەورەکە (واتە ئەوەی خاوەنی جەستەیەکی قەبەو گەورە بووە) ناوی (عوج)ی لێ بنرێت، ئەم وشەیەش لە زمانە سریانەکەدا مانای (زلو قەبە) دەگەیەنێت، هەروەها فەرمانی کردووە کە کچە بچووکەکەش ناوی (عنج)ی لێبنرێت کە مانای (کورتە باڵا) دەگەیەنێت.

ئیدی حیکمەتی خودای کردگار وابووە کە هەریەکەیان لە ماوەیەکی کورتدا گەورە ببێت.

جا کاتێك بالّغ بوون، پێغەمبەرەکەی خودا (نوح - سلاّوی لیّ بێت) — فەرمانی کردەوە، کە (عوج)ی کچە گەورەکەی لە (یەئجووج)ی کوڕە گەورەکەی مارە بکرێت، (عنج)ی کچە بچووكو کورتە بالآش لە (مەئجووج)ی کوڕە بچووك مارە بکرێت.

پاشان وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە کە (نووح)- سەلامی لیّ بێت- بە فەرمانی خودا (وەچەو نەوەکانی) بەسەر هەموو ناوچەکانی زەویدا دابەش کردووەو بەوشێوەی، کە خودا بۆی دیارییو ڕوون کردۆتەوە، ڕاستیو حەقیقەتی ئەمەش وابووە، کە خودای مەزن فەرمانی بەدوو فریشتە (مەلائیکە) کردووە، کە لەشێوەو قەبارەی دوو باڵندەدا بچن بۆلای (نووح). (نووح)یش لە ساتی دابەشکردنی نەوەکانیدا بەسەر ناوچەیەك لە ناوچەکانی زەویدا فەرمانی پیّ کردوون، کە دوای ئەو دوو باڵندە بەڕێزە بکەون، تاکو بەخواستی خودا لە شوێنێك دەگیرسێنەوەو لەو جێگەیەش دابێت، کە ئیرادەی خودا لەسەر ئاوەدان کردنەوەی هەیە، جا کاتێك نۆرەی ئەو دوو (ژنو مێردە) دوانانەی، کە دوو کوڕی دوانەو دوو کچی دوانەی زۆر سەیرو سەمەرە بوون، هەردوو لا (واتە هەردوو خێزانەکە، یان هەردوو مێردەکە) فەرمانیان پێکراوە، کە دوای ئەو دوو باڵندەیە بکەون، ئەمەش وەك ئەو نەریتەی، کە لەو ڕۆژەدا باو بووە، ئینجا زەویش بەفەرمانی خودا بۆیان هێنراوەتە یەكو پێچراوەتەوە، تاکو بەئاسانی بگەنە ئەو جێگەیەی، کە بەخواستی خودا دەبوایە بگەنە ئەویّ وئاوەدانی بکەنەوە، ئەو دوو باڵندە بەڕێزەش، هەردوو خێزانەکە (واتە هەردوو مێردەکەو هەردوو ژنەکە)ی بەهەردوو جۆرو ڕەنگو جەستەلێك جوداکانیانەوە بردوەو ڕیّ نیشاندەریان بوون، تاکو گەیشتوونەتە ئەو جێگەیەی، کە ئێستا دوو خێزانەکەو وەچەکانی خۆیانی لێیەو، باڵندەکان لەویّ نیشتوونەتەوەو، ئەو شوێنەی ئێستای (یەئجوجو مەئجووج)یان بۆ دەسنیشان کردوون، بەردەوام

هەرلەوێش دان تا ئەو ڕۆژەی که خودای مەزنو باڵادەست ڕێگەی دەرچوونیان بۆ شوێنەکانی تری زەوی پێ دەدات، ئەم دەروازەیەکی ئەو ناوچەیەیان لە جێگەیەکی تایبەتەوەو لە دەشتەکانی (سیبریا)وە، هەیە، ئەو سەهۆڵبەندانە کەڵکە بووەش کە ئەمڕۆ لەو ناوچەیەدا هەیە، لەو زەمانەدا نەبووە، بەڵکو چەند مێرگێکی فراوانی سەوزی پێ دەشتەکان بووە کە درەختەکانو جەنگەڵە چڕەکان بەڕیزی درێژ درێژ دەبینرانو دایانپۆشیبوون. ئەمەش لە ئاکامی ئەو لافاوەوە کە ژیانی بەناوچەکە بەخشیبووو کە چەندین دۆڵو شێوو نشێوی لێ ببوەوەو، چەندەها ماددەی هەمە جۆرو بەپیتیشی لێوە پەیدا ببوو، پاشان هەردوو باڵندە بەڕێزەکە، (یەئجووجو مەئجووج) یان بەنێو کەلەبەرێکی گەورەی زەویدا بردە ناوەوە کە بەرەو خوار لێژ دەبۆوەو لەو پارچەیەی زەوییشدا وەك ئەشکەوتێکی گەورەو نێوانی هەردوو دیوارەکەی لەڕاستەوە بۆ چەپ نزیکەی یازدە فەرسەخ بووە، بەرزیی بانی سەرەوەشی لەلێژایی یەوە نزیکەی نیو فەرسەخ بووە، ئەو ناوچەی لێژایی یەش کە لێیەوە دابەزیبوون دەگەیشتە سەر بنی ڕووە بنەڕەتی یە ڕووناکەکەی زەوی کەپێش ئەوەی زەوی لەسەریەك کەڵکە بکرێتەوەو بەم ڕەنگە خڕو کۆبکرێتەوە. چونکە پێش پیادەکردنی ڕێسای (ئۆرگانەکان) کە ببوە هۆی بەرفراوان کردنو گەورەکردنی زەویو لەڕێی هێنانی خاكو خۆڵی لەسەر یەك کەڵکەکراویشەوە، کە بووە هۆی خڕکردنەوەی، بۆیە پێش ئەو ڕووداوانە (زەوی) پانو پۆڕو درێژ بووە وەك تابلۆیەك لە گەوهەرێکی ڕوون، کە خودای پەروەردگار ئەفراندن (ابداع)ی لە دروستکردنیدا لە جوانترین دەرياو ڕووبارو چیاو دارودرەختو کێڵگەی بەشێوەی بەرجەستەو زیندوو لەسەر وێنا کردبوو، ئەمەش بە حوکمی ئەو ڕێسای (بەخۆر ڕووناك کردنەوە)یەوەی، کە ژیانی تەواوی خاوەنداریێتیی بەپێی خواستەکانی خودا لە وێناندنو ئەفراندندا پێ بەخشیوە. جا هەر کەسێك خوازیاری چوونە خوارەوە بۆ نێوبنی زەوی بێت ئەوا لە هەر لێژایی یەکەوەو لەهەر لایەکییەوە بێت بۆی دادەبەزێت، چونکە لایەکانی زەوی کە بەو ڕێکخستنە تۆکمەیەوە بۆ سەر بنی

رووەکەی ژێرو ناوەوەی لێژ دەبێتەوە، حاڵەتێکی ئاسایی خوازراوو ئیرادە لەسەر دانراوی خودایە، خوداش کە بەچاکی‌و ڕێکی هەموو شتێکی دروست کردووە، بنی ناوەوەی وەك شێوەی رووکارە دیارەکەی داناوە، کە چۆن هەموو وێنەیەکی زیندووی دەریاو ڕووبارو چیاو دارو درەختو ڕووەکەکانی تیا داهێناوەو، ئیدی وەك بەهەشتێکی پڕ لە نیعمەتو خێرو خۆشیی گەورەی لێ‌هاتوە، کە بە شەونمە ڕژێنراوەکەی ڕووناکی خۆرەوە پەیدا بوون.

سەرووی بنەوەی زەوی، ئاسمانێکە بۆ ئەو کەسەی، کە بەسەر بنی خوارەوەیدا دەڕوات، چوار گۆشەیەکی پێکهاتووش لە نێوەڕاستدا، کە هەرلایەك لە هەر چوارلاکەی دەگاتە سەدان میل، نێوانی هەر دووکیان پێك دەگەیەنێت، کەعبەی پیرۆزیش ئێستا لە سەنتەری ناوەڕاستیدا وەستاوە، ناوەوەی ئەو زەوی یەو خوارووتریشی، مەڵبەندی ژیانێکی سەلمێنراوی ڕووناك بووەو ژیانەکەشی بەهێز تربووە لەو ڕووکاری زەوییە ڕۆشن کراوە بنەڕەتییەی، کە لەپێش خڕکردنەوەو هێنانەوەیەکی زەویدا بووە.

جا کاتێك (یەئجووجو مەئجووج) بۆ ناخی زەوی یە بنەڕەتییە ڕۆشن کراوەکە لەو کەلەبەرەی نێوان هەردوو لووتکەی چیاکەوە دابەزیون، کە (دەکەوێتە لایەك لە لایەکانی زەوی یەوەو لەو لایە دیاری کراوەوە، کە پێشتر ڕوونمان کردەوە)و، کە خوداش خۆی بۆ ئەو کارە سەرسوڕهێنە هێشتویێتی یەوەو حیکمەتێکی زۆرو گەورەشی وای خواستووەو، کە دوای ماوەیەکی کەم لەم دێرانەی داهاتوودا (بەیارمەتی خودا) بۆمان دەردەکەوێت. ئای کردەی خودای باڵادەست چۆنەو، چەند دڵفڕێنە ئەوەی دەیبینین، کە دوای ئەوەی هەریەکە لەو دوو ژنو مێردە بەهێواشی چوونەتە نێو ئەو زەوییەوە. ئینجا ڕەنگو ڕوویان گۆڕاوە، واتە لەو ڕەنگە ناشیرینەوەی، کە پێشتر وەسف کراو هەیانبوو، گۆڕاون بۆ جوانترین ڕەنگ لە ڕووخساری سەرنج ڕاکێشو دڵفڕێن. تەنانەت گەر جوانترین ئافرەتی دنیا لەگەڵ

هەرمێ بینەیەك لەو دوو جۆرەدا بەراورد بكرێت، ئەوا لە ئاستیدا ناشیرینترین مرۆڤ بوو، بە هەمان شێوە هەر دوو پیاوەكەش جوان ببوونو، ئەگەر هەر نێرینەیەك لەگەڵ یەكێكیاندا بەراوردكەین، ئەوا ئەو نێرینەیەش ناشیرینترین مرۆڤ بووە لە ئاستیدا.. ئەمەش بەهۆی ئەو هێزە ڕۆشن كە ڕەوانەی ڕەحمەتی خوداوە كە لەو جێگریاندا لە ناخی زەوی ڕاستەقینەی درەوشاوە بەنووری پەروەردگاری باڵا دەستدا، هەبووەو، كە بەحوكمی ڕۆشن بوونەوەكەیەوە بووە بە بەهەشتی خودا لە زەوییەكەیدا. ئیدی هەریەكە لەو دوو خێزانە، نەوەیەكی هێجگار زۆرو بێ شوماریان لێ كەوتۆتەوە، بەشێوەیەك كە مەگەر هەر خودای خالق خۆی ژمارەیانی زانیبێت، ئەوانیش سەرەڕایی زۆربوونیان هەر لەو زەوییەدا بەگیانی خۆشەویستیو ڕەحمو بەزەیی یەوە لەگەڵ یەكتردا ژیاون و، لە ئاستێكی بڵندی دڵسۆزییدا بوون بۆ خواپەرستیو زانستو گەیاندنی پەیوەندی سۆزی نێوان خۆیان، بەمەش وایان لێهاتووە كە مرۆڤە زەبەللاحەكانیان كوڕانی مامیان كە (كورتە باڵابوون) خستۆتە سەر شانیان لەكاتی ڕۆیشتندا.. هەروەها سەرەڕایی پێچەوانەی بەشەكانی زەویو كەم كردنەوەیان (بەحوكمی كاری جێگیری ڕۆشن كردنەوەی بەرەحمانەی خودا بۆ هەركەسێك بەسەری دا بڕۆشتایە، بەڵام هەر بەحوكمی ئەو ژیانە جێگیرە ڕووناكەوەش خۆشەویستیو سۆزو بەزەیی لە نێوانیاندا بڵاوببووەوە.

خودای پەروەردگاریش ڕزقو ڕۆزیی ئەوانی والێكردبوو، كە لەگەنجینەكانی ئەو ڕەحمەتەی خۆیەوە پەیدا بێت، كە لە یاسای ڕووناك كردنەوەی پڕ ڕەحمەتی خۆیەوەو بەپێی ماندووبوونو ڕێو شوێنێك بۆی دانابوون، تەنانەت بەپێی خواستو ئیرادەی واقیعیانەی ئەو خەڵكەش بووە، ئەمەش حاڵو بارودۆخی هەموو ژیانێكی مولكدارانەیە، بەتایبەتیش لە بەهەشتەكاندا. جا ئەگەر ئێستا ئێمە تێیان ڕامێنینو ئەو جۆرە ژیانەشیان لەلای خەڵكی ئێستا زانراوبێت، ئەوا حەسوودیو ئێرەییان پێ دەبەن، چونكە ئەوان چەندان هێندەی ئەو ئادەمیزانە بوون، كە ئێستا

لەسەر ڕووی زەویی دەژین، چەندان هێندەی ئەفسانەیی بوون، کە ناژمێررێت‌و هیچ عەقڵێکیش بەخەیاڵیدا نایەت، چونکە ئەوان لەوپەڕی چاوتێری‌و بەختەوەرییدا دەژین، جگە لەوەی هیچ نەخۆشی‌و دەردو پەتایەکیش هەرگیز ڕوویان تێ ناکات، ئەمەش لەبەر نەبوونی ئاسەوارێکی ئەو دیاردانەی کە ئەو دەردو پەتایانە بەهۆی هەمە جۆری‌و تێکەڵاوبوونیانەوە دەخولقێنن، هەروەها هیچ وجودێکیش بۆ حوکمی مردن لەو خاکەیان دانیە، ئەمەش بەهۆی بڵاوبوونەوەی گیانی چەسپێنراوی ژیان تیای دا.. تەنانەت گەر بتوانرێت مردوویەك ببرێت بۆ ئەوێ، ئەوا بە لەش ساغییەوە هەڵدەستێتەوەو لە هەموو دەردو نەخۆشیەکیش چاکبۆتەوە. لەوانەشە تۆ بپرسیت‌و بڵێیت: دەی باشە ئەم جیاوازییە بەرفراوانە خەیاڵییە چییە لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز وای باس کردوون کە ئەوان تێکدەرو فاسیدن لە زەویدا (مفسدون في الارض)؟ منیش لە وەڵامدا پێت دەڵێم: هەر لە هەمان سەرچاوەی پیرۆزەوە کە قورئانەو لە سوننەتی چڕوپڕ بەرەکەتی پێغەمبەریشەوە ﷺ دەتبەمەوە بۆ خاڵی سەرەتاو بنچینەی مەسەلەکان.. ئەوەبوو وەك پێشتر باسمان کرد دوای ئەوەی یەکەمین باب‌و باپیرە پێشینەکان دابەزینە خوارەوە بۆ نێو ناخە بنەڕەتییە ڕۆشن کراوەکەی زەوی و، دوایی زاوزێ‌و زۆر بوونی نەوەکانیان (بەو ڕەنگەی کە لەمەو پێش ڕوونمان کردووەوە) پارچە زەویەکانی سەر ڕووی هەسارەی زەوی کە لەوبەرەوە نزیك بوون، خاڵی پێك گەیشتنی ئەو توێژە زەمینیە بوون کە دراوە بەسەر رووی زەوی‌و بەسەر ناخی خوارەوەی ئەو زەوییە ڕاستەقینە بنەڕەتییەشدا کە پێشتر وەسفمان کردو، کە لە سوورەتی (فجر)یشدا لێی دواین، ئەو پارچە خاکانەش پڕ کرابوون لە نەوەکانی ئامۆزاکانی ئەمان‌و لەو هۆزو تیرە هەمەچەشنانەی تری وەك (تەتەر)و (مەغۆلەکان) بوون، هەروەها لە سەرجەم تیرە هەمە جۆرەکانی تری مرۆڤی سەرەتایی بوون کە بناغەی هەموو ئەو ڕەگەزە مرۆیی یانەی ئەمرۆن‌و ئەم پارچە زەوییانەی تریان ئاوەدان کردۆتەوە، یان بناغەی پەیوەست بە هەموو ئەو نەتەوانەی ترن کە لە ناوچەکانی تری دەوروبەریانەوە هەبوون‌و نەوەکانیان

بەشێوەیەکی بێ سنوور زیادیان کردووە. بێگومان نزیك بوونەوە لەهەر تیرەیەك لەو تیرانەش لەو کەندەلانەی زەوییەوەکە (یەئجووج‌و مەئجووج) تیایدا نیشتەجێ بوون، کارێکی مەحاڵ بووە، چونکە سام‌و هەیبەتێکی وای لێوە دەرکەوتووە کە بەهێزترین دڵی لەرزاندووە، بەڵام دواتر دەرچوونی هەندێك دەستەو کۆمەڵی (یەئجووج‌و مەئجووج) بۆ دەرەوەی خاکەکەیان دەستی پێ کردووەو، هەر لەگەڵ دەرچوونیشیاندا کەوتوونەتە بەر پەلاماری (داب‌و نەریتی باوی ڕەگەزەکان) کە حوکمی سەر ڕووی زەویی دەکردو، ئەوانیش بە نەمانی ئەو جوانیە ڕۆشن بۆوەی کە تیایاندابوو، گەڕاونەتەوە سەر بنچینەی ڕوخسارەکانی پێشوویان‌و بەهەمان ڕەنگ‌و ڕوخساری باب‌و باپیرەی یەکەمیانەوە دەرکەوتوونەتەوە، واتە بەو ڕەنگەی کە لەسەر شێوەو هەیئەتی فیل بوون، سائیتر زەبەللاحەکانیان بووبن، یان کورتە بالاو بچووکەکانیان. بەم ڕەنگەش لەوپەڕی کاملی‌و ڕێك‌و پێکیی ڕەوشتمەندیی یەوە کە لەو خاکەدا پێیانەوە لکابوو، هەڵگەڕاونەتەوە بۆخراپترین نەریت‌و ئاکار لە توندی‌و ڕەقی‌و شەڕخوازی‌و کرداری شەیتانیانەوەو، بەئەندازەیەکی هێندە ترسناکیش کە هیچ عەقڵێك بەخەیاڵی دا نایەت، ئەوان بەم ڕەنگە بوون‌و پێچەوانەی هەردوو ڕێساکەی (ڕۆشنکردنەوە)و (ڕەگەزەکان) بوون، ڕێسای (ڕۆشنگەری) ڕووخسارەکانی ئەوانی بۆ چەند شان‌و شکۆیەکی بەسام‌و بەڕێز گۆڕیوە، ڕێسای ڕەگەزەکانیش کە لەسەر ڕووی زەوی تووشی بوون هەڵیگەڕاندوونەتەوەو، کردوونی بەچەند ئاژەڵێکی دڕندەو چەند تارماییەکی شەیتانییانەی ئەفسانەیی.

لەم حاڵەتەشدا دەشێت کەوتبنە بەر مردن، ئەگەر مردن یەخەی پێ گرتبن، بەڵام کێ توانیویەتی بەرامبەریان بوەستێت‌و خۆی ڕاگرێت، لە کاتێکدا ئەوان خاوەنی ئەو هێزە ئەفسانەیی یە ترسێنەرو نائاسایی یە ڕیزپەڕ بووبن و، ئەو هەموو نەریتە خراپ‌و شەڕخوازانەشیان هەبوو بێت کە هیچ ئارام‌و حەوسەڵەیەك لە بەرامبەریاندا ناگیرێت؟!

ئەو هێرش‌و شاڵاوانەی بۆ هەر لایەکیان دەبرد، وەك چەند گەردەلوولێکی تێکدەر بوون کە پەلی بۆ چەند ناوچەیەکی فراوان‌و دوورمەوداش دەهاویشت، ئەمەش بەهۆی ئەو توانایەوەی کە ژیانە ڕۆشنکراوەکەیان لەچەند هێزێکی نائاساییەوە پێی بەخشیبوون‌و، کە چەندین وزەی لەڕادەبەدەریشیان لە بڕینی ماوەی ڕێگاکاندا بەخێراتر لە ڕۆشتنی باڵندە بۆ مەیسەر بوو، تاوای لیّ هات فەسادو خراپەیان گەیشتە قووڵایی ناوچەکانی ئەو وڵاتانەی کە ئەمڕۆ بە (وڵاتانی هیندو چین) ناودەبرێن و، گەلێك وڵاتی دوورتریشی گرتەوە کەلەو سەردەمەدا ناوەکانیان دیاری نەکرابوون. هیچ شتێکیش (هەر چییەك‌و هەر چۆنێك بوایە) لە بەرامبەر شاڵاوی ترسناك‌و تۆقێنەری ئەوان دا نەدەما، ئەوان هیچ مرۆڤێك‌و هیچ ئاژەڵێکیان فەرامۆش نەدەکرد تا بەزیندوویی دەیانخوارد، هەروەها گشت ڕووەك‌و درەختێکیان نەدەهێشتەوە بەساغی، بەڵکو یان دەیانخوارد، یاخود تێکیان دەداو لەناویان دەبرد.. تەنانەت گەر گەلێك لەسەر چیایەك یان پێدەشتێك دا بووبن، ئەوانیشیان بە دارو درەخت‌و کێڵگەو مەزراکانەوە ڕامالیوە، کەواتە ئەوان چ گەردەلوولێکی وێرانکەر بوون؟ ئەی داخۆ چ ترس‌و بیم‌و بەڵایەکیان خولقاندبێت؟! لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێك بۆ زەوی یەکەی خۆیان هاتبنەوە، باسی ئەو ڕووداوانەیان نەکردووە کە خۆیان خولقاندوویانە، بەڵکو دەسبەجێ دەچوونەوە سەر حاڵەتە بەڕێزو شکۆمەندییەکەی خۆیان‌و سەر ڕوخسارە ڕێك‌و پێکە پڕشنگدارەکەنیان جا بەحوکمی زانین‌و ئاگاداربوونی سرووشداریی پڕشنگدارێتییانەوە مەبەستیان لە دەرچوونیان، گەیاندنی سوودو کەڵك بووە بە کوڕانی ئامۆزاو خزم‌و کەس‌و کارەکانی خۆیان‌و لەو گەلانەی تردا، بەڵام نەیانزانیوە کە ژیانی هەموو ئەوانە تێك دەدەن‌و لەناویان دەبەن، بێگومان ئەوان بوونەتە هۆی قڕکردنی چەندین هۆزو تیرەی بیّ شومار لە ئامۆزایان‌و کەس‌و خزمانیان، تەنانەت ئەو ناوچانەو بەشەکانی دەوروبەریشیان تاماوەیەکی زۆر لە مرۆڤ چۆڵ ببوون.

هەر بۆیەش خودای مەزن ((ذوالقرنین))ی بۆناردن تاکو ئەوان لەو شەڕو بەڵا هەرە ترسناکە ڕزگار کات. جا بزانە ئەگەر ئەوەی زانایان لەو ناوچانەو دەورو بەریان دۆزیویانەتەوە، وەك ئاسەواری هاوشێوەو وێکچووی چەند جەستەیەکی نیمچە مرۆیی‌و کە لەشێوەی ئاژەڵەوە نزیکن، ئەوە لە بنەڕەتدا لاشەی هەندێك لەوانەن کە چەند تیرەیەك توانیویانە بیانکوژن..

زانایانیش گومانیان وابووە کە ئەو لاشانە تەنەکانی ڕەگەزێکن لەو مەخلووقانەی کە لەپێش مرۆڤدا زەوییان ئاوەدان کردۆتەوە. ئەمەش هەڵەیەکی دیارە، چونکە یەخچاڵ (سەللاجە)کەی (سیبریا) ئەم دەروازەیەی داپۆشیوە کە دەچێتە خوارەوە بۆ نێو ناخی زەوییە ڕۆشنکراوە بنەڕەتی یەکە.

هەر ئەو دەروازەیەشە کە بەربەستەکەی (ذوالقرنین)ی لەسەر بنیاتنراوە، کە بەیارمەتی‌و کۆمەکی خودا توانی ی بنیاتی بنێت.

لەوانەشە بپرسیت: (ذوالقرنین) - سلاوی لێ بێت- چۆن توانیویەتی بەربەستەکەی نێوان هەردوو لوتکەی چیاکە لە ڕاست‌و چەپەوەو لەنێوان نۆکەندە بەرزەکەو نۆکەندە نزمەکەی توێژاڵی زەویدا بنیات بنێت، لە کاتێکدا ڕووبەری نێوانیان دەگاتە نزیکەی یازدە فەرسەخ بەرامبەر نیو فەرسەخ؟! ئەی داخۆ بڕی ئەو پارچە ئاسنە گەورانەو پارچە مسەکانیش چەند بووبن کە بەکاری هێناون؟ ئەی چەند تیرە بەشدارییان لەگەڵدا کردووەو یارمەتییان داوە لە بنیاتنانی ئەو بەربەستە قەبەو ئەفسانەییەدا ؟! پاشان بۆچی هەر بەتایبەتی ئاسن‌و مسیان تێکەڵ کردووە.

منیش لە وەڵامدا بەو ڕەنگەی کە خودای زاناو دانا دەریخستووە پێت دەڵێم:-

ئەوانەی لەگەڵ (ذوالقرنین)دا بەشدارییان لە بنیاتنانی بەربەستەکە کردووە، لە پیاوانی ئەو تیرەو هۆزانە بوون‌و، تەنها حەوت پیاویش بوون، هیچ کەسێکی تریشیان سا ئیتر لە لایەنگرانی، یان لە سەربازانیشی بەشداریی ئەو کارەیان

نه‌كردوه‌، چونكه‌ فه‌رمانی به‌ هه‌موو تیره‌و هۆزه‌كان‌و سه‌ربازه‌كانیش كردووه‌ كه‌ بۆ ماوه‌یه‌كی وه‌ها له‌و جێگه‌یه‌ دووركه‌ونه‌وه‌ كه‌وا له‌به‌ر چاویان نه‌مێنێت‌و هێنده‌ دووركه‌ونه‌وه‌ كه‌ توانای دیتنی كاره‌كه‌و ڕووداوه‌كه‌یان نه‌بێت، بۆیه‌ش (ذوالقرنين) حه‌وت پیاویانی له‌ هه‌ره‌ خواپه‌رستترینیان‌و له‌ به‌تواناترینی پیاوانی ئه‌و تیرانه‌ هه‌ڵبژاردوه‌، هه‌رچه‌نده‌ پێویستیی به‌ كه‌سانی‌تریشیان هه‌بووه‌، به‌ڵام خودای به‌هێزو باڵاده‌ست خۆی بۆی ئاسان كردووه‌، ئه‌مه‌ش به‌پێی ئه‌و هه‌واڵه‌ی كه‌ خودای حه‌ق‌و مافپه‌روه‌ر له‌ كتێبه‌كه‌یدا ڕایگه‌یاندووه‌و فه‌رموویه‌تی:-﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ الكهف﴾، هه‌روه‌ها به‌گوێره‌ی ئه‌و فه‌رمایشته‌ی تری خودا ده‌رباره‌ی وه‌ڵامی (ذوالقرنين) بۆ ئه‌و پرسیاره‌ی هۆزه‌كان كاتێك داوایان لێكرد كه‌وا پاره‌و ماڵی بۆ كۆده‌كه‌نه‌وه‌ له‌ به‌رامبه‌ر بنیاتنانی به‌ربه‌سته‌كه‌داو، كه‌ ئه‌ویش پاداشتی خودای به‌باشتر زانی: ﴿...فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ ...﴿٩٥﴾ الكهف﴾.

به‌ڵام بۆیه‌ ته‌نها ئه‌و حه‌وت پیاوه‌ی به‌شداری كاره‌كه‌ی خۆی كرد تاكو ئه‌و پیاوانه‌ خۆیان‌و هۆزه‌كانیشیان پاداشتی كرێی به‌شدارییكردنیان ده‌سگیر بێت كاتێك هۆكاره‌كانیان ده‌سته‌به‌ركردو كاروباری شاراوه‌ی حوكمرانیشیان ده‌رخست و، له‌مه‌شه‌وه‌و به‌م هۆیه‌وه‌ ئه‌و پیاوانه‌ی هه‌ڵبژارد، ئه‌و حه‌وت پیاوه‌ش ئه‌وانه‌ن كه‌ خودا له‌ فه‌رمایشته‌كه‌یداو له‌ باسی چیرۆكی (ذوالقرنين)دا ـ سلاوی لیّ بێت ـ ده‌سنیشانی كردون‌و له‌سه‌ر زاری (ذوالقرنين)یش فه‌رموویه‌تی: ﴿...فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ الكهف﴾: .

برِی ئەو پارچە ئاسنە گەورانەش، کە بەکاری هێناون قورسایی حەوت (رەطل)[1] یان هەبووەو لە قاپێکی گەورەدا دانراوە، پاشان فەرمانی پێ کردوون، کە حەوت جار هاواری (الله اکبر) بلێنەوەو خودا بەگەورە بگرن و، ئاگرێك بکەنەوەو، ئینجا لەگەڵ فووتێکردن دا حەوت جار (الله اکبر) بلێنەوە. ئیدی بەم ڕەنگە (ذوالقرنين) ئاسنە تواوەکەی بۆ ئامادە کراوە. فەرمانی بەو کەلەبەرەش کردووە، کە بەمۆڵەتی خودا بێتەوە یەكو دابخرێت، کەلەبەرەکەش هاتۆتەوە یەكو داخراوە تا وەك پەنجەرەیەکی بچووکی لێ هاتووە، ئینجا (ذوالقرنين) بەدەستی خۆی تەختی کردووەو بەپێی ئەو وزەو توانایەی، کە خودا پێی بەخشیبوو تاوای لێهاتووە ڕووبەرەکەی (مەترێك بە نیومەتر) بێت بەپێی پێوەرەکانی ئەمڕۆمان، ئەوەش لەو پەڕی ڕێکیو تەختی دایە، پاشان پارچە لەوحێکی گەورەی لە بەرد، کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادەی کردبوو، خستۆتە سەری، ئینجا فەرمانی بە هەر حەوت پیاوەکە کردووە، کە قاپە گەورەو پڕ لە ئاسنە تواوەکە بەدەم (هاواری (الله اکبر)و خوا بەیەك دانانەوە) هەڵگرنو بیخەنە بەردەستی، ئەویش ئاسنە تواوەکەی کردووە بەسەر بەردە گەورەکەو ئەو درزو کونانەیدا، کە لەچوار دەوری کەلەبەرەکەدا هەڵیکەندبوون تاکو بەتەواوەتی لەگەڵیدا یەك بگرن، پاشان برێکی لەو جۆرەی لە مس تواندۆتەوەو بەهەمان شێواز کردوێتیی بەسەر ئاسنەکەدا، ئەمەش بەپێی ئەو حیکمەتو خواستەی خودا بوو، کە خودای خاوەن هێزو حیکمەت بڕیاری بۆ دابوو، پاشان (ذوالقرنين) فەرمانی بەزەوی کردۆتەوە کە بەئەمری پەروەردگاری بەتوانا بچێتەوە سەر دۆخی پێشووی لە درێژبوونەوە، زەویش درێژبۆتەوەو بەئەمری خودا وەك خۆی لێ هاتۆتەوە، ئیدی خێرا ئەو بەربەستەش لەگەڵیا کشاوەو بەقەد فراوان

---

١) (رەطل) جۆرە پێوەرو کێشانەیەك بووە کە لە هەر وڵاتێکدا بەشێوەی تایبەتو لێك جودا بەکارهاتووە، بەشێوەیەکی گشتی لە میسرو چەند وڵاتێکی تردا هەر (رەطلێك) دوازدە (ئۆقە) بووە، دیارە هەر ئۆقەیەکیش سێ کیلۆ غرامو نیو بووە.

بوونەوەی کەلەبەرەکە لەگەڵیا فراوان بووە، بەڵام هەر لەسەر شێوازێکی نایابی ڕێکی‌و تەختی‌و بڵندیی بووە، سەردەمێك لە دوای ئەمەش سەهۆڵبەندانەکە پەیدا بووە تاوەك ئەم حاڵەتەی ئەمڕۆی لێهاتووە.

کەواتە بزانە (ئاسن) ئەرکێکی گرنگی هێزو توانای توندی هەیە، ئەمەش سیفەتێکیەتی کە خودای خالق‌و کردگار پێی بەخشیوە، وەکو لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿..وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ..﴿٢٥﴾ الحديد﴾.. واتە: (هەروەها لە ئاسنمان دروست کردووە کە مادەیەکی ڕەق‌و هێزداری توندەو، لەهەمان کاتدا چەندین کەڵکیشی بۆ خەڵکی تێدایە).

جا ئەگەر لەنێو خۆی زەوی یە ڕۆشنکراوەکەوە تیشکەکانی خۆرهەڵاتنی لەسەر ڕەنگ بداتەوە، ئەوا ژیانێکی لەباری پێ دەدات‌و دەیانکاتە چەند تیشکێك لە هێزو ڕەقیی ئاسن‌و بەنێو ئەو بەردەدا کە (لە خوارووی ماوەیەکی یەك فەرسەخی یەوەیە) دەچێتە خوارەوە.

ئەوەش حیکمەتی دانانی بەردەکەیە لە پێش دانانی ئاسنەکەدا، چونکە کایەی پۆزەتیف (لەبار)ی ڕۆشنکاریی، کە ڕێگە بەشتە سرووشتی یەکانی دی نادات، گەر هەرچییەکیش بن، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتی ڕاستەقینەو زیندوانەی نین تەنها ئەوە نەبێت، کە بە فەرمانی خودا تیایدا دانراوە، ئەوا ئیدی (کایەی ڕۆشنکاری) مۆرکی بنەڕەتی خاکی زیندووی بە بەردەکە بەخشیوە، چونکە بەگەڕخستنەوەی ژیانی لەبارو، پاشان ژیاندنەوەی گیانی ئەو ژیانەو لەو ئاسنەدا، کە لە سەرووی دایە تاکو وزەو تینەکەی بۆ ناوخۆی خوارەوە (ناوەوەی زەوی بێت) بەگوێرەی خواست‌و ئیرادەی دانایانەی خودایە، ئەمەش چونکە سروشتی ئەو گەوهەرە بنەڕەتە ڕۆشنانەی کە بەگیانی لەباری ژیان ڕۆشن کراونەتەوە، وای لێدەکات ئیرادەی دوێنراوی پەسندکات.

لەمەشەوە خواستی (ذوالقرنین) لەنێو بەردەکەدا پەخشکراوە، واتە لە ڕەنگدانەوەی هێزو توندیی ئاسنەکەوە بۆ نێوخۆی خاکەکەو بەپێی ئەو قەزاو قەدەرەی کە خودای داناو زانیار بڕیاری لەسەرداوە.

لەسەر ئەم بناغەیەش یەك رەطل لە ئاسن، ئەگەر بکەوێتە بەرکایەیەکی ڕۆشنکردنەوە، ئەوا کایەی هێزی توند (البأس الشدید)ی بۆ ماوەی (فەرسەخێکی سێ جا) لێ دەردەچێت، چونکە هەر حەوت ڕەطلەکەی ئاسنەکان کایەی هێزی توندیان لێوە دەرچووە، کە دەگاتە (حەوت فەرسەخ سێ جا) بۆ نێو خاکە ڕۆشنکراوەکە.

جا ئەگەر بڕوانیت بۆ ڕووبەری (١١ * ٥ر.) فەرسەخ، کە ماوەی فراوانبوونەوەی کەلەبەرە بنەڕەتییەکەیە، ئەوا تێدەگەیت، کە چ وزەیەکی بەرجەستە لە هێزی توندی ئاسنەکە بەوپەڕی ڕاگرتنەوە بەسەر مەوداکانی ئەو کەلەبەرەو بەماوەی یەك فەرسەخدا دابەش بوون، کە پاڵ بە هەرکەسێکەوە دەنێت بۆ خوارەوە گەر بیەوێت بەسەر ئەو بەرزاییەدا سەرکەوێت، کە ڕێگەیەك بووە بۆ چوونە درەوە لە ناوەوەو، تاکو هیچ کەسێکیش نەتوانێت دەریخات، یان لێی نزیك بێتەوە، خودای مەزنیش بۆیە فەرموویەتی:- ﴿ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾ الكهف ﴾.

ئەوان هەرجارێك خەریك بوو نزیك دەبوونەوە لەکایەی هێزە توندەکەی ئاسنەکە، یەکسەر کۆمەڵێك تیری ڕێك و سەنگینیان بەسەردا دەباری و نەیدەهێشت بگەنە ئەو بەرزاییەی کە ڕێگای دەرچوونیان بۆ دەرەوە بۆ ئاسان دەکردن. پاشان ڕازو نهێنیی هێزی ئاسنەکەیان بەسەردا ڕەنگ دەدرایەوەو وایان لێدەهات لەنێو خۆیان دا لەیەکتریان دەداو سزاو تەمێی یەکتریان دەدا بێئەوەی کەسێکیشیان زامداربێت، ئەمەش بەهۆی نەبوونی زام و دەردو مردن لەو شوێنەدا، وەك پێشتریش باسمان کرد!!

بەڵام بەهۆی ئەو خۆشەویستیو سۆزو بەزەیی یەی کە لەنێو خۆیان دا بۆ یەکتریان هەبووە، دەروونیان ئازاری دەچەشت بەوەی گەر بەو شێوەیە پەلاماری یەکتر بدەن کە لەکاتی نزیك بوونەوەی ئەو کایەیە (مجال)ە دا بەیەکتریان دەکرد. بۆیە دەبینین ئەوان لە مەودایەکی دیاری کراوو لەو کایەیەوە نۆرەی پاسەوانێتی یان بۆ خۆیان ڕێك خستبوو تاکو سەعاتی وادەی لێ نزیك بوونەوەیان لێ تێك نەچێتو نەکەونە بەر ئەو نەفرەتە سەیرو سەمەرەیەی کە وێنەیەکی سەرسوڕهێنی هەیە، بەڵام ئەو مسەی کە (ذوالقرنین-سڵاوی لێ بێت) بەسەر ئاسنەکەدا ڕژاندوویەتیو تێکەڵی کردووە، مەبەستی لەو کارەدا بەدی کردنی ئەو گیانە ڕۆشن کراوەیە بووە کە ئاوێتەی گوڕو تینی ئاسنەکە بووە، تا کارلێكو کاردانەوەی مسەکە لەگەڵ ئاسنەکەدا بەدیی بێتو وەك وزەیەکی تیشکدەری برووسکە پرژێن بێت بەرامبەر هەر کەسێك کە بیەوێت سووکایەتی بە تەنی بەربەستەکە لەدەرەوە بکات ئەگەر پێ ی گەیشتبێت.

بەشێکی ماوەو دیاری ئەم بەربەستە لەسەر ڕووی زەویش هەبوو، کە تاماوەی نزیکەی سێ سەدساڵێك بوو، پاشان دیار نەماوەو لەژێر چیا بەستەڵەکی یەکانی (سیبریا)دا شارراوەتەوە تاکو بەهۆی ئامرازەکانی فڕینی وەك فڕۆکەکانیشەوە نەدۆزرێتەوە، یان بەهۆی هەر ئامرازێکی ترەوە، بەم پێ یەش گران بووە لەسەر مرۆڤی گەر بگاتە ئەو شوێنە، ئەمەش هەر ڕەحمەتێکی تری خودایە بەبەندەکانی.

هەروەها ئەم بەربەستە هەر چەندە بەو ساکاری یە بنیان نراوە کە ئاسنو مسی تیادا بەکارهێنراوە، بەڵام لە پتەوی دا هێندە بەهێزو تۆکمەیەکە هەرگیز مەزەندە ناکرێتو تێك نادرێت تەنانەت گەر هەزار بۆمبی ئەتۆمیشی بەسەردا بتەقێنرێتەوە ئەوا تاکە (ئینج)ێکی لێ ناشکێت.. چونکە ئەمە بەکۆمەكو هاوکاریی خودای بەهێزو بەتوانا بنیات نراوە.

پاشان ئەگەر بۆ ئەو حیکمەتە بڕوانین کە ئۆرگانــە کانزاییییـەکانی بەربەســتەکە بەو هێزەیان بەخشیوە، ئەوا دەبینین لەژیانی ڕێسا پۆزەتیڤەکەی ڕۆشــنکاری یــەوە دەرهاوێژراوەو ئەو ئۆرگانو ڕەگەزانەش ڕێسایەکەیان لــەناخی زەوییــە بنــچینەییە ڕۆشنکراوەکەوە وەرگرتووە. لەلایەکی تریــشەوە (ذوالقــرنین) ـــ ســلاوی لێ بێــت ـ بەربەستەکەی بۆ بنیات نەدەنرا، تەنها بەو یارمەتیو کۆمەکەی خودا نــەبێت، کــە زانستو توانای پێ بەخشیبوو، ئیــدی چــۆن حاڵەتــە ئاســاییییەکان لــە بەردەمیــدا نابەزێنرێت.

بەربەستەکەش بەردەوام لەسەر ئەم حاڵەتەی دەمێنێتــەوە تــا ئــەو کاتــەی کــە خــودای زانــا بڕیــار لەســەر تــەختکردنی دەدات لــە ڕۆژی نزیکبوونــەوەی بەڵێنــە ڕاســـــتەکەیدا لەســـەر هـــــاتنی قیامـــەت، وەك لـــە ســـوورەتی (کهـــــف)دا فەرموویـــــەتی: ﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ الكهف﴾.

جا بۆ ئەوەی سینەشت فێنكو دڵت ئارام ببێتەوەو، عەقڵو هۆشت ڕۆشنو ڕوون بێتەوە، ئەوا بۆ زیاتر ڕوون کردنــەوەو لەگەنجینــەی پــڕ زانــستی خوداییییــەوە ئــەو زانیاری یەشت بۆ زیاد دەکەم، کە ڕاســتگۆی متمانــە پێکــراو، واتــە پێغەمبــەری (الصادق الامین) ﷺ لە دوایین سووڕی بلندی ی دا بەناوی (عبدالله المهدی)یــەوە ـ سلاوی لێ بێت ـ هەواڵی لەسەر داوەو، وەك لە (الشرح المبین)دا باسکراوە.. بۆیە لەم بارەیەوە پێت دەڵێم:-

(یەئجووج ومەئجووج) لە پشت ئەو بەربەستەیانەوە ناتوانن دەرچن، مەگەر بــە فەرمانی خودای مەزن نەبێتو لەکاتی نزیك بوونەوەی وادەی بەڵێنــە ڕاســتەکەیدا لەسەر هاتنی قیامەتی گەورە، وەك خودا لە سوورەتی (کهــف)دا هــەواڵی لەســەر داوەو لە فەرمایــشتە پیرۆزەکەیــدا هــاتووە: ﴿...فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ

وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا﴾، له سوورەتی (انبیاء)یشدا ئەم فەرمایشتەی خودای لەبارەوە هاتووه:-

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٩٧﴾ الأنبياء. بێگومان بەڵێنی خودا هەر دێتەدی (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ)..

بەڵام دوای کۆتایی هاتنی ماوەی حوکمی ئیمامی گەوره (عبدالله المهدی) ـ سڵاوی لێ بێت ـو که دوای فیتنەی (مەسیحی جادووگەر) دێت که پێشتر له تەفسیری سوورەتی (فجر)دا باسکرا، جا کاتێك ئەو پیاوه نەفرەت لێکراوەش خۆی له ئایەتو ڕێنمایی یەکانی خودای پەروەردگاریدا دەماڵێتو، سیمای بەهەشته نوورانیەکەی (إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ)ی لێ دادەبڕێت و، لەبەر سەرکەشیو یاخی بوونیشی دادەبەزێته سەر زەویو دەست بەدنیاوه دەگرێت، ئیدی لەو ڕۆژەدا زەوی له حاڵەتی ڕۆشن بوونەوەیەکی تەواو به ڕووناکیو نووری پەروەردگاری دایه.. وەك له سوورەتی (الأعراف)دا هاتووه، که دەفەرموێت:-

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦﴾ الأعراف.

واتە:- (ئەی پێغەمبەر هەواڵو بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بۆ بخوێنەرەوە، کە فەرمانو ڕێنماییی یەکانی خۆمان پێ ڕاگەیاندبوو، کە بۆ پێغەمبەرەکەمان ناردبووە خوارەوەو کەچی ئەو شەیتانی بەدواوە بووو شەیتان ئەوی دابووە پێش خۆی و، ئەویش چووە ڕیزی گومراو لەناوچوانەوە، خۆ ئەگەر خواستمان لێی بوایە، ئەو کابرایەمان بەو ئایەتو ڕێنماییانەمان بەرزو سەنگین دەکرد، کەچی ئەو خۆی سەری کردە سەر ژیانی فریودەری دنیاو، تەنها بەجوانیەکانی دنیا قایل بوو، نموونەی ئەم جۆرە کەسەش، وەك نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەریکەیت، یان دەرینەکەیت، یان پیایدا هەڵشاخێیت، یاخود وازیشی لێ بهێنیت، هەر زمان دەردێنێتو لە هەناسە برکێ دایە.. بەڕاستی ئەمە نموونەی ئەو کەسانەیە، کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆزانیوەو باوەڕیان پێ نەهێناوە.. جا تۆش ئەم جۆرە هەواڵو بەسەرهاتانە بۆ خەڵکی بگێڕەرەوە، تاکو هەڵوێستەو تێفکرینیان هەبێت).

جا لەو ڕۆژەدا، کە ئەم پیاوە خۆی لە ئایەتو فەرمانەکانی خودا دادەماڵێتو سەرپێچیان لێ دەکات، زەویش لەوکاتەدا (لە حاڵەتی ڕۆشن بوونەوەیەکی تەواو بە نووری پەروەردگارییەوە)ی دایە، بێئەوەی، کە (هەڵبەتە) هیچ چرپیەکی لەسەر مابێت، مەگەر ئەوەی ناخی نەبێت، وەك ئەو بەربەستەی، کە ڕێ لە دەرچوونی (یەئجووجو مەئجووج) دەگرێت. جا بە هاتنی مەسیحی جادووگەر (دجال)و نەفرەتلێکراویش بۆسەر زەوی، هەر شتێك چاوی بەسەر بکەوێت دایدەپۆشێتو ڕووی زەویش بە ڕووپۆشێك لە خۆڵەمێش دادەپۆشێت، کە ڕەنگی خۆڵەمێشەکە لە ڕەنگی ڕەشەوە نزیکە، بەوەش چەندین دیمەنی بەرجەستە لە دەریاو ڕووبارو کێڵگەو درەختەکان دادەپۆشێت، بەڵام حاڵەتە ئیجابییە ڕۆشنکراوە زیندووەکەی بۆ داناپۆشێرێت. پاشان هەموو کۆشكو خانووو ڕووبارەکانی بەهەر حەوت باخەکانی (ئیرەم)ە وە دێنە سەر زەویو لەو ئاگرە پیرۆزەدا دەپێچرێنەوە، کە خودای بەرزو باڵادەست لە سوورەتی (نمل)دا لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿...أَنۢ بُورِكَ مَن فِي

ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨﴾ النمل﴾، واتە بانگی لێکراو پێی گوترا: (پیرۆزو پاکژو خوا پێداون ئەو کەسەی، کە لەپاڵ ئاگرەکەدایەو، ئەو مەلائیکەتانەش کە لە چواردەوری شوێنی ئاگرەکەدان). ئەو ئاگرەش ئاگرێکی پیرۆزەو هەرگیز شت ناسووتێنێت هەرچەندە بارستاییەکەی گەورەو سیفەتێکی سامناکیشی هەبێت، چونکە بەقەد ئەو لە ئاکامو شوێنەواری ئەوەشدا ئەو جادووگەرە نەفرەت لێکراوو درۆزنە بەیارمەتی شەیتانو سەربازانی شەیتان شتە دروستکراوە خەیاڵییەکانی لەسەر ئەو ڕووپۆشەی کە بەسەر ڕووی زەویدا داوە، دادەنێت، وەك ڕووبارو خانووو باریگەکانی کە بەزمان وەسف ناکرێت ئەویش بەحوکمی توانا ستەمکارییەکەیەوە. فیتنەو ئاشووبی ئەم کابرایە (نەفرەتی خودای لەسەر بێت) لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا (عیسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ کۆتایی دێت کە (عیسا) بە قەمە ڕۆحانییەکەی (الحربة الروحانية) لێی دەدات و، پاشان مەلائیکەتی سزا دەیخەنە دۆزەخەوە (ئاگرەکەوە)، چونکە حوکمی مردن لەکاتی هاتنی ڕۆژیی دوایی تا ڕۆژی قیامەتی گەورە ڕاوەستێنراوە.

پاشان پێغەمبەری خودا (عیسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ فەرمان بەئاگرە پیرۆزەکە دەکات کە بۆ ئاسمان بەرزبێتەوە بەو کۆشكو خانووانەی (ئیرەم)ەوە کە لەنێوی دانو، بەو (خەڵکەوەی تێی دان)و (بەو کەسانەوەش کە ئازایەتییان لە چوونە نێویەوە پێدراوە کاتێك پێی دەترسێنران) بە هەموو ئەمانەوە بەرزبێتەوە، ئینجا هەر ئەوانەشن کە دەگەڕێنەوە بۆ ئاسمان.

بەڵام پێغەمبەری خودا (عیسا) ـ سلاوی لێ بێت ـو جێنشینانی ئیمامی گەورەش ـ سلاوی لێ بێت ـو هەموو ئەو نەتەوەو هۆزانەش کە لە دوایانەوە بوون، سرووشی ئەوەیان بۆ دێت کە بچنە پاڵ (بيت المقدس)و (مسجد الحرام)و ئەم دوو جێگە پیرۆزەش لەو ڕۆژەدا لە سیمای گەوهەریانەی پڕشنگدار بووی خۆیان دان، هەروەها سرووشیان بۆ دێت، کە بچنە (مەدینە)ی نوورینو ڕۆشنکراو بەسنوورە

بنچینەییەکانی ئەوسای زەمانی پێغەمبەری خودا (محمد) ﷺ کە لەو دیمەنەیدا خودای حەق کردوێتی بە گەوهەرو خاکی درەوشاوە، ئەوەش بەتیشکی ڕۆشنکەرەوەی زەوی کە بە نوورو ڕۆشنایی پەروەردگاری خۆی لەدوای هاتنی قیامەت ڕۆشن بۆتەوە.. خودا ئەم خاکەی لە (یەئجووج و مەئجووج)یش پاراستووەو ناهێڵێت بچنە ناویەوە.

لێرەوە ڕازو نهێنیی سرووشی خودا بۆ پێغەمبەری خۆی (عیسا) دەردەکەوێت کە خۆی و هەموو ئەو نەتەوانەی لەگەڵیدان بچنە نێو ئەو جێگە ڕێزلێگیراوو پیرۆزانەوە، ئەمەش لەبەر نزیکبوونەوەی بەڵێنی حەقی خودا لەسەر دەرچوونی (یەئجووج و مەئجووج)، لەو ڕۆژەشدا هەر شتێك لەو چڕییانەی کە چواردەوری ناخی زەوییان داوە، ڕێیان لێ دەگرن، بەڵام ئەوان لە هەر چوار لاکەی زەوییەوە زۆر بەخێرایی و کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ دێن و وەك ئەوەی سەر ڕووی هەموو ئەو زەوییانە داپۆشن کە داگیری دەکەن، ئەم بەخێرایی دەرچوونەشیان، وەك بەدیی هاتنی بەڵێنەکەی خودای پەروەردگارەکە فەرموویەتی:- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾، ئیدی بەچەندین تاقم و کۆمەڵەوە دێن و سەر ڕووی زەوی دادەپۆشن و وێنەی ڕوخسارەکانی باب و باپیرانی پێشوویان دەچێتەوە سەرو ناشیرینیی ڕەنگ و ڕوویان دەردەکەوێت و، سیمای وەحشیانەو درندانەشیان بەدیار دەکەوێت و، بەو ناشیرینیی و خراپییەی نەریت و ئاکاریانەوە بڵاو دەبنەوەو، ڕەقی و توندی و قێزەوەنی هەڵس وکەوتیشیان دەردەخات، ئەمەش لەکاتی دەرچوونیاندا لەو کایە ڕۆشنەوە بۆ کایە ناهەموارە پێچەوانەکەو لەئاکامی ئەو هەموو فیتنەو ئاژاوانەشەوە کە جادووگەرەکە لەسەر ڕووی زەوی ئەنجامی داوە. ئیدی هەر درۆو دەلەسەیەك و هەر کارێك کە جادووگەرەکە لەسەر ڕووی زەوی ئەنجامی دابێت، ئەوان دەیخۆن و، هەر ڕووبارو دەریایەکیشی دروست کردبێت هەمووی دەخۆنەوە. بەم ڕەنگەش ئەو دوو ناوەی (یەئجووج و مەئجووج) کە

(نووح)ی پێغەمبەری خودا لێی نابوون تیایاندا بەدی دێت، وەك گوتمان وشەی (یەئجووج) لە مانا سریانیەکەیدا بەمانای (بخۆری درۆ) دێتو، وشەی (مەئجووج)یش بەمانای (بخۆرەوەی درۆ) دێت وەك پێشتریش ڕوون کرایەوەو کە وائیدی بەو شێوەیەش تێیاندا بەدی دێت.

ئینجا شەیتانەکانیش لەو پێگەو مەڵبەندە پڕ لەدرۆو دەلەسانەی جادووگەر کە هۆزو کۆمەڵەکانی (یەئجووجو مەئجووج) قووتیان داونو خواردوویاننەتەوە، بۆ دەرەوەی زەوی هەڵدێنو لە ئاسۆکانی دەوروبەری لەنگەر دەگرنو، لە سەرووشیانەوە (ئیبلیسی بابەگەورەیان) هەیەو، بەردەوام لە بۆشایی ئەو ئاسۆ فراوانەدا تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە، ئیدی دوای ئەوە جێگەیەکیان لەسەر زەوی نیە، وەك خوداش فەرموویەتی:- ﴿...وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١﴾ الحج.

واتە:- (هەرکەسێك هاوەڵ بۆ خودا دابنێت، وەك ئەو حاڵەتەی وایە کە لەئاسمانەوە بەربووبێتەوەو دەسبەجێ باڵندەش پەلاماری بداتو پارچە پارچەی بکات، یاخود ڕەشە بایەکی بەهێز بیفڕێنێتو بیبات بۆ شوێنێکی زۆر دوور).

بەڵام ئەو گومڕاییە یەی کە دوای ماوەی حوکمرانی پێغەمبەری خودا (عیسا) - سڵاوی لێ بێت - تا ڕۆژی قیامەتی گەورە دروست دەبێت، ئەوە لە خودی خەڵکییەوەیە بەهۆی ئەو هێزە سرووشتییەی هەیانبووەو کە بەهەواو ئارەزووی نەفسەکانیشیان چۆکیان پێداداون.

پاشان دوای ئەوەی زەوی لەو هەموو درۆو دەلەسەیەی جادووگەر پاك دەبێتەوەو کە گەلی (یەئجووجو مەئجووج) خواردوویانەو خواردوویاننەتەوە، چەند باڵندەیەك بە وردە بەردی سوورکراوەی (سجیل)ەوە دێنو دادەبەزنە سەریانو هەموویان بەردباران دەکەنو دەیانکوژن، پاشان ئاسمان بارانێکی وەها بەلێزمەو گەورە

دەبارێنێت کە لاشە مردارەوەبووەکان بۆ دەرەوەی زەوی توورِ دەدات، لەوێش چەند باڵندەیەکی ڕەشی زەبەللاح کە (لەش‌و لارو باڵەکانیان گەورەن)، دەیانخۆن..

بەمەش فەرمایشتەکەی خودا بەدیی دێت کە فەرموویەتی:- ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ﴾..

هەر شەیتانەکانیشن کە (با) لەجێیەکی دوور فڕێیان دەدات، چونکە هیچ جێگەیەکیان لەسەر زەوی لەو ڕۆژەدا نییە، وەك لەمەو پێشیش ڕوون کرایەوە..

بەڵام ئەوانەی، کە باڵندەکان پەلاماریان دەدەن، هەر ئەوانن (واتە: قەومی یەئجووج‌و مەئجووج) بەهۆی ئەوەی درۆو بوختانی جادووگەرە نەفرەت لێکراوەکەیان پێوە پەیوەست کراوەو کە خواردوویانەو خواردوویانەتەوە، چونکە بوونەتە چەند قاپێك بۆیان‌و بەرەو ئاگرە گەورەکەیان دەبات‌و، چەندەها سەدەو عەیامی بێ‌شومارو نەزانراو تێیدا دەمێننەوە، هەر ئەوانیش کە دوایین کەس‌و کۆمەڵن لەوانەی لەئاگر دەردەچن، ئەوان تیایدا ئازاریش نادرێن، بەڵکو ئامرازێك بوون لە ئامرازەکانی سزادانی خەڵکی نێو دۆزەخ، لەهەمان کاتدا پێکهاتە ئەتۆمییەکەشیان بەبێ‌ئەوەی ئازاری ناخی دەروونیان بدات ڕێك دەبێتەوە، چونکە ئەوان لە بنەڕەتی شێوە خولقێنراوەکەیاندا لێبوردراوو چاوپۆشیی لێکراون.

بەدەرکەوتن‌و بڵاوبوونەوەی لاشەکانیشیان لەسەر زەوی بەو بارانەی، کە ڕایماڵیون (وەك پێشتر باسمان کرد) ئەم بارانە ئەو ڕوو پۆشە خۆڵەمێشییەش ڕادەماڵێت کەوا بەسەریەوە نیشتبوو، پاشان حاڵەتی ڕووناکی‌و ژیانە سرووشتییەکەش بۆ زەوی دەگەڕێتەوە،و ئاشتی‌و دادپەروەری خۆشەویستیش لەسەر زەوی باڵ دەکێشێت، ئەمەش لەژێر حوکمی پێغەمبەری خودا (عیسا) ـ سلاوی لیٚ بێت ـو لایەنگرانی بەدی دێت.

ئایەتەکەی نێو ئەو ئینجیلە ڕاستەقینە پیرۆزەش بەدیی دێت کە دەڵێت:- (گەورەیی‌و نەمریی لە ئاسۆکانی بڵندییدا هەر بۆ خودایە، هەروەها لەسەر زەویش ئاشتی‌و بۆ خەڵکیش خۆشحاڵی)[1].. ئیدی زەوی هەر لەو ئارامی یەی دا دەبێت تاکو پێغەمبەری خودا (عیسا) ـ سڵاوی لیّ بێت ـ بۆ لای خودای (رفیق الاعلی) بەرزدەبێتەوەو جێنیشینانیشی ـ سڵاویان لیّ بێت ـ دوای دەکەون.. دوای ئەمەش خەڵکی تووشی نسکۆیەکی ترسناك‌و تۆقێنەر دەبن، ئەمەش بەگوێرەی ئەو هەواڵەی کە خودای بەرزو باڵادەست پێی ڕاگەیاندووین‌و فەرموویەتی:- ﴿...وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ﴿٩٩﴾ الكهف﴾.. ئینجا حاڵەتەکە هێندە ناخایەنێت کە قیامەتی گەورە دادێت، وەك بەدیی هاتنێکی فەرمایشتی خودا کە فەرموویەتی:- ﴿...وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ الكهف﴾.

بەم ڕوونکردنەوە ڕاست‌و هەقپەروەرانەیەش توانیومانە پەردە لەسەر بەسەرهاتی (یەئجووج‌و مەئجووج) هەڵدەینەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەیەی، کە باشترینی خەلق‌و گەورەی بەندەکانی خوداو، ئاشناو خۆشەویست‌و هەڵبژێرراوی خودا: (ئیمامی گەورەی دوایین (عبدالله المهدی) سڵاوی لیّ بێت) بەئەنجامی داوە.

ڕۆژانیش ئەم ڕاستییە لەنزیکەوە ((بە فەرمانی خوداو بەخواستی خۆی)) دەسەلمێنن.. بۆیە لە خودا دەپاڕێینەوە، کە ئێمەو ئێوەش بەکەسانی بڕوا پێکەرو باوەڕدارو تەسلیم بووی حەق، دابنێت تاکو پاداشتی سەرکەوتن‌و چاکەخوازی بەدەست بێنن‌و، بەو خەڵات‌و خێرو بەرەکەتەش بگەین‌و، لە بەهرەمەندان بین.. (امین).

---

١) وەك پێشتریش لە پەراوێزی لاپەرەیەکی تردا ئاماژەم بۆ کرد من وەك وەرگێڕی ئەم کتێبە هاورای نووسەر نیم لە هێنانی ئەم دەقە درێژەدا کە خۆیشی بە ئەفسانەو خورافاتی دادەنێت، بەڵام وەك ئەمانەتێك تەرجەمەم کردۆتەوە. (وەرگێڕ)

تا ئێرە لە بڕگەی (یەئجووجو مەئجووج لە ڕوانگەی بەهائی یەکانەوە) دەقی ئەو شریتە بوو کە یەکێك لە بانگەشەچییانی بەهائی یەکان تێیدا دەربارەی (یەئجووجو مەئجووج) دواوەو بەزمانێکی ڕەوانی عەرەبیو بەئەدایەکی ڕۆشنو شێوازێکی ڕوونی وتاربێژییەوە ئەو هەموو ئەفسانەو قسە پووچو بێ نێوەڕۆکانەی تیادا هەڵ ڕشتووە.

## ((بەدواداچوونێکی کورت لەسەر ئەم وتە پووچەڵانە))

ئێمە بۆیە ئەم گوتارە گومڕاو ناهەقەمان بەو درێژییەی خۆیو بەتەواوەتی هێناوەو، سووربووین لەسەر خستنە ڕووی هەموو دەقەکەیشی، تاکو وێنەیەك لە تێڕوانینی دەستەو تاقمە گومراکان بخەینە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێزو هەروەها لێکدانەوەی مەزهەبە لادەرەکانو یاری کردنیان بەکتێبی خوداو، شێواندنی ماناو دەلالەتەکانیشی بخەینە ڕوو.. لەم هەراو زەناو ساختەکارییەشدا چەند خاڵێك بەدیی دەکەین، وەك:-

ئەم گوتارە پشتی بەهیچ سەرچاوەیەکی ڕاست نەبەستووە لەسەرچاوەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ، بەڵکو هەر تەنیا گریمانو ئیدیعایە کە ئاتاجی بە بەڵگەو نموونەو سەلماندنە.

ئەمە گەڕانە لەنێو جیهانی نادیار (غیب)دا بەبێ ئامرازێکی ڕاستو، بەبێ بەڵگەیەکی پەسند لۆژیکی عەقڵێکی ساغ، جیهانی نادیارو ڕووداوو ڕاستییەکانیش، تەنها لەکتێبی خوداوە وەردەگیرێت، یان لە فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەرەوە ﷺ .

ئەم درۆزنە قسە هەڵبەستو بوختانچیو ئیددیعاکارەش جڵەوی تەواوی بۆ خەیاڵی خۆی شل کردووەو، بە ئارەزووی خۆی ڕۆشتووەو گەڕاوەو چەندین شتی سەیرو سەمەرەی لەژێر زەویدا خستۆتە خەیاڵی خۆیەوە، کە گوایە ئەو شتانەو ئەو

مەخلووقاتانە ژیانێکی تایبەتییان هەیەو، ئەوان هۆزی (یـەئجووجو مـەئجووج)ن، لە ڕاستیدا ئەو وێنەو دیمەنانەی کە ئەو کابرایە خستوونیە ڕوو لە جیهانی واقیعی ماددیدا هیچ وجودێکیان نیە، تەنانەت لە خەیاڵی کابرا خۆیشیداو لەخەیاڵی هـەر کەسێکیشدا کە بڕوای پێدەکات، هیچ وجودێکیان نیە.

بۆ ئەوەی ئەم شێواندنو درۆو بوختانانەش زیاتر هانمان دات بۆ وریایی‌و بێداری لە ئاست ڕاستییەکانی قورئانو ماناو مەبەستەکانیشیداو، بەردەوام بین لەسەر ئەوەش کە بانگەواز بۆ تەفسیری قورئان تـەنها بەڕاستی‌و زانـست بکـەین، بـەڵام ڕێگاش نادەین بەهیچ کەسێك کە لەو دەقەی هێنامان بڕوای پێ بکات یان ئیمانی پێ بێنێت، بەڵکو تەنها لە دەرووی‌و ئاگادارکردنەوەوە بۆ خەڵکی تری باس بکات.

## ((لەگـەڵ ئایەتـەکانی ئەم چیـرۆکـەدا))

## ((پێغەمبەر ﷺ لە ئایەتـەکانی چیرۆکی (ذوالقرنین) دەخوێنێتەوە..))

ئایەتەکانی چیرۆکی (ذوالقرنین) بەو پرسیارە دەست پێدەکات کە کافرو (هاوەڵ بۆ خوا دانەران) ئاڕاستەی پێغەمبەری خـودا ﷺ یـان کردبـوو، کـە پێـشتریش جوولەکەکان ڕێنمایی ئەو کافرانەیان کردبوو تا ئـەم پرسـیارە لـە پێغەمبـەر ﷺ بکەن، ئەوەبوو پێیان گوتبوون: (دەربارەی پیاوێکی گەڕۆك پرسیاری لێبکەن کە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا گەڕاوەو، داخۆ بەسـەر هاتەکـەی چـی بێـت)؟! وەکـو لەمـەو پێشیش دەقەکەیمان هێنایەوە. ئایەتی پرسـیارەکەش ئەمەیـە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾ (پرسیارت لەسەر (ذوالقرنین) لـێدەکەن).. وەڵامی نێـو ئایەتەکـەش ئەمەیە ﴿قُلْ سَأَتْلُواْ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴾ (پێیان بڵێ باسێکی ئـەوتان لـە چـەند ئایەتێکی قورئانەوە بۆ دەخوێنمەوە).

کاتێك سەرنج لەم وەڵامە دەدەین هەندێك دەرسو ئاماژەو پەندو ڕێنموونیی لێ دەردێنین، وەك:-

١- سەرەتای وەڵامەکە بە وشەی (قل/ بڵێ) دەست پێدەکات، زانایانی تەفسیر ئەمە بە (قل-ی- تلقینی) ناودەبەن، واتە: بە (وەڵامی فێرکاریی ی-بڵێ-).. بەو مانایەی کە باسەکەو چیرۆکەکەش لەلایەن پێغەمبەری خوداوە دانەنراون بەڵکو فێرکردنو تێگەیاندنێکە لە خودای زاناو کاربەجێوە بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ گوزارشت کردن (تعبیر)یش بە (فەرمانی (بڵێ)ی فێرکاریی) ڕێنموونیمان دەکات بۆ زانینی ئەو ڕاستییەی کە بێگومان سرووش (وحی) لەلایەن خوداوەیەو، فێرکاریو تێگەیاندنێکە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەریش ﷺ کە لەم دۆخەدا (پرسیاری لێکراو)و (تاقیکراو)ەو کەوتۆتە بەردەم تاقیکردنەوەیەك (امتحان) بەو ووتە ڕۆشنە بەڕاشکاوی وەڵامیان دەداتەوەو، بۆشیان ڕوون دەکاتەوە کە وەڵامەکە لەلایەن خۆیەوە نیە، بەڵکو لەلایەن خوداوەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی هیچ هەوڵێکی خۆی بە وەڵامەکەوە نەبەستێتەوەو دان بەوەش دابنێت کە ئەو تەنها گەیەنەری فەرمایشتی خودایە.

هەر لێرەشدا تێبینی سەرپەرشتیی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی دەکەین کە یارمەتیی داوەو سەریخستووەو بەڵگەی ڕێنمایی پێداوەو وەڵامیشی بۆ خستۆتە ڕوو، ئەوەتا لەسەر (ذوالقرنین) پرسیاری لێ دەکرێت و، خوداش هەواڵی وەڵامەکەی پێ دەگەیەنێت.

٢- مانای ئەوە چییە کە پێغەمبەر ﷺ چەند ئایەتێك لە باسی (ذوالقرنین) دەخوێنێتەوە، بێگومان جگە لەوەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، مانای ئەوەش دەگەیەنێت کە ئاخاوتنی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی (ذوالقرنین)ەوە هەقو ڕاستەو، مەسەلەکەش هەر بەو ڕەنگەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە، چونکە لەخوداوە پێی ڕاگەیاندراوە، مانای ئەوەش دەگەیەنێت کە دەبێت ئێمە

ئـەو هەواڵـە ڕاگەیـەنراوەی پێغەمبـەر ﷺ نەخەینـە بـەر حـوکمی چـەند سەرچـاوەیەکی تـرو بـەهۆی ئەوانـەوە داوای ڕاسـتکردنەوەی هەواڵەکـە، یـان ڕێککردنـەوەی، یـان بەدواداچـوونی لـێبکەین، هـەروەها مانـای ئـەوەش دەگەیەنێت کە تەنها دەست بەم ڕاگەیـەنراوە ڕاسـتو جـێگیرەی پێغەمبـەرەوە بگرین و، بەو چەند ڕووداوەی لە چیرۆکەکەدا دیاریکراون قایل بینو زیـاتر لـەوە لـە سەرچـاوە نادروسـتەکاندا پەیـدا نەکـەینو، پـەناش نەبەینـە بـەر دەقـە ناڕاستەکانی (ئیسرائیلیات)و، بەسەرهاتو هـەواڵو وتـەی پێـشینەکان تـاکو چەند شیکارو درێژەیەکی ڕووداوەکانی چیرۆکەکەی لەسەر وەرگرین.

٣- با هەڵوێستەیەکیش لەبەردەم وشەی (منه)ی نێو ئایەتەکەدا بکـەین ﴿سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا﴾ ئەم پیتـەش ئـامرازی (مـن-ی- تبعیـضی)یـە (واتـە/ دابەشکاری) واتـە پێغەمبـەر ﷺ هـەموو زانیـاریو بەشـەکانی چـیرۆکەکەو ڕووداوەکانی (ذوالقـرنين) بـاس ناکـات، بـەڵکو گرنگترینـی زانیـاری یـەکانو ڕووداوەکان (واتە: هەندێكو (بەشێکی) لـێ بـاس دەکـات). هـەروەها وشـەی (منـه) ئاماژە بۆ شێوازی قورئـان لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکـانی چـیرۆکەکانیدا دەکات کـە هـەموو چـیرۆکەکە بەدرێـژیو بەیـەك جـاری تـەواو ناگێڕێتـەوە، هەمدیسان لەسەر بنچینەی ڕوودانی ئەو بەرسەرهاتە بەشەکانی ڕێك ناخات و، شیکارو سەرجەم کارو مەسەلە وردو درشتەکانیشی بەتێکڕایی ناهێنێت.

جا ئەوەی کە واتای قورئانی تێدا ڕەنگ بداتەوە، وێستگەکانی عیبرەتو پەنـد لـێوەرگرتنە کە گوێگران (بیـسەرانی قورئـان) وانـەو ئامـاژەو ڕێنماییـیەکانیان لـێوەردەگرن، هەر بۆیەش لەنێو چیرۆکەکەدا تەنها ئەو وێستگانە پێـشان دەداتو ئەو بەشەیە کەوا نیازە ویستراوەکانی پێ بەدی دەهێنێت.

هەروەها لـە چـیرۆکەکەوە ئـەو دیـمەنو پـەردەو بڕگانـەش پێـشان دەدات کـە سوودێك، یان زانستێك، یان پەندێکیان تێدایە. ئیـدی بەئانقەسـت ئـەم شـیکارو ڕووداوو هەواڵانەی تری کە (سوودێك، یـان زانـستێك، یـان پەنـدێك) نابەخـشن، فەرامۆش کردووە.

لەبەرئەوە باوەڕمان هەیە بەوەی کـە قورئـان پیـشانی داوە، ئـەوە گرنگترینـی دیمەنو بڕگەکانی چیرۆکەکەیە، ئەوەش هەنـدێك لـە دیمەنەکانیـەتی، نـەك هـەموو دیمەنو بەشەکانی ئەو چیرۆکە.

دانیش بەوە دادەنێین کە ئەگەر قورئان هەر بەشێکی تری چیرۆکەکەی فەرامۆش کردبێت، لەبەر ئەوەیە بەپلەی یەکەم هیچ سوودێکی نەبووەو، بەپلەی دووەمیش بە کردەیی (فعلی) هیچ بوارێکی بۆ هەڵوێستە لەسەرکردنی تێدا نیە.

هەر بۆیەش ناشێت لەنێو سەرچاوەو چاوگەکانی تردا بەدوایدا بگەڕێین، بـەڵکو پێویـستە لەسـەرمان هێنـدە لـە گرنگترینـی ڕووداوەکـانی پێـشینان وەرگـرینو، مامەڵەش لەگەڵ ئەو بەشو دیمەنە پیشاندراوانەیدا بکەین کـە هاوەڵـە بـەڕێزەکان (الصحابە الکرام) مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە کاتێـــك بەوەنـدە لـە چیـــرۆکەکەدا قایل بوون.

## ئەو دەسەڵاتەی کە خودا بە (ذو القرنیـن)ی داوە

قورئان هەواڵی ئەو دەسەڵاتەی کە خـودا بـۆ (ذوالقـرنین)ی مەیـسەر کـردووە، پێداوین، وەك لە فەرمایشتەکەی خودادا هاتووە:- (انا مکنا لـە) واتـە:- (ئێمـە دەسەڵاتێکی زۆرو گەورەمـان پێدابوو). دەسەڵات پێدانیش کە لـە ڕیـشەی زمانـە عەرەبییەکەیدا لە (تمکین)ەوەیە لە وشەکانی (مکان)و (مکانـة)ەوە وەرگـیراون کـە مانای خاوەندارێتی دەگەیەنێتو، واتە (بـووە بـە خـاوەنی شـوێنەکە)و بـووە بـە خاوەنی پلەو پایەیەك، خوداش بەو ڕەنگە دەسەڵاتی لـە زەویـدا بـە (ذوالقـرنین)دا

بوو، کە هۆیەکانی سەرکەوتنو سەرفرازیی بۆ مەیسەر کردبوو. (ذوالقرنین)یش دانی بەو دەسەڵاتەدا نابوو کە خودا پێی بەخشیوەو کە هەر شتێك (لە هێزو لە سەرکەوتن) خاوەنی بوو بێت بە هێزو کۆمەکی خودا بووە، بۆیە کاتێك لە گەشتەکەی باکووردا ئەو گەلەی کە لەنێوان هەردوو چیا بەرزەکەدا دیتنی، پێی گوتن ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٌ﴾ (ئەو تواناو دەسەڵاتەی کە خودا پێی داوم لەهەر کرێو پاداشتێکی ئێوە باشترە).

وەك تێبینیش دەکەین فەرمانی ڕابردوو (الفعل الماضي)ی (مكن) دووجار لە چیرۆکەکەدا هاتووە: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ و، ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٌ﴾.

جا کاتێك سەرنجی ورد لەم فەرمانەی نێو هەردوو ڕستەکە دەدەین، چەند خاڵێکی گرنگی لێ بەدی دەکەین، وەك:-

١- بێگومان بکەر (فاعل) لە هەردوو (فعل)ەکەدا، خودایە، چونکە فەرمانەکە دراونەتە پاڵ خودا، ئەمەش باوەڕ دانی پێدا دەنێت و، عەقیدەش ئاماژەی بۆ دەکات کەوا خودا هەر خۆی بکەر (فاعل)و ئەنجامدەری ڕاستەقینەی هەر کردارو مەسەلەیەکی نێو ئەم گەردوونەیە. هەر خوداشە بڕی ڕووداوەکان بەپێی خواستو ئیرادەی خۆی دادەنێت، دەنا خەڵکی لە هەر کردو کۆشو هەوڵو کارێکیاندا تەنها وەك چەند هۆکارێکی ڕواڵەتیی دەرەکی دیارن، بەڵام هۆ خوڵقێنو قەدەرکارەکەی تەنها خودایە.

٢- (ذوالقرنین) لەو دوو ڕستەیەدا وەك (مفعول به) یەك هاتووە کە فەرمانەکەی لە ڕستەی یەکەمداو بەپیتی پێشگر (حرف جر)ی (له) لە ڕستەی (مكنا له)دا بۆ پەڕیوەتەوە، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا (مكني) بەبێ ئەو جۆرە پیتانەو، هەر بەڕاستەوخۆ فەرمانەکەی بۆ پەڕیوەتەوە.

٣- ئێمەش پرسیار دەکەین لەسەر ئەوەی داخۆ حیکمەت چییە لە پەڕینەوەی (فعل) بۆ (مفعول) لە ڕستەی یەکەمدا بە (حرف جر)ی (مکنا لە)، لە کاتێکدا بەبێ ئەو (حرف)ەو ڕاستەوخۆ لە ڕستەی دووەم (مکنی)دا بۆی پەڕیوەتەوە؟ بێگومان (فعل/فەرمانەکە) لە ڕستەی یەکەمدا لە فەرمانەکەی نێو ڕستەی دووەم لاوازترە، هۆکاری لاوازتر بوونیشی ئەو بۆتەیەیە کە تێیدا هاتووە، چەندین شوێنو بۆتەی تری قورئانیش دەبینین کە کاریگەرییان لە هێزی فەرمان، یان لە لاوازییو لە بزووتنیو لە داڕشتنەوەیدا هەیە. فەرمانی (مکن)ەش لە ڕستەی یەکەمدا لاوازە، هەر بۆیەش نەیتوانیوە خۆی ڕاستەوخۆ بۆ (مفعول)ەکە بپەڕێتەوە، یان بەبێ شتێکی دی پێی بگات، لەبەر ئەمە پشتی بە (حرف جر)ێکی وەك پیتی (لام) بەستووە تاکو بە (مفعول)ەکەی بگەیەنێت، ئیدی بەهۆی ئەوەوە بۆی پەڕیوەتەوە، هۆی لاوازیی ئەم فەرمانەی نێو ڕستەی یەکەم ئەوەیە لەسەرەتای باسی چیرۆکی (ذوالقرنین) دا هاتووەو، لەمەڕ سەرەتای کاروباری دەدوێت. وەك زانراویشە کاروبارو مەسەلەکان لە خاڵی سەرەتایانەوە لاوازترن لە کۆتایی یەکانیان. لەبەر ئەم لاوازی یەش ئاتاجی بە (لام)ەکە هەبووە تاکو بۆ (مفعول بە)یەکە بپەڕێتەوە.

بەڵام لە ڕستەی دووەم دا ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ فەرمانی (مکن) بەهێزە، هەر بۆیەش خۆی بەتەنها بۆ (مفعول بە)یەکە پەڕیوەتەوەو، ڕاستەوخۆ چۆتە سەری. بۆ سیاقی ڕستەکەش ئەو هێزەی پێ بەخشیووە.چونکە:-

یەکەم:- ئەو دەربارەی (ذوالقرنین) دەدوێت کە دوای ئەوەی پەیدا بووەو دەسەڵاتی پێدراوەو کۆنترۆڵی بارودۆخەکەی کردووەو سەرکەوتووە.

دووەم:- لەبۆتەی باسی هێزو توانای (ذوالقرنین) لە بنیاتنانی بەربەستەکەدا بووە کە بۆ ئەو گەلە ستەمدیدەی بنیات ناوە.

ئەم جیاوازییەی نێوان هەردوو جۆرە دەسەڵاتەکەش (تمکین) لەنێو هەردوو ڕستەکەدا، لە جیاوازی یەکی نێوان خۆیان‌و دوو ڕستەی تری هاوشێوەیان دەچن‌و لێکەوە نزیکن، ئەو دوو ڕستە هاوشێوەشیان لە فەرمایشتێکی تری خودا لە سووڕەتی (الأنعام) دایە کە فەرموویەتی:- ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ ...﴿٦﴾ الأنعام ﴾.. واتە:-

(ئایا ئەو بێباوەڕانە بەهۆی ئاسەوارەکانەوە نەیاندیوەو نەیانزانیوە کە لە پێش ئەواندا چەندەها نەوەمان لەناو بردووە کاتێك پێشتر دەسەڵات‌و پایەمان لە زەویدا پێدابوون‌و دەسەڵاتداریتیشیان بەجۆرێکی وابوو کە ئێوەمان ئاوا پایەدار نەکردووە).

## (دەسەڵات ڕەخساندن لە قورئاندا)

هەڵوێستەمان لە ئاست ووشەی دەسەڵات‌و ڕەخساندن (التمکین)ی نێو چیرۆکی (ذوالقرنین)دا هانمان دەدات بۆ سەرنجدان لەم بابەتی دەسەڵاتە لە ئایەتەکانی ترو سوورەتەکانی تری قورئاندا.. لەم ڕووەشەوە دەبینین کە سیازدە جار لە قورئاندا وشەکانی (مکن.. یمکن/ واتە بەفەرمانی ڕابردووو ڕانەبردوو) هاتوون، وەك (مکنا، مکنا کم.. مکناهم.. مکنی.. نمکن.. ولیمکنن..) کاتێك لەهەر سیازدە جارەکەشدا لەم فەرمانە وورد دەبینەوە، دەبینین هەمووی براوەتەوە پاڵ تواناو کاری خوداو کە هەر خۆی بکەرو کردگاریانەو، هاوەڵفرمانیش (مفعول بە)یەکان ئەو کەسانەن کە خودا دەسەڵاتی بۆ ڕەخساندوون یان ئەوانەن کە لەمەولا دەسەڵاتیان بۆ دەڕەخسێنێت.

ئینجا لە ئاکامی هەڵوێستەکردنمان لە ئاست ئەم بابەتەدا ئەم ڕێسا ڕوونکراوەیەی لێ دەردێنین:- (بکەر (فاعل)ی فەرمانەکانی (مکن..یمکن) لە

قورئاندا هه‌ر خودا خۆیه‌تی.. ڕه‌خساندنی ده‌سه‌ڵاتیش له‌ قورئاندا ته‌نها به‌ كارێكی خودا داده‌نرێت‌و، ته‌نها بۆ خودایه‌و ده‌خرێته‌ پاڵ خودا.. ئه‌م ڕێسا ڕوونكه‌ره‌وه‌یه‌ش به‌ره‌و ڕێسایه‌كی باوه‌ڕدارانه‌ی عه‌قیدییمان ده‌بات كه‌ ڕه‌هه‌ندێكی مێژوویی‌و ژیاریی هه‌یه‌، بێگومان خودا هه‌ر خۆی ده‌سه‌ڵات ده‌دات به‌ سه‌ركرده‌و پێشه‌واو فه‌رمانڕه‌وایان، هه‌ر خۆیشی مه‌وداو ڕاده‌ی پادشایی‌و سه‌رۆكایه‌تی‌و سه‌روه‌رییان بۆ دیاری ده‌كات، بۆیه‌ ئه‌وان به‌هۆی هێزێكی ڕواڵه‌تی ی خۆیانه‌وه‌ كه‌ تێیاندا بێت، یاخود به‌هۆی قودره‌تێكی خۆڕسكی خۆیانه‌وه‌ نابنه‌ پادشاو ده‌سه‌ڵاتدار، به‌ڵكو ئه‌وان خۆیان په‌رده‌و ڕووپۆشێكی خودان.

هه‌ر خوداش ده‌سه‌ڵات‌و سه‌روه‌ری بۆ گه‌لان‌و نه‌ته‌وه‌و هۆزو ده‌وڵه‌تان ده‌ره‌خسێنێت‌و دیسان هه‌ر خوداش بڕیاری سه‌ركه‌وتن‌و سه‌رفرازیی بۆ نه‌ته‌وه‌یه‌ك ده‌دات‌و، هه‌ر خۆیشی سه‌روه‌ری‌و ده‌سه‌ڵات بۆ ده‌وڵه‌تێك دیاری ده‌كات‌و، باڵا ده‌ستی‌و سه‌ربه‌خۆییش به‌ گه‌لێك ده‌دات. هه‌روه‌ها خودا هه‌ر خۆی ڕاده‌و بارستایی ڕووداوه‌كان دیاری ده‌كات‌و، به‌خواستی خۆی كاره‌ساته‌كان له‌ واقیعدا ده‌خولقێنێت‌و، كاروباره‌كانیش به‌ڕێوه‌ ده‌بات، دیاره‌ هیچ شتێكیش له‌هه‌ر جێگه‌یه‌كدا ته‌نها به‌ڕێگه‌دانی خوداو ته‌قدیرو خواستی خۆی نه‌بێت، ڕوونادات.

ئه‌مه‌ش ڕێسایه‌كی باوه‌ڕدارێتی‌و، ڕاستییه‌كی قورئانیه‌ كه‌ گه‌لێك له‌ ئایه‌ته‌كانی قورئان جه‌ختیان له‌سه‌ر كردووه‌..

دیاره‌ هه‌ندێك كه‌س له‌ خه‌ڵكی له‌م ڕاستییه‌ بێئاگا ده‌بن له‌ كاتێكدا له‌ هۆیه‌كانی په‌یدابوونی ده‌وڵه‌تان‌و له‌ هۆكاره‌كانی به‌زین‌و تێشكانیان ده‌كۆڵنه‌وه‌. له‌ كاتێكیشدا دیراسه‌ی ده‌سه‌ڵاتدارێتیی پێشه‌وایان‌و حوكمی سه‌ركرده‌كان ده‌كه‌ن‌و سه‌رنج له‌ ململانێی سه‌ر حوكم‌و ده‌سه‌ڵات ده‌ده‌ن، ئه‌م ڕێسایه‌یان بیرده‌چێته‌وه‌.. هه‌روه‌ها له‌ كاتێكیشدا باسی ڕووداوه‌ سیاسی‌و سه‌ربازی‌و جه‌نگییه‌كان ده‌كه‌ن‌و هه‌واڵه‌كانیان ده‌گێڕنه‌وه‌و ده‌بیستن، دووباره‌ له‌م ڕێسا خوداییه‌ بێئاگا ده‌بن‌و له‌یادیان ده‌چێت.

بەڕاستی هیچ ڕووداوێك نایەتە ئاراوە تەنها بە فەرمانی خودا نەبێت.. هیچ شتێکیش بەدیی نایەت تەنها بەفەرمانی خۆی نەبێت.. هیچ حاکمێکیش لاناچێت تەنها بە فەرمانی خودا نەبێ، هیچ کەسێکیش نابێت بەحاکم تەنها بەفەرمانی خودا نەبێت..

هەر سوپایەکیش تەنها بەفەرمانی خودا سەردەکەوێت.. هەر نەتەوەیەکیش تەنها بەفەرمانی خودا بالادەست دەبێت، هیچ دەولەتێکیش بەفەرمانی خودا نەبێت، بێدار نابێتەوەو دانامەزرێت، هیچ شارستانەتێکیش بەفەرمانی خودا نەبێت، نایەتەکایەوەو دروست نابێت..

﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ الكهف﴾..

## دیاردەکانی ئەو دەسەلاتەی کە خودا بە (ذوالقرنین)ی بەخشیبوو

قورئان ئاماژەی بۆ ئەو دەسەلاتە کردووە کە خودا بە (ذوالقرنین)ی بەخشیبوو، هەروەها دیاردەکانی ئەو دەسەلاتەیشی بە بڕگەیەکی کورتی گشتی خستۆتە ڕوو کە لە فەرمایشتەکەی خوادا هاتووە: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾.. واتە (دوای ئەوەی دەسەلاتێکی گەورەمان بە (ذوالقرنین) بەخشی، هەموو هۆکارو ئامرازێکی حوکمو فەتحی ولاتانو سەرکەوتنمان بۆ دابین کرد).

هۆکاریش (السبب) ئەو ئامرازەیە کە دەسەلاتو فەرمانڕەواییی پێ بەدەست دەهێنرێتو، ئەو ڕێگایەشە کە بە دەسەلاتەکەی دەگەیەنێت.. هۆکارەکان ئەو دیاردەو ڕوالەتە ماددیانەن کە دەسەلاتو سەروەریی بەدی دێنن، سا ئیتر لە بواری ئابوورییەوە بێت، یان سیاسی، یان سەربازی، یان جەنگی، یان پیشەسازی، یان شارستانیو ژیاریی..

خـــوداش هۆیـــەکانی حـــوکمڕانیو فـــەتحی ولآتـــانو، هۆیـــەکانی بیناســـازیو ئاوەدانکاریو، هۆیەکانی دەسەلآتو سەرداریێتییـــشی بـــە (ذوالقـرنین) بەخـشیبوو، جگە لە چەندین هۆی تر..

(ابن عباس)و خوێندکارەکانیشی ئەو هۆکار و(سەبەب)ەی نێـو ئایەتـەکان بـە (زانست/ العلم) لێکداوەتەوە، بەمانای (اتیناه علما تـمکن به من الفتح والنـصر و السیادة) — واتە (زانستی وەهامان پێ بەخشیبوو کە بەهۆیەوە توانیی فـەتحکردنی ولآتانو سەرکەوتنو دەسەلآت بەدەست بێنێت).

(قتادە)ش گوتوویەتی:- (وشەی (سبب) لە ئایەتەکـەدا پلـەو پایـەکانی سـەر زەویو پێشەوایەتیو پێشەنگییەتی).

(عبدالرحمنی کوڕی زەیـد)یـش گوتوویـەتی: (هۆکـار (سـبب)ەکـە فێرکردنـی زمانەکانی گەلان بووە، چونکە (ذوالقـرنین) جەنگی لەگەڵ هیچ گەلێکـدا نـەدەکرد هەتا فێری زمانەکەیان نەبوایە).

بـــەلآم هەنـــدێك لەوانـــەی هـــەواڵو بەســـەرهاتەکانیان لـــە ڕێـــی دەقـــە ئیسرائیلییەکانەوە گێڕاوەتەوە تەنها پـەنایان بـۆ ئەفـسانەکان بـردووەو، لـەبارەی دیاردەکانی ئەو دەسەلآتەو دیاریکردنی هۆیەکانیەوە چەندان ئەفسانەو خوڕافـاتو وتەی هەڵبەستراوی جوولەکەکانیان هێناوەتەوە کە زۆر دوورن لە ڕاستییەوە.. هـەر لـەم ڕووەوە (امـام/ ابـن الکثیـر)یـش بەسـەرهاتێکی خۆشـی گێڕاوەتـەوە کـە گفتوگۆیەکی نێوان (معاویـەی کـوڕی ابوسـفیان)و (کعـب الاحبـار)ەو کـە (ابـن الکثیـــر) خۆیـــشی لێکدانەوەیـــەکی نایـــابی خـــستۆتە ســـەر گفتوگۆکـــەیان. بەسەرهاتەکەش بەم جۆرەیە:-

(لە سعیدی کوڕی ابوهلالەوە گێڕاوەتەوە، کەوا (معاویەی کوڕی ابوسـفیان بـە (کعب الاحبار)ی گوتووە: (تۆ دەڵێیت گوایـە (ذوالقرنیـــن) ئەسـپەکەی خـۆی بـە کۆمەڵە ئەستێرەیەکەوە بەستۆتەوە، ئایا ئەمە وایە؟

(کعب)یش لە وەڵامدا پێی گوتووە:- (ئەگەر واشم گوتبێت هەر دەچێتە ژێر سایەی ئەو مانایەی کە خودا دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾..

(ابن الكثير)یش لە لێکدانەوەی ئەم گفتوگۆیەدا، گوتوویەتی:- (ئەو بیروڕایەی کعب کە معاویە نکوولّی لێکردووە، ڕاستو دروستەو، معاویەش لەسەر هەقە لەو نکوولّی لێکردنەیدا.. چونکە هەر خودی (معاویە) وتەیەکی دەربارەی (کعب الاحبار) هەیەو لەبارەیەوە گوتوویەتی: (ئێمە تاقیمان کردبۆوەو درۆمان لێدیبوو).

واتە لەوەی کە دەیهێنا نەك ئەوەی کە لە لاپەڕەکانی تەوڕاتیانەوە دەیهێنا، دیارە ئەوەی نێو لاپەڕەکانیشیان زۆربەی لەو دەقە دەسهەڵبەستانەی (ئیسرائیلیات)ەوە بوون کە زۆربەی ئەو دەقانەش گۆڕراوو دەسکاریکراوو نووسراوەو خولّقێنراو بوون، هەر بۆیەش لە کاتی باسی هەر بەسەرهاتێك کە لە دەقەکانی قورئانی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە هێنرابێت، هیچ پێویستییەکمان بە گشتی بەو سەرچاوە ناڕاستانە نابێت، چونکە هەر لەو سەرچاوە ناڕاستانەوە شەڕو خراپەیەکی زۆرو پشێویەکی گەورەش بەسەر خەڵکیدا هاتووە. لێکدانەوەکەی (کعب الاحبار)یش بۆ فەرمایشتی خودا ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾و پەنابردنی بۆ لاپەڕەکانی خۆیان کە بیانکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی گوایە (ذوالقرنین) ئەسپەکەی خۆی بەکۆمەڵە ئەستێرەیەکەوە بەستبێتەوە، ئەوە بێگومان لێکدانەوەیەکی ناڕاستو ناهەموارە، چونکە هیچ ڕێگەیەك لەبەردەم مرۆڤ دا بۆ ئەو مەبەستە نییە کەوا بۆ ئاسمانەکان بەرز بێتەوەو ئاژەڵێکی بە ئەستێرەوە ببەستێتەوە.

خۆ ئەگەر خودا دەربارەی (بەڵقیس)ی شاژنیش فەرمووبێتی: ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾ مەبەستی لەوەیە کە هەر ئامرازو کەرەسەیەکی پێویست لەوانەی بۆ پادشایان دەستەبەر دەکرێت بەویش دراوە. (ذوالقرنین)یش هەر لەم چوارچێوە

شیاوو ئاساییە دابووە.. خودا هۆکارو ئامرازەکانی بۆ مەیسەر کردووە.. واتە ڕێگەو بانو ئامرازە پێویستەکان بۆ فەتح کردنی هەرێمو ناوچەو سەوزاییەکانو وڵاتانو خاکو زەویو زاری ترو، کەسانی بێباوەڕو شوێنکەوتوانی (شیرك)یشی بۆ سەر شۆڕو لاواز کردوون. ئیدی هەر شتێکی (وەك هۆکار) پێویست بوو بێت پێی بەخشیووە، خوداش هەر خۆی زانایە لەم ڕووەوە)[1].

## -ذو القرنين- هۆکارەکانی گرتۆتەبەر

خودا (ذوالقرنين)ی لەسەر زەوی پایەدار کردو، هۆکارو ئامرازەکانی بۆ سازو ئامادە کرد بۆ بەدی هێنانی حوکمو دەسەڵاتدارێتیو سەرکەوتن.

قورئانیش ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە کە خودا پێی بەخشیبوون، بێگومان بەچاکیش بەکاری هێنابوونو بەگەڕی خستبوونو مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن.

خوداش لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ الکهف﴾، واتە: (ذوالقرنینیش ئەو هۆکارو ئامرازانەی گرتەبەر.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر چەلەنگیو ژیریو زیرەکیی (ذوالقرنین).

زۆریشن ئەو کەسانەی کە خودا لەدیاردەکانی تواناو لە هۆکارو ئامرازەکانی پایەدارێتیان پێدەدات و بەرەو سەرکەوتنو باڵادەستیو سەروەریی دەڕۆن.. هەندێك لەو هۆکارانەش مادديی بەرچاوو هەست پێکراون، هەندێکی تریشیان بەهادارو مەعنەویین وەك وریاییو زیرەکیو، تەندروستیو هێزو کەسێتیو پێکەوە هەڵکردن لەگەڵ خەڵکیداو، کاتو تەمەنو.. هتد..

هەروەها زۆریشن ئەو کەسانەی کە هۆیەکانی سەرکەوتنو پایەدارێتیان بۆ دەرەخسێتو، بەڵام هەموویان سوود لەو هۆکارو ئامرازانە وەرناگرن کە خودا بۆیان

---

١) تەفسیری (ابن الکثیر) بەرگی سێیەم، لاپەرە (١٠١).

دەرەخسێنێت، بەڵکو زۆربەی ئەو کەسانە ئەو کەرەسەو هۆکارانە پەرش‌و بڵاودەکەنەوەو ونیان دەکەن‌و، سوود لە دەرفەتەکە وەرناگرن‌و، موناسەبەکان ناقۆزنەوەو، بارودۆخ‌و کاتە گونجاوەکەش بەهەل نابینن بۆ خۆیان، ئیدی بەم هۆیەشەوە بۆنەو موناسەبەی لواویان لەکیس دەچێت.

کەمیشن ئەو کەسانەی کە سوود لەو کەرەسە بەخشراوانەی خودا وەردەگرن‌و بەچاکی مامەڵەی پێ دەکەن‌و دەیانقۆزنەوە، هەر ئەوانیش کەسانی زیرەك‌و ژیرن.

بێگومان (ذوالقرنين)یش لەو کەسە کەم‌و دەگمەنانە بووەو، هەموو هۆکارەکانی گرتۆتەبەر.

ئەم بڕگەیەش کە دەربارەی گرتنە بەری هۆکارەکانە، واتە بڕگەی ﴿فَأَتۡبَعَ سَبَبًا﴾ سێ جار هاتووە، چونکە سێ گەشتی جەنگیی جیهادکاریی ئەنجام داوە، گەشتێکیان بۆ ڕۆژئاواو، گەشتی دووەمیش بۆ ڕۆژهەڵات‌و، سێیەم گەشتیشی بۆ باکوور بووە:-

﴿فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ ...﴾ الكهف... ﴿ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ ...﴾ الكهف... ﴿ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ ...﴾ الكهف...

## ئاوابوونی خـۆر له کانیـاوێکی تێکـەڵ له قوڕی ڕەش دا

قورئانی پیرۆز هەواڵی گەشتی یەکەمی (ذوالقـرنین)ی بـەم فەرمایـشتەی خـودا ڕاگەیاندووە کە فەرمـوویـەتی:- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ ﴾.. دیارە ئەم گەشتە جیهادکارییەی بـەرەو خۆرئـاوا بـووە وەك لەوتەیـەکی پێشترماندا دەربارەی (ذوالقرنین) باسمان کردو گوتمان ئەو (کۆرشی فـارس) بـووەو، ئەم سەفەرەشی وەك هەڵمەتێك بـۆ سـەر مەملەکـەتی (لیـدیا)ی یۆنـانی بـووەو، پایتەختەکەیان کە شاری (ساردیز) بووە، داگیر کـردووە، پادشاکەشـیان کـە نـاوی (کرۆسیس) بووە بەدیل گرتووە.

شاری (ساردیز)یش کەوتبووە سەر دەریای (ئیجـە) لـە نزیـك شـاری ئێـستای (ئیزمیر)ی تورکیاوە.

ئایەتەکەش ئەو هەواڵەمان پێ‌دەدات کە (ذوالقرنین) گەیشتۆتە خۆرئاوا، واتـە شـوێنی ئـاوابوونی خـۆر. وەك زانراویـشە زەوی دەسـوورێتەوەو، خـۆریش هـەر دەسوورێتەوە. دیارە شوێنی خۆرئاوابوون (مغرب الشمس) لەڕاسـتیدا ناوچـەیەکی دیاریکراوی لـێ ئاوابوونی نییـە، چـونکە خـۆر تـەنها یـەك خۆرهـەڵاتو، یـەك خۆرئـاوای نییـە، بـەڵکو چـەندان خۆرهـەڵاتو چـەندان خۆرئـاوای هەیـە، لـەم بارەیەشـەوە خـودا لـە قورئانـدا فەرموویـەتی:- ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ المعارج ﴾.. کەوابوو بە گوێرەی ئەوەی کە بینەرانو تەماشـاکاران لـە هەر پارچەیەك لە پارچەکانی زەوییەوە بۆ شـوێنەکانی هـەڵاتنی خـۆرو ئـاوابوونی بڕوانن، وای دادەنێن کە چەندین خۆرهەڵاتو خۆرئاوا هەیە.

هەروەها بەگوێرەی ئەو ناوچانەش کە خۆریان لێوەهەڵدێتو، کە خۆریان لێوە ئاوا دەبێت، چەندین خۆرهەڵاتو خۆرئاوا هەیە، پاشان بەگوێرەی وەرزەکانی ساڵو بەگوێرەی مانگەکانو ڕۆژەکانی ساڵیش هەر چەندین خۆرهەڵاتو خۆرئاوا هەیە..

ئیدی شوێنی ئاوابوونی خۆر، لەڕاستیدا ئەو خۆرئاوایە نییە، بەڵکو ئەوەیە کە لەبەرچاوی بینەران وایە.

(سید قطب) دەڵێت: (مغرب الشمس/ شوێنی ئاوابوونی خۆر): ئەو شوێنەیە کە بینەر دەیبینێت خۆر لە پشت ئاسۆوە ئاوا دەبێت. ئەمەش بەگوێرەی جێگاکان جیاوازو گۆڕاوە.. بۆ نموونە هەندێك شوێنی وا هەیە بینەر وای دەبینێت کە خۆر لە پشت چیایەکەوە ئاوا دەبێت، لە هەندێك شوێنی تریشدا دەبینێت کە خۆرەکە لە ئاودا ئاوا دەبێت، وەك لە ئۆقیانووسە فراوانو دەریاکان دایە، لە هەندێك جێگەی تریشدا دەبینێت خۆر لەنێو لم دا ئاوادەبێت ئەگەر لە بیابانێکی دیارو فراوانی دوورو مەودادا بوو کە تا چاو پڕبکات هەر بیابان بێت)[1].

ئەمە دەربارەی شوێنی خۆر ئاوابوون.

بەڵام ئاوابوونی خۆر لە کانیاوێکی تێکەڵ لە قوڕی ڕەشدا (فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ)، ئەوەبوو هەر پێشتر لەم چیرۆکەدا باسمان کردو گوتمان: ناوچەی (ئیرمیز) کە (ذوالقرنين) پێی گەیشتووە کەنداوی زۆری تێدایە، لە ناودارترینیان کەنداوی (هرمس)و (مەندرێس)و (کەنداوی ئیزمیرە). قووڵایی کەنداوی (ئیزمیر)یش بۆ ناوەوە بە ئەندازەی سەدو بیست کیلۆمەترەو، ئاوی ڕووباری (غدیس)یشی دەڕژێتە ناو، کە ئاوێکی لێڵەو قوڕی پاشماوەی گڕکانو خۆڵی سووری تێکەڵەو لەسەر بەرزایی (ئەنادۆڵ)ەوە تێی دەڕژێت، هەر جارێکیش ڕووبارەکە ڕووەو کەنداوی (ئیرمیز) بڕوات، خێرایی ڕۆشتنەکەی زیاد دەکات.

---

١) سید قطب/ في ظلال القرآن، بەرگی چوارەم، لاپەرە (٢٢٩١).

کاتێك (ذوالقرنین)یش لەو مەوقیعەدا وەستاوە، کە ڕووباری (غـدیس) دەڕژێتـە نێو کەنداوی (ئیزمیر)ەوە، (واتـە دوای فـەتحکردنی شـاری (سـاردیز)ی پایتـەختی مەملەکەتی (لیدیا) سەرنجی وێنەی سینییە بازنەییەکەی خـۆری داوە، کـە چـۆن دەکەوێتە شوێنی ڕژانی ئاوی ڕووبارەکە لە کەنداوەکەداو، دیویەتی (سوورایی قوڕە سوورەکەو قوڕە ڕەشەکەش)، کە ڕووبارەکە فڕێی دەداتە نێو کەنداوەکەوە تێکـەڵی ئاوەکە دەبن‌و لە ئەنجامی ئەم ئاوێتە بوونەشدا لە دوورەوە وای بینیوە، کـە گوایـە خۆرەکە دەکەوێتە نێو ئەو ڕەشاوە قوڕینەوە.. لەوانەیە هەر ئەمـەش ئـەو کانیـاوە تێکەڵەی قوڕە ڕەشەکە (العین الحمئة)ەکە بێت، کە قورئان باسی کردووە.. خـوداش هەر خۆی دەزانێت چۆنە..(والله أعلم)

## ئایا (ذوالقرنین)یـش پێغـەمبـەرێك بووە؟!

قورئان هەواڵی ئەوەشی پێ ڕاگەیاندووین کـەوا کاتێـك (ذوالقـرنین) گەیـشتۆتە بەشی خۆرئـاوای زەوی، گـەلێکی لەوێـدا بـەدی کـردووە: ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾ مانای ڕواڵەتی‌و دەرکەوتووی ئایەتەکەش ئەوەیە، بێگومان خودا ئەو فەرمایشتەی خۆی وەها پێ ڕاگەیاندووە، کە کاتێك بەسەر ئەو گەلەدا سەرکەوتووە، سەرپشکی کردووە چۆن هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵدا بکـات، سـا ئیتر بەخواستی خـۆی سـزایان بـدات، یـان لێیـان ببورێـت‌و بەچـاکی‌و بەخۆشـی مامەڵەیان لەگەڵ دا بکات.

زانایانیش ڕای جۆراوجۆریان لەسەر لێکدانەوەی ئەم فەرمایشتەی خـودا هەیـە، کەوا ئاڕاستەی (ذوالقرنین)ی کردووەو (لەو فەرمایـشتانە دەچـێت، کـە ئاڕاسـتەی پێغەمبەرانی کردووە)، پاشان هەر بۆیەش زانایان ڕای لێك جوداو جیاوازیان لەسەر پێغەمبەرێتی (ذوالقرنین) هەیە. بۆ نموونە: (هەندێك لەزانایان وای بۆ دەچـن کـەوا

ئەم پیاوە پێغەمبەرێك بووەو، ئەو فەرمایشتەی خوداش دەکەنە بەڵگەی پاڵپشت بۆ بۆچوونەکەیان کە فەرموویەتی (قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ ..)= (گوتمان ئەی ذوالقرنین تۆ دەتوانیت سزایان بدەیت، یان چاکەیان لەگەڵدا بکەیت..).

ڕووکاری هێنانەوەی ئایەتەکەش بەبەڵگەیەك بۆ بۆچوونەکەیان ئەوەیە کە فەرمایشتەکە ڕاستەوخۆ لە خوداوە تەنها بۆ پێغەمبەرێك ڕادەگەیەنرێت.. جا مادام خودا ئەو فەرمایشتەی پێ فەرمووە، کەواتە ئەویش (ذوالقرنین) پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرانی خودا).

چەند زانایەکی تریش نکوولّی دەکەن لەوەی کە (ذوالقرنین) پێغەمبەرێك بوو بێت، بەڵکو گوتوویانە:

(ئەو پیاوێکی صالّحی خوداو پادشایەکی دادپەروەر بووە).. پاساوی نکوولّی کردنیشیان لەو پێغەمبەرێتی یەی، ئەوەیە کەوا پێغەمبەرێتی (النبوة)ی هیچ کەسێك ناسەلمێنرێت تەنها بەبەڵگەیەکی شیاوو پەسند کراو نەبێت، بەڵگەکەش دەبێت ئایەتێك، یان فەرموودەیەکی (صحیح) بێت.. جا لەبەرئەوەی ئێمەش هەتا ئێستا ئەو بەڵگەیەمان نیە، ئەوا ناشێت بڵێین ئەو پێغەمبەر بووە، چونکە بەم وتەیە (گەر بڵێین پێغەمبەر بووە) ئەوا یەکێکی تر لەنێو پێغەمبەراندا دادەنێین کە تیایاندا نییەو لەوان نیە.

کۆمەڵێکی تریش لە زانایان لە ئاست ئەم مەسەلەی پێغەمبەرێتییەیدا بێدەنگ بوونو هیچ ڕاو بۆچوونێکیان لەسەری دەرنەبڕیوە.. لەم بارەیەشەوە گوتوویانە: (ئێمە ناڵێین ئەو پیاوە پێغەمبەرێك بووە، چونکە ئەم وتەیە ئاتاجی بە ئایەتێك یان فەرموودەکی ڕاست (صحیح) هەیە. ئایەتو فەرموودەش لەم بارەیەوە نی یە، هەروەها نکولّی لە پێغەمبەریەتییەکەشی ناکەین لەبەر گریمانی ئەوەی نەبادا پێغەمبەرێك بوو بێت، چونکە وەك ئاشکرایە قورئان باسی هەموو

پێغەمبـەرانی نـەکردووەو نـاوی گـشتیانی نـەهێناوە: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ ...﴿١٦٤﴾ النساء﴾.

جـا ئەگـەر ئێمـەش بڵـێین (ذوالقـرنين) پێغەمبـەر بـووەو، لـە هـەمان کاتـدا پێغەمبەریش نەبوو بێت، ئەوا خستوومانەتە نێو ڕیزی ئەو پێغەمبەرانەی خـوداوە کە لەوان نیە، ئەمەش هەڵەیەکە.

خۆ ئەگەر نکوولّی لە پێغەمبەرێتیشی بکەین لە کاتێکدا (گریمان: پێغەمبەرێك بووە) ئەوا یەکێك لە ڕیزی پێغەمبەران دەکەینە دەرەوە، ئەمەش هەر هەڵەیەکە.

جا لەبەر ئەوەی بەڵگەیەك بـۆ سـەلماندنی پێغەمبـەرێتی و، بەڵگەیـەکیش بـۆ نکوولّی لێکردنی پێغەمبەرێتی یەکەمیان لەبەردەستدا نییە، بۆیە ڕاستو دروسـتتر ئەوەیە کە لێی بێدەنگ بین، کەواتـە ئێمـە لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵـە زانایـەداین کـە بێدەنگن لە ئاست مەسەلەی پێغەمبەرێتیی (ذوالقرنين)داو، ناشـزانین ئایـا (ئـەو) پێغەمبەرێك بووە یان نا؟

ئەمە سەرەڕایی ئەوەی مەسـەلەکە هـەردوو بـۆ چـوونەکەش لـەخۆ دەگرێـتو ئەگەری ڕاستیو شیاویی هەردووکیان لەئارادایە. بەڵام لێرەدا بێدەنگ بوون لەسەر ئەو بۆچوونو مەسەلەیە لەگەڵ توێژینـەوەی مەنهـەجیی زانـستیانەدا دەگونجێـت، چونکە ناشێت ئێمە هیچ وتەو بیروڕایەك بدرکێنین تەنها بەزانست نەبێت.

پشت بەهیچ شتێکیش نابەستین تەنها بە بەڵگـە نـەبێت، دیـارە لـەم بارەیـەوە زانستو بەڵگەمان لەلا نییە. خۆ ئەگەر (ذوالقـرنين) پێغەمبەرێك بوو بێـت، ئـەوا هیچ ئاستەنگێك (اشكال) لە فەرمایشتەکەی خوادا نییە کـە فەرموویـەتی: ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾، چـونکە دیـارە خـودا ڕاسـتەوخۆ پێغەمبـەرانی دوانـدووەو ڕووی فەرمایشتی تیّ کردوون.

یـــان ئەگـــەر پێغەمبـــەرێکیش نـــەبووبێت، هـــەر ڕێـــی تێدەچـــێت، چـــونکە فەرمایشتەکەی خودا ﴿يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ ...﴾ سێ گریمان لەخۆ دەگرێت:-

١- لەوانەیە خودا ئەم فەرمایشتەی بـە پێغەمبـەرێك فـەرموو بێـت کـە لەگـەڵ (ذوالقرنين) بووە لە نێـو سـوپاکەیداو، ئـەم پێغەمبـەرەش ئـەو فەرمایـشتەی خودای بە (ذوالقرنين) گەیاندبێت.

٢- لەوانەیە خودا بە ئیلهامێك ئەوەی خستبێتە نێو بـیرو هۆشـی (ذوالقـرنين)ەوە وەك چۆن سرووش‌و (وەحی)ی بەدایکی (مووسا) گەیاندووە (سەرەڕایی ئـەوەی دایکی (مووسا) پێغەمبەرێکیش نەبووە) کە ئەو ئامرازە مسۆگەر کـراوە بـۆ پاراستنی (مووسا) بەکاربهێنێت.

٣- لەوانەشـە ئـەم ڕسـتەیە گێڕانەوەیـەکی (ذوالقـرنين) بێـت لەگـەڵ ئـەو گەلـە بەزێنراوەی ژێر دەسەڵاتی‌و ئەو وڵاتە فەتح کـراوو ڕزگارکراوانـەدا، کـە خـودا کردبویە دەسەڵاتدار لەسەریان‌و، سەربەستیشی کردبوو، کە چۆن هەڵسوکەوت‌و مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، ئایا سزایان بدات یان لێیان ببورێت و..؟! هتد..

ئێمەش هیچ بەڵگەیەکی ڕاست‌و یەکلاکراوەی کەسـێکمان لـەم بارەیـەوە نیـە، ئەمەش لەبەر نەبوونی‌یە کلاکەرەوەیەکی مەسەلەکە بەلای ئەوەدا، کـە پێغەمبـەر بووە، یان بەلای ئەوەدا، کە پێغەمبەر نەبووە..

## دەسـتووری دادپـەروەرانەی (ذوالقرنيـن)

کاتێـك خـودا (ذو القـرنين)ی سەرپـشك کـرد لــە هەڵـسوکەوت لەگـەڵ وڵاتـە فەتحکراوەکانداو، لــە مامەڵــەی لەگـەڵ گەلــە بــەزیووو ژێـر دەسـتەکانیدا، هـیچ ستەمێکی نەکردو نەیچەوساندنەوەو، زوڵم‌و زۆرداریشی لەسـەریان پیـادە نـەکرد، هەروەها ئەو سەرکەوتن‌و سەرپشك بوونەشی نەکردە دەرفەتێك بـۆ زەبـرو زەنـگ‌و

ملهوڕیو خراپەکاری، بەڵکو (ذو القرنين) ڕێساو دەستووری خۆی له مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو گەلەدا ڕوونکردەوەو گوتی: ﴿ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ الكهف ﴾.

لەم دوو ئایەتەی سوورەتەکەدا ئەو دەستووره دادپەروەرانەیەی ڕوون کردۆتەوەو، کە بەڵگەیەکە لەسەر باوەڕداریێتیو خواپەرستیو تەقوای (ذو القرنين)و، لەسەر شارەزاییو زیرەکییەکەیو، لەسەر دادگەرێتییەکەیو چاکەخوازیو ڕەحمو بەزەییشی.

بێگومان ئەو خەڵکە بێباوەڕەی کە (ذو القرنين) لەجەنگدا بەزاندبوونیو وڵاتەکەیانی فەتح کردووە، لەیەك پلەو ئاستی تێگەیشتندا نەبوون و، هەمووشیان یەك جۆرە سیفەتو خووو نەریتیان نەبووە، هەر بۆیەش ناشێت یەك جۆرە مامەڵە لەگەڵ هەموویان دا بکرێت.

ئەوان دوو جۆرە کەس بوون، ئیماندارو کافر، چاکە خوازو ستەمکار.. جا ئایا لە مامەڵەکردنیاندا یەکسان دەبن؟ (ذو القرنين) گوتوویەتی: (سەبارەت بە ستەمکاری بێئیمان، ئەوا سزای دەدەین، بەهۆی ستەمو بێباوەڕێتی یەکەیشیەوە سزاو ئازاری دەدەین، ئێمەش لەم سزادانەیدا دادپەروەرین، چونکە ئەوە سزاو ئازاردانی نێو دنیایەتی، سزایەکی تریشی لە ئایندەدا دەدرێت کە سزای ڕۆژی دوایی یە کاتێك بۆ لای خودای پەروەردگاری دەگەڕێنرێتەوە، ئەو سزایەشی لە قیامەتدا سزایەکی هێجگار توندو بە ئازارە (عذابا نكرا)..

لەو ئایەتەدا (عذابا نكرا) ئەو ئازارو ئەشکەنجەدانە توندەیە کە خەڵکی ڕقیان لێیەتیو بەئازارێکی هێجگار توندو تیژو ناخۆشی دادەنێن. بەڵام سزایەکی عادیلانەیەو بەپێی حوکمی دادگەرانەی خودا خۆیەتی، چونکە شایستەی ئەو

سزایەن، قورئانیش جیاوازیی لە نێوان وشەی (منكر)و (نكر)دا كردووه.. بۆ نموونه: (منكر) ئەو كاره ناڕەواو پووچەڵەیه، كه لە شەرعو دینی خوادا حەرام كراوەو، كه دڵو دەروونه پڕ له باوەڕەكانی ئیماندارانیش بە خراپی دادەنێنو رەتی دەكەنەوەو بەربەرەكانی دەكەنو نكوولّی لیّ دەكەن. (نكر)یش ئەوكارەو مەسەلە گرانەیه، كه هەندێك كەس نكۆڵی لێدەكەنو خۆیانی لیّ دوور دەخەنەوەو بەشتێكی رەت كراوەو هەڵەی دادەنێن..

بەڵام له حەقیقەتدا شتێكی ڕاستو دروستو پەسندكراوە لەشەرعو حوكمی خواداو لە تەقدیریو كرداریو خواستی دا، چونكه ستەمكاری لە ستەمدا ڕۆچووی بێباوەڕ بەپێی دەستووری (ذو القرنین) دوو جار سزا دراوە، جارێكیان لە دنیاداو بەدەستی خۆی، جارێكی تریش لە ڕۆژی قیامەتدا، كاتێك خودا سزایەكی گەورەو توندی ناخۆشی دەدات.

سەبارەت بە مرۆڤی باوەڕداری چاكەخوازیش، ئەوە بێگومان لە (ذو القرنین)ەوە نزیك بووەو پاداشتی چاكی داوەتەوەو، خەڵاتی باشی پیّ بەخشیووەو، بەخۆشیو نەرمیو زەردەخەنەو سۆزو خۆشەویستییەوە لەگەڵیا دواوە..

﴿...فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴿٨٨﴾ الكهف﴾.

## ( پەروەردەكردن بە پاداشت و سزا )

دەشێت ئەو هەڵسوكەوتەی (ذو القرنین)، لەگەڵ ئەو گەلەدا ببێتە دەستوورێك بۆ گشت حاكمو بەرپرسیارێك، كه مامەڵە لەگەڵ كەسانی تردا دەكات، هەروەها دەشێت خودی (ذو القرنین)یش، ببێتە نموونەو پێشەنگێكی باش بۆ هەر حاكمێك یان لێپرسراوێك. پێویستیشە هەر كەسێك لەوانەی لە واقیعی بەجێهێنانی فەرمانداریيو پابەندی كاركردن دەكۆڵنەوەو، خوازیاری چاكسازین لە فەرمانو

فەرمانگەکانداو، شێوازی بەڕێوەبردن چاك دەکەن، پێویستە سەرنجێکی قـوولّ لـەو دەستووره بدەنو هەڵوێستەیەکی درێژی لە ئاست دا بکەن، فەرمان (وظیفة)ش لەم سەردەمەماندا تووشی شێواندنو، خراپیی کارکردنی فەرمانبەران بـووەو، چـەندان ناهـەمواریو بـەدکاریو لادانـی بەسـەر داهێنـراوە. بنـچینەی هەڵـسەنگاندنو پاداشتو خەڵاتی هەر فەرمانبەرێکیش بەندە بەڕادەی پابەندیی فەرمانبەرەکـە بـە رژێمەوەو، بەخێرایی خزمەتکردنی لێپرسراوەکەیو خۆ لێ نزیك کردنەوەی و، ڕیـاو مەرایی بۆکردنی. ئیدی تاکە ئومێدی فەرمانبەران هاتۆتە سەر ئەوەی چۆن لەبـەر پرسان نزیك بنەوەو هەنگاوی بۆ بنێنو خێرو بێرو پاداشتێکیان لێوە دەسگیر بێت، یاخود پلەو پایەی فەرمانبەرێتیو بەجێهێنانو خزمەتی خەڵکیو گەیاندنی چـاکە پێیـان لەسـەر بناغـەی ئـەو سـەلامو ڕێـزە بێئەنـدازە ناشـەرعیانەیە بێـت کـە فەرمانبەران لە لێپرسراوانیان بگرن.

بەڕاسـتیو بێگومـان تـەرازووی حـوکم لـەجێی خـۆی جـوولێنراوەو بناغـەی فەرمانبەرێتیش لە جیهانی هاوچەرخماندا لەرزیوە، هـەر بۆیـەش ئـەو سـتەمکارو بەدکارو دەستدرێژکارانە نزیکترین کەسن لە حاکمـەوە کـە خێـرو بێـرو خـەڵاتو بەخششی ئەویان دەست دەکەوێت.. لەولاشەوە کارمەندانی دڵسۆز زویـر دەکـرێنو بەربەرەکانێیان دەکەنو دەریان دەکەنو ئازاریـان دەدەنو لـە بەخـششو ڕێزلێنـان بـێبەش دەکرێن.

بەم ڕەنگە کارەکانیش تێك چوون و، شێوازی بـەڕێوەبردنیش لارو وێـر بـووەو، بەدکاریی بڵاوبۆتەوەو، پشێویش تەشەنەی سەندووە.

بەڕاستی (ذو القرنين) بەرنامەیەکی بنچینەییو شێوازێکی کردەیی (عملی) بـۆ گشت لێپرسراوێك یان حاکمێك دادەنێت تاکو ئـەرکی خۆیـان چـاککەنو، پـەرەش بـەکاری فەرمانبـەرێتیو ئیـداریی بـدەن. دەشـێت ئـەم بەرنامەیـەش نـاوبنێن (پـەروەردەکردن بـەهۆی پاداشـتو سـزا) و، یـاخود نـاوی بنـێن: (هانـدەرەکانو تەمێکارەکان).

گرنگ ئەوەیە فەرمانبەر یان کرێکار بەچاکی ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێتو بەم پێوەرە هەڵسەنگێنرێت، نەك بەهۆی نزیکی یەوە لە حاکم یاخود بەهۆی کلکەلەقێو خۆ بردنەپێشەوە لە لێپرسراوان. جا ئەگەر فەرمانبەرێك کەمتەرخەمی کرد، یاخود خراپەی کرد پێویستە سزای بدرێت یاخود تەمێ بکرێت یان وەلاَمێکی بدرێتەوە، چونکە ناهەقی یەکی هەڵبژاردووەو پێویستە لە ئاکامی ناهەقییەکەی تێبگەیەنرێتو وریابکرێتەوە.

دەشێت ئەم فەرمانبەرە (لەسەر ئەو کارە نالەبارەی) لە مووچەی ببڕدرێت، یان لەو فەرمانەی بگوازرێتەوە بۆ فەرمانێکی دی، بەلاَم فەرمانبەری باوەڕدارو خواناسو چالاكو خۆشەویستی لای خەڵکی، ئەو فەرمانبەرەیە کە پێویستە ڕێزی لێ بنرێتو پاداشتی بدرێتەوەو، یارمەتی دەسخۆشانەو خەلاَتی هاندانی پێشکەش بکرێت، تاکو ببێتە پێشەنگ بۆ کەسانی دی و، ئەو کەسانەش بەهاندەرێکی خۆیانی دانێن بۆ کاری باشو چاکە خوازیو چاکسازی، ﴿مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ﴾. واتە: (هەر کەسێك باوەڕی بەخودا هەبێتو کردەوەی جوانو چاکی کردبێت ئەوا پاداشتی چاكو فرەی هەیە)، بێگومان ئەم جۆرە کەسە باوەڕداریتیو خواپەرستیی بەچاکی کردووەو، کارو فەرمانیشی بەچاکی کردووە، بۆیە ئێمەش بەچاکە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین، چونکە پاداشتەکەش لە ڕەگەزی کارەکەیە:

﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ الرحمن﴾.

﴿وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾ واتە: (بەخۆشیو نەرمو نیانیو سۆزەوە دەیدوێنین، لەمەش دا هەر پاداشتمان داوەتەوەو هانمان داوەو خستوومانەتە پێشو ڕێزو شکۆمان بۆ داناوە. جا کەسانێك کە سەرنج لەم دۆخە دەدەن، پەندی لێ وەردەگرنو وانەی لێوە فێر دەبن، چونکە هیچ کەسێك نایەوێت بەئانقەست خۆی بخاتە بەر سزاو ئازار (مەگەر کەسێك شێت بێت).

ئیدی ئەو کەسانەی تریش واز له ستەمو زۆرداریو بەدکاریی دێننو، سوودو خێرو چاکه بڵاودەکەنەوەو لەسەر ڕاپەراندنی ئەرکەکانیان بەچاکیو، باش بەڕێوەبردنی کاروبارو گەیاندنی خێرو چاکه بەخەڵکی، سوور دەبن.

خەڵات کردنی چاکەکاریش به پێشکەشکردنی خەڵاتێك دەبێت بۆیو، بەوەش ڕێزو بەهای بۆ دەگەڕێنرێتەوەو هانی دەدرێت لەسەر زیادکردنی چەندان هێندەی کۆششەکانیو بانگی کەسانی تریشی پێ دەکرێت که وەك ئەو بن.

## ((لَمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا))

(ذوالقرنين) بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتەڕێ، بەرەو شوێنی هەڵاتنی خۆر: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾ الكهف ﴾.

واتە: (کاتێك گەیشتە بەشی خۆرهەڵات دیتی خۆر لە نیشتمانی گەلێك هەڵدێت کە هیچ بەربەستێکی وەك گردێك یان چیایەك یان هۆیەکی تریان نیە).

جالێرەدا ئەوەی دەربارەی (شوێنەکانی خۆرئاوا بوون) گوتمان، دەربارەی شوێنەکانی هەڵاتنیشی دەیڵێین، چونکە خۆر چەند شوێنێکی لێوە هەڵاتنیشی هەیەو، هەر گەلێك خۆر هەڵاتێکی خۆیان هەبووەو، هەر نەتەوەیەکیش خۆر هەڵاتێکی هەیە، گرنگ ئەوەیە ئەو گەلەش خودا هیچ بەربەستێکی وەك چیاو گردو تەپۆڵکەی بۆ دانەناون، بەو مانایەی شوێنێکی وایان نەبووە کە ببێتە بەربەستو سێبەر لەبەر خۆرەکەدا لەکاتی هەڵاتندا.

دەربارەی تەفسیری ﴿قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا﴾ زانایان بیروڕایی جیاوازو لێك جودایان هەیە:-

١- هەندێکیان گوتویانە:- (ئەو گەلە لە نێو چەند دەشتێکی پانو بەریندا نیشتەجێبوونو هیچ چیاو گردێکی وایان نەبووە کە تیشکی ڕۆژیان لێبگرێتەوە، بۆیە لە کاتی هەڵاتندا تیشکی ڕۆژ کەوتۆتە نێو ماڵانیانەوە).

٢- هەندێکی تریشیان گوتوویانە:- (ئەوان خاوەنی خانوو، یاخود بیناو ساختمانێکی وا نەبوون کە تیشکی ڕۆژو گەرماکەیان لێ قەدەغە بکات، هەر بۆیەش لە یەکەم ساتی خۆرهەڵاتندا تیشکەکانی لەنێویان دابووە.

٣- هەندێکی تریشیان گوتوویانە:- (هیچ شتێکی وایان نەبووە کە لەش‌و لاریانی پێ داپۆشن، بۆیەش ڕووت‌و بێ‌بەرگ بوون، ئەگەر خۆرەکەش لێ یان هەڵاتبێت ئەوا بەتیشکەکانی خۆی ئازاری داون.

جێی باسیشە پێشتر ئەوەمان یەکلا کردەوە کە ئەو گەلە لەوانەیە لە تورکەکان یان لە گەلێکی تر بن‌و، ئەوان خۆیشیان لە ناوچەکانی تورکستان‌و ئەفغانستان‌و پاکستاندا ژیاون. لێرەشدا ئەوە تێبینی دەکرێت کە قورئان بەدرێژی ئەو ڕێنماییانەی نەهێناوە کە خودا لەبارەی ئەو گەلەوە پێی ڕاگەیاندووەو باسی ئەو بەربەست‌و هۆکارانەی ڕێگرتن لە تیشکی خۆرەکەش لەسەریانی نەکردووە. واتە دەستووری تایبەت بەحوکمی ئەو وڵاتانەی خۆرهەڵات‌و چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵدا کردنیانی دیاری نەکردووە، چونکە تەنها دەستووری مامەڵەی لەگەڵ وڵاتانی خۆرئاوادا دیاری کردووە لەکاتی بەجێهێنانی ئەرکەکانیدا لەوێ. بۆیە پێویست نەبووە کە دەستوورەکەی ئەوانیش دووبارە بکاتەوە، ئەمەش لەڕوانگەی دووبارە نەکردنەوەوە.

## ((وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَیۡهِ خُبۡرࣰا ))

پێش ئەوەی قورئـانی پـیرۆز کۆتـایی (بەباسـی جەنگـەکانی (ذو القـرنین) و — فتوحات-و ئەرکی ڕزگارکردنی گـەلو ولآتـان) بێنێـتو، پـێش ئـەوەی دەربـارەی کاروباری لە بەشی باکووری ناوچەکانی زەویدا، بدوێت، باسەکەی وەستاندووە تاکو ڕاستییەکی بنچینەیی دەربڕێت کە فەرمایشتەکەی خودایە: ﴿كَذَٰلِكَ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرࣰا﴾.. بـەمانای: بێگومـان خـودا زانـاو ئاگـاداری هـەموو حاڵـەتێکی (ذوالقـرنین) بوو و، بینەری هەڵسوکەوتو جموجووڵیی بوو و، هـەموو هـەواڵێکی خۆیو سوپاکەشی دەزانی.. هەر هەنگاوێك دەیاننا، بەمۆڵـەتو ڕێگـەدانی خـودا بوو، هەر جموجۆڵێکیان دەنواند بەخواستی خودا بوو، هەر جەنگێکیشیان دەگێراو هەر ولآتێکیان ڕزگار دەکرد، خودا ئاگاداری حاڵیانو، بینەری واقیعیانو، بیسەری هەواڵیان بوو.

لێرەشدا ڕوانگەیەکی هونەریی داڕێژراو هەیە کە دوای باسکردنی بەسەر هـاتی ئەو گەلەی لەبەر ڕۆژدا (بەبێ بەربەستێکی پارێزەریان لە تیشکی خـۆر لـە کـاتی خۆرهەڵآتندا) دەژیان، سەرنجی لێ دەدەین، ڕوانگەکـەش (واتـە ئـەو جـێ سـەرنجە هونەرییە داڕێژراوە)ش ئەوەیە کە (سید قطب) لەبارەیـەوە گوتوویـەتی:- (لێـرەدا هەڵوێستەیەکی کورت لەبەردەم دیاردەی جوانکـاریی پێکگەیانـدنی هونەرییانـەی نێو شێوازی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە دەکەین، چونکە ئەو دیمەنەی کە لێرەداو لـەو بەشەی چیرۆکەدا پیـشان دراوە، لـە سروشـتدا دیـارو دەرخـراوە.. خۆرهـەڵآتووەو تیشك دەداتەوە، ئەو گەلەش هیچ پەردە پۆشێکی وەك چیایەك یان بەرزاییەك یان

دیوارێکیان نیە کە لە تیشکی خۆر بیانپارێزێت.. هەمدیسان ویژدانی (ذوالقرنین) و ئامانج‌و نیازەکانیشی، هەمووی لەلای خودا دیارە.. بەم ڕەنگەش دیمەنی نێو سرووشت‌و دیمەنی ویژدان‌و ناخی (ذوالقرنین)یش لەسەر شێوازێکی وردو جوانی ڕێکخستنی قورئان بەیەك گەیەنراون)[١].

هەروەها ڕادەمێنین لەوەی پرسیارێك لەبارەی حیکمەتی خوداوە لەسەر باسی زانینی هەموو هەواڵێکی (ذوالقرنین) و سوپاکەی بکەین، کە بۆچی خودا باسی ئەو زانابییەی خۆی لە زانینی هەواڵەکانی دەکات‌و، بۆچی زانستی لەسەریان هەیە لەکاتی باسکردنی فتوحات‌و جەنگەکانی ڕزگارکردنی وڵاتاندا؟ ئاخۆ حیکمەت لەم باسە چی بێت؟! بێگومان ئەو حیکمەتەی کە لێیەوە بۆمان دەردەکەوێت: سووربوونی قورئانە لەسەر پێکەوە بەستنی هەرچی ڕوو دەدات لە گەردووندا بەخواستی خوداو ئیرادەو زانستی خۆی، تاکو خەڵکی ئەم ڕاستی یە لەبیر نەکەن لەکاتی سەرنجدان لە ڕووداوەکاندا، پاشان بۆ ئەوەی خەڵکی وای تێنەگەن کە ئەوان خۆیان تەنها بە وزەو تواناکانی خۆیان‌و (دوور لە زانست‌و فەرمانی خودا) هەڵس‌و کەوت دەکەن.

بۆ نموونە ئەوەتا بەڕێزێکی وەك (ذوالقرنین) چەندەها فتوحاتی گەورەشی لەبەرەی ڕۆژئاواو پاشان لەبەرەی ڕۆژهەڵاتیش بەئەنجام گەیاندووەو، چەندەها دەسکەوتی گەورەشی لەبەرەی باکوور بەدەست هێناوەو، کەچی وێڕایی ئەوەش خودا چاودێری کاروباریەتی‌و، ئاگاداری سەرجەم هەواڵەکانیەتی‌و، زانای دەسکەوتەکانیەتی‌و، لە هەمان کاتدا خودا هەر خۆیشی قەدەرو ئەندازەی بۆ داناون‌و خواست‌و ئیرادەی لەسەریان بووە.

---

١) في ظلال القرآن، (٤: ٢٢٩٢).

## (خَبَر) و (خُبْر) – خەبەر و خوبر-

هەر لێرەشدا هەڵوێستەیەکی هونەرییانە لە ئاست دیاردەیەکی ناوازە لە ناوازەکانی قورئان دەکەین.. داخۆ جیاوازیی نێوان (خُبر)و (خَبر) چی بێت؟! ئەی لە چ شوێنێکی قورئاندا هەردوو وشەکە هاتوون؟.. وشەی (خەبەر) دوو جار لە چیرۆکی (مووسا)دا ـ سلاوی لێ بێت ـ هاتووە، هەردوو جارەکەش لەیەك باسدا هاتوون هەر چەندە لە دوو سوورەت دان.

جاری یەکەم: خودا دەربارەی (مووسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ.. ﴿٧﴾ النمل﴾، واتە (کاتێك مووسا لە ڕێگەیاندا بۆ (میسر) بەخێزانەکەی گوت:- ئەوا من لە دوورەوە ئاگرێکم بەدی کردوەو دەچم بۆ ئەودەوروبەرە تاکو هەواڵێکتان لەوبارەیەوە بۆ بهێنمەوە).

جاری دووەم: هەر دەربارەی (مووسا) خودا فەرموویەتی:- ﴿...قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ... ﴿٢٩﴾ القصص﴾، کە هەمان مانای هەیە..

بێگومان (مووسا) ـ سلاوی لێ بێت ـ کاتێك لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا بەرەو (میسر) گەڕاوەنتەوە، ڕێگەی لێ وون بووە، پاشان ئاگرێکی لە دوورەوە بەدی کردووەو، ڕووی تێکردووە تاکو کەسێکی وای لێ ببینێت کە ڕێگەی پێ نیشان دات و ڕێنمایی بکات.. بەڕاستی ئەو (واتە مووسا) ئومێدێکی گەورەی بەو کەسە هەبووە کە بۆ ئەوەی هەواڵێکی ڕێگاکەی لێوە دەست کەوێت.

بەڵام ووشەی خوبر(خُبر) تەنها لە سوورەتی (کهف)دا هاتووە، لەو شوێنەدا کە (خضر) بە (مووسا)ی گوتبوو: ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾= (چۆن ئارام

لەسەر کارێکی سەیری وا دەگریت کە پێشتر زانستو زانیارییەکت لەسەر لایەنە شارراوەو نەزانراوەکەی نەبووە). لەم چیرۆکەشدا لەبارەی (ذو القرنین)ەوە گوتوویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴾= (بەم ڕەنگە ئاگادارمان کرد لە هەواڵو زانستی شارراوە). جیاوازیی نێوان (خبر)-بە فەتحەی سەر هەردوو پیتی (خ)و (ب)، لەگەڵ وشەی (خبر) بە (ضمة)ی سەر پیتی (خ)و (سکون)ی سەر پیتی (ب)، ئەوەیە کە:

(خَبَر): زانینی ئەو شتە زانراوانەیە لە ڕووی هەواڵو گەیاندنەوە.

(خُبَر)یش: زانینی ڕووە نادیارو ناوەکی یەکانی مەسەلەکانە)[1].

واتە: ئەگەر زانینەکە بۆ ڕواڵەتی هەواڵەکانو، شتە دیارەکانو، ڕووی دەرەکیی مەسەلەکان بێت، ئەوە بە هەواڵ دادەنرێت، واتە بە (خەبەر).

بەڵام ئەگەر زانینەکە بۆ ناواخنی مەسەلەکانو، شتە نادیارەکانو نهێنییەکانی ئەو شتانەو، لایەنە ناوازەو تەماوییەکانی بێت، ئەوە بە (خوبر) دادەنرێت.

وشەی (خبر)یش تەنها لە سوورەتی (کهف)دا دیاری کراوە، چونکە سوورەتی زانینی ئەو شتە نادیارانەیە کە بە فەرمانی خودا دەرخراون، هەروەها سوورەتی دەرخستنی بنچینەی ڕووداوەکانو نهێنییەکانیانو وردەکارییەکانیانە.

جا بۆیە (موسا)ش چەند کاروکردارێکی وا لە (خدر) دەبینێت، کە لەوەو بەر حەقیقەتەکانی نەزانیوەو، زانستی لەسەر لایەنە شارراوەو نادیارەکانیشی نەبووە، هەربۆیەش نارەزایی لەسەریان دەربڕیوە: ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴾... دیارە (ذوالقرنین)یش چەند کردارێکی وا ئەنجام دەدات، کە گەلێك کەس زانیارییان لەسەری نەبووە، ئەوەی لە ناخو دڵو نیازیایەتی، لەلای خەڵکی نەزانراوە، بەڵام خودا چاودێرو ئاگادارو شارەزای کارونیازو بارودۆخیەتی.

---

١) المفردات/ ص(١٤١).

## ئەو گەلە دواکەوتوو و بێتوانایەی کە (ذوالقرنين) بەربەستەکەی بۆ بنیاتنان

قورئانی پیرۆز بەسەرهاتی (ذوالقرنين) و کارەکانی لەبەشی باکووری زەویدا بۆ گێراوینەتەوە، ئەمەش لەو فەرمایشتەی خوادایە کە فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ الكهف ﴾. واتە: (-ذوالقرنين-) ڕۆشت تا گەیشتە ناوچەی نێوان هەردوو چیا بەرزەکەو لەوێ دیتی گەلێك هەیە کە هێندە نەفامو دواکەوتوون، مرۆڤ بەشێوەیەکی گرانو زەحمەت لێیان تێدەگات، ئەو گەلە (کە لە حاڵەتێکی ترسو دوو دڵیدا بوون) بە (ذو القرنين)یان گوت:- (یەئجوجو مەئجوج، گەلێکی خراپو بەدکارن لە زەویداو مەترسییان بۆ سەر ئێمە هەیە، جا ئایا کرێیەکت پێبدەین لەسەر ئەوەی، کە لە نێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێکی پتەو دروست کەیت تاکو پێمان نەگەنو ئازارمان نەدەن؟).

لە وەڵامدا (ذو القرنين) پێی گوتن: (ئەو هێزو توانایەی کە پەروەردگارم پێی بەخشیوم لەو کرێیە باشترە بۆم، بەڵام من کارەکەتان بۆ دەکەم، ئێوەش بەهێزی دەستو بازووتان یارمەتیم بدەن تاکو بەربەستێکی گەورەو پتەوو تۆکمە لە نێوان ئێوەو ئەواندا دابنێم.

ئه‌و ناوچه‌یه‌ی نێوان هه‌ردوو چیا به‌رزه‌که‌ش ئه‌وه‌یه‌ که‌ ده‌که‌وێته‌ باشووری زنجیره‌ چیاکانی (کافکاس)ه‌وه‌و، که‌ ئه‌مڕۆ به‌ ولاّتانی (ئه‌رمه‌نستان)و (گورجستان)و (ئازه‌ربایجان) ناوده‌برێت، ئه‌و میلله‌ته‌ش که‌ له‌سه‌رده‌می (ذو القرنین)دا له‌وێ نیشته‌جێ بوون هۆزو تیره‌کانی (کۆشیا) بوون که‌ سکالاّی حاڵی خۆیان له‌لاکردو باسی شالاّوه‌کانی (یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج) له‌ڕێی ته‌نگه‌ی (داریال)ه‌وه‌یان بۆ کرد، ئه‌وه‌بوو (ذوالقرنین)یش ئه‌و ته‌نگه‌یه‌ی گرت‌و، به‌ربه‌سته‌که‌ی له‌سه‌ر بنیاتناو، ماوه‌ی نۆ ساڵیشی له‌و کاره‌دا خایاند تا ئه‌و پرۆژه‌ گه‌وره‌یه‌ی ته‌واو کرد. کاتێك باسه‌که‌ی نێو قورئانیش له‌سه‌ر ئه‌و میلله‌ته‌ ده‌خوێنینه‌وه‌، چه‌ند سیفه‌تێکیان به‌دی ده‌که‌ین‌و ده‌ردێنین، که‌ ئه‌مانه‌ن:-

١- ئه‌وان گه‌لێکی دواکه‌وتوو بوون: ﴿لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴾، (له‌ هیچ وته‌یه‌ك تێ نه‌ده‌گه‌یشتن) ئه‌مه‌ش دوو مانا هه‌ڵده‌گرێت:-

یه‌که‌میان: یان وادیاره‌ ئه‌وان زمانی گه‌لێکی تریان له‌گه‌لانی غه‌یری خۆیان نه‌زانیوه‌و له‌هیچ وشه‌یه‌کیان تێ نه‌گه‌یشتوون، چونکه‌ شاره‌زاو ئاگاداری نه‌بوون‌و فێری ئه‌و زمانانه‌ی تر نه‌بوون، بۆیه‌ش ته‌نها له‌نێو زمانه‌که‌ی خۆیاندا په‌نگیان خواردبوو.

مانای دووه‌میش: یان وادیاره‌ دواندن‌و ئامۆژگاریکردنیان بێ‌سوود بووه‌، چونکه‌ گه‌لێکی تێ‌نه‌گه‌یشتوو بوون‌و، قسه‌و ئامۆژگاری کاری تێ‌نه‌کردوون‌و، له‌ قسه‌و ئاکاری به‌رامبه‌ره‌کانیان حاڵی نه‌بوون، ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ده‌مارگیری‌و توندوتیژییه‌کی خۆیان، یان له‌به‌ر گه‌مژه‌یی‌و ساویلکه‌یی‌و نه‌فامییه‌ك که‌ له‌ نه‌ریت‌و سروشتیاندا بووبێت.

٢- ئه‌وان گه‌لێکی لاوازو بێ‌ده‌سه‌لاّت بوون، هه‌ر بۆیه‌ش ده‌سته‌و سان بوون له‌ به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی شالاّوه‌کانی (یه‌ئجووج‌و مه‌ئجووج) بۆ سه‌ریان‌و، له‌ڕووبه‌ڕوو بوونه‌وه‌یان و، ڕێگرتن له‌کاری تێکدان‌و پشێوییان.

٣- ئــەوان گــەلێکی بێدەســەڵات بــوون بــۆ بــەرگریی لــە خــاکی خۆیــان و، بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژکاران، هەربۆیەش پەنایان بردۆتە بەر هێزێکی تری دەرەکی واتە: هێــزی (ذوالقـرنين)و کــاری چارەســەری ئــەم حاڵەتــەیانیان پــێ سپاردووەو، ئامادەییشان بۆ دەربڕیوە کە کرێیەکی پێبدەن:

## (( فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا ))

بێگومان ئەو گەلە سیماو ڕوخسارو نەریتی گەلانی بێدەسەڵاتو تەمەڵو دواكەوتوویان لێنیشتبوو كە بێتوانان لە چارەسەری گرفتەكانیانداو، ئەركی چارەسەرو بنبڕكردنی گرفتەكانیان دەدەنە دەست بێگانە.

ئەوەی لەم سەردەمەشماندا مرۆڤ لێی سەرسام دەبێت ئەوەیە گەلێك كەس لە عەرەبەكان هەمان سیفەتی ئەو گەلانەیان گرتووەو، لە چەندین گرفتی ترسناكو بەردەوامدا دەژین لەسەروو هەموو گرفتەكانیشەوە، كێشەی (فەلەستین) هەیەو، لەم كێشەیەدا ڕووبەڕووی چەند دوژمنێكی شەڕخوازو فێڵباز بوونەتەوە، لە پێشەوەی ئەو دوژمنانەشدا جوولەكەكان هەن كە لە فەلەستیندا دانراونو كۆسپێكی ترسناكیان بۆ عەرەبەكان دروست كردووەو، سا ئیتر خۆیان لە پشتیەوە بن یان نا ؟! دیارە ئەم ڕەوشو بارودۆخەش ئەوە لە عەرەب دەخوازێت كە ژیرو عاقڵ بنو پەی بەو مەترسی یە ببەنو بەچاكی ڕووبەڕووی ببنەوەو، وەكو پیاوان (یان پیاوانە) بەڕووی كۆسپی شارستانیانەدا بووەستنەوەو، بۆ (چارەسەری گرفتەكانیش بەدەستی خۆیان) بێدار بنەوە.

بەڵام ئەوان وەك ئەوگەلە (بێ تواناو لەهیچ حاڵی نەبووە) مامەڵەیان لەگەڵ كێشەو گرفتەكانیاندا كردووە.. كێشەكەیان خستۆتە بەردەم خەڵكی تر.. بردوویانە بۆ لای نەتەوە یەكگرتووەكانو ئەنجوومەنی ئاسایشو گەورە لێپرسراوانو كۆنگرەی نێو دەوڵەتیو، تۆپەكەیان خستۆتە نێو یاریگای ئەوانەوەو داوایان لێكردوون خۆیان یاریی پێبكەن.. داوا لە بیانی یەكان دەكەن كە (لەجیاتی خۆیان) كێشەكەیان بۆ چارەسەركەن، تكاشیان لێكردوون قەناعەت بە جوولەكەكان بێنن تاكو بەدەم

دەنگەکانی ئاشتییەوە بێن، خۆشیان وەك بینەر لە ئاست مەسەلەکەدا وەستاون و، چاوەڕوانی ئەوەن، کە ئاخۆ بێگانەکان چییان بۆ دەکەن و، کێشەکەیان چۆن بۆ تاوو توێ دەکەن.

دیارە هیچ کەسێکیش (وەك بینەر) لە ئاست ئاگر کەوتنەوە لەنێو ماڵیدا، کە خەریکە ماڵەکەی بۆ دەسووتێنێت، ڕاناوەستێت، مەگەر کەسێکی بێ عەقڵو دواکەوتوو بێت.. هەمدیسان هیچ کەسێکیش، تەنها وەك چاودێرێك سەیری دز ناکات کاتێك ماڵەکەی دەبڕێتو دەدزێت، مەگەر کەسێکی بێعەقڵو دواکەوتوو بێت.. هیچ کەسێکیش داوای کۆمەك لە دوژمنو، داوای ڕەحمەت لە ناحەز ناکات، مەگەر کەسێکی دەستەوسانو تەمەڵ بێت.. ئەم سیفەتانەش ئەمڕۆ بوونەتە خوونەریتی عەرەبەکان، کتومت وەك خوونەریتی ئەو گەلە ستەمکارو دواکەوتووە. دیارە گرفتەکانیش بەم ڕەنگە چارەسەر ناکرێن، نیشتمانیش بەم شێوەیە ناپارێزرێت.. بەم شێوەیەش داوو فێڵو پیلانەکان هەڵناوەشێنرێتەوە..

## لێبڕانی (ذو القرنین) لە ماڵ و سامان دا

(ذوالقرنین) بەو پەڕی پاکیو لێبڕانەوە پێشنیازەکەی ئەو گەلەی (دەربارەی کرێو پاداشتی دارایی) کە لەبەرامبەر پاراستنیان لە دوژمنانیاندا پێیان دەدا، ڕەت کردەوەو ڕازی نەبوو، کە بەکرێو پاداشت کاریان بۆ بکات، بەڵکو پێی گوتن: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ ... ﴾.. من هیچ ئاتاجێکم بە ماڵو سامانی ئێوە نیە، چونکە خودا خێرو بێرێکی وای پێ بەخشیوم، کە لەو پاداشتەی ئێوە باشترەو، هەروەها هێندەی لە وزەو تواناو دەسەڵات پێ بەخشیوم کە وای لێ کردووم لێبڕێم لەو ماڵو سامانەی، کە ئێوە بۆم دادەنێنو، خۆمی لێ بپارێزم.

بێگومان زوهدو لێبڕانی (ذوالقـرنین) لەماڵو ساماندا و خۆلێ پاراستنیو بـەرز ڕاگرتنی خۆی لە سەرووی ئەو سامانەوە، سیفەتێکە لە سیفەتەکانی حاکمی باشو دادگەرو لێـبڕاو، بـەو ڕەنگـەش داوا لـە حاکمـانی موسـڵمانان دەکـات، بیکەنـە پێشەنگ بۆ خۆیان لەو سیفەتەدا..

(امام ابن کثیـر)یش لە کـاتی لێـدوانی لەسـەر (ذوالقـرنین)دا، هەڵوێـستەکەی (سـولەیمان- سـەلامی لێ بێـت)ی دیـاری کـردووە لـە ئاسـت دیارییەکـەی (یـان بەرتیلەکەی) شاژنی (سەبەء)دا کاتێك ئەو شاژنە وەفدێکی خۆی بە هەندێك پارەو ماڵەوە بۆ لای (سولەیمان) ناردووە، تاکو (سولەیمان) دەست هەڵگرێت لێیانو داوای باوەڕهێنانو تەسلیم بوونیان لـێنەکات. وەك خوداش ئەم بەسەرهاتەی لە قورئاندا گێڕاوەتـەوەو فەرموویـەتی: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَـٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَـٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم ...﴿٣٧﴾ النمل ﴾. کەواتە: (سولەیمانی پێغەمبەری خوداش) ـ سلاوی لێ بێت ـ وای داناوە، کە فەزڵو خێرو بێری خودا باشترە لەو ماڵو سامانەی بۆی براوە، بۆیە ئەویش نەویست (زاهید)ی بووەو وەك (ذو القـرنین) پێی گوتوون: (ئەوەی خودا پێی بەخشیوم لەوە باشترە، کە بۆتان هێنـاومو پـێم دەدەن): ﴿فَمَآ ءَاتَـٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَـٰكُم﴾... (ذوالقرنین)یش ئەو بەخششەی خـودای لـەو مـاڵو سـامانە بەباشـتر داناوە، کە ئەو گەلە بۆیان داناوە:

﴿ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ ﴾.. هەروەها (لە هەڵوێستی (ذوالقرنین) لە ئاست سەداو ئالۆیری یەکەی ئەو گەلەدا).. ئەو ڕێسایەش لە پێشەوای خەڵکیدا بەدیی دەکەین، کە پێویستە لە ئاست موڵكو ماڵی گەلەکەیدا لێبـڕاوو خۆشەویستو پاك بێـتو، هیچ شتێکی بۆ خۆی لـێ گل نەداتەوە، چونکە ئەوەی لێی خوازراوە ئەوەیـە، کـە پارێزەری وڵاتو خەڵکەکەی بێتو، لەبەرامبەر ئەو پارێزگارییەشدا هـیچ پـاداشو

کریَ یەکی تایبەتی لە هیچ جۆرە کەسێك وەرنەگرێت، چونکە ئەم نەریتی زوهدو لێبرانە، لە مەرجو پێداویستی یەکانی پێشەوایەتی ی ئەون.

لەم بارەیەوە، ئیمام (ابوبکر بن العربی) هەڵوێستەیەکی لە ئاست وەڵامەکەی (ذوالقرنین)دا کردووەو بنەمایەکی گشتیی لە (چۆنیەتی مامەڵەی حاکم لەگەڵ گەلەکەیدا)و (زوهدو نەویستنی ماڵو سامانیان) لێ دەرهێناوەو، گوتوویەتی:

(لەسەر پادشاو حاکمی وولات پێویستە کە موڵكو ماڵی خەڵکی لە بچووکترین شتیانەوە بپارێزێتو کەلێنو پێداویستییان پڕکاتەوەو، ئەو کەموکوڕییە داراییەی کە بەمافی خۆیان دەگەڕێتەوەو شایستەیانە چاكو ڕاستکاتەوەو، هەموو ئەو مافانەشیان پێ بگەیەنێت کە گەنجینەدارانی لەژێر دەسەڵاتو چاودێریی خۆیدا کۆی دەکەنەوە تەنانەت گەر هەقەکانی هەندێك خەڵکی تریشی تیادا نەما بێتو بە مووچەو دەرامەتی خەڵکی (گەنجینەکان) بەتاڵ بووبنەوە، یاخود بە کارەسات رۆشتبن.. ئەوا پێویستە لەو جۆرە حاڵەتەدا کاروباری داراییان بۆ ڕاست کاتەوەو بەچاکیو عەدالەتەوە چاو بەکەمو کورتییەکانی خەڵکیدا بگێڕێتەوە، بەڵام بە سێ مەرج:

<u>یەکەم</u>: هیچ بەرژەوەندییەکی تایبەتی بۆ خۆی لێ گل نەداتەوە.

<u>دووەم</u>: سەرەتا بەکەسانی نەدار دەست پێبکاتو هاریکاریی ئەوانە بکات کە ئاتاجیان پێیەتی.

<u>سێیەم</u>: بەپێی پلەو ئاستی بژێوی خەڵکەکە ئەو ماڵو سامانە دابەش کات.

خۆ ئەگەر دوای ئەوەش ئازوخەی نێو گەنجینەکانو پێداویستییە پاشەکەوت کراوەکانی تەواوبوونو هیچیان تێدا نەماو، بەهۆی ڕووداوەکانەوە دۆخێکی نەداری هاتە ئاراوە دەبێت ئەو خەڵکە خۆیان لە هەوڵو تەقەلادابن لە پێش خەرجکردنی ماڵو سامانیاندا، خۆ ئەگەر بەوە سوودی نەبوو، ئەوا بەگوێرەی ئەندازەیەکی دانراو، ماڵو سامانیان لێ وەردەگیرێتو، بە باشترین شێوازی ڕاوێژ لەسەر کراویش ئەو ماڵو سامانە بۆ کۆتایی هێنان بەو دۆخە نائاسایی یە خەرج دەکرێت، وەك

چۆن (ذو القرنين) کاتێك کرێو ماڵو سامانی خرایە بەردەم، گوتی:- (پێویستیم پێی نیە، بەڵکو پێویستیم بەخۆتانە، کە بەهێزی دەستو بازووتان یارمەتیم بدەن بۆ بنیاتنانی بەربەستەکە بەمانای لەگەڵ مندا خزمەتی خۆتان بکەن، چونکە من ماڵو سامانم هەیەو، ئێوەش پیاوانو هێزو بازووتان هەیە) مەبەستی جێگیرو نەگۆڕیش لەمەدا ئەوەیە، کە ناشێت پارەو ماڵ لە هیچ کەسێك وەرگیرێت (مەگەر بۆ پێداویستییەکی گرنگ نەبێت)، سا ئیتر بەئاشکرا بێت، یان بەنهێنی، لێی وەردەگیرێتو، بەشێوەیەکی دادگەرانەش بۆ سوودی گشتی خەرج دەکرێت، نەك بەو ڕەنگەی کە (ئەو لێپرسراوەی پارەو ماڵەکەی پێدراوە) بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکاری بێنێت.. دەبێت بە ڕای کۆمەڵە کەسێکی پەیوەندیداریش بێت، نەك هەر پابەند بێت بەڕای خۆیەوە)[1].

---

[1] احكام القران لإبن العربي، (٣: ١٢٤٨)، هەروەها بڕوانە کتێبی (ذوالقرنين)ی مامۆستا (محمد خير يوسف)، لاپەرە (٢٧٤-٢٧٥).

## (( فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ ))

کاتێك (ذوالقرنین) ڕووی له پارەو ماڵیان وەرگێڕاو نەیویست، خوازیاری ئەوە بوو کە ئەوان واز له بێدەسەلاتیو تەمەڵیو تەوەزەلی بێنن، هەروەها حەزی کرد لەوەی کە فێری جمەوجووڵو چالاکیو کارکردنو هەوڵدانیان بکات، بۆیەش پێی گوتن:- ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾.. بەمانای: (بە کۆمەكو یاریدەی خۆتان هاوکاریم بکەن)، واتە بەدیاردەکانی هێزو بازووتان، کەواتە ئەو داوای لێکردوون یارمەتیی بدەنو هێزی دەستو مەچەك (کەهێزێکی مادییانە) بۆی دەستە بەر بکەن تاکو لەبەربەستەکەدا کاری پێ بکەن.. ئەمەش وەك ئەوە وایە کە بڵێیت:- (هێزی دارایی لەسەر خۆمو، هێزی فیکریو تێڕامانیش هەر لەسەر خۆم بێت، ئێوەش هێزی ماددی کردەیی (عملی)تان لەسەرەو، ئیدی ئەوەی من هەمەو ئەوەی ئێوەش هەتانە، دەکەین بەیەكو، بەم ڕەنگە کارەکەش بەئەنجام دەگات.

ئەم دەستەواژە کورتەی قورئان ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ دادەنرێت بە مەشخەڵێکی دیاری قورئانی له هاوکارییو پێکەوە بەستنی هەوڵو تەقەللاکانو لەیەکخستنی وزەو توانـاو هێزەکانـدا، هەروەها ڕێسایەکی جوانی دەرهاوێژراوی قورئانمان دەربارەی بەئەنجام گەیاندنی کاروبارو ڕاپەراندنی ئەرکی پێویست، پیشان دەدات.

بێگومان کۆمەڵگەی تەواوو کاملو سەرکەوتوو ئەو کۆمەڵگەیەیە کە هەموو هێزو تواناکانی بۆ بەدیهێنانی کاری چاك تیادا کۆدەبێتەوە، سەرکردایەتیی سەرکەوتووی هۆشیاریش ئەوەیە کە هەموو هێزو تواناکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان لەخۆ بگرێت.

بێگومان لەنێو کۆمەڵدا چەند چینو توێژێك لە خەڵکیدا هەنو توانای فیکری‌و تێڕامانیان هەیەو، دەتوانن بیربکەنەوەو، بەرنامە دابنێن و، لەمەسەلەکان بکۆڵنەوە، بەڵام ئەگەر ئەو چینو توێژەی بەتەنها سەر پشك بکرێن بۆ بەدی هێنانی کارێکی گران، ئەوا هەر خۆی بەتەنیا ناتوانێت ئەو کارە بەئەنجام بگەیەنێت کە نەخشەی بۆ کێشاوەو بیری لێ کردۆتەوە. هەندێك چینو توێژیش لە کۆمەڵگەدا ماڵو سامانو سەرمایەی تەواویان بۆ کارکردن هەیە، بەڵام لەوانەیە تێفکرینو نەخشەو پلانیان نەبێت، هەروەها لەوانەشە توانای گونجاویان بۆ کارکردن نەبێت.

هەندێك چینو توێژی تریش لە خەڵکیدا هەن، کە نەماڵو نە سامانیان هەیەو، نەفیکری نەخشەو پلان دانانیان هەیە، بەڵام کاتو توانای کارکردنیان هەیەو، دەتوانن بەهەوڵدانو هێزی جەستە بژێوی خۆیان وەدەست خەن.

بۆیە هەر دەبێت ڕاوێژو هاوکاریی لە نێوان ئەو چینو توێژانەدا هەبێت‌و هەموو هێزو وزەو توانایەکیان کۆبکرێتەوەو، بۆ بەرژەوەندی‌و خێرو بێرو پێشکەوتنی نەتەوە ئاڕاستە بکرێت، هەر دەبێت خاوەنی فیکرو نەخشەدانەر لەگەڵ خاوەنی ماڵو سامانو لەگەڵ کەسی خاوەنی تواناو هێزی بازوو پێك بگەنو هەموویان ڕوو لە خێرو بێرو بەدییهێنانی بەرژەوەندی ڕەوا بکەن.

سەرکردایەتی هوشیاریش لەنەتەوەدا ئەوەیە کە توانای پێکەوە بەستنی هەموو ڕێچکە ڕێکخراوەکانو هێڵەکانی هەیەو، بەهرەو وزەکان لەگەڵ یەکتردا دەگونجێنێت. جا ئایا نەتەوەکەمان لە واقیعی هاوچەرخماندا هێزو تواناکانی پێك گەیاندووە، یان لێکی دابڕیون؟ ئەی ئایا هەموو بەهرەو تواناکان لەسەر بەرژەوەندیی نەتەوەی ئیسلام پێك گەیشتوون، یان پەرتەوازەو بەش بەشکراون؟!

ئای چەند بەهرەی وون بوو لە نەتەوەدا هەیەو!! چەند ووزەی پەکخراو هەیەو!! چەند ماڵو سامان بەفیڕۆ دراونو!! چەند کاتیش بەخۆڕایی تێپەڕیوەو!! چەندە لە گەنجانی ڕێ لێتێکدراویش هەن!!

جا هه‌ر ده‌بێت نه‌ته‌وه‌ی ئیسلام ڕێساکه‌ی (ذوالقرنین) له‌ کۆکردنه‌وه‌ی وزه‌و تواناکانی خه‌ڵکی‌و له‌ ڕاوێژو هاوکاریدا بگرێته‌به‌ر، هه‌روه‌ها ده‌بێت دروشمی ئه‌م نه‌ته‌وه‌یه‌ به‌هه‌موو چینو توێژو وزه‌و تواناو شاره‌زاییه‌کانه‌وه‌: ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ بێت.. واته‌ (دروشمی هاوکاریی‌و یه‌کخستنی بیروڕاو ووزه‌و تواناکان بێت).

## به‌ربه‌سته‌که‌ له‌ چی دروست کرا ؟!

قورئان ئاماژه‌ی بۆ ئه‌و مادده‌یه‌ کردووه‌ که‌ به‌ربه‌سته‌که‌ی لێ دروستکراو، چۆنیه‌تی بنیاتنانیشی باسکردووه‌، وه‌ك خودا فه‌رموویه‌تی:

﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ الكهف﴾

كه‌واته‌ (ذوالقرنین) له‌ كاری بنیاتنانی به‌ربه‌سته‌كه‌دا داوای له‌و گه‌له‌ كردووه‌ كه‌ چه‌ندین پارچه‌ ئاسنی گه‌وره‌ی بۆ بێنن‌و بیانخاته‌ ئه‌و ناوچه‌ ته‌نگه‌به‌ره‌ی نێوان هه‌ردوو چیا به‌رزه‌كه‌وه‌، له‌م ئایه‌ته‌دا ووشه‌ی (زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ) واته‌ چه‌ند پارچه‌ ئاسنێكی هێجگار گه‌وره‌ كه‌ له‌ ناوچه‌كه‌یاندا ده‌یانبڕییه‌وه‌. وه‌ك پێشتریش گوتمان ناوچه‌ی (ئه‌رمینیا)و (گورجستان) ناوچه‌یه‌كی پڕ له‌كانزای وه‌ك (ئاسن)و (مس) بووه‌، هه‌روه‌ها ناوچه‌یه‌كی پڕ له‌ دره‌خت‌و دارستان بووه‌و، وڵاخێكی زۆریشی بۆ گواستنه‌وه‌ی ئه‌و كانزاو دره‌ختانه‌ش هه‌بووه‌ كه‌ له‌ شوێنه‌ دووره‌كانه‌وه‌ پێیان گواستوونه‌وه‌.

ئیدی ئه‌وان پارچه‌ ئاسنه‌ گه‌وره‌كانیان بۆ (ذوالقرنین) هێناوه‌و له‌ دۆڵه‌ ته‌نگه‌به‌ره‌كه‌دا بۆیان داناوه‌و له‌سه‌ر یه‌ك كه‌ڵه‌كه‌یان كردووه‌و، به‌ره‌ به‌ره‌ هه‌ر كه‌ڵه‌كه‌یان كردووه‌ تاكو گه‌یاندوویانه‌ته‌ ئاستی هه‌ردوو لوتكه‌ی چیاكان.

وشەی (ٱلصَّدَفَيۡنِ) لە ئایەتەکەدا مانای هەردوو لوتکەکەی ئەو دوو چیا بەرزە دەگەیەنێت.

پاشان فەرمانی پێ کردوون کە لەژێر ئەو ئاسنە گەورەو لەسەر یەك کەڵەکەکراوانەدا ئاگرێك بکەنەوە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ﴾..

جا سەرنج بدە لە زۆریی‌و تین سەندنی ئەو ئاگرە گەورەیەو، لە زەبەلاحی ئەو دارو تەختانەش کە ئاگرەکەیان پێکراوەتەوە، چونکە مەبەستی (ذوالقرنین) لەوەدا تواندنەوەی چەندین ئاسنی بێشوماری پۆڵا بووە لەو ڕێڕەوە سەختو بەرزەدا.

لەهەمان کاتدا (ذوالقرنین) فەرمانی بە کۆمەڵە کەسێکی تری ئەو گەلە کردووە کە (مس) بێنن‌و لە چەند قاڵبێکی گەورەدا بیتوێننەوە، جا کاتێك ئاسنەکان بەتەواوەتی لەو ڕاڕەوەدا توێنراونەتەوەو، مسەکەش لەنێو لەگەن‌و مەنجەڵە گەورەکاندا توێنراوەتەوەو وەك قۆناغی کۆتایی لە قۆناغەکانی بنیاتنانی بەربەستەکەدا کراوە بەسەر ئاسنەکەدا: ﴿ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا﴾. ووشەی (قطر) لەم ڕستەیەی نێو ئایەتەکەدا بە مسی تواوە دەگوترێت.. ئەویش واتە: (ذوالقرنین) فەرمانی پێ کردوون کە مسی تواوە بکەن بەسەر ئاسنە توێنراوە شلەوە بووەکەدا، ئیدی مسەکەش چۆتە ناوەڕاستی ئاسنەکەوەو تێکەڵی یەکدی بوونو، پێکەوە بوونەتە کانزایەکی پتەوی تۆکمە.. بێگومان ئاسن لە بنەڕەتدا پتەوو تۆکمەیە، مسیش هەروەها پتەو تۆکمەیە.. جا ئاخۆ کاتێك هەردووکیان دەتوێنرێنەوەو تێکەڵی یەکدی دەکرێن، چۆن بن؟ دیارە هەریەکەیان هێزو پتەوی ئەوی تریش وەردەگرێت‌و پێکەوەش لەو پەڕی تۆکمەیی‌و بەهێزی‌و چاکیدا دەبن.

ئینجا (ذوالقرنین) ئاسنەکەو مسەکەی لەو دۆخەدا هێشتۆتەوە هەتا ڕەق بوونو وەك بەستەڵەکیان لێ هاتووەو بوونەتە بەربەستێکی قایم‌و گرنگ‌و سەرسوڕهێنەر.

## ( ذو القرنين ) وەك ئەندازیارێـك

بەڕاستی (ذوالقرنين) خاوەنی هێزو شارەزاییو تێگەیشتنو دەسەلاتێکی وەها بووە کە لە خوداوە پێی دراوەو فێری کراوە.

بێگومان خودا ڕێنموونی ئەوی بۆ شێوازێکی بێوێنەی سەرسوڕهێن لە بنیاتنانی بەربەستەکەو بەتینکردنو بەهێزکردنیدا کردووە. بەو شێوازەش ئاسنو مسی تێکەڵی یەکتر کردووە. جا ئەگەر دەربڕینەکە شیاو بێت (ذو القرنين) ئەندازیارێکی بەشی شارستانی (مدنی) بووە، چونکە بەربەستەکەی لەو ماددە بەتینە بنیاتناوەو، چەندەها سەدەش پێش ئەندازیارانی ئەمڕۆ ئاسنو مسی تێکەڵ کردووە.

لەمبارەیەوە (سید قطب) دەڵێت: (ئەم شێوازە لەسەردەمی نوێدا بۆ بەتینکردنی ئاسن بەکارهێنراوەو، دەرکەوتووە ئەگەر ڕێژەیەك لە (مس) لە ئاسندا تێکەڵاو بکرێت، ئەوا هێزی مانەوەو قایمیی ئاسنەکە چەندان هێندە زیاد دەبێت، جا ئەم شێوازەی کە خودا ڕێنموونیی (ذو القرنين)ی پێکردووەو لە قورئانە نەمرەکەشیدا باسەکەی تۆمار کردووە، چەندەها سەدەی بێشومار (کە هەر خودا خۆی دەزانێت چەند سەدەیە) پێش زانستی نوێی مرۆڤایەتی کەوتووە)(١).

ئەمەش پێچەوانەی ووتەی هەندێك لە مێژوونووسانە کەوایان ڕادەگەیاند گوایە ئەم بەربەستەی (ذوالقرنين) شوورە گەورەکەی چینە، بەڵام ئەو شوورەیە زۆر درێژ بووەو، درێژاییەکەشی سەدان کیلۆمەترەو، لە نێوان دوو چیادا دروست نەکراوە. پاشان ئەم شوورایەی چین لە بەردو گڵ دروستکراوە، بەڵام بەربەستەکە لە ئاسنو مس بنیاتنراوە، لێرەدا هەمان ووتەی پێشوومان دووبارە دەکەینەوە کە

---

١) (في ظلال القرآن/ ٤: ٢٢٩٣).

گووتبوومان: (بەربەستەکەو، شووراکەی چینیش، هەردووکیان بۆ یەك مەبەست دروستکراون. (ذو القرنين) بەربەستەکەی بۆ بەرگرتن لە شالاوەکانی (یەئجووج و مەئجووج) بنیاتناوە، (ئیمپراتۆڕی چین)یش شووریی چینی بۆ هەمان مەبەست (بۆ بەرگرتن لە شالاوەکانی (یەئجووج و مەئجووج) بۆ سەر چین) بنیاتناوە.

قورئانی پیرۆزیش شێوازێکی پشت پێبەستراوی مسۆگەرکراومان بۆ بەهێزکردنو بەتینکردنی کاری بیناسازی پیشان دەدات، ئەو شێوازەش: ئاوێتەکردنی ئاسنو مسە.

هەروەها ئەو ئایەتەی دەربارەی ئەو شێوازە هاتووە، ئاماژە بۆ خاڵێکی زانستیانەی قورئان دەکات، ئەویش تێکەڵکردنی ئاسنو مسە بۆ بەهێزکردنی بینا.

هەروەها دیاردەیەکی ئەندازەییشمان پیشان دەدات، ئەویش چۆنیەتی بنیاتنانی بەربەستە قایمەکەیە. بۆیە دەکرێت لە قورئاندا چەندین ئاماژەی سرووشبەخشی ئەندازەییش بەدی بکەین. بێگومان ئایەتەکانی قورئان چەند ئاماژەی هەمەجۆرو، چەندین سەرنجی هەمەڕەنگیان تێدایەو ئێمەش دەتوانین لەو ئایەتانەوە چەندین سەرنجو ئاماژەی زانستیو پزیشکیو گەردوونناسیو، ئەندازەییو، ژمێریاریو، ئامارکاریو، سەرکردایەتی کردنو، کۆمەلایەتیو، نیشتەجێکاریو، شارنشینییان لێ دەربێنین، جگە لە دەرهێنانی ئەو ڕاستییە بابەتیانەو باوەڕداریتیانەو عەقیدیانەو، فیقهیو زانستیانەو، تەفسیرکاریو جیهادیو بانگەوازکارییانەی کە لەو ئایەتانەدا پیشانمان دەدرێن.

دیارە ئامانجی بنەڕەتی قورئانیش لە بیرناکەین کە کتێبێکی ڕێنماییو، بانگەوازو دەستوورێکی تۆکمەو بەرنامەی ژیانو، بنچینەی جیهادو بانگەوازو بەرەنگارییە.

بەڵام خۆ ئەمەش ڕێگر نیە لەسەر هەڵوێستەکردن لە ئاست چەند ئاماژەیەکی مام ناوەندی لە بوارە زانستییەکانو بوارەکانی تری ژیاندا.

## شـکسـتی (یەئجووج و مەئجووج) لەبەردەم بەربەستەکەدا

کاتێك (ذوالقرنین) لە بنیاتنانی بەربەستەکە بووەوە، (یەئجووج و مەئجوو)یـش بەنەریتی خۆیان هاتن تاکو لە تەنگەبەرەکە (مـضیق) بپەڕنەوەو خەریکی تێکدانو ئاژاوە بن، بەڵام کتوپڕ تووشی ئەو بەربەستە پتەوە بـەرزە بـوون لەبەردەمیانـداو هەوڵیاندا دەرچنو سەرکەون بەسەریا، کەچی نەیانتوانی، چونکە لە ئاسن دروسـت کرابوو، ئاسنیش ڕووکارێکی لووسی هەیەو ئەگەر چەند دەسکێکی ڕاگیرکـاری بـۆ ئەو کەسە پێوە نەبێت کە دەیەوێت پێیدا سەرکەوێتو تا دەستی پێوە بگرێت، ئەوا کەس ناتوانێت پێیدا سەرکەوێت.

هەروەها هەوڵیاندا ئەو بەربەستە بڕووخێننو تێکـی بـدەن، بـەڵام نـەیانتوانی، چونکە لە ماددەیەکی بەهێزو پتەوی (وەك ئاسنو مس) بنیاتنرابوو.

ئەم ئایەتەش ﴿ فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓاْ أَن يَظْهَـرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًـا ﴾ ئەو شکستو سەرنەگرتنی هەوڵەیانی تۆمار کرد کە لە سەرکەوتن بەسەر بەربەسـتەکە، یـان لـە تێکدانیدا شکستو دەستەوسان بوون، مانای ئایەتەکەش واتە: (ئەوان ـ یەئجووجو مەئجووج ـ نەیانتوانی بەسەر ڕووی بەربەستەکەدا سەرکەون و، نەشیانتوانی تێکی دەنو کەلەبەری تێ بخەن).

ئیدی ئەم بەربەستە بووە ئامرازێکی باش بۆ نەهێشتنی شاڵاوەکانی (یەئجووجو مەئجووج)و ڕێگرتن لەکاری تێکدانو وێرانکارییان.

## (ٱسۡطَٰعُوٓاْ) و (ٱسۡتَطَٰعُواْ)

لێرەدا هەڵوێستەیەك لە ئاست دیاردەیەکی جوانی قورئاندا دەکەین، ئەویش دوو شێوازی جیاکاریی ئایەتەکەیە لەنێوان دوو فەرمان (فعل)دا لە ڕووی دارشتنەوە.. ئاخۆ لە هەردوو ڕستەی: ﴿ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ ﴾ و، ﴿وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴾دا حیکمەت چی بێت لە لابردنی پیتی (ت) لە ڕستەی یەکەمدا ﴿ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ ﴾ لە کاتێکدا لە هەمان فرمانی ڕستەی دووەم ﴿وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ ﴾دا دانراوە؟!

بێگومان لابردنی پیتی (تاء) لە ڕستەی یەکەمدا بۆ هێواشکردنەوە (تخفیف)ە، لەبەر ئەمە دەشێت بە (تاء الخفة) ناوی ببەین، ڕووبەندی هێواشکارییەکەش ئەوەیە ڕستەکە هەواڵی شکستبوونی ئەوانی لە سەرکەوتنی بەربەستەکەدا ڕاگەیاندووە، ئەم پێدا سەرکەوتنەش یەکەم جار ئاتاجی بەخێرایی و گورج و گۆڵیی (خۆپێدا سەرخەر) و زیرەکی و شارەزایی و ڕێکیی بەژن و باڵایەتی، چونکە زۆرجار مرۆڤی قەڵەو ناتوانێت بە شوێنی بەرزدا هەڵگەڕێت، لەبەرئەوەی پێویستیی بە کێشی سووکە تاکو بەخێرایی سەرکەوێت.

ئەمەیە ئەو حاڵەتەی کە ڕستەی ﴿ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ ﴾ هەواڵی لەسەر دەدات و، هەر ئەو چوارچێوەیەشە کە ڕستەکەی تێدا هاتووە. هەربۆیەش پیتی (تاء) لە فەرمانەکە داماڵراوە تاکو بەئاسانی هێواش بکرێتەوە. دیارە وەك ئەوەی فەرمانەکە (الفعل) ویستبێتی یارمەتیی کەسی خۆ پێداسەرخەر بدات لەسەر

(لەش سووکی)و، ئیدی (تاء)ەکەی لێ داماڵیوە تاکو بەشداریی شارەزاییی شارەزایان بکاتو، بەشداریی لەش سووکی ئەوانەش بکات کە بە شوێنە سەختو بەرزەکاندا هەڵدەگەڕێن.

بەڵام لە فەرمانی دووەم ﴿وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا﴾دا پیتی (ت) لەگەڵیدا ماوەتەوە، چونکە ئەمە بۆ ئەو شوێنە گونجاو ترەو، لەگەڵ (کەشی گشتی)یشدا تەبایە.

چونکە کونکردنی بەربەستەکەو ڕووخاندنیشی ئاتاجی بە هەوڵی گەورەو زەحمەتو کاری دژوارو بە کاتیشە، هەروەك ئاتاجی بە ئامێرەکانی هەڵکەندنو ڕووخاندنە.. ئاتاجیشی بە پیاوانێکە کە بتوانن بیڕووخێننو، هەوڵو ماندووبوونو زەحمەتو ئارامییەکی زۆریشی تێدا خەرج بکەن، دیارە کاتو ماوەیەکی زۆریشی دەوێت پێش ئەوەی کارەکەیان بە ئەنجام بگەینن، لەو کەشەدا کە ڕستەی ﴿وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا﴾ گوزارشتی لێ دەکات، پیتی (ت) لە فەرمانەکەدا ماوەتەوە. واتە (ت)ەکە بۆ بارگرانی (ثقل) ماوەتەوە تاکو خاڵێکی یاریدەدەر بێت لە وێناندنی کەشی بارگرانیو زەحمەتی ڕووخاندنی بەربەستەکەداو، تاکو لەو پرۆسە قورسو دژوارەشدا بەشدار بێت. کەواتە جاری یەکەم، واتە لە ڕستەی یەکەمدا پیتی (ت) لە فەرمانەکەدا بۆ هێواشکردنەوەو بەئاسان دانانی کارەکە لابراوە، بەڵام جاری دووەم (لە ڕستەی دووەمدا) پیتی (ت) لە هەمان فەرمانی نەیانتوانی ﴿وَمَا اسْتَطَاعُوا﴾دا بۆ قورسکردنو بەگران دانانی کارەکە هێڵراوەتەوەو بەکارهاتووە.

هەر لێرەشدا ئەوە بەیادی هەموان دەخەینەوە کە بێژەکان (الفاظ) لە گوزارشتی قورئانیدا پاڵاوتەو ڕێکخراون لەگەڵ چوارچێوە گشتییەکەیدا. ئەمەش بەچاکی هەڵبژێرراوەو، بەتەواوەتیش لەگەڵ ئەو کەشودۆخەدا گونجاوە کە ڕستەکەی تێدا هاتووەو، لەگەڵ ئەو مەسەلەیەشدا هاوڕێکە کە هەواڵی لەسەر ڕاگەیاندووە.

بێگومان پیتی (تاء)ی (خفة) پێشتر لە چیرۆکی (مووساو خدر)دا ـ سلاّویان لێ بێت ـ هاتبوو، ئەوەش لە وتەی (خدر)دا بە (مووسا) کە پێی گوتبوو: ﴿ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾.

جا ئەوەتا لەم چیرۆکەی (ذو القرنین)یشدا بۆ جاری دووەم پیتی (تاءی خفة) دێتەوە بەرچاومان.. هەر لە چیرۆکی (ذو القرنین)دا فەرمانێك بەدوو شێوە هاتە بەر چاومان، جاری یەکەم لەو فەرمایشتەی خوادا کە باسی پایەدارکردنی (ذو القرنین) دەکاتو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾.

جاری دووەمیش لە ووتەی (ذوالقرنین) خۆی دا کە باسی ئەو هێزو پلەو دەسەڵاتە دەکات کە خودا پێی بەخشیوەو لەکاتی بنیاتنانی بەربەستەکەدا بەو گەلە دەڵێت: ﴿ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ ﴾ ئەوەی خودا لە هێزو توانا پێی بەخشیوم لەو پاداشتەی ئێوە باشترە کە پێم دەدەن).

ئیدی گرنگ ئەوەیە کە ئەو خوێنەرەی بەوردیو تێرامانو تێفکرینەوە قورئان دەخوێنێت، هەڵوێستە لە ئاست چەندین نموونەی تری هاوشێوەدا بکاتو، گەلێك نموونەی تر بەدی دەکات.

## (بنیاتنانی بەربەستەکە رەحمەتێك بووە لە خوداوە)

((ذوالقرنین)) کاتێك بۆ ئەو بەربەستە گەورەیەی ڕوانیوە کە خەڵکی ئەو ناوچەیەی لە شالاّوەکانی (یەئجووجو مەئجووج) پاراستووە، گوتوویەتی: (ئەمە ڕەحمەتێکە لە خودای پەروەردگارمەوە﴿ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾.

کاتێك لەبەردەم ئەم بڕگە جوانو پیرۆزەی ﴿هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ﴾شدا دەوەستین، ئەم پەندو ئاماژانەی لێ دەردێنین:

١- ئەوەی (سید قطب) لەبارەیەوە گوتوویەتی: ((ذوالقرنین) کاتێك بۆ ئەو پرۆژە مەزنەی خۆی ڕوانیوە، تووشی لووتبەرزیو بەخۆ نازین نەبووەو، بۆنو بەرامەی هێزو زانستیش مەستی نەکردووە، بەڵکو یادو سوپاسی خودای کردووەو، هەمان چاکەی لە پێناوی خوادا کردووە کە ڕێنماییی بۆ سەری کرد بوو)[١].

٢- (ذو القرنین) بەزیکرو نزاو یادی خودا لەکاتی بەئەنجام گەیاندنی کارەکەیدا، فێری ئەوەمان دەکات چۆن زیکرو یادی خودا بکەین، بێگومان گەورەترین کاتو شێوەی زیکر ئەوەیە مرۆڤی باوەڕدار لەکاتی سەرکەوتنی کارەکەیدا یادی خودا بکاتو بزانێت کە ئەوە بە فەرمانی خودای پەروەردگارێتی، ئیدی لەخۆبوردوو دەبێتو، دادگەریی ڕەچاو دەکاتو یادو سوپاسی خوداش دەکات.

٣- بنیاتنانی بەربەستەکە ڕەحمەتێك بووە لە خوداوە. (ذو القرنین)یش ئەو زانستەی کە خودا فێری کردبوو و، ئەو پایەو دەسەڵاتەش کە بۆی ڕەخساندبوو، لە (یارمەتیدانی خەڵکی)و (کاری چاك بۆیان)و (نەهێشتنی پەلامارو دەستدرێژیی لەسەریان)دا بەکاری دەهێنان، هەر بۆیەش زانستەکەی ڕەحمەتێك بوو لە خودای پەروەردگاریەوەو، بەکارهێنانی ئەو زانستەش هەر ڕەحمەتێکی خودا بووە. بەکارهێنانو خستنە گەڕی ئەو زانستو زانیارییەش (کە خودا فێری کردبوو) لەگەڵ بابەتی نێو سوورەتی (کهف)دا (سوورەتی زانستو ڕەحمەت) دەگونجێت، وەك خوداش دەربارەی (خدر) ـ سڵاوی لێ بێت ـ فەرموویەتی:- ﴿ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾، هەروەها وەك ئەو ووتەیەی کە لەسەر زاری (خدر) هاتووەو بە (مووسا)ی گوتووە ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾.

---

١) (في ظلال القرآن/ ٤: ٢٢٩٣).

٤- ئەو گەلە لەبەردەم هەڕەشەی (یەئجووج‌و مەئجووج)دا بوون‌و، کەوتبوونە بەر هەڵمەتەکانی وێرانکاری‌و شێواندنیان. هیچ پارێزەرێکیشیان نەبوو کە پارێزگارییان لێ بکات، تەنها خودا نەبێت کە ئەو بەربەستەی بۆ دابین کردن، هەروەها هیچ ڕزگارکەرێکیشیان نەبوو کە لەو مەترسییە ڕزگاریان بکات تەنها بنیات نانی بەربەستەکە نەبێت، هەر بۆیەش بەربەستەکە ڕەحمەتێك بوو لە خوداوە بۆ ئەوان، هەروەك چۆن (بە فەرمانی خودا) هۆیەکی ڕزگار بوون‌و ئازاد بوون بوو بۆیان، خۆ ئەگەر بەربەستەکە بنیات نەنرایەو، ئەگەر ئەو گەلە هەر سکاڵاو دادو بێدادیان (بەبێ کۆشش‌و هەوڵ‌و جم‌وجوولێك) لەدەست حاڵی خۆیان بکردایە، ئەوا خۆیان لەو مەترسییە ڕزگار نەدەکرد. دیارە ڕزگاری‌و ئازاد بوونیش تەنها بەکارو هەوڵدان بەدی دێت.

## (لە بنیاتنانی بەربەستەکەدا وانەیەك بۆ ئێمەش هەیە)

هەمدیسان لەم بەربەستەی (ذو القرنین)دا وانەیەکی گرنگ‌و پێویست بۆ نەتەوەی ئیسلامیش هەیە، بەتایبەتیش لەم سەردەمەدا کە ڕووبەڕووی مەترسییەکی فەوتێنەرو وێرانکەری وەها بۆتەوە کە توندو ترسناکتریشە لە مەترسییەکەی (یەئجووج‌و مەئجووج) لەسەر ئەو گەلە. ئەو مەترسییەش کە ئەمڕۆ بۆ نەتەوەی ئیسلام لە ئارادایە، مەترسی وێرانکەری جوولەکەیە، دێوەزمەی ترسناکی دڕندەو چەپەڵی جوولەکەیەو، هەموو گۆشەو کەنارێکی نەتەوەو هەموو ووزەو تواناکانیشی‌و کە هیچ شتێکی لێ ناپارێزرێت کەوتوونە بەر هەڕەشەی ئەو مەترسییە، کارێکی شیاویش نییە بۆ نەتەوەی ئیسلام کە ئەمڕۆ شکست‌و دەستەپاچە بێت لەبەردەم ئەم مەترسییەدا.

هەروەها بۆ نەتەوە ناشێت کە تەنها بە خەمخواردن‌و ئازار چەشتن‌و لاواندنەوە لە ئاست ئەم کێشەیەدا ڕەفتار بکات، ناشبێت هەر تەنها ڕێگە چارەی ناڕەزایی‌و

ئیدانەکردنو سکاڵاکردن بگرێتەبەرو، تەنها لەسەر ئەوەش سوور بێت کە ڕووی گفتار بکاتە ڕایی گشتیی جیهانیو ویژدانیان بدوێنێتو، هاوار بەرێتە لای خێرخوازان لە دنیاداو داوا لە جیهان بکات بێنە پێشەوە بۆ نەهێشتنی هێرشی داگیرکاریو بەرفراوانبوونی ناوچەکانی جوولەکەو، ڕاوەستاندنی مەترسییان.

هەروەها بۆ نەتەوەی موسڵمانان ناشێت کە هەر لەسەر ئەو جۆرە ڕێچکەو ئامرازو شێوازانە سوور بێت کەوا بەئەنجامێکی ناگەیەنن و، چارەسەرێکی بۆ پەیدا ناکەن، بەڵکو هەر سەرابو خەوو خەیاڵن، وەك پەنابردنە بەر (ئەنجوومەنی ئاسایش)و (نەتەوە یەکگرتووەکان)و (بانگەواز بۆ بەستنی کۆنگرەی نێو دەوڵەتی)و (جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش)و.. ئەو ڕێگە چارە بێ‌ئەنجامانەی تر..

بەڕاستی هیچ خێرو بێرێك لەو هەڵوێستانەدا نییە، ئەم جۆرە ئامرازانەش هیچ چارەسەرێك نابەخشن. نەتەوەی ئیسلامیش بەردەوام لەبەردەم هەڕەشەی مەترسی یە لەناوبەرەکەی جوولەکەدا دەمێنێت. بۆیەو بەبێ هیچ گومانێك تەنها بەکاری جیددیو ڕاستو دروست نەتەوەی ئیسلام ڕزگاری دەبێت..

تەنها بە بەرەو ڕووبوونەوەی جوولەکەو بەڕەنگاری کردنیان ڕزگار دەبن..

هیچ شتێكو هیچ ڕێگا چارەیەك وەك جیهادو شەڕو کوشتارو هێزی سەربازییش نەتەوەی ئیسلام ڕزگار ناکات. بەڕاستی هەر بەهێزو بەکارو هەوڵدان بوو کە ئەو گەلەش لەدەست (یەئجووجو مەئجووج) ڕزگاریان بوو و، ڕەحمەتی خودایان بەهۆی بنیاتنانی بەربەستەکەوە پێ‌گەیشت.

دیارە نەتەوەی ئیسلامیش هەر بەهێزو هەوڵو تێکۆشان لە مەترسیی جوولەکە ڕزگاریان دەبێت، بۆیەش جیهاد لەدژی جوولەکەو شەڕ لەگەڵداکردنیان شتێکی هاوشێوەی بەربەستەکەی (ذوالقرنين)ە.. جا کاتێك نەتەوەی ئیسلام بە چاکی فێری جیهادو شەڕو کوشتار دەبنو سوور دەبن لەسەر شەهیدبوون، ئەوا ڕەحمەتی خودایان پێ‌دەگات وەك چۆن بەگەلانی پێشین گەیەنراوە.

بەڕاستی گەلێکی شکستو تەمەڵ شایستەی ڕەحمەتی خودا نین، خودا ڕەحمیان پێ ناکات، خەڵکیش ڕەحمیان پێ ناکەن، هیچ کەسێکیش دەنگیان نابیسێت، هیچ کەسێکیش بەزەییی بەحاڵیاندا نایەتەوە.

بێگومان ئەوانەی شایستەی ڕەحمەتی خودان پیاوانی بەهێزو توندو تیژن کە موجاهیدە بە ئارامو خۆڕاگرتووەکانن.

بۆیە پێویستە کە ئیدی نەتەوەش ماڵئاوایی لە هیواو ئاواتو خەونە فریودەرەکان بکاتو، دەبێت بچێتە دەروازەی جیهادو شەهادەتخوازییەوە، دەنا هەر تووشی لەناوچوونو نغرۆبوون لە لافاوی سەرشۆڕیدا دەبن.

## ((بەڵێنی خودا و تەخت کردنی بەربەستەکە))

دوای ئەوەی (ذوالقرنین) لەلای ئەو گەلە دانی بەوە دانا کە بنیاتنانی ئەم بەربەستە بۆ ئەوان ڕەحمەتێکە لە خودای پەروەردگارییەوەو، سوپاسیشی لەسەر ئەوە کرد، لە هەمان کاتدا حەقیقەتێکی باوەڕدارانەی گرنگی بۆ خستنە ڕوو، ئەمەش لەو وتەیەیدا کە خودا لەسەر زاری ئەوەوەگێڕاویێتیەوەو فەرموویەتی:-

﴿...فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ الكهف﴾.

لەم ووتەیەیدا، (ذوالقرنین) باسی ئەوە دەکات کە ئەم بەربەستە ماوەو تەمەنێکی دیاریکراوی هەیەو، بەردەوام تا ڕۆژی دوایی لە ئارادا نابێت، بۆیە نابێت خەڵکی تەنها پشت بەوە ببەستن، چونکە ئەو خودایەی کە ڕێگەی بە بنیاتنانیو هێنانەکایەی داوە، هەر ئەو خودایەشە ڕێی داوە کە بەربەستەکە توندو تۆکمە بوو بێت، هەر خوداشە ڕێی داوە کە ڕێگە لە هێرشەکانی (یەئجووجو مەئجووج) بگیرێت.

بەڵام خودا لە ماوەو زەمەنێکی تردا ڕێگە بە (یەئجووج و مەئجووج) دەداتەوە کە بتوانن ئەو بەربەستە تێك بدەن و، بڕیاری تێکدانەکەشی بۆ نووسیون و، ئیدی لەو بەربەستەوە دێنە دەرەوە تاکو سەر لەنوێ بۆ جاری دووەم و سێیەم و چوارەم دەست بە خراپەو تێکدان بکەنەوە.. جا ئەگەر بەڵێنی خودا ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي﴾ هاتە پێشەوەو تەمەنی بەربەستەکە کۆتایی هات و، خودا خواستی لەسەر تێکدان و وێرانکردنی بوو، ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت لەبەردەم خواستی خوادا بووەستێت و ناتوانێت ڕێگا لە بەجێهێنانی فەرمانیدا بگرێت، چونکە مرۆڤەکان بێهێزو لاوازن و، خوداش هەر خۆی بەهێزو بە تواناو کارایە لەسەر هەر کارێك بیەوێت.

﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي﴾ ئەگەر بەڵێنی پەروەردگارم هاتە پێشەوە ئەوا بەربەستەکە تەخت دەکات ﴿جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ﴾ (دکاء) واتە لەگەڵ زەویدا ڕێکی دەکاتەوەو تەختی دەکات. لە وشەی (دکاء)دا سەرنجێکی ڕوون کەرەوەی قورئانیش بەدیی دەکەین.

بێگومان وشەی (دکاء) (مؤنث)ە، (سد)یش (مذکر)ە، داخۆ بۆچی وەسفی ئەم (مذکر)ە بە (مؤنث) کراوە، لە بنچینەشدا ئەوەیە کە (وەسف کراو/ موصوف) لەگەڵ سیفەتەکەدا لە بواری بەنێر دانان و بەمێ دانان (التذکیر والتأنیث)دا یەکسان بکرێن. دوو جۆرە خوێندنەوەش بۆ ئەم وشەیە هەیە:-

یەکەمیان/ دکاء: بەدرێژکردنەوەو هەمزە بۆ دانانەوە:- ئەمە خوێندنەوەی (حەمزە)و (عاصم)و (کسائی)یە. لابردنیشی (واتە کردنی بەربەستەکە بە زەوییەکی تەخت)، وشەی (دکاء) سیفەتێکیشە بۆ وشەیەکی لابراوی بە مێ دانراو (مؤنث)ی وەك (ارض دکاء)، پاشان وشەی بۆ زیادو پاڵ خراو (مضاف)ی (ارض)ەکە لابراوەو تەنها لەپاڵدانراو (مضاف الیە)ەکە جێگەی گرتۆتەوەو، بووە بە (جعلە دکاء). بۆ نموونەش: عەرەبەکان دەڵێن (ناقة دکاء) واتە حوشترێك کە سەرپشتی تەخت بێت و (سەنام)ی نەبێت.

خوێندنەوەی دووەم/ بە (دکاً) واتە بە (تەنوین-ً)ی سەر (کاف)ەکە بخوێنرێتەوە ئەوا بە سیفەتێك بۆ بەربەستەکە دادەنرێت، ئەمەش هیچ گرێوگۆڵێکی تێدا نیە)[١].

جا دوای ئەوەی ڕووکاری وەسفی (مذکر)ە کەمان بە ئاڕاستەی (مؤنث) داناو، کە لە ڕاستیشدا ئەو (مؤنث)ە سیفەتێکە بۆ (مؤنث)ێکی لابراو (محذوف) ئەوا لێرەدا حیکمەتی وەسفکردنی بەو سیفەتە (مؤنث)ەی (دکاء) ڕوون دەکەینەوە:-

بێگومان ئەو بەربەستە توندو تۆکمەیە، سەردەمێکی تری بەسەردا دێت کە دەکرێتە زەوییەکی تەختو هەرچی لە ئاسنو مسی تێدایە نامێنن، دەگۆڕێت بۆ زەوییەکی تەختەڵان، بۆ تەنها زەوییەك (ارض دکاء).

لە باسێکی پێشتری ئەم چیرۆکەدا ئەوەمان بەڕاستترو یەکلاکراوە دانا کە وادەی بەڵێنی خودا لەمەوبەر چەند جارێك لەو جێگایانەدا بەدیی هاتووەو، (یەئجوجو مەئجووج) بە خواستو فەرمانی خودا توانیویانە کەلەبەر بخەنە بەربەستەکەوەو وێرانیشی بکەن، ئیدی بە ڕاستیو بە واقیعی ئەو بەربەستە نەماوەو بووەتە زەوییەکی تەختکراو.

ئەمڕۆش هەر کەسێك بۆ تەنگەی (داریال)ی نێو چیاکانی (کافکاس) بڕوانێت، بە واقیعی دەبینێت کەوا بەربەستەکە لەگەڵ زەویدا تەخت کراوەو، لە ئاسنەکەشی تەنها چەند بڕێکی کەم دەبینێت کە لەسەر هەردوو لێواری تەنگە (مضیق)ەکە ماوەتەوە.

بەڕاستی (ذوالقرنین) ڕاستی گوتووە کاتێك پێشبینی نەمانی بەربەستەکەی لە سەردەمێکی تردا کردووە، وەك گوتویەتی: ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا﴾.

---

١) بڕوانە/ (حجة القراءات)ی (ابن زنجلة)، لاپەرە (٤٣٥-٤٣٦).

## ئه‌و په‌ندانه‌ی كه‌ (ئیمامی قاسمی) له‌م چیرۆكه‌ی ده‌رهێناون

ئیمامی قاسمی لـه‌ كتێبه‌كه‌یـدا (محاسـن التأویـل) چـه‌ند په‌نـدو ئامۆژگـاری‌و فه‌رمانێكی شه‌رعی لـه‌م چـیرۆكه‌دا ده‌رهێنـاوه‌و، مامۆسـتا (محمـد خـیر رمـضان یوسف)یش پوخته‌ی ئه‌و په‌ندو ئه‌حكام‌و ئامۆژگارییانـه‌ی لـه‌ كتێبـه‌ی خۆیـدا(ذو القرنین) به‌ نه‌ختێك ده‌سكاری‌و كورتكردنه‌وه‌وه‌ خستۆته‌ڕوو. (ئێمـه‌ش لێـره‌دا لـه‌و كتێبه‌ (محمد خیر رمضان)ه‌وه‌ پوخته‌یـه‌كی ئـه‌و په‌نـدو وانـه‌ كورتكراوانـه‌ دیـاری ده‌كه‌ین:-

١- په‌ند وه‌رگرتن له‌وه‌ی كه‌ بێگومان خودا هه‌ندێك خـه‌ڵكی به‌چـه‌ند پله‌یـه‌ك لـه‌ هه‌ندێكی تر به‌رزتر داناوه‌و، له‌ ڕزق‌و ڕۆزیشداو بـه‌ خواسـتی خـۆی سـامان‌و موڵك‌و ماڵی به‌ هه‌ندێك كه‌س به‌بێ حساب‌و ژماره‌ به‌خشیوه‌.

٢- گرتنه‌ به‌ری هۆكارو ئامرازه‌كان‌و كه‌وتنـه‌ دوای سـوننه‌ت‌و ڕێـسای خـودا لـه‌ گه‌ردووندا به‌ كاری جیددی‌و هه‌وڵدان. دیاره‌ به‌ پێی ئه‌ندازه‌ی هه‌وڵ‌و كۆشـش، سه‌ركه‌وتن‌و ڕزگاریش هه‌یه‌.

٣- به‌گه‌ڕخستنی وزه‌و وره‌ بۆ لابردنی كۆسپ‌و ته‌گه‌ره‌كان.

٤- پێویستیی ده‌ست پێ‌كردن‌و هه‌نگاونان بۆ كاروباره‌ گه‌وره‌كان.

٥- هه‌ر كه‌سێك به‌سه‌ر دوژمنـانی دا زاڵ‌و سـه‌ركه‌وتوو بێـت، بـۆی ناشـێت كـه‌ ملكه‌چ‌و زه‌لیل‌و كۆیله‌یان كات، به‌ڵكو ده‌بێت به‌ دادو عه‌داله‌ته‌وه‌ مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵـدا بكـات و، پاداشـتی چـاكه‌كار له‌سـه‌ر چـاكه‌كه‌ی بداتـه‌وه‌و، سـزای خراپه‌كاریش له‌سه‌ر خراپه‌كه‌ی بدات.

٦- پێویسته‌ پادشاو سه‌رداری خه‌ڵكی، هه‌موو هه‌وڵ‌و كۆشـشێكی خـۆی لـه‌پێناو پاراستنی نیشتمان‌و دابینكردنی ئاسووده‌یی‌و ئارامی‌و هاووڵاتیاندا بخاته‌ گه‌ڕ.

٧- پێویستە پادشاو سەرۆکی وڵات خۆی لە پارەوپوولی خەڵکی ژێر دەسەڵاتی بپارێزێتو خوازیاری وەرگرتنی کرێو پاداشت نەبێت لەسەر کارێکی کە بۆیان دەکات .

٨- ئەگەر لە جێگەیەکدا پێویستو گونجاو بوو باسی نیعمەتەکانی خودا کە بەخۆی داون، بکرێت، ئەوا پاشا دەتوانێت باسیان بکات .

٩- توندکردنی شوورەو قەڵاکانو بەهێزکردنیان .

١٠- پادشا بەشدارییکاری کرێکاران بکات تاکو چالاکییان زیاتر پێبداتو بەو بەشداریکردنەشی خۆشحاڵیان بکات .

١١- باسو پێناسەی بەروبوومی کارکردن بۆ کەسانی تر بکات تاکو ڕێزو بەهای بزاننو سوپاسی خوداشی لەسەر بکەن .

١٢- ڕۆژی دواییو کۆتایی هاتنی ئەم ژیانەی دنیا بەبیر کەسانی تر بێنێتەوە تاکو دڵانی خەڵکی بەڕۆژی دواییەوە پەیوەست بن .

١٣- پەندو دەرس وەرگرتن بە ڕازاندنەوەو پەرەپێدانی ستایشی جوانو هێشتنەوەی ئاسەواری گەورەو شکۆدار لەنێو دڵاندا، ئەمەش لە ڕێگەی ڕەوشتی چاکو نەریتی جوانو، ئازایەتیو مەردایەتیو چاو پۆشیو دادگەریو چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدا.

١٤- ئەو کەسەی کە پادشاو سەرداری چەند گەلو هۆزێکی هەمە چەشنە بێت، دەبێت بایەخێکی زۆر بەیەك خستنی گوتارو هەڵوێست بدات)[١] .

---

١) کتێبی (ذو القرنین)ی (محمد خیر یوسف)، بەدەسکاریو کورتکردنەوەوە، لە لاپەرەکانی (٢٨١-٢٨٣)ەوە.

